ناوی کتێب : گوتاری ناسیونالیستی کوردی

بابەت : لێکۆڵینەوە

ناوی نووسەر : عەتا قەرەداخی

تایپ ونەخشەسازی : فەرەیدون عەزیز بابا

بەرگ : سەیوان سەعدیان

ساڵی چاپ : ٢٠٠٧

نۆرەی چاپ : یەکەم

ژمارەی سپاردنی (٩٨٣) ی ساڵی ٢٠٠٧ ی دراوەتێ

تیراژ : ١٥٠٠ دانە

نرخ : ٧٥٠٠ دینار

چاپ و بڵاوکردنەوە : چاپخانەی رەنج

# ناوەڕۆك:

# پێشەکی:

خوێنەری خۆشەویست ئەم کۆمەڵە بابەتەی لەم کتێبەدایە پێکەوە هەوڵدەدەن ئاخاوتنی گوتاری کوردی بکەن، هەڵبەت دەبێ ئەوەش بڵێم لێرەدا مەبەست لە گوتار (Discourse) یان (خطاب)ە، نەك وتە یان (خطبة). کەواتە ئێمە لێرەدا دەمانەوێت قسە لەسەر بابەتێك بکەین کە لە سادەترین پێناسەیدا پێکهاتەیەکی زمانی نووسراوە یان تۆمارکراوە کە دەبێ بارگاوی کرابێت بە فیکر، مەعریفە، جیهانبینی. کاتێ باسی گوتاری نەتەوەیی دەکەین دەبێ ئەو گوتارە هەڵگری فیکرو مەعریفەو جیهانبینی نەتەوەیی بێت.

دیارە هەر گوتارێك کۆمەڵێك رەگەزو توخمی بنیادنەرو بەرهەمهێنی هەیە. بەگوێرەی گوتاری کوردیش هەمان بۆچوون راستە یان بەشێوەیەکی تر ناشێت لە بۆشایدلو بەبێ بوونی رەگەزو پێکهێنەرەکانی گوتار، باس لە بوونی گوتاری کوردی بکرێت، بەلام دیارە زۆرێکی ئەو رەگەزو توخمانە لە بوونی کورد خۆیدا ئامادەبوونیان هەیە، کە سەرەکی ترین رەگەزی هەر گوتارێك زمانە. راستە زمانی کوردی هەتا ئێستا لە ئاستی زمانی ناوچەیی‌و دایەلێکتی جۆراوجۆردا ماوەتەوەو زمانی یەککگرتوو یان زمانی ستاندەر پێکنەهاتووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم زمانە بوونی خۆیی پاراستووەو لە بەرهەمهێنانی گوتارێکدا کە پێشتر ئێمە بە گوتاری مانەوە ناومان بردووە توانیوویەتی بەجۆرێکی سادە بەرگری لە بوون‌و مانەوەی خۆی بکات، هەرچەندە دەشێ وای بۆ بچین هەر چۆن دەوڵەت نەتەوە دروست دەکات، بە هەمان شێوە هەر دەوڵەتیش زمانی یەککگرتووی نەتەوەیی دروست دەکات، بە وتایەکی دی لە دروستکردنی نەتەوەدا زمانی یەککگرتووی نەتەوەش دروست دەکات، دیارە ئێمە دەزانین ئێستا زمانی کوردی هەیەو ئاخاوتنی پێدەکەین‌و پێی دەنووسین. بەلام نەبوونی زمانی یەککگرتوو هەر چۆن هۆکارێکی

لاوازیی کەسێتی نەتەوەیی ئێمەو ناسیۆنالیزمی کوردییە بە هەمان شێوە یەکێکە لە کۆسپەکانی بەردەم گوتاری نەتەوەیی کوردی، هەروەك لەلایەکی ترەوە ناشێت گوتاری نەتەوەیی لە دەرەوەی ناسیۆنالیزم باس بکرێت کە لێرەدا گوتاری نەتەوەیی هەلگری ماناو دەلالاتو جیهانبینی نەتەوەییانەیە چی لە ئاستی ئەنتۆلۆژیانەدا چی لە ئاستی سیاسیو ستراتیژیدا، بە واتا کاتێ باس لە ناسیۆنالیزم دەکەین دەبێ ئەوەمان لەلا ئاشکرابێت کە ئاستی هەرە کەمی پرۆژەی ناسیۆنالیزم دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیە. راستە لێرەو لەوێ بە کاریگەری هەردوو گوتاری ئینتەرناسیۆنالیزمی مارکسیو ئایینی لە عەقڵی کوردیدا پرۆژەی ناسیۆنالیزم گۆڕانی نێگەتیڤی بەسەردا هاتووەو لەبری پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوە، پرۆژەی پێکەوە ژیانی نەتەوەو ئێتنیکە جیاوازەکان هاتۆتە ئاراوە، ئەویش لەژێر دروشمی دیموکراسی بۆ وڵاتو ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد یان لەژێر دروشمی هەموومان برای دینین و پەیوەستبوونی ئایینی بەهێزترە لە پەیوەستبوون و ئینتیمای نەتەوەیی، بۆیە هەموو مسوڵمانان بەجیاوازی رەگەزو زمان و رەنگو شێوازیانەوە وەکو یەکن و برای یەکترن بۆیە دەبێ هەموویان بەگشتی لەژێر دروشمی ئومەتی ئیسلامدا کۆببنەوە، لەم دوو حاڵەتەوە گوتاری نەتەوەیی کوردی بە کاریگەری ژێردەستەبوون و مانەوەی هەمیشەیی لە دەرەوەی کورسی دەسەڵاتدا کەوتۆتە پەراوێزەوەو هەردوو گوتاری ئایینی و مارکسی شاردویانەتەوە یان رێگایان نەداوە فۆرمەلە ببێت یان هەوڵی تێکشکاندن و لەنێوبردنی رەگەزو تۆخمەکانی بنیادنانیان داوە کە ئەوەش زیاتر لە شێوازی جۆرێك لە پرۆسێسی کۆلۆنیالیکردنی کەلتوریدا دەرکەوتووە.

لە مێژووی دوای دەرکەوتنی ئایینی ئیسلامەوە گوتاری کوردی تاوەکو جەنگی یەکەمی جیهانی و روخاندنی دەوڵەتی عوسمانی نەیتوانیوە خۆی لە گوتاری ئیسلامی جیا بکاتەوە کە ئەو گوتارەش سەرباری ئایینی بوون هەلگری زۆرێك لە رەگەزەکانی گوتاری نەتەوەیی عەرەبی، یان گوتاری شیعەگەرێتی فارسی یان گوتاری تورکێتی بووەو لە هەمان کاتدا رەگەزەکانی کوردی بوون لەو گوتارەدا بوونی نەبووە، دەشێ لە سەردەمی دەرکەوتنی نووسین بە کوردی بۆ دواوە لە ئاستی زماندا، سیمایەکی لاوازی ئەم گوتارە واتە گوتاری کوردی دەرکەوتبێت بەڵام ئەو دەرکەوتنە لەو ئاستەدا نەبووە کە شوناسی کوردبوون بەدەست بهێنێت، بەڵکو

بەپێچەوانەوە سەربارەی بەکارهێنانی کوردی بۆ نووسین، ئەو نووسینە بارگاوی کراو بووە بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی ئایینی.

لەسەر وەختی کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیشەوە واتە هەر لەو کاتەی کە لە کوردستان لایەنگرانی سۆڤێتی لە بزوتنەوەی کوردیدا دەرکەوتوون واتە لەسەردەمی عەبدولڕەزاق بەدرخانەوە کاریگەری گوتاری مارکسیزم هێندە بەهێز بووە کە خەبات لەپێناوی وەهمی دیموکراسیو برایەتی گەلاندا جێگای خەباتی لەپێناوی سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی یەکگرتووی نەتەوەیدا گرتۆتەوە. بە واتا گوتاری ئینتەرناسیۆنالیزمی ڕابەرایەتی کراو لەلایەن سۆڤێتەوە بووەتە ئەڵتەرناتیڤی گوتاری نەتەوە.

بە هەرحاڵ ئەمە بارودۆخی کەلتوریو عەقڵیو سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردی هەموو پێکەوە گرتۆتەوەو سەرئەنجام بکەرێکی نەتەوەیی لاوازو گوتارێکی نەتەوەیی سادەو ساکار لەڕووی ماناو جیهانبینییەوە لەڕووبەری فراوانی جوگرافیای کوردستاندا دەرکەوتووە کە لە دەرەوەی هەر پرۆژەیەکی جدی نەتەوایەتیدایەو لەسەر بنەمای کارو کاردانەوە ڕەفتار دەکات، کە دەتوانین بڵێین لە یەکەم بزوتنەوەی دیاری کوردەوە واتە لەسەردەمی بەدرخانیەکانەوە تاکو ئێستاش بزوتنەوەو ڕاپەرینەکانی کورد لەبری ئەوەی بەرهەمی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی کوردی بن، جۆرێکن لە کاردانەوە بەرامبەر بە زەبرو زەنگی داگیرکەرانی کوردستان. هەر بە هەمان شێوە گوتاری بزوتنەوەکانی کوردیش ڕەنگدانەوەی ئەو کاردانەوانەن نەك بەرهەمی ناسیۆنالیزمو پرۆژەی ناسیۆنالیزم. هەر ئەم هۆکارەشە کە وایکردووە بزووتنەوەکانی کورد هەر لە سەروەختی بزوتنەوەی بەدرخانیەکانەوە تاکو نیوەی دووەمی سەدەی بیست لە ماوەیەکی کورتدا دووچاری شکست بنو هەرەس بهێنن. بە هەر حاڵ گوتاری کوردی دەربڕو بەرجەستەکەری ئەم بزوتنەوانە بووە کە سەرباری بەرزکردنەوەی هەندێ دروشمی ناسیونالیستانە ناشێت هیچ کام لە بزوتنەوەکانی کورد بە بزوتنەوەی نەتەوەیی خاوەن پرۆژە دابنرێن، هەرچەندە زۆرێك لە کوردناسانو مێژوونووسانی کوردیش مێژووی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کورد دەگێڕنەوە بۆ مێژوویەك کە تەنانەت لە ئەوروپاش لەو مێژووەدا هێشتا مەسەلەی ناسیۆنالیزم جێگای قسە لەسەر کردن نەبووە، بۆ نموونە هەندێ پێیان وایە ئەحمەدی خانی ڕابەری ناسیۆنالیزمی

کوردییەو میرنشینەکانی ئەردەڵانو بابانو سۆران بە دامەزراوی نەتەوەیی ناو دەبەنو سەرجەم بزوتنەوەکانی دواتریش بە بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی دەزانن، لەکاتێکدا کە نە پرۆژەی ناسیۆنالیزم ئامادەیی هەبووە نە نوخبەی ناسیۆنالیستی لەو ئاستەدا بووە کە رابەرایەتی بزوتنەوەکان بکات، ئەمە جگە لەوەی کە خودی بزوتنەوەکان لەروانگەی رووبەری جوگرافی‌و بەشداربانی بزوتنەوەکانو گوتارو بەرنامەو ستراتیژی کارکردنو سەرکردایەتیشەوە زیاتر بزووتنەوەی خێڵایەتی بوون.
راستە هەریەکە لەم بزووتنەوانە بەجۆرێك باسی مەسەلەی کوردیشی کردووە بەڵام ئەوە لە سنووری هەستێکی ئاسایی تێپەڕی نەکردووە، چونکە ئەوە ئاشکرایە پرۆژەی نەتەوایەتی پرۆژەیەکی بەرفراوانەو دەبێ هەموو جەستەی نەتەوەو هەموو جوگرافیای نیشتمان بگرێتەوە، ئەوکاتە گوتارێکی نەتەوەیی خاوەن شوناس ئەگەری بوونی دەبێت، بۆیە دەتوانین بڵێین گوتاری بزوتنەوەکانی کورد گوتاری خێڵایەتی بارگاوی کراوبوون بەرەگەزەکانی نەتەوەوایەتی‌و ئایینی‌و لەدوای جەنگی یەکەمیشەوە رەگەزی مارکسیزمیش بووەتە بەشێك لە بارگەی ئەو گوتارە.
ئەم بەرهەمەی لەبەردەستدایە هەوڵێکە بۆ قسەکردن لەسەر سروشتی گوتاری کوردی‌و چۆنێتی پێکهاتنی‌و کارکردنی کە تاکو سەردەمی کۆماری مهاباد دەگرێتەوە، لە بەشی دووەم یان بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا هەوڵدەدەین گفتوگۆی گوتاری کوردی حیزب‌و رێکخراوو بزوتنەوەکانی دواتری کوردستان بکەین، لەگەڵ ئەوەشدا قسە لەسەر گوتاری نوخبەیەکی دیارو ناسراو لە رۆشنبیرانو نووسەرانی دیار بکەین ـ کە هەندێ جار بوونو روانینی ئەوانە رووبەرێکی فراوانی لە مێژووی سیاسی‌و رۆشنبیری‌و فیکری کوردی چ بە پۆزەتیف بێت یان نێگەتیف داگیر کردووە.

٧ی / ئازاری / ٢٠٠٧

**سلێمانی**

تاکو ئێستا چەند جارێك لەسەر گوتارەکانی کورد ئاخاوتنمان کردووە [1] بەڵام بەشێوەی جیاجیاو هەرجارە لەلایەنێکی ئەو گوتارە دواوین، بەڵام لێرەدا هەوڵدەدەین لە دوو ئاستی جیاوازدا ئاخاوتنی ئەو ناونیشانە بکەین، یەکەم هەوڵدەدەین چەمکی گوتار بناسێنین‌و لەو ئاقارەشدا ئاخاوتنی گوتاری کوردی بکەین. دووەم هەوڵدەدەین ئاراستەکانی گوتاری کوردی یان گوتاری هاوچەرخی کوردی بخەینە بەردەم لێدوانەوە، دیارە کاتێك دەربارەی باسێکی لەم جۆرە ئاخاوتن دەکەین پێویستمان بەوەیە کە نموونەو زانیاری لەنێو واقیعی کۆمەلایەتی‌و مێژوویی‌و سیاسی خۆمان وەربگرین‌و بشکەرێنینەوە بۆ قسەکردن لەسەر بەرنامەو کارکردنی بزوتنەوەکانی کوردو هەروەها ئاماژە بە بەرنامەو پەیڕەوو کارکردنی حیزب‌و ڕێکخراوە کوردییەکانیش بکەین. پێشەکیش رایدەگەیەنین کە وەرگرتنی بەڵگەو زانیاری لە بەرنامەو کارکردنی بزوتنەوەکان‌و حیزب‌و ڕێکخراوەکانیش بە مەبەستی کارو لێکۆڵینەوەیە نەك رەخنەگرتن.

زاراوەی گوتار دەشێ مانای زمان یان نووسین هەڵبگرێت. هەروەها گوتار مانای تایبەتی هەیەو دەشێ (تەنیا) پەیوەست نەبێت بە زمان یان بە نووسینەوە، بەڵکو لەبواری تێرامانیشدا بەکار بهێنرێت(٢)و لێکبدرێتەوە، دەشێ زمان لەخۆیدا شتێك یان رەگەزێکی بێ لایەن بێت بەڵام کاتێ بارگاوی دەکرێت بە ماناو تێکڕا زمان دەبێتە (دال)و هەڵگری (مەدلول) دەبێت، ئەوکاتە پەیوەندی نێوان زمان‌و گوتار یان نووسین‌و گوتار دەردەکەوێت، راستە کردەی نووسین یان ئاخاوتن ناشێت لە مانا رووت بکرێتەوە، بەڵام دەشێ ئەو مانایەی کە هەر گوتنێك یان نووسینێك هەڵیدەگرێت لە ئاستێکی لاوازدا بێت‌و بەجۆرێك رێك نەخرابێت کە شێواز یان فۆرمی گوتار بەخۆی بگرێت.

کاتێ لەبارەی هەر فیکرێکەوە دەدوێین، مەبەستمان بەرهەمەکانی ئەو فیکرەیە، لە بنەڕەتیشدا مەبەستمان کۆمەڵە دەقێکە. دەقیش پەیامێکە لە نووسەرەوە بۆ خوێنەر ئەوەش بریتییە لە گوتار[3] کەواتە پەیوەندی لەنێوان بەرهەم هێنی دەق‌و خوێنەری دەقدا بەهۆی دەقەکەوە دروست دەبێت،

هەروەك چۆن زمان هۆی دروستكرنی پەیوەندییە لەنێوان قسەكەرو گوێگردا.
بێگومان زمانیش كاتێك دەتوانێت ئەو پەیوەندییە لەنێوان قسەكەرو گوێگردا دروست بكات كە هەڵگری مانا بێت، قسەكەرو گوێگریش لە یەك كاتدا دەبێ هاوبەشی بكەن لە بەرهەم هێنانی ئەو مانایەدا، واتە ئەو مانایەی كە قسەكەر لەرێگەی زمانەوە دەری دەبرێت ئەگەر گوێگر ئامادەبوونی نەبێت بۆ وەرگرتنی ئەوا ئەو پەیوەندییە دروست نابێت، بە هەمان بۆچوون كاتێ بەرهەم هێنی دەقی نووسراو لەرێگای دەقەكەیەوە كە نووسینە مانا بۆ خوێنەر دەنێرێت ئەگەر خوێنەر ئامادەی وەرگرتن یان تێگەیشتنی نەبێت لەو مانایە ئەوا دەق كە بریتییە لە پێكهاتەیەكی زمانی ناتوانێت دەوری ئەو ناوەندە ببینێت كە پەیوەندی لەنێوان بەرهەم هێنی دەق و خوێنەری دەقدا دروست بكات هەر لێرەشەوە زەمینە بۆ بەرهەم هێنانی گوتار ناڕەخسێت.. نووسەر دەیەوێت فیكرەیەك یان تێڕوانینێكی دیاری كراو لە بابەتێكی دیاریكراودا پێشكەش بكات.. ئەوەش بریتییە لە گوتار[4] لێرەوە ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەبێت كە گوتار لەسەر بنەمای فیكر بەرهەم دێت و بنیاد دەنرێت. هەر لێرەشەوە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە كاتێ باسی گوتار دەكەین دەبێ فیكر ئامادەبوونی هەبێت، دەبێ دەق ئامادە بێت ئەویش دەشێ دەقی نووسراو یان دەقی زارەكی بێت چونكە هەردوو جۆری دەق دەتوانن هەڵگری فیكرو مەعریفە بن، لەم تێڕوانینەوە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە كاتێ باسی گوتاری نەتەوەیی هەر نەتەوەیەك بكەین دەبێ فیكری نەتەوەیی یان مەعریفە لە رووبەری بوونی ئەو نەتەوەدا ئامادەبوونی هەبێت.. دەتوانین لەم دەروازەیەوە بەدرێژی ئاخاوتنی سەرچاوەو پایەكانی گوتاری كوردی بكەین.. بەڵام لێرەدا ئەم باسە بەجێ دەهێڵین و لە بەشی دوایی لێكۆڵینەوەكەماندا بۆی دەگەڕێینەوە.

گوتار بەو پێیەی كە دەقێكی نووسراو بێت كەواتە دەبێتە گوتەی نوو-
خۆ ئەگەر گوتار دەقێكی زارەكیش بێت ئەوا دەبێتە گوتەی قسەكەر، بەڵام لە هەردوو بارەكەدا دەبێ لەسەر بنەمای فیكرو بوونی فیكر ناسنامەی گوتاری

پێ ببڕێت. هەر لێرەوە.. زاراوەی گوتار بەدیلێکی بنەڕەتیو تیۆرییانەی ئەو تێڕوانینانەیە[٥]، کە بەرهەم هێنی گوتار گوزارشتی لێدەکات لەڕێگای زمانەوەو ماناو هەستی ئێمە یان مەعریفەی ئێمە سەبارەت بە جیهان لە زمان بار دەکات. بەو پێیە زمان دەبێتە سەرچاوەی هەستکردنی ئێمە بە حەقیقەتو بەرپرسیارە لە بەرهەمهێنانی مانا[٦] هەر لێرەشەوە دەشێ گفتوگۆی زمانی کوردیو گوتاری کوردی پێکەوە بکەین لە ڕوانگەی سەرهەڵدانی نووسین بە کوردیو بارگاوی کردنی ئەو نووسینە بە مانای کوردیو بە هەستی کوردیو بە مەعریفەی کوردیو بە فیکری کوردی.. لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت ئایا ئەو بوارانە کامانەن کە دەشێت بکرێنە بواری قسەکردن لە سنووری گوتاری کوردیدا. ئایا چۆن ئاخاوتن لە گوتاری ڕابوونەوەی کوردی دەکرێت؟ ئایا ڕابوونەوەو تازەگەری فیکریو ڕۆشنبیری کوردی لە کوێدایەو لە چ ئاستێکدا توانیویەتی فۆرمی گوتار وەربگرێت؟ ئایا گوتاری نەتەوەیی کوردی بەرهەم هاتووە؟ سەرچاوەکانی ئەو گوتارە کامانانەن؟ سنوورەکانی ئەو گوتارە چۆن دیاری دەکەین؟ ئەنجا ئایا دەشێ ئەو گوتارە لە دەرەوەی فیکری بوونی هەبێت؟ ئەگەر فیکری کوردی بوون نەبێت ئایا گوتاری کوردی بوونی دەبێت؟ لێرەوە دیسان قسەکردن لەسەر پەیوەندی نێوان گوتارو فیکر دێتە ئاراوە. دیسان ئایا ئەو گوتارە لە کوردستانێکی داگیرکراوی دابەشکراودا بوونی هەیە، یان بە زارەوەی بێشکچی لە "کوردستانێکی کۆلۆنی نێو دەوڵەتیدا[٧] چۆن ئەو گوتارە بەرهەم دێت، پاشان ئاخاوتن لەسەر گوتاری سیاسی کوردی دێتە ئاراوە کە ئەوەش ناشێت لە دەرەوەی عەقڵی سیاسی کوردی ئاخاوتن بکرێت، دەشێ ئاخاوتن لەسەر گوتار بەگشتی ئەوە بێت کە تا چەندێ هەڵگری سیماکانی عەقڵە کە بێگومان دەبێ دەستنیشانی سیماکانی ناعەقڵانیو ناڵاندنی گوتاری کوردی لەژێر کاریگەریو کارکردنی ناعەقڵانی بووندا بکرێت، بەجۆرێك کە ناعەقڵانی بوون لە پانتایی مێژووی ئێمەدا لەلایەك مەرجەعیەتی وەهمی بۆ دروستکردووین، لەلایەکی ترەوە سەرچاوەکانی فیکری دەرەوەی کوردی کردۆتە مەرجەعی گوتاری کوردی، لەو ئاقارەشدا هەژموونی سەرچاوە

ناكوردييەكان كۆنترۆڵی عەقڵی كوردی كردووەو گوتاری كوردیشی خستۆتە بەردەم گرفتی لێدوانێكی ئاڵۆزەوە، لێدوان لە رەسەنایەتیو نارەسەنایەتی ئەو گوتارە. هەروەها كاریگەری نێگەتیڤی سەرچاوە ناكوردییەكانی گوتاری كوردیو كاریگەری سەرچاوە ناكوردییەكانی بەرهەم هێنانی عەقڵی سیاسی كوردی كە دەوری نێگەتیڤیان هەبووە لە مێژووی ئێمەدا دەبێ ئاخاوتن بكرێن، بۆ نموونە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەكەین كە بە كاریگەری گوتاری ئیسلامی كە هەڵگری ماناكانی ئەو گوتارە زمانی عەرەبییە چۆن پانتایی بیركردنەوەی كورد بۆتە پانتاییەك بۆ بیركردنەوەی ناكوردیانە، ئیتر گرنگ نییە ئەو بیركردنەوەیە بیركردنەوەیەكی ئایینی یان عیلمانی بێت، بەڵكو گرنگ ئەوەیە كە چۆن ئەو گوتارە غەریبە بۆتە سەرچاوە یان مەنبەع لە روویەری نەتەوەیی ئێمەداو بە ئاراستەی مەرجەعیەتی خۆی كورد كێش دەكاتو لە ناوەندی كورد بوونی دوور دەخاتەوە. كەواتە كاتێ باسی گوتاری سیاسی كوردی دێتە ئاراوە مەسەلەی رەسەنایەتیو هاوچەرخی دەبێ لە پلەی یەكەمدا دابنرێن، هاوچەرخێتیش لەلایەك بەو مەبەستەیە كە تا چەند ئەو گوتارە لەگەڵ ژیانی قۆناغی مێژوویی ئێستادا گونجاوە، لەلایەكی تر تا چەندێ ئەو گوتارە دەربڕی ویستو پێداویستییەكانی قۆناغی ئێستای ژیانی كۆمەڵگایە.

بۆ ئاخاوتنی ئەم ئاراستانەش پێویستمان بە توێژینەوەی هەمەلایەنەو گشتگری ژیانی كۆمەڵایەتیو مێژووییو كەلتووریو سیاسی كوردی هەیە هەتا بتوانین تایبەتمەندییەكانی گوتاری كوردی وەكو ئەوەی كە هەیە دەستنیشان بكەینو وەكو ئەوەشی كە وەكو گوتاری نەتەوەیی دەبێ هەبێت بناسێنین، بەواتا دەبێ هەوڵی دەستنیشانكردنی گوتاری نەتەوەیی كوردی بدەین كە بێگومان وەكو ئەوەی مەبەستە تاكو ئێستا دروست نەبووە. هەروەك ئەو گوتارەشی كە بەرهەم هاتووە بخەینە بەردەم هەڵسەنگاندنەوە تاكو بزانین كەموكورتییەكانی چینو كامانەن.

# مێژووی دەرکەوتنی گۆتاری کوردی

بۆ ئاخاوتن لەسەر دەرکەوتنی گوتاری کوردی ناتوانین ئەو پێشەکییەی سەرەوە پشتگوێ بخەین، بە مانایەکی تر دەبێ دەرکەوتنی گوتاری کوردی ببەستینەوە بە زمانی کوردییەوە لە پلەی یەکەمداو لە پلەی دووەمیشدا بارگاوی بوونی ئەو زمانە بە ماناو بیرکردنەوەو تێڕوانینی کوردانە بنەمایەکی سەرەکییە بۆ قسەکردن لەسەر دەرکەوتنی ئەم گوتارە.

بێگومان ئاخاوتن بەکوردی مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەڵام ئێمە نازانین تا چ ئاستێك زمانی زارەکی کوردی لە ئاخاوتندا بارگاوی کراوە بە ماناو بیرکردنەوەو روانینی کوردانە بۆیە ناچار دەبین کاتێ باسی گوتاری کوردی دەکەین پشت بە نووسین ببەستین راستە مێژووی کورد مێژوویەکی دەوڵەمەندە لەڕووی دەقی فۆلکلۆری‌و قسەی نەستەق‌و ئەفسانەو فانتازیاوە بەڵام تاکو ساتەوەختی تۆمارکردن ئەم دەقانەش بە ئاسانی ناتوانرێت بەبێ توێژینەوەو شیکردنەوەی هەمەلایەنە بکرێنە بەڵگەی سەلمێنەر بۆ دیاریکردنی رەگەزەکانی گوتاری کوردی‌و هەتا بەو پێیەش مێژووی دەرکەوتنی گوتاری کوردی دیاری بکرێت.

کەواتە سەرباری ئەوەی کە زۆرێك لە رەگەزەکانی بەرهەم هێنانی گوتاری کوردی لە مێژووی رابردووی کورددا ئامادەبوونیان هەبووە بەڵام ناتوانین تا قۆناغی سەرهەڵدانی نووسین بەکوردی لەبارەی گوتاری کوردییەوە گفتوگۆیەکی ئەوتۆ بکەین کە زەمینەی مادیانەی دیار بۆ ئەو گفتوگۆیەو بۆ سەلماندنی راوبۆچوونەکان پێشکەش بکرێن. دیارە لێرەدا دەبێ لەلایەك لەدوای قۆناغی سەرهەڵدانی نووسین بە کوردی بگەڕێین لەلایەکی ترەوە بەدوای ئەو کاتەدا بگەڕێین کە ئەو نووسینە بۆتە هەڵگری ماناو بیرکردنەوەو

روانینی کوردانە. لێرەشەوە ئێمە ڕوویەڕووی ئاخاوتن لە چەمکی ڕابوونەوە یان ڕێنسانس دەبینەوە کەواتە بەو پێیە لەگەڵ ئاخاوتنکردنی گوتاری کوردیدا دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە قسەکردن لەسەر گوتاری ڕابوونەوە یان پرۆژەی ڕێنسانسیش کوردی دێتە ئاراوە، ڕێنیسانسیش بەو مانایەیە کە ڕابوونەوەو زیندوبوونەوەیەکی گشتگرو هەمەلایەن بێت لە جەستەی نەتەوەی کورددا کە سەرجەم بوارە جیاوازەکانی ئەو جەستەیە بگرێتەوە کە بێگومان ڕابوونەوە لە خۆیدا هەوڵدانە بۆ بەخشینی مانای کوردانەو بیرکردنەوەو روانینی کوردانە بە جەستەیەك کە تاکو ئەو کاتە لەو مانایانە بێبەش و رووتکراوە بووە بێگومان وەك ئاشکرایە یەکەم هەنگاوی ڕابوونەوەیەکی لەم جۆرەش لە زمانەوە دەست پێدەکات بۆیە هاوشێوەییەکی تەواو لەنێوان گوتاری کوردی و ڕێنسانسی کوردیدا هەیەو ناشێت دوور لە ئاخاوتنی ڕێنسانس هیچ باسێکی گوتاری کوردی بێتە مایەی بەخشینی مانا بەو گوتارە. هەروەك هەنگاوی یەکەمی ڕابوونەوەو ڕێنسانسی کوردی لە زمانی کوردییەوە دەست پێدەکات مەبەست لەم قسەیەش زمانی نووسینە نەك ئاخاوتن کەواتە ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە گوتاری کوردی گوتەی نووسراوە، هەروەك دەشێ لە پلەی یەکەمدا گوتار بە وتەی نووسەر یان وتەی نووسراو[٨] پێناسە بکرێت کە بێگومان لە هەر بارودۆخ و ساتەوەختێکیشدا دەبێ ئەو وتەیە وتەی باڵاو هەژموندار بێت ئەگەر باس بێتە سەر ئاخاوتن لەسەر دەسەڵاتی گوتار یان گوتاری دەسەڵات، ئەگەرچی ئەم دوو زاراوەیە جیاوازن لە یەکتر بەڵام لەو ڕوانگەیەوە کە هەریەکە بەجۆرێك هەژموونی خۆی لە قۆناغێکی مێژوویدا دەبێت، نزیکی و پەیوەندیش هەیە لەنێوانیاندا. هەر لێرەشەوە دەشێ بۆ پرسیارکردن لە گەوهەرو ماهیەتی ئەو گوتارە ئاستی ئەو دەسەڵاتەو سنووری ئەو دەسەڵاتە بخەینە بەردەم پرسیارەوە، ئەویش لەو ڕوانگەیەوە ئایا گوتاری کوردی بۆتە گوتارێك کە لە بوونی کورددا دەسەڵاتی هەبێت، دەسەڵاتێك لە سنوورێکدا جۆرێك لە یەك بوون و پێکبهێنێت؟.. ئێمە باسی ئەوەمان کرد کە ناکرێت بەبێ بوونی

نووسینی کوردی بارگەکراو بە ماناو بیرکردنەوەو روانینی کوردانە باسی گوتاری کوردی بکەین، بۆیە لێرەوە دەبێ بزانین سەرهەڵدانی نووسینی کوردی لە کەیەوە دەست پێدەکاتو ئایا ئەو نووسینەش لە کەیەوە بارگەکراوە بە ماناو بیرکردنەوەو روانینی کوردانە.

دیارە زۆرێك لە سەرچاوە مێژووییەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە دەوڵەتی مید وەکو دەوڵەتێکی کوردی خاسێتی نەتەوەیی هەبووە، بەلام بۆمان هەیە بپرسین ئایا ئەو زمانەی کە زمانی دەوڵەتی مید بووە کوردی بووە؟ گریمان یان راستتریش وەهایە بڵێین کاتێ ئەو دەوڵەتە دەوڵەتێکی کوردی بووە بێگومان دەبێ زمانی رەسمیش تیایدا زمانی کوردی بوویێت، بەلام بەڵگەی تۆمارکراو یان سەلمێنەر بۆ ئەوەی کە زمانی کوردی لەو دەمەدا چەندێ ئیشی پێ کرابێت لەبەردەستدا نییە، بۆیە دەتوانین بڵێین زمانی کوردی ئەگەر لەو قۆناغەدا بە بەریلاویش بەکارهێنرابێت ئەوا لە ئاستی زارەکیدا بەکارهێنراوەو بەو پێیەش لەرووی بوون بە گوتارەوە یان تەنانەت وەکو سەرچاوەی گوتاریش ناتوانین پشتی پێببەستین.

هەروەك ئاشکرایە ئەو زمانەی کە زمانی پەیامی ئایینی زەردەشتییە زمانی ئاڤێستایەو بەپێی لێکدانەوەکانی زانستی زمانو ئیتمۆلۆژیای زاراوەی کوردی زمانی ئاڤێستا وەکو دایکی زمانی کوردی سەیر دەکرێت، بەلام ئەو زمانەی ئاڤێستاش هەم وەکو خۆی بەشێوەی تۆمارکراو نەگەیشتۆتە بەردەستی ئێمە، هەم ئەوەی کە دواتر تۆمارکراوەو گەیشتوەتە دەستی ئێمە لە روانگەی بارگاوی بوون بە مانای کوردانەو بیرکردنەوەو روانینی کوردانەوە ناکرێت خاسێتی گوتاری نەتەوەیی کوردی هەبێتو بەو پێیەش نابێتە پایەیەکی زیندو بۆ بەرهەم هێنانی گوتاری کوردی لەو کاتەدا، دیارە ئەوە راستە چ زمانو چ ئایین لە ئاستێکی تردا وەکو پایەیەکی گرنگی گوتاری نەتەوەیی سەیر دەکرێن بەلام بۆ ئەو قۆناغە نە زمان وەکو رەگەزێکی نووسراوو نە ئاینیش وەکو رەگەزێك کە لە ئاستی یەکەمدا زمان بنەمای دەربڕینو گواستنەوەو

گەیاندنیەتی توانیوویانە ببنە فۆرمێك كە گوتاری كوردییان تێدا بەرهەم بێت. دیارە ئەوەش ئاشكرایە كە چ ئەو دەسەڵاتەی میدو چ دەسەڵاتی ئایینی زەردەشتی نەیانتوانیووە درێژە بە بوونی خۆیان بدەنو لە روخاندنی ئەو دەسەڵاتەوە ئیتر كورد كەوتۆتە بەردەم دەسەڵاتی ئەوانی ترو گوتاری ئەوانی تر تیایاندا باڵادەست بووە. یان بە دەربڕینێكی تر گوتاری باڵادەست لە رووبەرێكدا كە رووبەری جوگرافیو ئەنتولۆژیای كوردە گوتاری غەیری كوردە. مادەم زمانی نووسین زمانی كوردی نییە مادەم بیركردنەوەی كوردیانەو مانای كوردیانەو تێڕوانینی كوردیانە ئامادەبوونیان نییەو زمانێكیش نییە كە بەو رەگەزانە بارگاوی كرابێت واتە گوتاری كوردی گوتارێكی دەسەڵاتدار یان كۆنترۆڵكەر نییە لە واقیعی كوردیدا.

هەڵبەت ئەوەش ئاشكرایە لەدوای روخاندنی دەسەڵاتی میدیا لەسەر دەستی ئەخمینییەكاندا ئیتر تاكو ساتەوەختی سەرهەڵدانی میرنشینەكان شتێك نەماوەتەوە بەناوی دەسەڵاتی كوردییەوە. هەروەك لەدوای بەتەواوەتی تێكشكانی ئایینی زەردەشتیش لەژێر كاریگەریو پرۆژەی ئیسلامو فەتحی ئیسلامیدا ئیتر ئاینێكی'دیاریش نەما كە وەكو ئایینی كورد سەیر بكرێت كەواتە لێرەدا بەگوێرەی كورد نە گوتاری ئیداریو نە گوتاری ئاینیش كە خاسێتی كوردبوونیان هەبێت بوونیان نەما یان بە لایەنی كەمەوە دیار نەمان ـ بێگومان لە غیابی گوتاری ئیداریو ئایینی كوردیدا هەلێكی لەبار بووە بۆ گوتاری ئیداریو ئایینی ئەوانی تر لەو رووبەرە بۆ شەدا بوونی خۆیان بسەلمێنن. هەر لەوێشەوە گوتارەكانی ئەوانی تر كە بە زمانی غەیری زمانی كوردی بوون لە كوردستاندا جێگایان گرتۆتەوە، دیارە ئەو زمانەش كە زمانی ئەوانی غەیری كورد بووە بە ماناو فیكرو روانینی ناكوردانە بارگاوی كراونو ئەویش لەكاركردنی رۆژانەی بەردەوامدا كۆنەستی كۆمەڵایەتی كوردی بە ماناو بیركردنەوەو روانینی ناكوردانە بارگاوی كردووە، كاریگەری ئەو بارگاوی بوونەی كۆنەستی كۆمەڵایەتی ئێمە بە ماناو بیركردنەوەو روانینی ناكوردانە

تاكو ئەمرۆش ئامادەبوونی هەیەو یەكێكە لەو هۆكارە سەرەكیانەی كە گوتاری كوردی لە ئێستادا بەوانی ترەوە گرێداوە. بە هەر حاڵ ئێستا جێگای خۆیەتی بەدوای ئەو قۆناغەدا بگەڕێین كە لێیەوە سەرەتاكانی گوتاری نەتەوەیی كوردی دەست پێدەكات، وەك ئاماژەمان بۆ كرد گوتار بریتییە لە گوتەی نووسراویان گوتەی نووسەر كەواتە دەبێت بەدوای ئەو ساتە مێژووییەدا بگەڕێین كە نووسینی كوردی تیایدا سەری هەڵداوە.

ئەوە ئاشكرایە كە كۆنترین شێوازی نووسینی كوردی بە زاری گۆرانی بووە، ئەگەرچی ئەو نووسینەش شتێكی ئەوتۆی سەرەتاكانی نەمابێتەوە یان لەبەردەستدا نەبێت، بەڵام دیسان وەك دەزانین ئەو نووسینەش بە شیعر دەستی پێكردووەو، ئاشكرێت كە وای بۆ بچین كە ئەو نووسینە بە ماناو بیركردنەوەو روانینی كوردی بارگاوی كرابێت كەواتە لەو سەرەتایەی نووسیندا یەك پایەی گوتاری كوردی بە ئاشكرا ئامادەبوونی هەبووە كە ئەویش پایەی زمانە كە لە راستیشدا سەرەكی ترین پایەی پێكهێنانی گوتاری كوردییە.. بەسامی كوردی لە دەوری نۆهەم سەدەی زاینیدا ژیاوەو پیرشالیاریش لە دەوری دەهەم سەدەی زاینیدا ژیاوەو بەیتەكانی خۆیانیان بە دیالێكتی گۆرانی نووسیوەتەوە[9] كەواتە ئەوەی ئاشكرایە مێژووی نووسین بە كوردی تا ئەندازەیەك لەچاو مێژووی نووسینی هەندێ لەو نەتەوانەی كە ئێستا لەسەر ئاستی دنیا ئامادەبوونیان هەیە نەك نوێتر نییە بەڵكو كۆنتریشە، بەڵام ئایا نووسینی كوردی هەر لەو سەرەتایەوە بارگاوی كراوە بە ماناو فیكرو روانینو دەلالاتو هێمای كوردی؟ بێگومان بە ئاشكرا دەردەكەوێت كە وەلامی ئەم پرسیارە وەلامێكی نێگەتیڤە، نووسینەكانی پیرشالیارو نووسینی شاعیرانی سەرەتای زاری گۆرانی ناتوانرێت وەها لێكبدرێنەوە كە هەڵگری ماناو بیركردنەوەو روانینو دەلالاتو هێمای كوردین.. بەڵكو بە پێچەوانەوە زیاتر ئەو زمانە زمانێكی بێ لایەنە لە رووی چەمكو مانای نەتەوەیی بوونەوە، وەكو

گوتمان بنەمای نەتەوەیی بوون تیایاندا تەنیا بنەمای زمانەو پایەکانی تری گوتاری نەتەوەییان نییە.

دیارترین کەسێك کە زیاتر بەرهەمی لێ بەجێماوە بابا تاهیری هەمەدانییە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی یانزەدا ژیاوەو بە زاری لوڕیو بە فارسیش شیعری گوتووە. ئەگەرچی فارسەکان وەکو شاعیرێکی فارسی سەیری دەکەن بەڵام ئەو شیعرانەی کە بەزاری لوڕی گوتوونی کوردبوونی ئەم شاعیرە دەردەخەن لە ڕوویەکی تریشەوە بایەخدارە چونکە پێشتر تەنیا بەزاری گۆرانی نووسینی کوردی دەرکەوتووە بەڵام لەسەردەستی باباتاهیردا نووسینی کوردی بە زاری لوڕیش سەری هەڵداوە، بەتایبەتی بەو زارەی کە هەندێ لە نووسەرانی غەیری کورد وای بۆ دەچن کە زاری لوڕی زمانێکی سەربەخۆیەو پەیوەندی بە زمانی کوردییەوە نییە[10]. بە هەر حاڵ ئەوەی بەگوێرەی باباتاهیر گرنگە ئەوەیە ئایا باباتاهیر تا چەندێ شیعرەکانی خۆیی بەبیرکردنەوەو ماناو ڕوانینو دەلالاتو هێمای کوردیانە بارگاوی کردووە؟ بێگومان ئەوەی زیاتر لە شیعری باباتاهیرو شاعیرانی زاری گۆرانیدا هەستی پێدەکرێت بوونی ئەو ڕۆحی ئیشراقەیە کە سەرچاوەکەی ئیشراقی ڕۆژهەڵاتیو زەردەشتییە کە ئەوەش لە ئاستێکی ترداو لە ڕووی پەیوەستکردنی ئایینی زەردەشتییەوە بە کوردەوە دەشێ وەکو جۆرێك لە بەخشینی ماناو بیرکردنەوەو ڕوانینی کوردانە بە دەقەکان لێکبدرێنەوە، هەر بۆیە دەشێ لەم ڕووەوە جێگای خۆی بێت کە سەرهەڵدانی شیعری کوردی بەزاری گۆرانیو بەزاری لوڕی وەکو سەرەتای دەرکەوتنی گوتاری نەتەوەیی کوردی لێکبدەینەوە. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین ئەو سەرەتایە زۆر سەرەتایەکی لاوازە ئەویش لەو ڕوانگەیەوە کە شیعر سەرچاوەکەیەتی وەکو دەشزانین بنەمای بەرهەم هێنانی شیعر سۆزو خەیاڵو هەڵچوونە، بە واتا لەبری عەقڵ و فیکر لە پلەی یەکەمدا سۆزو خەیاڵو هەڵچوون ڕەگەزەکانی بەرهەم هێنانی گوتاری کوردین، هەر لێرەشەوە جیاوازی گوتاری کوردی لەگەڵ گوتاری زۆرێك لە نەتەوەکانی تردا

دەردەکەوێت ئەویش لەو روانگەیەوە کە گوتاری کوردی دوو پایەی گرنگی رابردووی نییە یەکەمیان فیکرو ئەوی تریشیان شارستانێتی کە ئەو دوو پایەش هەردووکیان عەقڵ لە پشتیانەوە کار دەکاتو بەرهەمیان دێنێت، هەر لێرەشەوە ئاخاوتن لەسەر ئەو سەرەتایە پێمان دەڵێت بۆچی گوتاری کوردی گوتارێکی لاوازە.

ئەگەر سەرنجی گوتاری عەرەبی بدەین ئەوە جگە لە قورئانو شارستانێتی عەرەبی ئیسلامیو کارکردنی ئیسلام بە زمانی عەرەبیو بارگاوی کردنی ئەو زمانە بە دەوڵەمەندترین ماناو بیرکردنەوەو روانین چ ماناو بیرکردنەوەو روانینی عەرەبیانە بێت یان گەردونیانە ئەو زمانەیان لەرووی دەوربینینەوە بۆ بەرهەم هێنانی گوتار دەوڵەمەند کردووە. ئەمە سەریاری فیکری عەرەبی کە ئەویش دەتوانرێت وەکو سیستەمێکی فیکری پتەوو بەهێز سەیر بکرێت، بەپێچەوانەی کوردەوە کە لەبواری فیکردا هیچ سەرچاوەیەکی نییە بۆی بگەڕێتەوە، کەواتە لێرەوە رووکەشێتیو لاوازی گوتاری کوردی نەبوونی فیکرە لە پشتی ئەو گوتارەوە تەنانەت هەڵگرانی پەیامی راپەڕینو حیزبو رێکخراوە کوردییەکانیش نەیانتوانیووە لە کاریگەری ئەو عەقڵە دەربازین کە بەرهەم هێنی گوتاری کوردییە کە دەتوانین لە سنووری سۆزو خەیاڵو هەڵچوونی شیعریدا پێناسەی بکەین کە ئەوەش بە ئاشکرا لەگەڵ بەرهەمی فیکرو لێکدانەوەو تێڕاماندا ناکۆکەو یەك ناگرێتەوە. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە کە بیانوو بۆ لاوازی هەڵوێستو کارکردن لە پانتایی کۆمەڵایەتیو سیاسی کوردیدا بهێنینەوە بەڵام دەبێ لەرووی راستییەوە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە خودی سەرچاوەکانی بەرهەم هێنانی گوتاری کوردی دەوری کاریگەری هەیە لەسەر ئەو لاوازی هەڵوێستە چونکە گوتاری کوردی گوتارێکە لە رووی رەسەنایەتییەوە دەشێ وەکو هەتیو یان بێ رەگ و ریشە سەیر بکرێت کە سەرچاوە سروشتییەکانی گوتاری نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەجۆرێك لە جۆرەکان لە فۆرمی لاوازدا ئەو گوتارە فۆرمەلە بووە بەڵام بونو ماهیەتی

گوتارەکە زۆر مایەی قسە لەسەر کردنە لەو روانگەیەوە کە ئایا دەشێ گوتاری نەتەوەیی نەتەوەیەکی مێژوودار لەڕووی بوونەوە نەك لەڕووی ئامادەبوونەوە تاکو ئێستا نەگەیشتبێتە ئەو ئاستەی لەسەر رووبەری جوگرافیای نەتەوە توانای خۆنمایش کردنی هەبێت؟ یان بتوانێت بە ئاشکرا خۆی بۆ دەرەوەی خۆی نمایش بکات؟

کاتێ ئاخاوتنی گوتاری کوردی دەکەین بێگومان ئەوەمان لا ئاشکرایە کە سەرچاوەیەکی فیکری یان شارستانی یان ئامادەبوونمان نییە لە رابردوودا کە بۆی بگەڕێینەوە هەر بۆیە دەتوانین گوتاری کوردی لە دەرەوەی مێژوو یان لە دەرەوەی پایەکانی رابردوودا سەیر بکەین، ئەگەرچی خودی ئەو بێ مێژووییەو نەبوونی فیکرو شارستانێتی لە هۆکارە لاوازەکانی ئەو گوتارەن، ئەمە جگە لەوەی کە لە واقیعی کۆمەڵگای کوردیدا سەرچاوە ناکوردییەکانی بەرهەمهێنەری گوتار بەردەوام تۆخمەکانی لاوازییان لە پێکهاتەی ئەو گوتارەدا پەرە پێداوە، من پێم وایە تاکو ئێستاش یەکێك لە هۆکارەکانی لاوازی گوتاری کوردیو تەنانەت گۆڕانی لە گوتاری نەتەوەییەوە بۆ گوتاری هەرێمایەتی کە ئەویش هاوشێوەی گوتاری خێڵایەتیەو ناوچەیەك یان حیزبێك یان بەشێکی کوردستان دەگرێتەوە لەژێر کاریگەری سەرچاوە ناکوردییەکانی ئەو گوتارەدایە، ئیتر ئەو سەرچاوانە لە ئاستی دیارو ئاشکرادا کار بکەن یان لە ئاستی شاراوەو نادیاردا، لە ئاستی بەئاگاییو هەستدا بێت یان لە ئاستی نائاگاییو نەستدا، گرنگ ئەوەیە باری سیاسیو دەسەڵاتی سیاسیش زەمینەی بۆ ئەوە رەخساندووە کە ئەو کاریگەرییە کۆنترۆڵی کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بکاتو بگرە باری سیاسیو دەسەڵاتی سیاسی کوردی لەبەر ئەوەی هەڵگری گوتاری نەتەوەیی نییە بەردەوام بە گوتاری ناوچەییو هەرێمایەتی.. دەیەوێت پەردە لەسەر گوتاری نەتەوەیی بنێت.

ئێمە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە سەرەتای سەرهەڵدانی گوتاری کوردی لە سنووری شیعرەوە دەست پێدەکاتو ئەو رووبەرەش رووبەرێکی زۆر

لاوازە هەتا لەویوە پەل بۆ بوارەکانی تری بوون یان مەسەلەی نەتەوایەتی رابکێشرێت، هۆکەشی ئەوەیە کە شیعر لەبەر ئەوەی سۆزو عاتیفەو خەیاڵو هەڵچوون دەوری تێدا دەبینن ناشێت ببێتە بنەمایەکی بەهێز بۆ بەرهەم هێنانی گوتاری نەتەوەیی کە لە پێش هەموو شتێکدا ئەو گوتارە پێویستی بە زمانێکی بارگاوی کراوە بە ماناو بیرکردنەوەو روانینی نەتەوەییانە.

دیارە شیعر بۆ نەتەوەیەکی وەکو عەرەب لەگەڵ مێژووی سەرهەڵدانیدا بە زمانی عەرەبی بووەو کاریگەری راستەوخۆی کەلتورو ئایینی ئەوانی تری لەسەر نەبووە لە سەرەتاوە هەتا لەژێر کاریگەری ئەو کەلتورو ئایینەدا بەرهەم بێتو بارگاوی بکرێت بەروانینو بیرکردنەوەو ماناکانی ئەوانی تر هەر چۆن گوتاری کوردی تا سەرئێسقان لەرێگای کاریگەری زمانو کەلتورو ئایینی ئەوانی ترەوە کاری لێکراوەو رەگەزی شیعر زیاتر لەژێر کاریگەری شیعری عەرەبیو فارسیدا سەری هەڵداوە ئیتر چۆن ئەو شیعرە بە ماناو بیرکردنەوەو روانینی عەرەبیو فارسیانە بارگاوی ناکرێت لەکاتێکدا شیعری کوردی لەسەر هەڵدانیەوە لەسەر رێبازو بنەماو کێشو پایەکانی شیعری عەرەبیو فارسی بنیادنراوە. واتە جگە لەوەی کە شیعر خۆی رەگەزێکی لاوازە بۆ بەرهەم هێنانی گوتارە ناشیعرییەکان کە گوتاری نەتەوەیی یەکێکە لەو گوتارانە، دیسان سەرهەڵدانی شیعری کوردیو نووسین بە کوردی لەژێر کاریگەری ئەزموونی شیعری عەرەبیو فارسیدا هێندەی تر بنەماکانی گوتاری کوردی لاواز کردووەو جارێکی تر گوتاری شیعری کوردیش لەژێر کاریگەری گوتاری شیعر ئەوانی تردا دەرکەوتووە بەتایبەتی گوتار ی شیعری عەرەبیو فارسی واتە لێرەشەوە ئەوە دەردەکەوێت کە سەرچاوەی گوتاری شیعری کوردیش رەگەزی ناکوردییانەی هەیە.

تاکو ئێرە ئێمە لەبارەی گوتاری کوردییەوە دواینو ئاماژەشمان بۆ ئەوە کرد کە بنەماکانی بەرهەم هێنانی ئەم گوتارە لاوازە بەتایبەتی لەو روانگەیەوە کە زمان بنەمای یەکەمی بەرهەم هێنانی گوتارە کە ئەویش زیاتر مەبەست

زمانی نووسراوه به مەرجێ ئەو زمانە بارگاوی بکرێت بە ماناو بیرکردنەوەو روانینی کوردانە، هەر لێرەشەوە دەشێ لە سنووری گوتاری کوردیدا ئاخاوتنی گوتاری فیکری بکرێت لە نێوەندی رۆشنبیری کوردیدا. بە ئاشکرا تریش بڵێین ئایا کورد گوتاری فیکری هەبووە یان کورد گوتاری فیکری هەیە؟

بێگومان بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ لەوە بپرسین ئایا کورد شتێکی هەیە بەناوی فیکری کوردییەوە یان "بیر"ی کوردییەوە؟ ئەگەر شتێکی لەو جۆرەی هەیە، سروشتی ئەو (بیر)ەو شێوازی بەرجەستەکردنیو سیستەمی دارشتنو کارکردنی کامەیەو چۆنە؟ ئایا ئەو (بیر)ە لە شێوەی بەرهەمی نووسراودا بەرهەم هاتووە؟ یان ئەگەر کورد (بیر)ی هەیە، ئەو (بیر)ە تەنیا وەکو (بیر) ماوەتەوە یان بۆتە بیری فەلسەفی؟

دیارە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە لە پلەی یەکەمدا بەستراوە بەو پرسیارەوە کە دەڵێت ئایا کورد (بیر)ی هەیە یان نا؟ کاتێ کە وەلامی ئەم پرسیارە نەخێر بێت، ئیتر بوار بۆ قسەکردن لەسەر پرسیارەکانی تر نامێنێتەوە. وەك دەشزانین کورد لە رابردوودا شتێکی بەرهەم نەهێناوە کە پێی بگوترێت (بیر)ی کوردیو ئەویش خاوەنێ ناسنامەیەکی دیارو ناسراو بێت وەکو بیری یۆنانی، بیری عەرەبی، دیارە ئەوەش دەمانخاتە بەردەم قسەکردن لەسەر بێ سەرچاوەیی لە رۆشنبیریو کەلتوری کوردیدا، هەڵبەت ئەم بارەی رابردووی مێژووی ئێمە دەوری کاریگەری بینیوە کە بەردەوام کورد خاوەنی گوتاری نەتەوەیی نەبێت بەو مانایەی کە ئەو گوتارە دەربڕی ئەو گوتەیە بێت.. کە سەرجەم ویستو ئامانجو داواکارییە کەلتوریو سیاسیو مێژوویيو شارستانیتیو ژیاریو ستراتیژییەکانی کوردی وەکو نەتەوە لە خۆیدا کۆکردبێتەوە، ئەم روانینو ویستە گشتگرو هەمە لایەنەی کورد ببێتە گوتای بالاو کار بۆکراو لە بەرنامەو ستراتیژو کاری رۆژانەی کورددا.

دیسان جێگای خۆیەتی لە مێژووی کورددا ئاخاوتن لەسەر رێنسانسو گوتاری رێنسانس بکرێت، بۆ ئەو مەبەستەش دەبێ ئاخاوتن لەسەر خودی

ڕێنسانس بکرێت، ئایا شتێك هەیە لە مێژووی ئێمەدا پێی بگوترێت ڕێنسانس؟ ئایا ڕێنسانسی کوردی سەری هەڵداوە؟ ئەگەر سەری هەڵداوە ئایا تەنیا لە سنووری کاری سادەو لە سنووری تەسکدا بووە یان گەیشتۆتە ئاستی پرۆژە؟ ئایا گوتاری ڕێنیسانسی کورد لە چ شێوەیەکدا بەرهەم هاتووە؟ یان ئایا لە بنەڕەتدا شتێکی ئەوتۆ هەیە بەناوی گوتاری ڕێنسانسی کوردی؟

ئەگەر سەرنجی زاراوەی ڕێنسانس بدەین ئەوا دەشێ بە مانای ڕابوونەوە یان ژیانەوە یان زیندوبوونەوە یاخود بە مانای لەدایکبوونی نوێ لێکبدرێتەوە، سەرجەم ئەم زاراوانەش لە زمانی کوردیدا ئەو دەلالەتە هەڵدەگرن کە پێشتر کورد لە بارێکی پێشکەوتوودا بوبێت و پاشان دووچاری شکست هاتبێت و ئێستا پرۆژەی زیندووکردنەوەی ئەو باری پێشکەوتنە سەری هەڵدابێت. ئەگەر سەرنجی ڕابردوو بدەین ئەوا بە ئاشکرا نموونەیەکی بەرجەستەی فیکرو شارستانی کوردیمان لەبەردەستدا نییە بۆیە لێرەوە زاراوەی ڕێنسانس ناشێت بەپێی ئەو تێڕوانینەی سەرەوە لێکبدرێتەوە، واتە ئەگەر کورد لە ڕابردوودا خاوەنی ڕابردوویەکی گەش نەبووبێت لەو ڕوانگەیەوە کە فیکرو شارستانێتی بەرهەم نەهێنابێت ئیتر بواری ئەوە نامێنێتەوە کە کورد باسی زیندووکردنەوەی ڕابردوویەك بکات کە لە خۆیدا بوونی نەبووبێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەدا لێکدانەوەی تر بۆ ڕابردووی کورد دەکرێت لەو ڕوانگەیەوە کە دەوڵەتی مید کە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو فەرمانڕەوایی سەرزەمینی ئێرانی کردووە لەنێوان ساڵی ٧٥ی پێش زاینی و (٣٥٠)ی ز.د جۆرێك لە شارستانی بەرهەم هێناوە، کە ئەوەش دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ سەلماندنی ئامادەبوونی کورد لە ڕابردوواو ئێستاش ڕابوونەوە بریتییە لە پرۆژەی گواستنەوەی کۆمەڵگای کوردی لەو باری شکستەی کە تێیدایە بۆ بارێکی زیندوو بە پشت بەستن بەسەرچاوەی ڕابروو. بە هەر حاڵ بۆ هەر قۆناغێك کە ئێمە پێمان وابێت بەشێك لە بنەماکانی ڕێنسانسی کوردی تیایدا بوونی هەبێت ئەوا مانای وایە پانتاییەك هەیە بۆ قسەکردن لەسەر ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی گوتاری کوردی

چونکە هاوشانیو هاوشێوەییو لێکتر نزیکی هەیە لەنێوان ڕێنسانسی کوردیو گوتاری کوردیدا. بەگوێرەی سەردەمی دەوڵەتی میدە لە ڕوانگەی نەتەوایەتییەوە کەمتر ئەو زەمینەیە ئامادەبوونی هەیە کە سەرنجی ئەو دەوڵەتە بەو جۆرە بدرێت کە ڕەگەزو بنەمای کوردی بەجێ هێشتبێت. تەنانەت لەڕووی کەلتووری ئیداریشەوە ناتوانرێت هەروا بە ئاسانیو بێ شیکردنەوەو لێکدانەوەو بەدەستهێنانی بەڵگەی مادی دەربارەی کەلتوری ئیداری ئەو دەوڵەتەو کوردی بوونی ئەو کەلتوورە قسە بکرێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە مەبەستمان ئەوە بێت کورد لەو پانتاییەی ڕابردوودا هیچ ئامادەبوونی نەبووەو ناشتوانێت جارێکی دی باس لە پەیوەستبوونی خۆی بەو ڕابردووە بکات. نەخێر مەبەستمان لەم قسەیە ئەوەیە کە تاکو ئێستا کورد نەیتوانیوە ئاماژە بۆ سەرچاوەکانی بەڕێوەبردنو شێوازی بەڕێوەبردنو کەلتوری بەڕێوەبردنی ئەو قۆناغە بکاتو کوردێتی بوونی ئەو قۆناغە ئیدارییەی سەرزەمینی ئێران بسەلمێنێت لەڕێگای دۆکیومێنتو بەڵگەنامەوە، بەڵکو ئەوەی تاکو ئێستا دەتوانین ئاخاوتنی لەسەر بکەین تەنیا گەڕانەوەیەکی مەعنەوییە بۆ ئەو یادەوەرییە واتە گەڕانەوە لەڕووی خۆپەیوەست کردنەوەیەکی مەعنەویانەوە بەڕابردووەوە، دیارە دەبێ لە هەر لێکدانەوەیەکی لەم جۆرەو لە هەر خۆبەستنەوەیەکدا بە ڕابردوو خاڵی لەبەرچاوگیراو کە وەکو ئامانجی کارکردن خۆی دەنوێنێت داهاتوو بێت، داهاتوویەك کە پرۆسەی هەمەلایەنەی ڕێنسانس بیگرێتەوەو گەڕانەوەش بۆ ڕابردوو دەبێ لەپێناوی بنیادنانی ئێستادا بێت بۆ ئەو ئایندەیەی کە چاوەڕوان دەکەین تیایدا مرۆڤی کورد خاوەنی بوونو ناسنامە بێت ئەویش بەو مانایەی کە مرۆڤی کورد ببێتە مرۆڤێکی بەرهەم هێن لەسەر ئاستی عەقڵیو مادیو قۆناغی پاشکۆیەتیو بەکاربردن بەجێ بهێڵێت.

# پایەکانی گوتاری کوردی

بێگومان کاتێ باسی گوتاری کوردی دەکەین دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە مەبەستمان لێرەدا تەنیا گوتاری سیاسی کوردی نییە بەڵکو مەبەستمان گوتارێکی شمولی ترو گشتگرترە کە سەرجەم پانتایی‌و ڕوویەری بوونی کورد بگرێتەوە کە لەو ئاقارەشدا گوتاری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئایینی‌و ئەخلاقی‌و ئابووری‌و ئەدەبی‌و هونەری‌و جوانناسی‌و گوتاری نەتەوەیش جێگایان دەبێتەوە.

هەر لێرەشەوە دەکرێت لەو پایە مادی‌و مەعنەوییانە بدوێن کە گوتاری کوردی پێکدێنن، هەڵبەت دەشێ خاڵی هاوبەش‌و خاسێتی هاوبەش لەنێوان گوتاری کوردی‌و گوتاری گەل‌و نەتەوەکانی تریشدا هەبێت بەتایبەتی ئەو گەل‌و نەتەوانەی کە لەڕووی کەلتوورییەوە نزیکیان لەگەڵ کورددا هەیە یان هەبووە، کە دەشێ شێوازی ئەو نزیکی‌و پەیوەندی بوونەش کاریگەرییەکانی داگیرکردنیش بگرێتەوە. بەڵام لەپاڵ ئەمانەشدا کۆمەڵە ڕەگەزو پایەیەك هەن کە ڕەسەنایەتی‌و ڕەگو ریشەداری گوتاری کوردی دەسەلمێنن کە جیاوازن لە گوتاری نەتەوەکانی ترو تایبەتمەندی خۆیی هەیە.

کاتێ عەرەبەکان دەربارەی پایەی گوتاری عەرەبی دەدوێن ڕاستەوخۆ دەگەڕێنەوە بۆ پانتایی ئایین‌و لەوێرا گفتوگۆی ئەو مەنهەجە فیکری‌و عەقڵییە دەکەن کە ئیسلام لەگەڵ هاتنیدا خستویەتیە ڕوو کاری پێکردووەو چەندین گفتوگۆو دەرئەنجام‌و لێکدانەوەی لێبەرهەم هاتووە ئایا بەگوێرەی کورد وەکو ئایین کام لەم ڕووانە دەبنە بنەماو پایەی گوتاری کوردی، هەمان مەنهەجی فیکری‌و عەقڵی کە ئیسلام هێناویەتی یان مەنهەج‌و فکرو عەقڵێکی تر کە ئایینی زەردەشتی هێناویەتی، یان مەنهەج‌و عەقڵ‌و لێکدانەوەیەکی تر لەپاڵ

ئیسلامدا کە تەسەوفی ئیسلامی لە سەدەی نۆزدەدا هێناویەتی؟ بێگومان هەریەکە لەم سێ پرسیارەیە لایەنگری خۆیی هەیەو هەریەکەش جێکەوتەو کاریگەری دیاری خۆیی هەیە لە گوتاری کوردیدا.

بەگوێرەی مەنهەج و فیکرو عەقڵیەتی زەردەشتی کاریگەرییەکی راستەوخۆی لە بنیاتنانی گوتاری کوردیدا هەیە، وەك ئاشکرایە ئایینی زەردەشتی بە ئایینی کۆنی کوردو گەلانی تری ئێران ناسراوەو زۆرێك لە سەرچاوە مێژووییەکان و لێکدانەوە زمانییەکان دەری دەخەن کە ئەم ئایینە بە زمانی کۆنی کورد واتە ئاڤێستا هاتووە، لەبەر ئەوە تێکەڵاوی و پێکەوە بەستنێك لەنێوان بەرنامەو پەیامی ئایینەکەو قسەکەرانی زمانی ئاڤێستادا هەبووە، بە مانایەکی دی زمانی ئایینەکەو زمانی کۆنی کورد هەمان زمان بوون، وەك ئاشکرایە یەکێك لە رەگەز سەرەکییەکانی گوتاریش زمانە کەواتە زمانی ئاڤێستا کە زمانی کۆنی کوردە لەرێگای ئایینی زەردەشتییەوە بەجۆرێك تۆمار کراوە کە سەرباری هەوڵدان بۆ لەناو بردنیشی هێشتا هەر توانیویەتی خۆی بپارێزێت. بەم پێیە ئایین بووەتە یەکێك لە پایەکانی گوتاری کوردی ئەویش لەو روانگەیەوە کە بنەمایەکی بوونی نەتەوەی پاراستووە کە ئەویش زمانە.

خاڵی گرنگو دیار لە بەرنامەی پەیامی ئایینی زەردەشتیدا بریتییە لە "بیرکردنەوەی چاك، گفتاری چاك، کرداری چاك "ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم سێ دەربڕینە بدەین ئەوا بنەمای گوتارێکی عەقڵانی پێکدێنن. لەکاتێکدا خاسێتی چاك بووەتە سیفاتی گشتی بەرنامەی ئەم ئایینە، مەبەست لە بیرکردنەوەی چاك چییە بێجگە لە بیرکردنەوە بەشێوەیەکی پەسەندو گونجاوو لەبار بۆ بنیاتنان و ئاوەدان کردنەوەو بیرکردنەوە لە مرۆڤ وەکو گەورەترین سەرمایەو وەکو ئەوەی کە هەموو شتێکی ئەم گەردوونە لەپێناوی ئەوداوایەو بۆ ئەوە، گفتاری چاك هەموو ئەو دەربڕینانەیە کە مرۆڤ بەرەو چاکەو بەرەو برایەتی و بەرەو یەکێتیی و بەرەو هاریکاری کردن ئاراستە دەکات. کرداری چاکیش سەرجەم ئەو هەڵس و کەوت و کارو رەفتارانەیە کە مرۆڤ بە دوو

ئاراسته ئەنجامی دەدات، یەکەمیان بۆ رازیکردنی ئاهورمەزادا، دووەمیان بۆ چاککردنی باری ژیانی خەڵکو بۆ ئاوەدان کردنەوەو بنیادنانی وڵات؛ بۆ رووەك رواندن، بۆ کشتوکاڵ کردن، بۆ دژایەتی کردنی ئەهریمەن.. هەموو ئەمانە بەگشتی بنەمای بەرنامەیەکی بەرفراوانو گشتگرن بۆ بنیادنانو ئاوەدانکردنەوە. هەر لێرەوە دەردەکەوێت کە گەوهەری ئایینی زەردەشتی سەرباری لایەنە روحیەکەی لایەنێکی بەربڵاو ژیانی دنیایشی لەخۆگرتووە کە ئەویش لەپێناوی چاکتر کردنی باری ژیاندایە لەسەر زەوی کە ئەویش بنەمای گوتارێك پێکدێنێ کە گوتاری بنیادنانو ئاوەدانکردنەوەیە، هەر لێرەوە دەتوانین بڵێین رەگەزو بنەماو پایەکانی ئایینی زەردەشتی سەرباری ئەوەی لەرووی زمانەوە یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی گوتاری کوردی پێکدێنێو دەیپارێزێ، بە هەمان شێوە لەرووی بەرنامەی بنیادنانو ئاوەدانکردنەوەو کشتوکاڵەوە پایەیەکی تری گرنگی گوتاری کوردی پێکدێنێ، ئەگەرچی ئەم پایەیە تاکو ئێستاش وەکو پێویست نەخراوەتە کار بەڵام گەوهەری پرۆژەی رێنمانسی لەخۆیدا هەڵگرتووە کە خاڵێکی گرنگ و سەرەکییە لە پێکهاتەی گوتاری کوردیدا، ئەگەر سەرچاوەی یەکەمی گوتاری کوردی خۆی لە پەیامی ئایینی زەردەشتیدا ببینێتەوە ئەوا لە ئەنجامی شکستی ئەو ئایینە لەبەردەم پەیامی نوێی ئیسلامدا بنەماکانی ئەو ئایینە دێرینەی کورد بەرەو لاوازی چووەو چی تر توانای ئەوەی نەماوە کە رۆڵی پایەی ئاشکرای گوتاری کوردی ببینێت لەوەشدا لە ئاستی یەکەمدا لە روانگەی رەسەنایەتی رابردووی پەیامی رۆحییەوە گوتاری کوردی بەشێك لە رەسەنایەتی رابردووی خۆی لەدەستداوە. هەروەك نابێت ئەوەش لەیاد بکەین کە بەگشتی گەڕانەوەمان بۆ ئایینی زەردەشتیو لێدوانی وەکو پایەی گوتاری کوردی لە سنووری یادەوەریدایە چونکە بەهۆی تێکشکاندنی ئایینەکەوە ئەو ئایینەو بنەما رۆحیو دنیاییەکان وەکو شتێکی لەبەردەستدا بوو نەماونەتەوەو ناکرێت بەو شێوەی کە عەرەب لە باسی پایەکانی گوتاری خۆیاندا دەگەڕێنەوە بۆ پەیامی ئیسلام کوردیش بە

هەمان شێوە بگەڕێتەوە بۆ ئایینی زەردەشتی بەتایبەتی ئەم ئایینە لەڕووی کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردیشەوە ئامادەبوونێکی ئەوتۆی نەماوە بەڵام لەڕووی یادەوەرییەوە ناشێت چاو لە کاریگەری ئەو یادەوەرییەی رابردوو بپۆشرێت بەتایبەتی بەشێك لەو یادەوەرییە گۆڕاوە بۆ هێماو دەلالەتی مێژووی پەیوەست بوونی کورد لە مێژوودا زیاتر لەوەی کە بەشێوەی یادەوەرییەکی ئایینی مابێتەوە. دیارە ئەو حاڵەتی گۆڕانکارییەش لە یادەوەری ئایینیەوە بۆ هێماو یادەوەری مێژوویی خاسێتی مێژووی زارەکی هەیە چونکە لەکاتی خۆیدا تۆمار نەکراوە دەشێ وەکو پایەیەکی زیندووی گوتاری کوردی سەیر بکرێت.

وەك ئاشـكرایە ئـاینی زەردەشـتی لـەپێش دەركـەوتنی پـەیامی ئیـسلامدا دووچاری شكست بـووە. هەرچـەندە لـە سـەردەمی ساسـانیەكاندا ئـەم ئاینـە بووەتە ئاینی دەوڵەتو لە ئاستێكی پەرەسەندودا بووە بەڵام لەگەڵ شكستی ساسانیەكاندا ئیتر ئەم ئاینەش بەرەو لاوازیو شكست چـووەو كـاتێ پـەیامی ئیسلام هاتووە مەگەر بە دەگمەن ئەگینا لە هیچ جێگەیـەكی دیـار ئـەم ئاینـە ئامادەبوونی نەماوە، واتە ئەو پانتاییە ڕۆحییەی كە پێشتر ئەم ئاینە داگیری كردبوو، بەرەو سـڕینەوە چـووەو مەگـەر تـەنیا لـە سـنووری یادوەریـدا بـوونی مابێت، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی پەیامی ئیسلامی لـەڕووی ڕۆحـیو دنیاییـەوە بەرنامەیـەكی تـەواو چـڕو دەوڵەمەنـدی پـێ بـووە، بـەزوویی توانیوویـەتی لای كوردو هەڵگرانی تری ئاینی زەردەشتی جێگـای خـۆی بگرێـتو ئـەو بۆشـاییە ڕۆحییەی كە پێشتر پەیامی زەردەشـتی داگیری كردبـوو ئـەم بیگرێتـەوەو لـە ماوەیەكی مێژوویی كورتدا كورد بچێتە سـەر ئـەو ئاینـە نوێیە. دیـارە ئـەوە ئاشكرایە كـە كـورد بـەڕێگای جۆراوجـۆر بووەتـە ئیـسلام بـەڵام ئـەنجام بـەوە كۆتایی هاتووە كە گوتـارێكی نـوێ كـە گوتـاری تەوحیـدی ئیـسلامییە جێگـای گوتارە جیاوازەكانی گرتۆتەوە، هەر بەو پێیـە لـە فـەتحی ئیـسلامییەوە تـاكو سەرهەڵدانی نووسین بـە كـوردی قسەكردن لەسـەر گوتـاری كـوردی تـەنیا لـە سـنووری دابـو نـەریتو تەقـسە كۆمەڵایەتیـەكانو گـۆرانیو سـەرجەم ڕەگەزەكانی فۆلكلۆردا خـۆی دەبینێتـەوە كـە دەشـێ بـە بـواری زارەكـی نـاو ببرێت كـە ئـەویش زیـاتر دەچـێتە چوارچێوەی كۆنەسـتی كۆمەڵایەتیـەوە كـە دیارە لەو پانتاییەشدا ڕەگەزە كوردییـە ڕەسـەنەكان ئامادەبوونیـان هەیـە كـە دەشێ وەكـو پایـەی گوتـاری كـوردیو ڕەگـەزی ڕەسـەنی ئـەو گوتـارە لێیـان بڕوانرێت. لەگەڵ ئیسلام بوونی كـورددا، لـە بەرامبـەر گوتـاری لاوازی كوردیـدا گوتارێكی بەهێزی ئیسلامی لە كوردستاندا جێگای گرتـووە كـە گەوهـەری ئـەو گوتارە تەوحیدی ئیسلامییە واتە كۆبوونـەوەو یـەكبوونو یـەكگرتنی سـەرجەم موسوڵمانان لەسایەی یەك گوتـاردا كـە گوتـاری ئیـسلامییە بـێ لەبەرچـاوگرتنی

تایبەتمەندی نەتەوایەتی‌و رەنگو نەسەب. لەم ئاقارەدا کورد وەکو نەتەوەیەك کە بووەتە هەڵگری پەیامی ئیسلام لەلایەك بە هەموو شێوەیەك هەوڵیداوە گوتاری ئیسلامی بچەسپێنێتو لەبواری خزمەتی ئیسلامدا رۆڵی دیارو لەبەرچاویشی هەبووە لە زیاتر چەسپاندنی گوتاری ئیسلامیدا، ئەگەرچی لەلایەکی ترەوەو لە سنووری کۆنەستو لەسەر ئاستی دابو نەریتو تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیشی هەوڵی خۆپاراستنی داوەو ویستویەتی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی خۆیشی بپارێزێت. لەم ئاقارەشدا دوو گوتار پێکەوە لەلای کورد ئامادەبوونیان هەبووە، گوتارێکی گشتگیری تەوحیدی ئیسلامی‌و گوتارێکی شەرمنو شاردراوەی نەتەوەیی لە ئاستی دابو نەریتو فۆلکلۆرو کۆنەستی کۆمەڵایەتیدا.

راستە کورد وەکو نەتەوەیەكو لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیش لە قۆناغی دوای فەتحی ئیسلامی‌و بە ئیسلامبوونیدا لەبەر ئەوەی پەی بە نەگونجاندنو ناکۆکییەکان نەبردووە کە لەنێوان ئەو دوو گوتارەدا هەبووە، لەلایەك ئیلتیزامی بە ئایینو پەیامە ئایینییەکەوە هەبووە، لەلایەکی ترەوە نەیتوانییوە لە دابو نەریتو تەقسە کۆمەڵایەتی‌و تەنانەت ئایینییە کۆنەکانی خۆیشی دوور بکەوێتەوە، تەنانەت زۆر جار لە دابو نەریتو رەفتاری کۆمەڵایەتی کوردیدا تاکو ئێستاش هەندێ شت هەن کە لەگەڵ بنەماو یاساکانی ئیسلامدا نەك ناگونجێن بەڵکو دژیشن کەچی مرۆڤی کوردی مسوڵمان نەیتوانیوە لەو هەڵسوکەوتو رەفتارانە دوور بکەوێتەوە کە بوونەتە بەشێك لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا بۆ نموونە سروتەکانی شایی‌و رەش بەڵەك ژن بە ژنو شیربایی رەدوکەوتنو تۆڵەو تاڵانو دزینو.. تاد سەرجەم لە روانگەی پەیامی ئیسلامەوە حەرامو قەدەغەن بەڵام مرۆڤی کوردی مسوڵمان سەرباری پەیوەستبوونی بە ئیسلامەوە دەست بەرداری ئەو لایەنە حەرامانەی ناو کەلتورو داب و نەریتی خۆی نەبووە. هەر لێرەوە دەردەکەوێت سەرباری تواندنەوەی رۆحی کورد لەنێو ئیسلامدا بەڵام هێشتا هەندێ لە تایبەتمەندییە

کەلتوری‌و نەریتییەکانی خۆیی پاراستووە، بێگومان هەمان قسە سەبارەت بە عەرەبی بەدو خێڵەکەی راستە چونکە گوتاری ئیسلام نەیتوانیووە گوتاری خێڵایەتی دواکەوتوو یان‌و داب‌و نەریتی کۆنی خێڵایەتیان تێکبشکێنێت بەڵکو بەپێچەوانەوە گوتاری ئیسلام هەوڵیداوە خۆی بگونجێنێ لەگەڵ گوتاری خێڵایەتی عەرەبی‌و تەنانەت گوتاری کوردیشدا.

لە ئاستی زماندا سەرباری ئەوەی کە پەیامی ئیسلام بە زمانی عەرەبی هاتووەو ئەوەش هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆ ئەوەی سەرجەم مسوڵمانانی غەیری عەرەبیش پەیام‌و تەقسە ئاینییەکان بە زمانی عەرەبی جێبەجێ بکەن، ئەگەرچی زۆرێك لە مسوڵمانانی غەیری عەرەب تەنیا ئەوەی پێویست بووە لەبەریان کردووەو لە ماناو ناوەڕۆکەکەشی نەگەیشتوون، بەڵام پەیامی ئیسلام هۆکاری سەرەکی بووە بۆ ئەوەی خوێندن بە زمانی ئەو پەیامە بێت‌و خوێندنیش لە سنووری پەیام‌و بنەماکانی ئیسلام‌و قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرو شەریعەتی ئیسلام تێپەڕی نەکردووە، ئەگەر هەر شتێکی سادەی ئەستێرەناسی‌و مێژوو، بیرکاری واتە جەبرو ئەندازەش خوێندرابێت تەنیا لە روانگەی پەیوەستبوون بە ئاینەکەوە بووە، دیارە خوێندن بە زمانی عەرەبی سەربارەی ئەوەی کە گوتاری ئیسلامی جێگیرکردووە بووەتە هۆکارێکی سەرەکی بۆ جێگیرکردنی یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی گوتاری عەرەبی کە زمانی عەرەبییە لەجێگای یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی گوتاری کوردی کە زمانی کوردییە. راستە زمانی کوردی لەئاستی ئاخاوتندا خۆی پاراستووە، بەڵام بەهۆی باڵادەستبوونی خوێندن بەزمانی عەرەبی‌و یەکگرتنەوەی ئەم زمانەش لەگەڵ جێبەجێ کردنی پەیام‌و تەقسە ئاینییەکاندا وایکردووە کە کورد نەکاتە ئەو ئاستەی بیر لە خوێندن‌و نووسین بە زمانی خۆی بکاتەوە، کەواتە زمانی کوردی لە فەتحی ئیسلامیەوە تاکو سەرهەڵدانی نووسین بە کوردی تەنیا لەسەر ئاستی ئاخاوتنی رۆژانە ماوەتەوەو پارێزگاری لە خۆی کردووە،

کە ئەویش بۆتە بەشێك لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی‌و پێداویستی ڕۆژانە‌و گوتاری ئیسلامی عەرەبی نەیتوانیووە لەنێوی ببات.

بێگومان کورد بە درێژایی مێژووی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی لە کوردستاندا جێبەجێ کەری پەیامی ئیسلام بووەو تاکو ئێستاش بە هەمان شێوە پەیڕەوی ئەو ئایینە دەکات، دیارە ئیسلام وەکو پەیامێکی ڕۆحی کە ڕێکخەری پەیوەندی نێوان مرۆڤو خوای خۆیەتی پەیامێکە لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی بەیەك چاو لێی دەڕوانرێت، بەڵام لە ئاستی دووەمدا هاتنە خوارەوەی ئەم ئایینە بەزمانی عەرەبی‌و بوونی بە بنەما بۆ دەسەڵاتی عەرەبی ڕێگاخۆشکەریووە بۆ ئەوەی هەم زمانی عەرەبی بەسەر زمانی نەتەوە مسوڵمانەکانی تردا زاڵ‌و باڵادەست بکات، هەم عەقڵ‌و داب‌و نەریت‌و کەلتوری عەرەبی لە ڕێگای ئەو دەسەڵاتەوە بەسەر عەقڵ‌و داب‌و نەریت‌و کەلتوری نەتەوەکانی تردا بسەپێنێت کە ئەو سەپاندنە‌و هەژموونی ئەو دەسەڵات‌و زمان‌و کەلتورەی عەرەب بەسەر کوردا لە نەتەوە بە مسوڵمان بووەکانی تر دیارترو ئاشکراتر بووە، هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ تواندنەوەی کورد لەنێو ئیسلامداو پاشانیش پەیڕەوکردنی مەزهەبی سونەی شافیعی کە مەزهەبی ناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامە کە زیاتر هاندەرو پاڵنەری کورد بووە بۆ پەیوەستبوون بەناوەندی ئیسلامەوەو تواندنەوە تیایدا. بێگومان لەو هەلومەرجەشدا پایەکانی گوتاری عەرەبی ئیسلامی کە گوتارێکی تەوحیدی کشتگر بووە بووەتە جێگرەوەی گوتاری کوردی‌و لە ئاستێکی زۆر ترسناکدا کە ئاستی ڕۆحیە هاتۆتە ناوەوە بۆ خۆ چەسپاندن‌و لەو ئاقارەشدا بەشێوەیەکی هێمن هەوڵی لەڕەگ هەڵکێشانی بنەماو پایەکانی گوتاری کوردی داوەو خۆی جێگای گرتۆتەوە بەتایبەتی کار گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە کوردی مسوڵمان لە پلەی یەکەمدا خۆی بە مسوڵمان بزانێت‌و لەدوای ئەوە خۆی بە کورد بزانێت. تەنانەت لەڕێگای دروستکردنی درەختی بنەماڵە‌و خۆتۆمارکردن بە سەید یان بە شێخ کە زۆربەی عەشیرەتەکانی کورد هەوڵیان داوە پێکهاتەی ئیتنیکی خۆیشیان بگۆڕن‌و خۆیان ببەنەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام‌و کەس‌و

کارو هاوەڵاتی، بە مانایەکی دی گوتاری ئیسلامی بە ئەندازەیەك کاری لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردی کردووە کە بیگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە نکوڵی لە رەسەنایەتی رەگەزی خۆی بکاتو شانازی بەوەوە بکات کە بە رەگەز دەچێتەوە سەر پێغەمبەرو کەسو کاری، کەواتە هەرچەندە لە ئاستی کۆنەستی کۆمەڵایەتیداو لە ئاستێکی شەرمندا گوتاری کوردی لە ئاستی زمانو دابو نەریتو سروتە کۆمەڵایەتیەکاندا بوونی خۆیی پاراستووە بەڵام لەزۆر رووی ترەوە کورد خۆی بە ئاراستەی چەسپاندنو بەهێزکردنی پایەگاکانی گوتاری عەرەبی ئیسلامی کاری کردووە کە کاریگەریو ئاسەواری ئەو هەڵوێستانەی کورد لە رابردووداو تاکو ئێستاش لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردیدا زیندووەو لە شێوازی جۆراوجۆردا خۆی دەنوێنێتو کاری خۆی دەکات.

بێگومان باڵادەستبوونی گوتاری عەرەبی ئیسلامی لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کورداو تەنانەت لە عەقڵو کارکردنی کورددا لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەمەویو عەباسییەکانیشدا زیاتر چەسپاوەو تەنانەت دواتر لە سایەی دەوڵەتی عوسمانیو فارسیشدا کە وەکو دوو ئیمپراتۆری ئیسلامی کاریان کردووە ئەو کاریگەرییە زیاتر بووەو ئاسەواری خراپتری بەجێ هێشتووەو گوتاری کوردی دووچاری زیاتر لەدابەشبوونێكو ژێرفشارکەوتنی زیاتر لە گوتارێکی دەرەکی بووە کە لە ئەنجامدا زیانی گەورە بە پایەو رەگەزو مۆتیڤی بزواندنی گوتاری کوردی کەوتووە بەجۆرێك کە نەتوانێت وەکو گوتارێکی نەتەوەیی خاوەن ناسنامە خۆی فۆرمەلە بکاتو خۆی نمایش بکات.

بە کاریگەری پەیوەستبوونی کورد بە ئیسلامەوە کورد بە گشتی نوخبەی پێشەوەی کۆمەڵی کوردەواری لە سەرخێڵو سەرۆك عەشیرەتو شێخو ئاغاو بەگو لەسەروی هەموو ئەمانەشەوە مەلاکان جگە لەوەی کە لە کۆمەڵدا دەسەڵاتیو نفوزی ئایینیان بەدەست هێناوە، لەپاڵ ئەوەشدا لەرێگای ئایینەکەوە کەسێتی کۆمەڵایەتی خۆیان زیاتر بەهێز کردووەو تا ئەندازەیەك شەرعیەتیان بۆ رەوایەتی دەسەڵاتی خۆیان لە ئایینەکەوە وەرگرتووە

ئەگەرچی زۆر جار ئەو شەرعیەتەی کە ئەمان بەناوی ئایینەکەوە دایانە بە خۆیان لە روانگەی ئایینەکەوە حەرامو قەدەغە بووە، بەوەش پەیوەستبوونی زیاتری خۆیان بە ئایینەکەوە نیشانداوە کە ئەویش زیاتر لەپێناوی پاراستنی دەسەلاتو بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بووە. لەم حاڵەشدا زیاتر پەیوەستبوون بە ئایینی ئیسلامەوە بووەتە پەیوەست بوون لەپێناوی بەژرەوەندیدا، هەڵبەت مەبەست لەم قسەیە ئەوە نییە کە ئەوانەی بەراستی بوونەتە هەڵگری پەیانی ئیسلام کەم بوون نەخێر، بەڵکو مەبەست لەوەیە ئەوەی کە دەسەلاتی لە کۆمەڵگادا بەدەستەوە بووە بەجۆرێك رەفتاری کردووە کە لە رووی عەدالەتو مرۆڤ پەروەریو مافەوە بەپێچەوانەی بنەماکانی ئیسلامەوە بووە ئەمەش لەلایەك پێ نان بووە لە بەشێك لە گوتاری ئیسلام کە عەدالەتو دادپەروەری بووەو ئەو لایەنەش دەشیا کورد سوودی زۆری لێوەربگرتایە، بەلام مامەڵە کردنی نادروست لەگەڵ پەیامی ئیسلامدا وایکردووە کورد نە لە پەیامو دەسەلاتی ئەو ئایینەدا چاوەڕوانی عەدالەت بکات، نەخۆشیی بنەمایەکی وەهای هەبووە، لەو بارەیەوە کەواتە لێرەوە دەردەکەوێت کە کورد لەنێوان گوتاری ئیسلامیو گوتاری کوردیدا لە بارێکی شلۆقو ناجێگیردا بووەو ئەوەش لەبەردەم بارێکی دەروونی ناجێگیردا رایگرتووە، واتە لەڕووی نەستی کۆمەلایەتییەوە لە حاڵەتێکی شیزۆفرینیدا بووە، کە ئەنجامیش ئەو حاڵەتە هەر بەبەردەوامی ماوەتەوە نە ئەوە بووە بەتەواوی دەست بەرداری رەسەنایەتی خۆیی بێتو بەتەواوەتی ببێتە هەڵگری پەیامی ئیسلام، نە ئەوەش بووە دابڕان لە ئیسلام بکاتو بگەڕێتەوە بۆ نێو ڕووبەرو جوگرافیاو پێکهاتەی ئێتنیکی خۆیو گوتاری نەتەوەیی خۆی پێکبهێنێت، نە توانیوویەتی لەسەر بنەمایەکی هوشیارانەو بەئاگاییەوە سوود لە ئیسلامو گوتاری ئیسلامی وەربگرێت بۆ بنیادنانی گوتاری نەتەوەیی خۆی. ئەم حاڵەتە شلۆقەش هەر لە فەتحی ئیسلامیەوە هەتا ئێستاش درێژەی هەیە. بێگومان سەرچاوەی گوتاری نەتەوەییو پایەکانی گوتاری نەتەوەیی دەبێ بریتی بن لە رەسەنایەتیو رەگ و ریشەی نەتەوەو بەرهەمی فکریو عەقڵی نەتەوەو بە زمانی نەتەوەش

لەبارەی گوتاری عەرەبیەوە دکتۆر محەمەد عابد جابری دەڵێت (مەبەستمان لە گوتاری عەرەبی ئەو گوتارەیە کە بیرمەندانی عەرەب بە زمانی عەرەبی بەرهەمیان هێناوەو لە ئاسۆیەکی عەرەبیانەوە بیریان لێکردۆتەوە[12] ئەگەر ئەم قسەیە سەبارەت بە گوتاری عەرەبی رەوا بێت، کەواتە بە هەمان پێوانە دەبێ گوتاری کوردیش بەرهەمی بیرمەندانی کورد بێتو بە زمانی کوردی بێتو لە ئاسۆیەکی کوردیانەوە بیریان لێکرابێتەوە. بەڵام دیارە بۆ سەردەمی پێش نووسین بە کوردی ناشێت باسی بیرمەندی کوردیو زمانی کوردیو ئاسۆی کوردیانەش بکەین بۆیە مێژووی دوای فەتحی ئیسلامی ئێمە تاکو قۆناغی دەرکەوتنو پەرەسەندنی نووسین بە کوردی قۆناغێکە تەنیا لەرووی زارەکیو دابو نەریتەوە دەتوانین باس لە گوتاری کوردیو پایەو سەرچاوەکانی ئەو گوتارە بکەین، ئەگینا ئێمە بۆ ئەو رابردووە هیچ دەقێکی نووسراومان نییە کە بتوانرێت بکرێت بە سەرچاوە بۆ ئاخاوتنی گوتاری کوردی.

لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا کاریگەری نەبوونی بیری کوردیو بیرکردنەوەی کوردیانەو لە ئاسۆی کوردیانەوە لە مێژووی فەتحی ئیسلامییەوە هەتا سەرهەڵدانو دەرکەوتنی نووسینی کوردی چ کاریگەرییەکی لەسەر شێوەو سروشتی پێکهاتنی گوتاری کوردی هەبووە لە قۆناغەکانی دواتردا بەتایبەتی لە قۆناغی سەرهەڵدانو دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمدا وەکو بەرهەمی مۆدێرنێتە؟ ئایا لاوازی گوتاری کوردی پەیوەندییەکی گەوهەری نییە بە لاوازی سەرچاوەو پایەکانیەوە؟

ئەوەی ئاشکرایە مێژووی سەرهەڵدانی نووسین بە کوردی لەو بەشەی کوردستاندا بووە کە کەوتۆتە ژێر سایەی دەسەڵاتی فارسەکانەوە بێگومان دەشێ هۆکاری هاونەژادیو هاو ئایینی پێشترو بوونی پەیوەندی نزیك لەنێوان زمانی کوردیو زمانی فارسیدا دەوری خۆیی هەبووبێت لەوەدا کە نووسین بە کوردی لەو بەشەدا زووتر دەربکەوێت هەروەك دەشزانین کۆنترین شێوەی نووسینی کوردی بە زمانی شیعر بووە، ئەوەش دەمانگرێتەوە بۆ قسەکردن

لەسەر ئەوەی کە لە قۆناغی گواستنەوەی گوتاری کوردییەوە لە قۆناغی زارەکییەوە بۆ قۆناغی نووسین یان بۆ قۆناغی گوتاری تۆمارکراو شیعر پایەی یەکەم یان پانتایی یەکەم بووە بۆ بەرهەم هێنانی ئەو گوتارە، هەروەك دەیزانین پایەکانی شیعریش بریتین لە سۆزو عاتیفەو هەڵچوون کە لە بنەڕەتدا سەرچاوەی "گوتار" فیکرە، هەر لێرەوە دەردەکەوێت کە دەستپێکردنی گوتاری نووسراوی کوردی لەبری ئەوەی لەسەر بنەمای فیکرو مەعریفەی هەمەلایەن بەرهەم هاتبێت لەسەر بنەمای سۆزو عاتیفەو خەیاڵی شیعری بەرهەم هاتووە کە ئەمەش بە یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی گوتاری کوردی دادەنرێت، بە هەر حاڵ ئەوە واقیعێکی بەسەرچووەو تازە ناتوانرێت بگۆڕدرێت ئەگەرچی جێکەوتە نێگەتیڤەکانی ئەو واقیعە لەسەر سروشتو ناسنامەو کارکردنی گوتاری کوردی قۆناغەکانی دواتر بە ئاشکرا دیارەو شێوازی مامەڵەکردنی شاعیرانە لە مێژووی بزووتنەوە نەتەوەییەکانی کورددا زیاتر پەیوەندی بەو سەرچاوەیەوە هەیە.

هەڵبەت لە نووسینیشدا هەر لە سەر هەڵدانی نووسینەوە بە کوردی، کورد بە پیتی غەیری کوردی یان باشتر بڵێین بە پیتی عەرەبی نووسیویەتی بەواتە بنیادی مانیانەی زمانەکە عەرەبی بووە، بە زەحمەتیش بیرکردنەوەی کوردیانە بوونی هەبووە، بۆیە نەتوانراوە ئەو زمانەی کە پیتەکانی عەرەبی بوون بە ماناو روانینو بیرکردنەوەو لێکدانەوەی کوردیانە بارگاوی بکرێت، بەکارهێنانی ئەبجەدییەتی عەرەبی کاریگەرییەکی نێگەتیڤی لەسەر کۆنەستی نیمەی کورد هەیە ئەویش لەو روانگەیەوە کە پێکەوە بەسترانی کوردو عەرەب بەرجەستە دەکات کە پێم وایە لە بنەڕەتدا ئەو پێکەوە بەسترانە بوونی نییە، تەنیا لەڕووی ئایینی یەوە نەبێت، دیارە پێکەوە بەسترانی ئایینیش لەنێوان عەرەبو هەموو نەتەوە مسوڵمانەکاندا هەیە هەمان شێوەی پێکەوە بەسترانی عەرەبو کورد.

کاریگەری بەکارهێنانی ئەبجەدێتی عەرەبی و بیرکردنەوەی عەرەبیانە کە بە کاریگەری پەروەردەو فێرکردن کۆنەستی کۆمەڵایەتی خوێنەواری کوردی داگیرکردووە ئاسەوارو دەرەنجامی هێجگار نێگەتیڤی هەبووەو هەیە. بەجۆرێك کە لە بەرهەمی نووسەرو رۆشنبیرانیشدا ئەو کاریگەرییە دەرکەوتووە هەر ئەوەش یەکێکە لە هۆکارەکانی لاوازی ناسنامەی کوردیانە لە گوتاری کوردیدا. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە ئەگەر سەیری ئەو رێزمانی کوردییە بکەین کە لە ماوەی سی ساڵی رابردوودا وەکو پرۆگرامی خوێندنی زمانی کوردی لە باشوری کوردستاندا دانراوەو کراوەتە پرۆگرامی خوێندنی قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی بە بیرکردنەوەیەکی عەرەبیانە دانراوەو بەجۆرێك دەتوانین بڵێین وەرگێڕانی رێزمانی عەرەبییە، چ لە رووی ناونانی رەگەزو پێکهێنەرەکانی رستەوە چ لەرووی بنیادی پێکهێنەری رستەوە چ لە شێوەی مامەڵە لەگەڵ کردنیدا واتە ئەو رێبازەی کە رێزمانی کوردی پێ دەگوترێتەوە هەمان رێبازی گوتنەوەی رێزمانی عەرەبییە. کە دەرئەنجامی ئەم پرۆگرامەی خوێندنیش جارێکی تر کۆنەستو عەقڵی منداڵی کورد بۆ بنیادی زمانو پێکهاتەی رستەی عەرەبی و بیرکردنەوەی عەرەبیانە ئامادە دەکات.

هەڵبەت هەر چۆن لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلامو فەتحی ئیسلامیدا گوتاری ئیسلامی جێگای هەموو گوتارە جیاوازەکانی گرتۆتەوەو لەو سەرو بەندەشدا رەگەزو پایەی زۆرێك لە گوتارەکانی تری هەڵوەشاندۆتەوەو بیرکردنەوەی ئیسلامیانەو لەرێگای ئەویشەوە بیرکردنەوەی عەرەبیانە بالادەستبووە بەسەر هەر جۆرە بیرکردنەوەیەکی تردا. بە هەمان شێوە لە مێژووی نوێشدا بالادەست بوونی گوتاری عەرەبی و فارسی و تورکی لە جوگرافیای کوردستاندا لەکاتێکدا کە گوتاری کوردی تەنیا لە سنووری خەیاڵو لێکدانەوەی تاکەکەسدا بوونی هەبووە.. ئەو گوتارە بالادەستانە زیاتر زەمینەی بیرکردنەوەی عەرەبیانەو فارسیانەو تورکیانەیان لای منداڵی کورد فراوانکردووەو بەوەش

ئاراستەی بیرکردنەوەی کوردیانە پەرەی نەسەندووەو رووبەری ئەو بیرکردنەوەیە لاوازتر بووە.

دیارە سەرباری ئەوەی کە نووسین بە ئەبجەدی عەرەبی زیانی دیاری لە سروشتی گوتاری کوردی داوەو زەمینەی بیرکردنەوەی عەرەبیانەی رەخساندووە لە کۆنەستی خوێنەواری کورددا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەرهەڵدانە بە خاڵێکی گرنگی فۆرمەلەبوونی گوتاری کوردی دادەنرێت چونکە بەلای کەمەوە نووسین بە زمانی نەتەوە با بە پیتی یان بە ئەبجەدێتی کوردیش نەبێت ئەوە هێشتا هەر گرنگە چونکە یەکەمین هەوڵە بۆ پاراستنی زمان لە لەناوچوونو یەکەمین هەنگاویشە بۆ پەرەپێدانی زمانەکەو یەکەمین سەرەتایشە بۆ پرۆسەی تۆمارکردن (تدوین) بە زمانی نەتەوە کە ئەوەش بە یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی گوتاری نەتەوەیی دادەنرێت.

مێژووی دەسەلاتی میرنشین‌و پێکهاتنی دامەزراوی میرنشین لە مێژووی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی کۆمەلگای کوردیدا جێگای لەسەر وەستان‌و لێدوانە. هەمیشە ئەو پرسیارە خۆی دەسەپێنێت ئایا بۆچی لە مێژووی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی کۆمەلگای کوردیدا لەبری دەولەتی خێل کۆمەلێك میرنشین پێکهاتووە؟ ئایا بۆچی دەولەتی خێل پێکنەهاتووە؟ ئایا بۆچی سیستەمی ئابووری فیودیالی پێکنەهاتووە بەجۆرێك کە سیستەمی ئابوری خێلایەتی هەلبوشێنێتەوە؟ ئەمانە کۆمەلێك پرسیارن کە پەیوەندی راستەوخۆیان بە گەوهەری ئەم باسەوە هەیە لە قۆناغی دەسەلاتی میرنشینەکاندا چونکە ئەو گوتارەی لەسەردەمی دەسەلاتی میرنشینەکاندا پێکهاتووە بەرهەمی ئەو قۆناغەی ژیانی کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌و کەلتوری کۆمەلگای کوردییە کە تیایدا کورد هێشتا لە ئاستی ئێتنیکدا بووەو ئەوەی کە پێی دەگوترێت نەتەوە (nation) پێکنەهاتووە بۆیە ئاخاوتن لەسەر گوتاری کوردی لەو قۆناغەدا بەو مانایە نییە کە گوتارێکی سیاسی یان گوتارێکی ناسیونالیستی بێت، بەلکو مەبەست گوتارێکە کە پەیوەستی ئێتنیکێکە کە تایبەتمەندی خۆیی هەیە ئەویش ئێتنیکی کوردییەو هێشتا گوتاری باوی ئەم پێکهاتەیە تێکەلاوە لە گوتاری خێلایەتی ئایینی هەرێمگیری مەودا تەسك.

زۆرێك لە مێژوونووسانی کورد هەر لە شەرەفخانی بەدلیسییەوە مێژووی دەسەلاتە ناوچەیی‌و هەرێمگیرییەکانی کوردیان ناوناوە دەولەت‌و هەندێ جار لە باسەکانیاندا وەکو دەولەتی گەورە باسیان کردوون ناوی پاشایان لە فەرمانرەواکانیان ناوە لە شەرەفنامەدا هاتووە: رووپەری یەکەمی شەرەفنامە: دەنگو باسی ئەو فەرمانرەوایە کوردانەیە کە لە کوردستاندا ئالای سەربەخۆییان هەلکردووەو مێژوونووسان لە ریزی پادشایانیان نووسیوون لەوانەش فەرمانرەوانیانی دیاربەکرو جزیرەو دینەوەرو شارەزوورو حەسنەوییەو، فەزلەوییە (واتە لوری گەورە)و لوری بچوك‌و بنەمالەی ئەیوبی[١٣]. پاشان لە شەرەفنامەدا باسی ئەو فەرمانرەوایانە دەکات هەرچەندە باری سەربەخۆیی

تـەواویان بـۆ نەرەخـساوە بـەڵام خۆیـان بـە پادشـا زانیـووە لەوانـەش فـەرمانڕەوایانی سۆران، بابـان، مـوکری، برادۆسـت[١٤] ئەگـەر سـەرنجی نـاوی هەریەکـە لـەم دەسـەڵاتانە بکـەین کـە لـە قۆنـاغێکی دیـاریکراودا دەسـەڵاتیان بەسەر ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراودا هەبووە، خاسیەتی دەسـەڵاتی خێڵیـان هەبووە، یان راستتر بڵێین بریتی بوون لە دەسەڵاتی دامەزراوی خێڵ. هەڵبـەت ناوهێنانی هەریەکە لەو دەسەڵاتە سنووردارانە بـە دەوڵـەتو فـەرمانڕەواکانیان بە پادشا هۆی لاوازی تێگەیشتنی ئێمە بەگشتیو مێژوونووسانی کورد بووە لـە پێناسـەی دەوڵـەت. دیـارە مەبەسـتمان لـەوە نییـە کـە ناخـاوتنی دەوڵـەتی نەتەوەیی بکەین لەو قۆناغـەدا، بـەڵکو باسـی ئـەوە دەکـەین کـە لـەو مێـژووە دووردرێژەدا تەنانەت دەوڵـەتی فیودیـالی کوردیش پێکنـەهاتووە کـە دەشـیا فیدراسیۆنی خێڵایەتی لەنێوان خێڵو دەسەڵاتە سنوردارەکانیاندا پێکبهاتبایەو لە ئەنجامی ئەوەشدا دەوڵەتی خێڵ پێکبهاتبایە.

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان حکومەتی روادی کۆنترین حکومـەتی کوردییـە کە لەدوای فەتحی ئیسلام لە کوردستاندا دروستبوویێت.. مێژوونووسـی عـەرەب ئـیبن خـوردانی لەسـاڵی (٢٣٢ی) کۆچـیدا چـووەتە تـەورێزو وڵاتەکـەی لـەژێر حـوکمی محەمـەد روداویـدا دیـووە کـە سـەردارێکی کـورد بـووە[١٥] بـەڵام لـە ئینـسایکۆپیدیای ئیـسلامدا هـاتووە: بناغـەی حکومـەتی روادی لـەو مێـژووە کۆنترە(١٦) ئەم دەسەڵاتەی کورد کە نزیکەی چوارسەد ساڵ بـەردەوام بـووەو سـنووری دەسـەڵاتی لـە ئازەربایجـان بـووەو لـە لوتکـەی گەشـەکردنیدا ئەرمەنستانو تورەی مەراغەو موکریانیشی گرتۆتەوە. دیارە ئـەم دەسـەڵاتەی کە مێژوونووسـان بـە حکومـەتی کوردی ناویـان بردووە خێڵـی روادی کوردی دایمەزرانـدووەو لـە دامەزراندنیـشییەوە تـاکو روخانـدنی دەسـەڵاتی لەلایـەن سەرخێڵەکانی روداوییەوە بەڕێوەبراوە. یان بەشێوەیەکی تـر دەسـەڵاتی ئـەم (حکومەتە) بەدەستی سەرخێڵەکانی روادییەوە بووە.

مەبەستمان لە وەستان لەسەر دەسەڵاتی روادیو مێژووی دەرکەوتنو روخاندنیو شێوازی دەسەڵاتداریتی تیایدا تەنیا بۆ ئەوە نییە وەکو مێژوونووسان ئێمەش ئەو مێژووە کۆنە بگێڕینەوە، بەڵکو مەبەستمان دیاریکردنو ناسینی گوتاری کوردییە لەو قۆناغەدا. قۆناغی مێژووی ئەم دەسەڵاتە کوردییە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆ بۆ دواوەیەو بەو پێیەی کە مێژوونووسان دیارییان کردووە نزیکەی چوار سەدە ئەم دەسەڵاتە بەردەوام بووە واتە دەگاتە ناوەڕاستی سەدەی سیانزەهەم، لەم قۆناغەدا کوردستان لە بارێکی هێجگار دواکەوتوودا بووەو خێڵایەتی کوردی لەنێوان نیشتەجێ بوونو گەرمیانو کوێستاندا بووە. هەر بۆیە ناشێت وای بۆ بچین کە دەسەڵاتی روادی زیاتر لە دەسەڵاتی خێڵێکی باڵادەست بوبێت کە دەسەڵاتی خۆیی بەسەر رووبەرێکی دیاریکراودا کێشابێت کە ئەندامانی خێڵەکەی بووین یان بەشێکی تر لەو خێزانو بنەماڵانەی کە خاوەنی خێڵ یان عەشیرەتێکی دیاریکراو نەبوون..
بە هەر حاڵ گوتاری باڵادەست لەو سەردەمەو بۆ دواتریش گوتاری خێڵایەتی بووە کە گەوهەری ئەو گوتارەش بریتییە لە پاراستنی خوێنی خێڵو جوگرافیای خێڵو شەرەفی خێڵ.. زۆر جار بۆ بەرجەستەکردنی ئەو گوتارەش لەسەر زمینەی واقیع خێڵ سوپای چەکداری خۆی دەبێتو نەك هەر ئەرکی پاراستنی ئەو بنەمایانە دەبێت بەڵکو دەستدرێژیش دەکاتە سەر جوگرافیای خێڵەکانی دەوروبەری بە مەبەستی فراوانکردنی رووبەری جوگرافیای خۆییو فراوانکردنی پاکژو لەوەڕگاو فراوانکردنی سنووری بەرهەم هێنانی کە لە پشتی ئەمانەشەو فراوانکردنی دەسەڵاتو کەسێتی مەعنەوی خێڵ ئامادەیە. بە هەر حاڵ بۆ ئەو قۆناغە گوتاری کوردی بریتیە لە گوتارێکی خێڵایەتی ئایینی داخراو کە تەنیا لەو روانگەیەوە سیمای کوردبوونی پێوە دیار بووە کە پارێزگاری لە زمانی کوردیو رەگەزەکانی کەلتوری کوردیو دابو نەریت رەفتاری خێڵایەتی کوردی کراوەو. دەتوانین بڵێین گوتاری سروشتی کوردی کە رەنگدانەوەو بەرهەمی ئەو قۆناغە مێژووییەی ئاستی ژیانو ئامادەبوونی

ئـەم كۆمەڵگايەيـە لـەو كاتـەدا پارێزگـارى لـە خـۆى كـردووە. راسـتە گوتـارى سياسى يان ناسيۆناليستى بوونى نەبووە، بەڵام گوتارێك ئامادەبوونى هـەبووە كـە پەيوەستبووە بـە ئيتنيكێكـەوە كـە ئيتنيكـى كورديـە. سـەربارى ديـار نـەبوون‌و ئامـادە نـەبوونى بنـەماكانى نەتەوايـەتى بـوون‌و سـەربارى لاوازى بنـەماكانى كۆمەڵايـەتى بـوونيش ئيتنيكێـك بـوونى هـەبووەو لـە مێژوويـەكى كۆنترەوە تا ئەو قۆناغە توانيويەتى پارێزگارى لە بوونى خۆى بكات هەرچەندە ئەو پارێزگاريكردنە لە گەوهـەرو پارێزگـاريكردن بووبێت لـە مانـەوە وەك هـەر بوونەوەرێكى ترى نێو سروشت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو روانگەيەوە گرنگە كە لەگەڵ خۆيدا بنەماكانى بوونى خۆيى وەكو ئيتنيكێكى سەربەخۆ پاراستووە.

بەڵام ئەوەى جێگاى ئاماژە پێكردنە گوتـارى كـوردى لـەم قۆناغـەدا گوتـارى زارەكييە واتە گوتارى نووسراو يان تۆماركراو نييە. بەو پێيـەش نازانرێـت ئايـا گوتارى زارەكى ئەو قۆناغە بە چى فيكرو جيهانبينييەك بارگاوى كراوە. تـەنيا لـە روانگـەى لێكدانـەوەوە دەتوانرێـت ئاخـاوتنى ئـەوە بكرێـت چـونكە هـيچ دەقێكى تۆماركراو لەبەردەستدا نييە هەتا بكرێت بە بنـەماو ئاخـاوتنى لەسـەر بكرێت و لـە ئـەنجامى شـيكردنەوەدا جيهـانبينى گوتـارى كـوردى ئـەو قۆناغـە ديارى بكرێت. بۆيە ديسان دەگەڕێينەوە بۆ ئەو خاڵە كـە گوتـارى كـوردى لـەو قۆناغەدا گوتارێكى زارەكى بووە، بنـەماى سـەرەكى زمـانى كـوردى‌و كـەلتوورو دابو نـەريتو تەقـسە كۆمەڵايەتيـە كورديـەكان بـووە، كـە پەيوەسـتى جوگرافياى كوردستان بووە كە ئەويش بەپێى سنوورى خێڵەكان دابەشـكراوەو دەسەڵاتى بەڕێوەبردن‌و سياسـى خێـڵ ئـەوە بـووە كـە پارێزگـارى لـە بـوون‌و خوگرافيـاى خـۆى بكـات‌و سـتراتيژى ئـەو گوتـارەش كـە گوتـارى خێڵايـەتى پـەرتخوازى داخـراوى سـنووردارەو تـەنيا خـۆى دەناسـێت‌و خـۆيى دەوێـت‌و ئامـادەبوونى تێكـەڵاوبوون‌و هاريكـارى‌و فيدراسـيۆن پێكهێنـان نييـە لەگـەڵ ئـەوانى تـردا دەيـەوێت دەسـەڵاتى خـۆيى هـەبێت هەرچـەندە سـنوورى ئـەو دەسەڵاتە بچووك‌و تەسكيش بێت گرنگ نييە.

ئەگەر بۆ زیاتر ئاخاوتن لەسەر ئەو قۆناغە ئامازە بۆ دەسەلاتێکی تری کوردی بکەین رەنگە زیاتر سیماو گەوهەری گوتاری کوردی ئەو قۆناغەمان بۆ دەربکەوێت. دووەم دەسەلاتی دیاری ئەو قۆناغە دەولەتی دۆستەکەییە کە لە سالی ٩٥١ی زایینیدا لە گوندی دۆستەکی نزیک شاری دیاربەکر لەلایەن (شاهـ بان)ەوە کە سەرخێلی حەمیدی بووە دامەزراوە(١٧).

سەرەتا ناوی دەولەت کە لەم دەسەلاتە نراوە پێناچێت لە جێگای خۆیدا بێتو ناشێت ئەم دەسەلاتە ئەو بنەماو خاسیەتانەشی هەبووبێت کە بە دەولەتی خێل ناو ببرێت، مەبەستمان لەم قسەیەش ئەوەیە کە ناشێت لەم قۆناغەدا گوتاری کوردی لە رووی سیاسییەوە گەیشتبێتە ئاستێ کە گوتاری دەولەت بووبێت. چونکە ئەگەر گوتاری سیاسی لەو قۆناغەدا بەرهەم بهاتبایە ئەوە دەبوو ئەو دەسەلاتە ناوی دەسەلات یان دەولەتی کوردی بوایە لەبری ئەوەی بەناوی ئەو گوندەوە ناو بنرێت کە تیایدا دامەزراوە. ئەمە جگە لەوەی کە دامەزرێنەری ئەو دەسەلاتە سەر خێلی خێلی حەمیدی بووە، کە ئەوەش زیاتر دەیسەلمێنێ کە دەسەلاتەکەی هەولی پێکهێنانی یەکێتییو فیدراسیۆنی لەگەل خێلو دەسەلاتە ناوچەییەکانی تردا نەداوە، بەلکو هەولیداوە لەرێگای شەرەوەو بە ناچار کردن بیانخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. کەواتە بە ئاشکرا دیارە گوتاری دەسەلاتی دۆستەکی گوتارێکی خێلایەتی بووە کە بە هەمان ستراتیژی خێلایەتی دەسەلاتە خێلایەتیەکانی تری کورد کاری کردووە کە گەوهەری ئەو گوتارەش سرینەوەی هەموو ئەوانی ترە.

زۆربەی مێژوونووسانی کورد دەولەتی ئەیوبی بە دەولەتی کوردی دەدەنە قەلەمو زۆرێکیش شانازی پێوە دەکەن، لە راستیدا دەولەتی ئەیوبی هیچ خاسیەتییەکی کوردی بوونی نەبووەو بنەمالەی ئەیوبی با بەرەگەز کوردیش بن بەلام ئەو دەولەتە دەولەتێکی عەرەبی ئیسلامی بووەو لەسەر خاکی عەرەبی دروستبووەو زمانی دەولەتەکە زمانی عەرەبی بووە. بەگوێرەی سەلاحەدینی ئەیوبی کە سەرۆکی ئەو دەولەتە بووە تەنیا هەر ئەوەیە بە رەگەز کورد بووە،

ئەگینا نە بیرو هەستی ئیتنیکی هەبووە نە مەسەلەی نەتەوایەتیش وەکو مەسەلەیەکی سیاسی بە واتای ناسیۆنالیزم لەو قۆناغەدا بوونی هەبووە، هەر بۆیە لەڕووی زانستییەوە ناشێت باسی نەتەوایەتی بوونی دەوڵەتی ئەیوبی بکەین بەگوێرەی کورد چونکە لەلایەك ئەو دەوڵەتە لەسەر جوگرافیای کوردستان دروست نەبووە، لەلایەکی ترەوە جگە لە ژمارەیەکی کەمی بنەماڵەی ئەیوبی کە ئەوانیش پەیوەستبوونیان بە ئیسلامەوە وای لێکردوون کە بگەنە ئەو ئاستە لە هەرەمی دەسەڵاتی عەرەبی ئیسلامیدا، ئەگینا کورد پەیوەندی نەبووە بەو دەوڵەتەوە، گوتاری دەوڵەتی ئەیوبی گوتارێکی عەرەبی ئیسلامی بووە کە لە بنەڕتدا گەوهەری ئەو گوتارەش پەیوەستبووە بە پایەکانی ئیسلامو نەتەوەی عەرەبەوە.

کوردی بوونی هەر دەسەڵاتێك لەسەر بنەمای بەرنامەو گوتاری ئەو دەسەڵاتە لێك دەدرێتەوەو دەناسێنرێت. بوونی کەسێکی کورد لە لوتکەی هەرەکی دەسەڵاتدا لەسەر زەمینەو جوگرافیایەکی غەیرە کوردیو پێکهاتەی ئەو دەسەڵاتەش بەتایبەتی کە هەرەمی دەسەڵاتێکە لە غەیری کورد هیچ لێکدانەوەیەك بۆ کوردی بوونی ئەو دەسەڵاتە ناسەلمێنێت. دەشێ لاوازی هەستی لێکدانەوەو گرێی هەست بە کەمیکردن لای ئێمەی کورد ئەوەی دروستکردبێت کە ئەو دەسەڵاتو دەوڵەتانەی لە دەرەوەی کوردستان دروستبوونو بە هەر ڕێگایەك بوو بێت کوردێك بووەتە سەرۆکیان بە دەوڵەتو دەسەڵاتی کوردی بدەینە قەڵەم. لەم ڕوانگەیەوە دەوڵەتی ئەیوبی نە لەڕووی گوتاری دەوڵەتەوە نە لەڕووی زمانی ئیدارەی دەوڵەتەکەوە نە لەڕووی پێکهاتەی ئیدارەی دەوڵەتەکەوە، نە لەڕووی ئەو خەڵکەی کە دەوڵەتەکە بەڕێوەی بردوون، نە لەڕووی ئەو جوگرافیایەوە کە دەوڵەتەکەی لەسەر دامەزراوە.. هیچ خاسێتێکی کوردی بوونی نەبووە. بەڵکو دەوڵەتێکی عەرەبی ئیسلامی بووەو بەرنامەو ستراتیژی کارکردنی پاراستنی عەرەبو ئیسلام بووەو شەڕی لەگەڵ خاچ پەرستانو ڕزگارکردنی قوسیش هەر لە سنووری ئەو

بەرنامـــەو ســـتراتیژەدا بـــووەو دەوری ســـەلاحەدین هـــەمان دەوری هـــەر ســـەرکردەیەکی تـری دڵسۆزی دەسـەڵاتی عـەرەبو ئیـسلام بـووە. لـە ڕووی ڕاستیشەوە ناکرێت بۆ ئـەو قۆناغـە داوا لـە سـەلاحەدینی ئـەیوبی بکرێـت کـە نەتەوەیی بێت یان هەڵگری بەرنامەی ناسیۆنالیزمی کوردی بێـت چـونکە ئـەوە ئاشـکرایە کـە ناسـیۆنالیزم بەرهـەمی قۆنـاغێکی تایبەتییـە لـە پەرەسـەندنی کۆمەڵایەتی کە ئەویش لە ڕوانگـەی مارکسیزمەوە قۆنـاغی دەرکـەوتنی چینـی بۆرژوایـە واتـە بەرهـەمی شۆڕشـی پیشەسازییە[١٨]. لـە ڕوانگـەی بیرمەنـدانی کۆمەڵناســـی مۆدێرنـــەوە، ناســـیۆلیزم بەرهـــەمی مۆدێرنێتەیـــە کـــە ئـــەم بۆچوونەش زۆر جیاواز نییە لەگەڵ بۆچوونی بیرمەندانی مارکسیزم لەسـەر ئـەو مەسەلەیە.

هەندێ جار لـە کوردسـتانو لای ڕۆشـنبیرانو سیاسـیانی کـورد گوێمـان لـەو جـۆرە داواکارییانـە دەبێـت بـۆ مەسـەلەی نەتەوایـەتی کـوردو دروسـتکردنی دەوڵەتی کوردی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو جۆرە داواکارییە لەژێر کاریگـەری پاڵنەری سۆزو عاتیفەدایەو لە هەمان کاتدا بـێ ئاگـایی ئێمـەش نیشان دەدات سەبارەت بە بنەما مادییەکانی دەرکەوتنی هـەر دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی یـان دروسـتبوونی هـەر دامـەزراوێکی کۆمەڵایـەتی، چـونکە ناکرێـت لـە دەرەوەی پەرەسـەندنی کۆمەڵایـەتیو لـە دەرەوەی مێـژوو بـاس لـە هـیچ دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتیو هـیچ دامـەزراوێکی کۆمەڵایـەتیو هـیچ سـەرخانێکی کۆمەڵایـەتی بکـەین، یـەکێك لـە کێـشە دیارەکـانی ناسیۆنالیـستی کـورد لـە سـەرەتای دەرکەوتنیەوە تاکو ئێستا ئەوەیە کە بەبێ زانینی ناسیۆنالیزمو بەبێ ناسـینی خۆییو بەبێ بوونی گوتارێکی کـراوەی ناسـیۆنالیزمی دواوەو بـەردەوامیش لـە ڕەخنەگرتنێکی عاتیفانەدا بووە بەرامبەر بە گەلی کوردو بە بزووتنەوەکانی، بـۆ نموونـە کاژیـك کـە خـۆی بـە حیزبـی ناسیونالیـستی کـورد زانیـووەو بـەدوای ئەویشدا پاسـۆك کـە خـۆی بـە هـەڵگری هـەمان بەرنامـە زانیـووە.. خـاوەنی گوتارێکی کراوەی زانستی ئەوتۆ نەبوون کە گەوهەری پرۆژەی نەتـەوەیی کـورد

لەخۆ بگرێت بەڵکو بەپێچەوانەوە خاوەنی گوتارێکی عاتیفی دلخراوی تاك رەهەندی مەودا تەسك بوون و نەیانتوانیووە لەسەر جوگرافیای کوردستان کەسێتییەکی دیارو جەماوەری یان تەنانەت کەسێتیەکی نوخبەییان هەبێت، ئەمە جگە لەوەی کە لەگەڵ بزووتنەوەی کوردی هاوچەرخی خۆیاندا بەردەوام لە رەخنەدا بوون و زیاتر وەکو نەیاری بزوتنەوەکە دەرکەوتوون، بۆ نموونە لە گەڕانەوەی بەرزانییەوە بۆ کوردستان و وەکو رابەری بزوتنەوەی کوردی لەدوای چواردەی تەمموزو روخاندنی رژێمی پاشایەتی هەمیشە کەسێتی بەرزانی کەسێتی دیاربووەو لەسەر ئاستی کوردستان و لە دەرەوەش تەنیا بەرزانی بە رابەری بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد سەیر کراوەو لەراستیشدا هەر ئەو کەسێتی رابەرو سەرکردەی هەبووە لە کوردستانداو گوتاری بەرزانیش لەسەر زەمینەی واقیع بە گوتاری مەوزوعی زانراوەو سەیر کراوە چونکە بەرهەمی سۆزو عاتیفەی رۆمانسیانە نەبووە ــ راستە لەسەردەمی سەرکردایەتی بەرزانیدا کورد نەیتوانی ببێتە خاوەنی داواکانی بەڵام بەرزانی سەوداگەری لەسەر مەسەلە ستراتیژییەکانی کوردو ناسنامەی نەتەوەیی کورد نەکرد، هەر ئەوەش وایکردووە کە لەبری ئەوەی کاژێك و پاسۆك وەکو هەڵگری گوتاری کوردی سەیر بکرێن، بزوتنەوەی کورد بەرابەرایەتی بارزانی بە هەڵگری گوتاری کوردی سەیر کراوە.

لەدوای دەوڵەتی ئەیوبی، زۆرێك لە کوردو لە مێژوونووسان و سیاسیەکانی کورد زۆر بە بایەخەوە دەربارەی حکومەتی زەند دەدوێن و وەکو حکومەتێکی دیاری کورد باسی لێوە دەکەن. حکومەتی زەند لەدوای کوشتنی نادرشا لەساڵی (١٧٥٣)دا لەلایەن کەریم خانی زەندەوە دامەزرا زەند تیرەیەکی سەر بە خێڵی (لەك)ەو ئەم خێڵەش لە ناوچەکانی (پشتکێو)دا دەژین، کەریم خان بناغەی حکومەتەکەی خۆیی لە دەوروبەری ئەسفەهان داناو پاشانیش حکومەتەکەی لە باشوری ئێران و شیرازدا دەسەڵاتی پەیدا کردووە، سەرباری شەڕو پێکدادانی لەگەڵ ئەسەدخانی ئەفغانی و محەمەد حەسەن خانی قاجاریدا

بەڵام دەسەڵاتی خۆیی سەپاندووە. کەریم خان لەساڵی ١٧٧٩دا کۆچی دوایی کردووەو دوای خۆیشی بۆ ماوەی پانزە ساڵ دەسەڵاتی حکومەتەکەی بەردەوام بووەو لەساڵی ١٧٩٤دا بەتەواوەتی حکومەتی زەند روخاوەو کۆتایی بە دەسەڵاتی هاتووە.

لێرەدا چەند پرسیارێك خۆیان دەسەپێنن، ئایا حکومەتەکەی کەریم خان حکومەتێکی کوردی بووە یان ئێرانی؟ ئایا حکومەتەکەی کەریم خان حکومەتی گەل بووە یان حکومەتی خێڵ؟ ئایا ئەو حکومەتە بەرهەمی هەستو هوشیاری نەتەوەیی کوردی بووە یان تموحی دەسەڵاتدارێکی خێڵ بووە بۆ فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتو قەڵەمڕەوی خێڵ؟ ئایا گوتاری ئەو حکومەتە گوتارێکی ئێرانی یان کوردی یان خێڵایەتی بووە؟

ئەوەی ئاشکرایە سەردەمی دروستبوونی حکومەتەکەی کەریم خان دەکەوێتە پێش سەرهەڵدانو دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی ئەورووپیشەوە بۆیە ناشێت وای بۆ بچین کە ئەو حکومەتە حکومەتێکی نەتەوەیی کوردی بووبێت، هەروەك دەشزانین ئەو حکومەتەی کەریم خان لە بۆشایی دەسەڵاتداو دوای کوشتنی نادرشاو هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆرێتی سەفەوی لە بەشێکی ئێراندا دروستبووە کە ئەو بەشەش لە دەرەوەی سنووری جوگرافیای کوردستانە، دیارە ناشێت لە دەرەوەی جوگرافیای نەتەوە دەوڵەتی نەتەوە دروست بکرێت، هەر بەو پێیەش ئەو دەسەڵاتەی کەریم خان مۆرکی نەتەوەیی پێوە نەبووە، جگە لەوە کەریم خان حکومەتەکەی بەناوی خێڵەکەی خۆیەوە ناوناوە کەواتە ئەو دەسەڵاتە دەسەڵاتی خێڵ بووە نەك دەسەڵاتی نەتەوە یان گەل، تەنانەت ئەو حکومەتە لەو ئاستەشدا نەبووە کە ناوی حکومەتی ئێرانی لەخۆی بنێت، یان ناوی هەرێمێکی جوگرافی پێوە بێت هەرچەندە جوگرافیاش بۆ قۆناغێکی لەو جۆرە لە جوگرافیای خێڵ تێپەڕ ناکات. لێرەوە ئاشکرا دەبێت کە حکومەتەکەی کەریم خان حکومەتێکی خێڵایەتی بووە لە روانگەی ناونانیەوە، هەروەك سنوورداریش بووەو نەیتوانیوە ببێتە حکومەتی هەموو

گەلانی ئێران وەکو ئیمپراتۆرێتی سەفەوی کە پێش دروستبوونی حکومەتی زەند رووخاوە. کەواتە گوتاری حکومەتی زەند گوتارێکی خێڵایەتی نا کوردی نیمچە ئێرانی بووە، تەنانەت هەستی ئێرانی بوونیش لەو قۆناغەدا لاوازبووە چونکە پەیوەستبوونی نیشتمانی تەنیا ئاستە غەریزییەکەی وابەستەبوونی مرۆڤی بەزێدو شوێنی لەدایکبوونەوە لێ دەربچێت، ئەوی دی بەرهەمی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی‌و بنەماکانی ناسیونالیومە، لە هەموو ئەم روانگانەوە حکومەتی زەند نەخاسێتی حکومەتێکی نەتەوەیی کوردی هەبووە نە خاسێتی حکومەتێکی نیشتمانی ئێرانی هەبووە، نە بەشێوەیەکی سروشتی دروستبووە، بەڵکو بەرهەمی شەڕو پێکدادانە لەگەڵ قاجەری‌و ئەفغانی‌و کەسانی تریشدا. بۆیە تەنانەت نەیتوانیووە لە کوردستانی ژێر سایەی ئێرانیشدا رۆڵێکی کاریگەری هەبێت‌و ئامادەبوونی هەبێت هەروەك هیچ کاریگەرییەکی مەعنەویشی وەکو یادوەری رابردوو بۆ ئێمە بەجێنەهێشتووە ئەویش لەو روانگەیەوە کە نە لەڕووی نەتەوەیی‌و نە لەڕووی جوگرافی‌و نە لەڕووی کەلتوورییەوە کوردی نەبووە، بەڵکو دەسەڵاتێکی خێڵایەتی بەشێکی دیاریکراو بووە لە ئێراندا، جگە لەوەش لەڕووی بنیادی شارستانێتیەوە شتێکی ئەوتۆی لەپاش نەماوەتەوە.

ئێستا دەردەکەوێت هەرچۆن دەسەڵاتی سەلاحەدینی ئەیوبی دەسەڵاتێکی کوردی نەبووە، بە هەمان شێوە دەسەڵاتی کەریم خانی زەندیش دەسەڵاتێکی کوردی نەبووە، هەر بەو پێیەش گوتاری هیچ کام لەم دوو دەسەڵاتە گوتاری کوردی نەبووە بە مانایەکی تر لەڕووی نەتەوەییەوە ئەم دەسەڵاتانە هیچ بایەخێکیان نییە چونکە کاتێك دەسەڵاتێك بایەخی نەتەوەیی بۆ کورد دەبێت پێکهاتەو دامەزراوەکانی ئەو دەسەڵاتە کوردی بێت‌و لەسەر جوگرافیای کوردستان بێت‌و زمانی بەڕێوەبردن کوردی بێت‌و بە عەقڵی کوردانەو بە نەریتی کراوەو رەسەنی کوردی بەڕێوە ببرێت، بە واتا دەبێ ئەو دەسەڵاتە پایەکانی ناسنامەی نەتەوەیی کوردی هەبێت.

بێگومان ئێمە لێرەدا باسی سێ دەسەڵاتمان کرد کە مێژوونووسانی کورد زیاتر وەکو دەوڵەتو دەسەڵاتی کوردی سەیریان کردون، بەڵام هاوکات لە سەدەی چواردە بەدواوە چەندین میرنشین لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستاندا دروستبوونو هەریەکە دەسەڵاتی بەسەر ناوچەیەکی دیاریکراودا هەبووەو بەڕێوەی بردووە. هەندێ لەو میرنشینانە زیاتر گەشەیان کردووەو شێوازی دەسەڵاتێکی ناوچەیی تا ئەندازەیەك پەرەسەندوتریان لە دەسەڵاتی خێڵ بەخۆوە بینیووە، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا دامەزراوی میرنشین بریتی بووە لە دەسەڵاتی تا ئەندازەیەك پەرەسەندووی خێڵ واتە میرنشین هەر هەمان دامەزراوی خێڵە بەڵام پەرەسەندنێکی زیاتری بەخۆوە بینیوە.

ئەوە ئاشکرایە کۆمەڵگا لە پەرەسەندنی سروشتی خۆیدا دەگاتە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت، بەڵام کۆمەڵگای کوردی لەبەر ئەوەی پەرەسەندنێکی سروشتی نەبووە بۆیە لە گەشەی ناسروشتی خۆیدا لەبری بەرهەمهێنانی دەوڵەت دامەزراوی خێڵی بەرهەم هێناوە(١٩) دیارە گەوهەری گوتاری کوردی بریتییە لە سەریەخۆیی‌و دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی لەکاتێکدا دامەزراوەی خێڵ لە خوار ئاستی دەوڵەتەوە بووەو زیاتر سیمای دامەزراوەیەکی خێڵایەتی هەبووەو گوتارەکەی گوتاری نەتەوەیی نەبووە بەڵکو گوتاری خێڵایەتی ناوچەگەری داخراو بووە.

دامەزراوەی خێڵ لە سنوورێکی جوگرافی تەسکدا دروستبووەو زیاتر خێڵە کوردەکان دروستیان کردووەو ئەو خێڵەی بەهێز بوو بێت هەوڵیداوە خێڵە لاوازەکانی دەورووبەری داگیر بکاتو بیانخانە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆیەوەو بەوەش قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات، ستراتیژی کارکردنی دەسەڵاتی میرنشینی کوردی ستراتیژی خێڵایەتی بووە، جیاوازی دامەزراوی خێڵ‌و میرنشین ئەوە بووە خێڵ پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی ئیداری بووە، میرنشین پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی بووە، بەڵام هەردووکیان بە هەمان ستراتیژو عەقڵیەت کاریان کردووە.

له دیارترینی ئەو میرنشینانە میرنشینی ئەردەلان (١٢٢٠-٠٠) سۆران (١٥٠٠ ـ ١٨٤٤)و بابان (١٦٥٠-١٨٥١) بادینان (١٥٠٠ـ١٨٤٢) بوو کە هەریەکەیان لە سنووریکی دیاری جوگرافیدا دەسەلاتیکی سنوورداریان هەبووە. هەرچەندە سەرۆکی ئەم میرنشینانە بە پاشا یان میر ناویراون بەلام هیچ خاسیەتیکی رەسمی سەرۆك دەولەت یان تەنانەت سەرۆك حکومەتیشیان نەبووە، زیاتر شیوازی بەریوەبردنی خیلیان هەبووە بەلام لە ئاستیکی پەرەسەندوتردا، ئەویش بەهۆی فراوانبوونی قەلەمرەوی دەسەلاتیانەوە، ئەوەشی ئاشکرایە، ئەم دەسەلاتانە لە ئەنجامی لاوازی دەولەتانی فەرمانرەوای ناوچەکەدا دەرکەوتوون و ململانیی نیوان دەولەتانی ناوچەکەش یارمەتی گەشەکردن و مانەوەیانی داوە، ئەگەرچی بە باریکی تردا ئەو دەولەتانە توانیوویانە ئەم میرنشینانە لەپیناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بەکاربهینن و بیانکەن بە گژی یەکتردا بە هەرحال ئەوەی گرنگە بۆ ئیمە ئەوەیە ئایا گوتاری ئەم میرنشینانە گوتاری خیل یان نەتەوە بووە؟. ئایا فەزای نەتەوایەتی بالادەست بووە لە سنووری دەسەلاتی میرنشینەکاندا یان فەزای خیلایەتی؟ ئایا عەقلی سیاسی کوردی ئامادەبوونی هەبووە؟ یان عەقلی خیل؟ ئایا هەستی کوردایەتی لەم قۆناغەدا پەرەی سەندووە یان نا؟ ئایا لەرووی گوتاری کوردییەوە دامەزراوی میرنشین چییەو چ جۆرە دامەزراوەیەکە؟ ئایا لە روانگەی پەیوەندی نیوان رۆحی رەهای کۆمەلگاو گەیشتن بە ئازادی، دامەزراوەی میرنشین لە کویدایە؟ ئایا دامەزراوەی میرنشین ئەو دامەزراوەیە کە رۆحی گشتی تیایدا گەیشتبیتە ئاستی رەهاو گوزارشت لە ئازادی بکات؟ چۆن دەروانریتە گوتاری نەتەوەیی کوردی ئەو قۆناغەو رۆحی کۆمەلگا لەو کاتەدا؟ هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی دامەزراوەکانی میرنشینەوە لە کوردستاندا تا روخاندنی دوامیرنشین لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەیەمدا لە کوردستاندا مەسەلەی نەتەوایەتی وەکو مەسەلەی ناسیونالیزم دەرنەکەوتووە، تەنانەت هەستی نەتەوایەتیش لەو ئاستەیدا کە ئەو هەستە گوزارشت کردن بیت لە کەسیتی نەتەوە بوونی

نەبووە، دەشێ هەستێکی سادەی ئینتیما بوون بۆ زمان و هاوڕەگەزی کە ئەوەش وەلائێکی غەریزەییانەیە بوونی هەبوبێت بەلام لە روانگەی دەرکەوتنی ناسیونالیزمەوە هیچ خاسێتێکی دیاری هوشیاری نەتەوەیی بوونی نەبووە، ئەوەش دیارە بارێکی سروشتییە چونکە لەو مێژووەدا نەك لە کوردستان بەڵکو لە رۆژهەلات بەگشتی و لە هەندێ شوێنی ئەورووپاش هێشتا ئەو زەمینە مادییانە لەئارادا نەبووە کە ناسیونالیزم بەرهەمی ئەوانە، لە پلەی یەکەمدا ناسیونالیزم کە گوتارەکەی گوتاری نەتەوەیی یان ناسیونالیزمە بەرهەمی مۆدێرنێتەیە، لەو مێژووەشدا لە رۆژهەلات بەگشتی هێشتا کۆمەڵگا لە قۆناغی پێش مۆدێرنێتەدا بووەو مەسەلەی تەکنەلۆژیاو شۆڕشی پیشەسازی و دەرکەوتنی چینی بۆرژوا هێشتا لە دەرەوەی مێژوودا بووە بەو مانایە لەو ئاستەدا نەبووە کە ئامادەبوونی هەبێت و کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی هەبێت.

لەلایەکی ترەوە لە قۆناغی پێش شۆڕشی پیشەسازی و دروستبوونی کۆمەڵگای شاردا، کۆمەڵگا لە قۆناغی فیودالی و خێڵایەتیدا دەژی، وەك ئاشکرایە لە لە کۆمەڵگای کوردیشدا قۆناغی فیودیالی نەبۆتە قۆناغێکی خاوەن خاسێت و سیمای دیار لەو روانگەیەوە کە دامەزراوی فیودالی دامەزراوێکی ناسروشتی بووە چونکە سیستەمی ئابوری فیودیالی لە کۆمەڵگای کوردیدا نەبۆتە سیستەمێکی خاوەن ناسنامە، رەنگە هەر ئەوەش هۆکارێکی سەرەکی بێت لەو هۆکارانەی کە بواریان بۆ دروستبوونی دەوڵەتی فیودیالی لە کۆمەڵگای کوردیدا نەڕەخساندووە، بەڵکو لەبری دەوڵەتی فیودیالی میرنشینی فیودیالی دروستبووە کە دامەزراوی میرنشینیش لەسەر جوگرافیاو نەسەبی خێڵ دروستبووەو توانای بەزاندنی سنووری خێڵ و جوگرافیای خێڵیشی زۆر لاواز بووە، ئەگەر توانیبێتیشی سنووری خێڵ و جوگرافیای خێڵ بەجێبهێڵێت، ئەوا تەنیا لەڕێگای شەڕو داگیرکردنەوە ئەوەی پێکراوە نەك لەڕێگای یەکگرتن و یەکبوون و یەکێتییەوە. ئەوەش پرسی بەنەتەوەبوونی کورد لەبەردەم ئەو

پرسیارەدا رادەگرێت کە لە قۆناغی فیودیالی کوردیدا چەمکی یەکگرتن یان کۆبوونەوە Integration دروست نەبووە واتە کورد لەو قۆناغەدا لەشێوەی یەکەی بچووک بچووکی پەرتبووی ناکۆک لەگەڵ یەکتردا پێکهاتووە کە ئەویش یەکەی خێڵو عەشیرەت بووەو هەریەکە لەم یەکە یان دامەزراوانەش ئابوری تایبەتی خۆیی‌و بەوپێیەش گوتاری تایبەتی خۆیی‌و ستراتیژی تایبەتی خۆیی هەبووە. کە ئەویش ئابوری خێڵو گوتاری خێڵو ستراتیژی خێڵ بووە، هەر ئەم (یەکە) پەرت‌و ناپەیوەستانە بەوانی ترەوە بنەمای دروستبوونی دامەزراوی میرنشین بووە بۆیە میرنشینیش هەر هەمان گوتاری هەبووە کە ئەویش گوتاری خێڵ بووە. لەنێو گوتارەکانی خێڵ یان میرنشینیشدا یەکگرتن دروست نەبووە بەڵکو لە گەوهەردا گوتاری میرنشین کە هەر هەمان گوتاری خێڵ بووە گوتاری دابەشبوون یان گوتاری هەرێمگیرییە.

لە سەردەمی دەسەڵاتی میرنشینەکاندا فەزای نەتەوایەتی تەنیا لە روانگەی بەراوردکردنەوە بە عەرەب‌و عەجەم‌و رۆم واتە تورك هەستی پێکراوە، هەرچەندە میرنشینەکانی کورد خۆیان سەربەخۆ نەبوون‌و لەژێر سایەو قەڵەمرەوی دەسەڵاتی تورك‌و فارسدا بوون، ئەو بەراورد کردنەش لەوەدا بووە کە فارس‌و تورك چۆن خاوەن دەسەڵات‌و دەوڵەت بوون‌و چۆنیش هەوڵیانداوە نفوزو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کوردو کوردستاندا بسەپێنن‌و چۆن بە ئارەزووی خۆیان لە کوردستاندا موڵك‌و زەوییان دابەشکردووەو فڵان سەرخێڵیان بەرز کردۆتەوەو فڵانی تریان دابەزاندووەو رسوایان کردووەو هەوڵیانداوە ئەو میرنشین لایەنگری خۆیان بێت‌و بەدژی ئەو میرنشینی تر یان ئەو خێڵو عەشیرەت بەکاری بهێنن ئەم فەزایەی کە لە کوردستاندا باڵادەستبووە هەمیشە هۆی شەڕو ئاژاوەو پەرتبوون‌و دابەشبوون بووە لەنێو پێکهاتەکانی کۆمەڵی کوردەواریداو بەردەوامیش بە ئاراستە دابەشبوون کاری کردووە، لەکاتێکدا بنەمای پێکهاتنی نەتەوە یەکگرتن‌و یەکبوونە واتە Integration. فەزای میرایەتی‌و میرنشین کە ئاستێکی کەمێك

گەشەسەندووی دامەزراوەی خێڵە فەزای دابەشبوون و پەرتبوون بووەو مەسەلەی یەکبوون لە ئاستێکی زۆر لاوازدا بووە، بەو ئەندازەی هەر میرنشینە وابەستەو لایەنگری یەکێك لە دوو ئیمپراتۆرە گەورەکەی ناوچەکە بوون واتە سەفەوی‌و عوسمانی یان فارس‌و تورك. کە ئەوەش مەسەلەی ناوەندبوون کە مەبەستمان یەکێتی نەتەوەییە دەخاتە بەردەم پرسیارەوە، ئەگەر شتێك هەبووایە بەناوی یەکێتی نەتەوەیی کورد ئەوا دەبوو سەرجەم میرنشین‌و خێڵەکانی کورد لەدەوری ئەو یەکێتییەدا کۆببونایەتەوەو لە راستیشدا لەنێویدا بتوانایەتەوەو بەوەش نەتەوە پێکهاتبایە. کە لەبارێکی وەهاشدا فەزای نەتەوەیی دەبووە فەزای باڵادەست لە کوردستانداو لەبری خێڵ نەتەوەو لەبری میرنشین دەوڵەت ئامادەبووەنی دەبوو، ئەوساش لەبری گوتاری دابەشکردن‌و پەرتبوون گوتاری یەککگرتن بەرهەم دەهات کە ئەوەش گوتاری نەتەوە یان گوتاری گەلە. بێگومان لەبەر ئەوەی پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی پێکهاتەیەکی بەو جۆرە پەرتبوو دابەشبوو بووە، دروستبوونی فەزای نەتەوەیی لەو قۆناغەداو بگرە بۆ قۆناغەکانی دواتریش مایەی گومانەو ناشێت وای بۆ بچین لە زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی لەو جۆرەدا فەزای نەتەوەیی دروست ببێت لەکاتێکدا هێشتا هەستی نەتەوایەتی‌و وەلاء بۆ نیشتمان‌و وەلاء بۆ نەتەوە کۆنترۆڵی بکات، بەو مانایەی کوردبوون جێگای جاف بوون‌و هەمەوەندی بوون‌و زەنگەنە بوون‌و لەك بوون‌و بەرزنجی بوون‌و قادری بوون‌و نەقشەبەندی بوون‌و موکری بوون‌و بۆتانی بوون‌و گەرمیانی بوون قەرەداخی بوون‌و جوانرۆیی بوون‌و تاڵەبانی بوون‌و بەرزانی بووو.. تاد بگرێتەوە.

پرسیارێکی ترمان بەرز کردەوە ئایا لە قۆناغی میرنشینەکاندا عەقڵی سیاسی کوردی بوونی هەبووە؟ دیارە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ بپرسین ئایا عەقڵی سیاسی بەرهەمی چییە؟ یان دەشێ دوور لە زانینی سیاسەت‌و دوور لە زانینی زانستی سیاسی‌و دوور لە بوونی دامەزراوی سیاسی عەقڵی سیاسی ئامادەبوونی هەبێت؟ پێموایە وەڵامی ئەم پرسیارانە ئاشکرایەو

ناشێت عەقڵی سیاسی بەبێ بوونی حیزبی سیاسیو دامەزراوی سیاسیو بەبێ ئاگا لە زانستی سیاسی ئامادەبوونی هەبێت هەر بۆیە ناشێت تەسەوری ئەوە بکرێت لە سەردەمی دەسەڵاتی میرنشینەکانی کورددا عەقڵی سیاسی ئامادەبوونی هەبووبێت چونکە ئەگەر عەقڵی سیاسی کوردی لەو سەردەمەدا ئامادەبوونی هەبوایە دەیتوانی بەرنامەی یەکخستنو یەکگرتنەوەو دروستکردنی فیدراسیۆن لەنێوان میرنشینەکانو خێڵو عەشیرەتەکانی کورددا بنێتو لە دامەزراوێکی یەکگرتووی گەورەتردا کۆیان بکاتەوە کە هەر ئەو عەقڵە ئەو دامەزراوەی بەڕێوەببردایەو هەوڵی بەدەستهێنانی ناسنامەی بدایەو بەرنامەی خۆگونجاندنو پێکەوەژیانیشی لەگەڵ هەردوو دەسەڵاتی فارسو تورك یان سەفەویو عوسمانیدا دابڕێژایە، بەڵام دیارە نەبوونی عەقڵی سیاسی لەو قۆناغەدا میرنشینەکانی وەکو دامەزراوی ئیداری دەرخستووە کە سیاسەتی عوسمانی یان سەفەوییان لە سنووری دەسەڵاتەکەیاندا پیادەکردووە. بێگومان بۆ ئەو قۆناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی نەك قسەکردن لەسەر عەقڵی سیاسی مایەی گومانە بەڵکو (خەیاڵی سیاسی)ش ئامادەبوونی نەبووە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا هەر بەو پێیەش گوتاری سیاسی کە بەرهەمی زەمینەیەکی مادییەو لەپێش هەمووشیەوە بوونی عەقڵی سیاسی لەو قۆناغەدا ئامادەبوونی نەبووەو دەتوانین بڵێین لە راستیشدا هەر دەرنەکەوتووە. راستە لە روکەشدا وا دەردەکەوێت کە خەیاڵی سیاسی سەرچاوەکەی وەهم بێتو بەو پێیەش لە کۆمەڵگای ماتیدا مەسەلەی وەهم تەواو دەبێتو کەواتە بەو پێیە دەبێ ئەو کۆمەڵگایە (لە خەیاڵ) رزگاری بێتو بنەمای مادی بۆ سیاسەت بێتە ئاراوەو بەو پێیەش عەقڵی سیاسی بەرهەم بێت. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە (خەیاڵ) رەگەزێکی سەرەکیو ئامادەیە بۆ گەیشتن بە ئاستی بەرهەم هێنانی عەقڵو بێ بوونی (خەیاڵ)یش زەمینەی رەخساندنو بەرهەمهێنانی عەقڵ نایەتە ئاراوە. لە کۆمەڵگای (خەیاڵ)دا کە هێشتا خاسێتی سروشتی بوونی هەیە زەمینەی کارکردنو بەرهەمهێنانی

عەقڵ‌و ئالۆزییەکانی بەرهەمی عاقڵ لاوازن.. لە کۆمەڵگای "خەیاڵ"دا هەموو شتێ وا دەردەکەوێت کە سادەو لەگەڵ یەکتر گونجاوو یەکگرتوو رێکخراوەو[٢٠] ئەو رێکخستن‌و گونجاندنەش بەرهەمی خەیاڵە، بەڵام ئەگەر سەیری مێژووی خێڵایەتی کوردو قۆناغی میرنشینەکانیش بکەین، ئەوا دەبینین ئەو رێکخستن‌و گونجاندن‌و یەکگرتنەبوونی نەبووە، کەواتە شێوازو سروشتی (خەیاڵ)یش لە کۆمەڵگای کوردی رابردوودا لاوازبووە، ئەو خەیاڵەش لە ئەنجامی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیاو پیشەسازی‌و برەوسەندنی ئابوری‌و رێنسانسی کەلتوریدا لاواز نەبووە، بەو پێیەی کە پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا کۆتایی بە سەردەمی وەهم دێنێت. یان بەزاراوەیەکی تر بڵێین: لە کۆمەڵگا پیشەسازییە پێگەیشتوو بەناوەندبوو بیرۆکراتەکان‌و لەوەهم رزگاربووەکاندا[٢١]، ئیتر بوار بۆ کارکردنی خەیاڵ نەماوەتەوە، نەخێر خەیاڵ رەگەزێکی دیارە لە ژیانی کۆمەڵایەتیداو کۆمەڵگا لێی دەرباز نابێت‌و لە بنەڕەتیشدا عەقڵی سیاسی یەکێك لە پایەو سەرچاوەکانی خەیاڵی سیاسی یان خەیاڵی کۆمەڵایەتیە. تەنانەت بندیکت ئەندرسۆن دەڵێت: "ناسیۆنالیزم کۆمەڵەیەکی خەیاڵییە[٢٢]" مەبەست لەم قسانە ئەوەیە کە کورد خەیاڵی سیاسیشی نەبووە یان لە ئاستێکی لاوازدا بووە، هەر ئەوەش وایکردووە کە عەقڵی سیاسی کوردی بە ئاسانی بەرهەم نەیەت بەتایبەتی لە قۆناغی فیودیالی‌و دەسەڵاتی خێڵ‌و میرنشیەکاندا، بۆیە ناشێت وای بۆ بچیت عەقڵی سیاسی کوردی لەسەروەختی دەسەڵاتی میرنشینەکاندا بوونی هەبوویێت، راستە ئاخاوتن لەبارەی سیاسەت‌و عەقڵی سیاسییەوە مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەڵام بەگوێرەی کورد لەبەر ئەوەی خاسیەتی کۆمەڵایەتی بوون‌و بنەماکانی کۆمەڵگا لاوازیووەو نەیتوانیوە دامەزراوی سیاسی دروست بکات‌و یەکێتیی‌و یەکبوون لەنێو پێکهاتەکانیدا دروست ببێت، عەقڵی بەڕێوەبردن‌و نەخشەدانانی ژیانی سیاسی‌و ئیداری‌و کۆمەڵایەتیش لاواز بووە چونکە ئەوە ئاشکرایە پێویست بوون لە ژیاندا زۆر شت دێنێتە ئاراوە، کورد لە مێژە خۆی سپاردووە بەوانی دی تا بەڕێوەی ببەن، لەبەر ئەوە

پێویستی بەوە نەبووە بیر بکاتـەوەو عـەقڵێك بەرهـەم بهێنێـت بـۆ ڕێکخستنی کاروباری بەڕێوەبردن‌و دروستکردنی ئاینـدەی خـۆی، خـۆ ئەگـەر لـە سـنووری داخراوی دامەزراوەکانی خێڵ‌و میرنشینیشدا عـەقڵێکی سـادە بەرهـەم هاتبێـت ئـەوە لـەو ئاسـتە تێپـەڕی نـەکردووە کـە پێداویستی ئـەو دامـەزراوە سـنوور تەسکەبووە.

# هەستی نەتەوایەتی لەسەردەمی میرنشینەکاندا

لە روانگەی مارکسیزمەوە هەستی نەتەوایەتی بەرهەمی سەرەتای دەرکەوتنی چینی بۆرژوایە، بە مانایەکی دی دەرکەوتنی ئەم هەستە هاوکاتە لەگەڵ دەرکەوتنی پیشەساوی‌و گواستنەوەی کۆمەڵگا لە قۆناغی فیودیالیەوە بۆ قۆناغی سەرمایەداری. دیارە هەر بەپێی روانینی هەمان میتۆدی فەلسەفی هوشیاری نەتەوەیی بەدوای هەستی نەتەوایەتی دێت، لە کۆمەڵناسی نوێشدا هەست‌و هوشاری نەتەوەیی پەیوەستن بە دەرکەوتنی ناسیونالیست‌و ناسیونالیزمەوە کە دیارە تا ناسیونالیزم وەکو فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیا دەرنەکەوێت ناسیونالیست وەکو بکەرێکی ناکردە یان لاواز لەرووی دروستکردنی رووداوەوە دەردەکەوێت کە لە راستیدا باری ئاسایی کۆمەڵگای کوردی تاکو ئێستاش ئەوەیە کە ناسیونالیست ئامادەبوونی هەیە بەبێ بوونی ناسیونالیزم، واتە بکەرێکی بێ بەرنامەو بێ پرۆگرام لە مێژووی سەد ساڵی رابردوودا دەجوڵێت بێ ئەوەی خاوەن پرۆگرام‌و فەلسەفە بێت.

بە هەر حاڵ هەستی نەتەوایەتی دەبێت لە دوو ئاستدا جیا بکرێتەوە یەکەمیان هەستێکی غەریزییە کە پەیوەندی بە کۆمەلایەتی بوونی مرۆڤەوە هەیەو لە یەکێتیی زمان‌و یەکێتی خاک‌و یەکێتیی مێژوو هاونەژادیدا خۆی دەبینێتەوەو ئەم هاویەشیانەش جۆرێک لە وەلاء و ئینتیمای بۆ یەکتر دروستکردووە کە پێکەوە ژیانی لێکەوتۆتەوە کە دەتوانین لە ئاستێکی تردا پێی بڵێین کۆمەلایەتی بوون. ئەم حاڵەتە شتێکی سروشتی‌و خۆرسکەو پەیوەندی نییە بە شێوازی پەرەسەندن‌و ئاستی ژیانی کۆمەڵگاوە. بەڵکو بووەتە بەشێك لە ژیانی سروشتی مرۆڤ و هەرکەسە پەیوەستە بەو کەسانەوە کە لە نەژادی ئەون‌و بەزمانی ئەو دەدوێن‌و پێکەوە لەسەر خاکێك هاوبەشن‌و

بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە. ئەم حاڵەتە نەك بۆ مرۆڤ بەڵكو بۆ زیندەوەرانی تریش راستە. دەبینێت بەگشتی ئاژەڵەكان لەشێوەی كۆمەڵدا پێكەوە دەژین، گەلەگورك، هورەوە بەرزا، پۆلە باڵندە، رانەمەڕ، گاگەل.. ئەمەش لە بنەڕەتدا بۆ خۆپاراستن‌و ململانێ لەگەڵ سروشتدا دروست بووە، ئەم ئاستەی پێكەوە ژیان كە هەستێكی هاوبەشی دروستكردووە بۆ خۆپاراستن‌و بەرگری كردن لە مانەوە بەگوێرەی سەرجەم زیندەوەران راستە، بەڵام بەگوێرەی مرۆڤ ئاستی دووەمی هەستی كۆبوونەوە گرنگە كە هەستی نەتەوایەتی وەكو بەرهەمی پەرەسەندن رێكی دەخات.

كۆمەڵ لەو ئاستەیدا كە پێداویستی كۆمەڵایەتی بوونی بەسەردا دەسەپێنێت‌و پاشان لەشێوەی خێزان‌و تیرەو خێڵدا دەردەكەوێت، مانای وایە هێشتا نەبۆتە نەتەوە، هەتا داوای ئەوەی لێبكرێت كە هەستی نەتەوایەتی هەبێت.. دەركەوتنی نەتەوە بەدڵنیاییەوە بەجۆرێك بووە كە بریتییە لە ئاستێك لە ئاستەكان (یان قۆناغەكانی، گەشەو پەرەسەندنی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە دەستەی بچوكەوە بۆ دەستی گەورەتر، لە خێزانەوە بۆ تیرەو خێڵ لەوێشەوە بۆ ناوچەو ئەنجا بۆ نەتەوە[١٣] كەواتە دەركەوتنی نەتەوە بەرهەمی قۆناغێكی دیاری پەرەسەندنی كۆمەڵایەتیەو بەگوێرەی كۆمەڵگای كوردی لە قۆناغی دەسەڵاتی میرنشینەكاندا بە چەمكی نوێ (نەتەوە) پێكنەهاتووە، هەر بەو پێیەش قسەكردن لەسەر هەستی نەتەوایەتی مانایەكی نامێنێت چونكە هەتا نەتەوە بوونی نەبێت هەستی نەتەوایەتی بوونی نابێت. ئەمە جگە لەوەی كە هەستی نەتەوایەتی بەتەواوەتی جیاوازە لە هوشیاری نەتەوایەتی‌و هوشیاری ئاستێكی بالاترو بەرهەمی قۆناغێكی پەرەسەندترەو هوشیاری پەیوەستە بە بوونی كەسی هوشیارەوە وەكو چۆن لە مێژووی سەدەی شانزەیەمدا لەكاتێكدا كە مەسەلەی نەتەوە بە چەمكی سۆسیۆلۆژیانەی نوێ لەئارادا نەبوو بەڵام میكافیلی وەكو كەسێكی هوشیار بانگەوازی بۆ یەكێتیی‌و یەكگرتنی ئیتالیەكان دەكرد، بەڵام ئەم پەیوەستبوونە

تاكە كەسییە بەهایەكی ئەوتۆی نابێت، بەڵكو بەهای ئاشكرای هوشیاری نەتەوەیی لەكاتێكدا دەردەكەوێت كە.. بزووتنەوەیەكی سیاسی نوێنەرایەتی نەتەوە بكات[٢٤]. بەلام بەگوێرەی هەستی نەتەوایەتی ئاستێكی سادەیە لە هەستكردن بە پەیوەستبوونو وابەستەبوونو وەلاء بۆ نەتەوە. لەنێوان هەستی سادەی نەتەوایەتیو هوشیاری نەتەوایەتیدا جیاوازییەكی تەواو ئاشكرا هەیە، هەستی نەتەوایەتی پەیوەست نییە بە بوونی بزووتنەوەیەكی ئایدیۆلۆژی نەتەوەییەوە، پایەیەكی بەهێزی ئەو بزووتنەوەیەش نییە بەلام هوشیاری نەتەوەیی زیاتر پەیوەستە بە بزووتنەوەیەكی ئایدیۆلۆژی نەتەوەییەوە. ئەگەر ئەو هوشیارییە لە ئاستی تاكە كەسەوە گواسترابێتەوە بۆ سەر ئاستی كۆمەڵ. لە قۆناغی دەسەلاتی میرنشیندا تەنانەت ئەگەر هەستی نەتەوایەتیش هەبووبێت ئەوا لەسەر ئاستی تاكە كەس بووە نەك لەسەر ئاستی (كۆ) چونكە نەتەوە خۆی وەكو یەكەیەكی كۆمەلایەتی — سیاسی پێكنەهاتووە، دەشێ لە قۆناغی میرنشینەكاندا تاكە كەسی واش هەبووبێت كە هوشیاری نەتەوایەتی هەبووبێت، بۆ نموونە دەشێ ئەحمەدی خانی لەو تاكە كەسانە دابنرێ، بەلام مادەم نەتەوە خۆی وەكو دامەزراوێكی كۆمەلایەتی — سیاسی پێكنەهاتووە ئەوا هوشیاری تاكە كەس كاریگەرییەكی ئەوتۆی نابێت.

دیارە لەكاتێكدا كە هەستی نەتەوایەتی لەسەردەمی میرنشینەكاندا نەبووبێتە هەستێكی گشتی، ئەوا گوتارێكی ئەوتۆش بەرهەم نەهاتووە كە گوتاری جەماوەری بێت كە مەبەست لەو جەماوەرەش كوردە، بەولتایەكی دی لەو قۆناغەدا گوتاری كوردی كە ناسنامەی كوردی بوونی هەبووبێت بەرهەم نەهاتووە. بەڵكو گوتاری بالادەست گوتاری خێڵ بووە كە بریتییە لە گوتاری پێكهاتەیەكی دیاریكراو لە خەڵكو لەسەر ناوچەیەكی جوگرافی سنووردار.

ئێمە پێشتر چەند پرسیارێكمان بەرز كردەوە دەربارەی ناسنامەی میرنشین وەكو دامەزراوی قۆناغێكی دیاریكراو لە مێژووی كورددا، هەروەها لەبارەی رۆحی رەهای كۆمەلگاو ئەو دامەزراوەشەوە پرسیارمان كرد. كۆمەلگا

ئاسـاییەکان کـە پەرەسـەندنێکی سروشـتیان هـەبووە لـە قۆنـاغی فیودالیـدا دەوڵـەتی فیودالیـان دامەزرانـدووە یـان کۆمـەڵگا خێڵایەتیـەکان لـە ئـەنجامی یەکگرتنی خێڵەکان لەشێوەی فیدراسیۆندا دەوڵەتی خێڵیان پێکهێنـاوە، بـەڵام کۆمـەڵگای کـوردی لەبـەر ئـەوەی پەرەسـەندنێکی ناسروشـتی هـەبووەو نەگەیشتۆتە بەرزترین ئاستی یەکبوونو یەکگرتنو لەو ئاقارەشدا رۆحی رەهای کۆمەڵگا نەبۆتە رۆحێکی گشتی کە لە پلەیەکی بـەرزتردا گوزارشـت لـە ئـازادی خۆی بکاتو دەوڵـەت پێکبهێنێت، لـەبری ئـەوە لـە خـوار ئاسـتی دەوڵەتـەوە دامەزراوێکی لەچاو دەوڵەتدا ئیفلیجی پێکهێناوە کە میرنشینە[26] واتە میرنشین دامەزراوەیەکی خێڵایەتی تا ئەندازەیەك پەرەسەندوتر بووە لە دامەزراوی خێڵ کـە لـە کۆمـەڵگای کوردیـدا لـە ئـەنجامی دروسـتنەبوونی سیسـتەمی ئـابوری فیودیـالیو لـە ئـەنجامی دروسـتنەبوونی فیدراسـیۆنی خێڵایـەتی کـوردیو لـە ئەنجامی بڵندنەبوونی رۆحی کۆمەڵگای کوردی وەکو رۆحێکی گشتی بۆ ئاستی رەهای خۆی کە بتوانێت لـەو ئاسـتەدا گوزارشـت لـە ئـازادی بکـاتو دەوڵـەتی فیودیاڵی یـان دەوڵـەتی خێـڵ لـەو قۆناغـەدا پێکنـەهاتووە، بـەڵکو میرنـشینی خێڵایەتی پێکهاتووە کە ئەویش لە ئاستی بەرهـەمی رۆحـی گـشتی کۆمـەڵگادا نـەبووە، ئەگـەر لـەو روانگەیـە بـڕوانین کـە کۆمـەڵگا یەکەیـەکی یـەکگرتووی ئۆرگانییە، بەڵام دیارە لەبەر ئەوەی مەسەلەی کۆمەڵایـەتی بـوونو ناسـنامەی (کۆمەڵ)یش بەگوێرەی کـورد لەبـەردە پرسـیاردایە بۆیـە دامـەزراوی میرنـشین هاوشانی ئاستی کۆمەڵایەتی بـوونو پەرەسـەندنی کـورد بـووە لـەو قۆناغـەدا. دیارە لەکاتێکدا کە زۆرێك لـە کۆمەڵناسـان پێیـان وایـە یـەکبوونو یـەکگرتنو فیدراسیۆن بنەمان بۆ دروستکردنی دەوڵەتو لەو روانگەیەشـەوە کـورد مـادەم یەکبوونو یەکگرتنو فیدراسیۆنی خێڵایـەتی دروسـت نـەکردووە لـەو قۆناغـەدا بۆیە نەیتوانیووە دەوڵەتی خێڵ یان فیودیالی دروست بکـات، بـەڵام لەبەرامبـەر ئەم بۆچوونەدا بۆچوونی تریش هەیە کە پێـی وایـە ئەگـەر دەوڵـەت دروسـتبوو ئـەوە یـەکێتیو یـەکبوون دروسـت دەکـات.. یـەکبوونی مێژووییانـەی چینـە دەسەڵاتدارەکان لە دەوڵەتدا دەبینرێت، بەڵام دەشێ ئەوە هەڵە بێت کە وەها

بیر بکرێتەوە ئەم یەکبوونە ئاسایی شتێکی یاسایی‌و سیاسیانە بێت، بەڵکو یەکبوونی بنەڕەتیانەی مێژوویی بەشێوەیەکی چەسپاو لە پەیوەندییە ئۆرگانیەکانی نێوان دەوڵەت‌و کۆمەڵگای سیاسی‌و کۆمەڵگای مەدەنیەوە بەئەنجام دێت[٣٦]. کەواتە لەم تێڕوانینەی گرامشی یەوە دەردەکەوێت کە یەکبوون‌و یەکگرتن دەرئەنجامی پەیوەندی نێوان دەوڵەت‌و کۆمەڵگای سیاسی‌و کۆمەڵگای مەدەنیە، بە واتا بە نەبوونی یەکێك لەم سێ رەگەزە مەسەلەی یەکبوون دەکەوێتە بەردەم گومانەوە. بەگوێرەی کۆمەڵگای کوردی لە قۆناغی میرنشینەکان‌و قۆناغی خێڵایەتیدا هیچ کام لەو سێ رەگەزە ئامادە بوونیان نەبووە نە کۆمەڵگای سیاسی‌و کۆمەڵگای مەدەنی‌و نە دەوڵەت خۆی، بێگومان ئەم روانینە تا ئەندازەیەك نزیکە لە روانینی هیگڵ بۆ (خێزان ــ کۆمەڵگای مەدەنی ـ دەوڵەت)[٣٧] بەڵام بەگوێرەی کورد لە هیچ حاڵەتێکداو تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت نەبۆتە کۆمەڵگای مەدەنی کەواتە بنەمای سەرەکی یان رەگەزی بنەڕەتی بۆ دەوڵەت‌و بۆ یەکبوون لە کۆمەڵگای کوردیدا ئامادەبوونی نەبووە بەپێی ئەم جۆرە روانینە. دیارە گوتاری نەتەوەیی لە پلەی یەکەمدا پەیوەستی (یەکبوون)ە. لەکاتێکدا یەکبوون نەبێت لە کۆمەڵگای کوردیدا نیارە قسەکردن لەسەر گوتاری نەتەوەیی کوردیش کە گوتارێکی گشتگیری بالادەست بێت جێگای گومانە.

# سەرچاوەکانی بەشی (١ ، ٢ ، ٣ )


١ـ عەتا قەرەداخی ـ ستراتیژو کەسێتی نەتەوەیی کورد ـ سلێمانی ١٩٩٩ ــ و، گەڕان بەدوای ناسنامەدا ـ سلێمانی ـ ٢٠٠١و گوتارەکانی ئەدەبی کوردی ـ گۆڤاری خەرمانە ژمارە (٥) سوید ١٩٩٢، گەڕان بەدوای بووندا ــ سلێمانی ٢٠٠٣.

٢ـ الدكتور محمد عابد الجابري ـ الخطاب العربي المعاصر ــ دار الطليعة ــ بيروت ـ ١٩٨٥ ـ ص٩.

٣ـ نفس المصدر ـ ص٨.

٤ـ ساڵح قەفتان ـ مێژووی کۆنی کورد ـ بەغداد ١٩٦٩.

5- Roger Webster – Literary Theory – London 1993 – P.63.

6- Ibid. P63.

٧ـ إسماعيل پێشكچي ـ كردستان مستعمرة دولية ـ ترجمة: زهير عبدال.. دار APEC للطباعة والنشر ـ ١٩٩٨.

٨ـ الدكتور محمد عابد الجابري ـ الخطاب العربي المعاصر ـ دار الطليعة ـ بيروت ص٨.

٩ـ هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

١٠ـ نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی ـ وەرگێڕانی عەتا قەرەداخی ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٥.

١١ـ عەتا قەرەداخی ـ کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد ـ سلێمانی ٢٠٠١.

١٢ـ الدكتور محمد عابد الجابري ـ الخطاب العربي المعاصر ـ دار الطليعة ـ بيروت. ص١٣.

١٣ـ شەرەفخانی بەدلیسی ـ شەرەفنامە ـ وەرگێڕانی هەژار ـ ٢٠٠٠ ل١٥.

١٤ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢٠.

١٥ـ ساڵح قەفتان ـ مێژووی کۆنی کورد ـ بەغداد ـ ١٩٦٩ ـ ل١٨٢.

١٦ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ ـ مێژووی کوردو کوردستان ـ سلێمانی ل٢٦.

١٧ـ ساڵح قەفتان ـ مێژووی کۆنی کورد ـ ل١٩٦، هەروەها بڕوانە عەبدولڕەفیق یوسف ـ الدوله الدوستکیه.

١٨ـ جورج طرابيشي ـ المسألة القومية ـ دار الطليعة بيروت ، ص١١.

١٩ـ عەتا قەرەداخی ـ چەمکی دەوڵەتو بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگەی کوردیدا. هەولێر ٢٠٠٥.

٢٠ـ جان فرانسوا بابا ـ أوهام الهدية ـ ترجمة ـ حليم طوسون ـ دار العالم الثالث ـ الطبعة الأولى ١٩٩٨ ـ ص١٢٤.

٢١ـ نفس المصدر السابقة ـ ص٢٢٤.

٢٢ـ نفس المصدر السابقة ـ ص ١٢٥.

٢٣ـ أريك هوبسباوم ـ الأمم و النزعة القومية منذ عام ١٧٨٠ ـ ترجمة عدنان حسين ـ دار المدى ـ ١٩٩٩.

٢٤ـ ئەنتۆنی دی سمس ـ نەتەوەخوازی ـ وەرگێڕانی هوشیار سیوەیلی ـ هەولێر ـ ٢٠٠٤ ـ ل١٥.

٢٥ ـ عەتا قەرەداخی ـ چەمکی دەوڵەتو بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا ـ هەولێ{ ـ ٢٠٠٥.

26- David Sugarman – Legality, Ideology and state, London, 1983-P.99.

٢٧– هيغل ـ مختارات ـ الجزء الثاني ـ ترجمة: ألياس مرقص ـ دار الطليعة ـ بيروت ـ الطبعة الأولى ١٩٧٨.

لــه ســەدەی نــۆزدەدا بــەگوێرەی ڕۆژئــاوا، ئاخــاوتن لەســەر مەســەلەی ناسیونالیزم‌و گوتاری نەتەوەیی، ئاخاوتنێکی دەوڵەمەندە چونکە ناسیونالیزم لەو قۆناغەدا گەیشتۆتە ئاستێکی تەواو پەرەسەندو مەسەلەی دەوڵەتی نەتەوە بەگشتی بواری کۆمەلایەتی‌و سیاسی گرتۆتەوە، پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کــە ناســیونالیزم بەرهــەمی مۆدێرنێتەیــە[1] لــە ســەدەی نــۆزدەی ڕۆژئــاوادا مەسەلەی مۆدێرنێتە بوو بووە دیاردەیەکی دیار کە هەموو پانتاییــەکانی ژیــانی ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌و فەرهــەنگی ڕۆژئــاوای گرتبــوورەوە بــەو پێیــەش مەسەلەی ناسیونالیزم‌و دەوڵەتی نەتەوە بووەتە دیاردەیەکی دیاری لەبەرچاو. دیارە سەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ چارەکی دوایــی ســەدەی هەژدەیــەم.. ساتەوەختی لــەدایکبووی بیرۆکــەی سیاســی نەتــەوەو ساڵی لــەدایکبوونی ئــەم هوشــارییە نوێیــە (١٧٨٩)یــە کــە ســاڵی بــەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسایە(٢) دیارە لە ڕوانینی مارکسیزمەوە شۆڕشــی فەرەنــسا لــە ئــەنجامی دروســتبوونی چــینی بــۆرژوای پیــشەسازیدا ڕوویــدا بەرامبــەر بــە دەســەلاتی فیودیــالی‌و چــینی ئەرســتۆکرات کــە دروشمــەکانی شۆڕشــەکەش دروشمی جەماوەری هاوچەرخ بوون، بێگومان چ لە ڕوانینی مارکسیزمەوە چ لە ڕوانینــی کۆمەڵناســە جۆراوجۆرەکانــەوە مۆدێرنێتــە، یــان پەرەســەندنی پیشەسازی‌و تــەکنۆلۆژیاو لەگەڵیشیدا گواستنەوەی کۆمــەڵگا لــە قۆنــاغێکی دواکــەوتووە بــۆ قۆنــاغێکی پەرەســەندوترو لەگەڵیــدا ســەرهەڵدانی فەلــسەفەی ڕۆشــنگەری‌و ڕاشــنالیزم.. کــە مەبەست لەمانــەش بەرهــەمهێنانی کــەلتورێکی نوێیــە کــە بــە کــەلتوری ســەردەمی مۆدێرنێتــە دەناسرێت.. هــەموو لــەوەدا کودەبنــەوە کــە دەرکــەوتنی ناســیونالیزم بەرهــەمی قۆنــاغێکی دیــاریکراوی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و فەرهەنگی ئەو کۆمەڵگایەیەو ناشێت بــەبێ ئامادەبوونی زەمینەیەکی مــادی ناسیونالیزم وەکو دیاردەیــەکی کۆمەلایــەتی دەربکەوێت.

هەڵبەت ئەوە ئاشکرایە کە پێش دەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوەیی دەوڵەتی فیودیاڵی و ئاینی و خێڵایەتی هەبووە بەڵام ئەو دەوڵەتانە دەوڵەتی شمولی بوون بەو مانایەی کە چەندین پێکهاتەی ئیتنیکی و ئاینی و مەزهەبی و خێڵایەتیان لەخۆیاندا کۆکردۆتەوە بۆ نموونە دەتوانین سەیری ئیمپراتۆری عوسمانی یان سەفەوی یان عەباسی و ئەمەوی و.. بکەین، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کوردەوە هەبێت نەیتوانیووە دەوڵەتی فیودیاڵی یان ئاینی یان خێڵایەتی دروست بکات لە قۆناغی پێش دەرکەوتنی ناسیونالیزمدا، دیارە لەو قۆناغەشدا کە نەتەوەکانی تر توانیویانە دەوڵەتی نەتەوەیی دروست بکەن، کۆمەڵگای کوردی نەیتوانیووە دەوڵەتی نەتەوەیی دروست بکات. کەواتە مەسەلەی دەرکەوتنی ناسیونالیزم لە مێژووی کورددا دەکەوێتە بەردەم پرسیارەوە، کە ئەویش پرسیارە لە سروشت و ماهییەتی ئەوەی کە پێی دەڵێن ناسیونالیزمی کوردی. بە هەر حاڵ دەگەڕێینەوە بۆ ئاخاوتن کردن لەسەر گوتاری نەتەوەیی کوردی لە سەدەی نۆزدەهەمدا و پەیوەندی ئەو گوتارەش لەگەڵ ئەگەری بوون یان نەبوون، دەرکەوتن یان دەرنەکەوتنی ناسیونالیزمی کوردی لەو قۆناغەدا باس دەکەین و لە روانگەی مەسەلەی ناسیونالیزم و بیرۆکەی سیاسی نەتەوەشەوە سەیری کورد دەکەین و بۆ ئەو مەبەستەش دەبێ ئاخاوتنی بزوتنەوە دیارەکانی سەدەی نۆزدە لە کوردستاندا بکەین لەسەر ئاستی بەرنامە و شێوازی کارکردن و ئامادەبوونیان هەم لە مەسەلەی ناسیونالیزم بوون یان ئامادەبوونیان لە دەرەوەی دەرکەوتنی ناسیونالیزمدا گفتوگۆیان بکەین و هەوڵی دۆزینەوە و دیاریکردنی سروشتی گوتاری هەریەکە لەو بزوتنەوانە بدەین.

لەدوای ئاخاوتن لەسەر دامەزراوی میرنشین کە تاکو نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە وردە وردە میرنشینەکان هەرەسیان هێنا و کۆتایی بەو شێوە دەسەڵاتەی کورد هات، بەڵام لەسەرویەندی هەرەسی میرنشینەکاندا چەند راپەرینێکی کورد تاکو کۆتایی سەدەی نۆزدە دەرکەوتوون.

## ١ـ راپەڕینی بەدرخانیەکان

لەسەروەختێکدا هێشتا دەسەلاتی میرنشینی بابان بەتەواوەتی هەرەسی نەهێنابوو بەدرخان پاشای کوڕی عەبدولخان بەگ کەوتە جموجۆڵو کۆکردنەوەی هێزو راپەڕینێکی لەبەرچاوی بەدژی دەوڵەتی عوسمانی بەرپاکرد کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستانی خستە ژێر سایەی دەسەلاتی خۆیەوە. ناوچەکانی (وان، باشقەلا، سێوڕۆك، موسڵ، رەواندوز، سابلاخو وێرانشاری داگیرکردو لەملاوەچووە سەرقاچی دیاریەکر، لەساڵی ١٨٤٢دا ناوی خۆی نا "ئەمیری بۆتانو قەڵەمڕەو هەموو دانیان بە ئەمارەتەکەیدا نا، شاری جزیرەی کردە پایتەختو پارەیەکی بەناوی خۆیەوە دەرکرد کە لە دیوێکیەوە نووسرابوو "ئەمیری بۆتان بەدرخان" ئەوانەی لەسەر ئەم دەسەلاتەی بەدرخانیان نووسیوە باسی ئەوەیان کردووە کە "ئەم ئەمیرە کارخانەی چەكو باروتیشی دروستکردووە؛ بەدرخان پاشان توانی تەواو کوردەکان دەس داتە دەس یەکەوەو هەموو سەرەك هۆزو عەشیرەتەکان سوێندخواربوون کە تێکڕا خزمەتی حکومەتی ئەو بکەن"[٤].

سەرەتا پێش ئەوەی ئاخاوتن لەسەر راپەڕینی بەدرخان بکەین دەبێ بزانین بەدرخان چۆنو لەکوێوەوە ئەو هەستە یان ئەو هوشیارییەی لا دروستبوو کە بەپێی ئەو بووچانەی سەرەوە بەرنامەی راپەڕینو دروستکردنی دەسەلاتو دەرکردنی دراوو دروستکردنی کارخانەی چەكو تەقەمەنی دابنێت؟

خێزانی بەدرخانیەکان کە پەروەردەی شارە دیارەکانی تورکیاو هەندێ لە شارەکانی ئەوروپا بوون لەڕووی خوێنەوارییو بەئاگاییەوە جیاوازییان هەبووە لە خەڵکی کوردستان، ئەوان لەلایەك بارودۆخی پەرەسەندنیان لە شارە دیارەکانی تورکیادا بینیوەو لەو پێشکەوتنو بەرخوردانەش بەئاگابوون کە لە ئەوروپادا روویدەدا، هەروەك تورکیاش لەبەر هاوسنووری لەگەڵ ئەوروپادا لە

کاریگەری ئەو گۆڕانکارییانە بەدوور نەبووە. سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لە ئەوروپاو دروستبوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکان‌و دەرکەوتنی سیمای نەتەوەو ناسیونالیزمیش لە تورکیادا کاریگەری تەواوی لەسەر بەدرخانیەکان هەبووە. دەشێ تاکی هوشار لە کۆمەڵگادا تاکێکی ناسیونالیست بێت بەبێ ئەوە لە بنەڕەتدا بزوتنەوەی ناسیونالیزمی یان تەنانەت ناسیونالیزم بوونی هەبێت، تا ئەو ئەندازەی کە دەشێت تاکی هوشیاری ناسیونالیست هەبێت بەبێ ئەوەی نەتەوە بە چەمکی نوێ بوونی هەبێت.

میر بەدرخان ئەو تاکە کەسەیە کە هوشیارییەکی نەتەوەیی هەبووە بەبێ ئەوەی ناسیونالیزمی کوردی بوونی هەبووبێت، دەشێ نەک بۆ ئەو سەردەمە بەڵکو بۆ ئێستاش هەروەها سەیری کۆمەڵگای کوردی بکەین کە ناسیونالیست وەکو تاکە کەس‌و وەکو گروپیش بوونی هەیە بەڵام ناسیونالیزم وەکو بزووتنەوەیەکی سیاسی کەلتوری کۆمەڵایەتی بوونی نییە. چونکە بەلایەنی کەمەوە بزووتنەوەی ناسیونالیزمی لە پلەی یەکەمدا کۆبوونەوەو یەکگرتن‌و یەکێتیی Integration لەنێوان تاکو پێکهاتە بچووکەکانی کۆمەڵدا بەرهەم دێنێ‌و لەو ئاستەشدا مەسەلەی جیاواز بوون‌و خۆجیاکردنەوە لەوانی دی دێتە ئاراوە. دیارە بۆ سەردەمی بزوتنەوەکەی بەدرخان نە بزووتنەوەیەکی سیاسی ئەوتۆش بوونی هەبووە هەتا کەسێتی کوردی تیایدا لە کەسێتی ئەوانی دی جیا بکرێتەوە، نە هیچ بنەمایەکی پرۆژەی رێنسانسی نەتەوەی بوونی هەبووە، چونکە بەلایەنی کەمەوە سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لەگەڵ خۆیدا پرۆژەی نەتەوەیی بوون لەسەر ئاستی کەلتووری سیاسەت‌و کۆمەڵایەتی بوون دەهێنێت، بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە لەسەردەمی بەدرخاندا جگە لە بوونی تاکە کەسێکی هوشیار بە کاریگەری واقیعی دەرەوەی زەمینەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و مێژوویی خۆی هیچ کام لە بنەماکانی بزوتنەوەیەکی ناسیونالیزمی لەئارادا نەبووە. دیارە دەوری تاکەکەسیش لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیدا ئەو بایەخەی نابێت.. زەحمەتە بتوانرێت گۆڕانە کۆمەڵایەتییە ـــ سیاسیە

گەورەکان بە پەنابردنە بەر هەڵسوکەوتی تاك یان خزمایەتی لێکبدرێنەوە[٥].
تاکو ئێستا بزوتنەوەکەی بەدرخان وەکو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی جەماوەری کوردی سەیر ناکرێت، ئەویش لە سادەترین لێکدانەوەدا ئەگەر لەسەردەمی بەدرخاندا ناسیونالیزمی کوردی وەکو بزوتنەوەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتی دەربکەوتایەو بنەمای یەکبوونی برەخساندایەو بەو پێیەش پرۆژەی ناسیونالیزمی پێ بوایە کە پرۆژەی ناسیونالیوم بریتییە لە دەوڵەتی نەتەوە ئەوا ئەو بزوتنەوەیە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەبوو نە بەناوی تاکە کەسێکەوە دەبوو، نە لە سنووری ناوچەیەکی دیاری جوگرافیشەوە دەمایەوە. بەواتا ئەگەر لە سەردەمی بەدرخاندا، ناسیونالیزمی کوردی لە ئاستی بزووتنەوەدا بوایە ئەوا دەبوو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەناوی کوردەوەو لە هەموو کوردستانداو لە یەکبوونی کورددا خۆی ببینایەتەوەو مەرجیش نەبوو ئەو بزوتنەوەیە بزووتنەوەیەکی چەکدار بوایە لە قۆناغی یەکەمدا. دیارە ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر نەبوونی پرۆژەی ناسیونالیزمو بوونی تاکی هوشیاری ناسیونالیست لەو قۆناغەدا، هەمیشە تاکی ناسیونالیستی هوشیار لەسەردەمی بەدرخانەوە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت دامەزرێنەرو جوڵێنەرو رابەری بزوتنەوەو راپەرینەکانی کورد بووەو هەرگیز دەرکەوتنی ناسیونالیزم وەکو دیاردەو بزوتنەوەیەکی سیاسی بەرهەمهێنی ئەو بزوتنەوانە نەبووە، لەلایەکی تریشەوە سیاسەتی تاجۆرو نادروستو سەرکوتکەرانی دوو ئیمپراتۆری عوسمانی فارسی تاکو دوای جەنگی یەکەمی جیهانیو دەوڵەتانی عەرەبو تورکو فارسیش لەدوای ئەو جەنگەوە تاکو ئێستا هۆکارێکی یاریدەدەرو لەبار بووە بۆ ئەوەی تاکە کەسی ناسیونالیستی هوشیار بتوانێت بزوتنەوەی چەکداری دروست بکاتو خۆیشی دەوری رابەرو سەرکردە ببینێت. بە مانایەکی تر بزوتنەوەکان لە ئاستی جەماوەریدا جۆرێك لەکاردانەوە بوون بەرامبەر بەو سیاسەتە ناجۆرانەی دەوڵەتانی باڵادەست دژی کورد پیادەیان کردووە. سەفیری بەریتانیا لە ئەرزەرۆم لە شوباتیساڵی

١٨٤٦ بۆ سەفیری بەریتانیای لە ئەستەمبوڵ نووسیوە لەبارەی بێ ئاگایی ئەسعەد پاشاوە لە مەسەلەی سەربازیو رابەرایەتی کردنو بەڕێوەبردنی سوپاوەو هەروەها لەبارەی لاوازیو خراپی بەڕێوەبردنییەوە کە وای باسکردووە دەشێ ئەوە ببێتە هۆی یاخی بوونو دەوڵەتیش بە ئاسانی بەرگری بۆ نەکرێتو نرخێکی زۆر بکەوێت لەسەر دەوڵەت ئەوەتا لەو راپۆرتەدا دەڵێت: لە ئەرمینیاو کوردستانو ئەنەدۆڵ عەشایەرو خێڵەکانو ئەوانی تریش لە حکومەت بێزارنو ئامادەن ئەو بێزارییە لەهێزەوە بگۆرن بۆ کردار[٦].

ئەم بۆچوونەی سەرەوە زیاتر سیمای راپەرینێکەی بەدرخان ئاشکرا دەکاتو هۆکاری سەرەکی ئەو بزوتنەوەیە وەکو کاردانەوەیەك دەردەخات کە بەدرخان وەکو تاکێکی هۆشیار کە دەشێ بە تاکێکی ناسیونالیستی ناوی ببەین توانیوویەتی ئەو بێزارییەی خەڵكو سیاسەتی خراپی عوسمانییەکان بقۆزێتەوە بۆ بەرپاکردنی راپەرینەکەی. دیارە گومان لەوە ناکرێت کە بەدرخان بە کاریگەری بەئاگایی لە ئەورووپاو مەسەلەی ناسیونالیزم ویستویەتی دەوری رابەری بزوتنەوەیەکی ناسیونالیزمی ببنێت بۆیە هەوڵیداوە خێڵو عەشیرەتەکانی کورد لەگەڵیدابنو فراوانترین روبەری کوردستانیش نەك هەر کوردستانی ژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانی بەڵکو کوردستانی ژێرسایەی فارسیش بخاتە ژێر سایەی دەسەڵاتی خۆیەوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە لە بزوتنەوەی بەدرخاندا بزوتنەوەیەکی ناسیونالیزمی کوردی ئامادەبوونی نەبووە کە پرۆسەی یەکبوون لە کوردستاندا بەرهەم بهێنێتو بزوتنەوەیەکی سیاسی جەماوەری پرۆژەدار بەرەو جیاکردنەوەی کورد لەوانی ترو بەرەو سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بخاتەرێ. میربەدرخان خۆی وەکو ناسیونالیستێك ئەرکی بزوتنەوەیەکی ناسیونالیزمی لە ئەستۆ گرتبوو، لەبری ئەوەی ناسیونالیزم وەکو بزوتنەوەیەکی جەماوەری هەموو پێکهاتەو یەکەکانی کۆمەڵ هەڵبوەشێنێتەوەو لەناو یەکەیەکی گەورەتردا بیتوێنێتەوە کە نەتەوەیەو بەوەی پرۆسەی یەکگرتن بەئەنجام بێت، خۆی وەکو تاکە کەس

هەوڵیدەدا سەرخێڵو سەرۆك عەشیرەتەكان رازی بكات لەگەڵیدا بن.. میر بەدرخان كوردەكانی هەموو هێنایە ژێر ئالآیەكی كوردییەوە بە هەموو گەورەو سەرەك عەشیرەتەكانی كورد سوێن خواریوون بۆی كە تێكرا خزمەتی حكومەتی كوردیو دامەزراندنو قایمكردنی حكومەتی كوردی بكەن[٧]. بەلآم ناتوانرێت باسی ئامادەبوونی گوتاری ناسیونالیزم لە راپەرینەكەی بەدرخاندا بكرێت.

# سەرچاوەکانی بەشی ( چوار )

١. ئەنتۆنی دی سمس ـ نەتەوەخوازی ـ وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە هوشیار سیوەیلی ـ هەولێر ـ ساڵی ٢٠٠٠، ل٦٢.

٢. رەهەندەکانی ناسیونالیزم ـ وەرگێڕانی ئارام جەمال ـ سلێمانی ساڵی ٢٠٠٤، ل٧٧.

٣. عەلائەدین سەدجادی ـ مێژووی راپەڕینی کورد ـ ئینتشاراتی محەمەدی ساڵی ١٩٩٦، ل٣٠.

٤. شوکرولای بابان ـ مێژووی کوردو کوردستان ـ سلێمانی ساڵی ٢٠٠٤، ل٢١١.

٥. ئەنتۆنی دی سمس ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٨.

٦. مالمیسانژ ـ بدرخانیو جزیرة بوتان ـ ترجمة ـ سکور مصطفی ـ أربیل ـ ١٩٩٨، ٢٦٠.

٧. عەلائەدین سەجادی ـ مێژووی راپەڕینی کورد، ل٣٠.

لێرەدا باسی ئەو قۆناغەی میرنشینی بابان دەکەین کە پایتەختی میرنشین لە قەڵاچوالانەوە گواسترایەوە بۆ سلێمانی واتە لەساڵی (١٧٨٤ بۆ ١٥٨١) واتە تاکو ساتەوەختی روخاندنی میرنشین. وەکو پێشتر باسمان کرد لە ناوەندی رۆشنبیری سیاسی و مێژوویی کوردیدا میرنشینی بابان وەکو دامەزراوەیەکی نەتەوەیی کوردی سەیر دەکرێت و هەندێ جار لە ریزی دامەزراوی دەوڵەتانی ناوچەکەدا ناو دەبرێت، کە لەو سەردەمەدا دەسەڵاتی دیاری ناوچەکە ئیمپراتۆری عوسمانی و ئیمپراتۆری فارسی بوون، کە هەریەکە لەو دوو دەوڵەتە بریتی بوون لە ئیمپراتۆرێتێکی ئایینی کە فەرمانڕەوایەتی چەندین نەتەوەو ئیتنیکی جۆراوجۆریان کردووە. بەڵام بەگوێرەی میرنشینی بابان، لە راستیدا دەتوانین بڵێین دامەزراوێکی خێڵایەتی سنوور دیاریکراو بووەو ئەو دامەزراوەش بەرهەمی پەرەسەندنی ناسروشتی کۆمەڵگای کوردی بووە، هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کردووە کە دامەزراوی میرنشین بەرهەمی پەرەسەندنی ناسروشتی کۆمەڵگا نائاساییەکانە لەکاتێکدا کە کۆمەڵگا ئاساییەکان لە پەرەسەندنی سروشتی خۆیاندا دەوڵەتیان بەرهەمهێناوە، کۆمەڵگای کوردی لە پەرەسەندنی خۆیدا لەبری دەوڵەت، میرنشینی بەرهەم هێناوە[1]، دیارە بەبەراورد لەگەڵ دەوڵەتدا دامەزراوی میرنشین، دامەزراوێکی سەرەتاییە. بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین دامەزراوی میرنشین ئاستێکی بالاتری دەسەڵاتی خێڵە، بەڵام ئەو دەسەڵاتە بەجۆرێك پەرەی نەسەندووە کە بتوانێت خۆی بگۆڕێت بۆ دەوڵەتی خێڵ، کە مەبەست لە دەوڵەتی خێڵ دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵایەتیە لەنێوان خێڵەکانی نەتەوە یان ئیتنیکێکدا بۆ دروستکردنی یەك دەسەڵاتی خێڵایەتی نەتەوەیی، کە سیستەمی ئابوری فیودیالی سیستەمی ئابوری و پەیوەندییەکانی کارو بەرهەمهێنان بێت تیایدا، بێگومان ئەم سیستەمە لە کوردستاندا دروست نەبووەو تەنانەت ناتوانرێت بە بەڵگە ئەوە بسەلمێنرێت کە کوردستان سیستەمی ئابوری فیودیالی بەشێوەیەکی سروشتی و وەکو سیستەمێکی خاوەن ناسنامە بەخۆوە بینێبێت.

بێگومـان گوتـاری بـاو لـە هـەر کۆمەڵگایـەدا پەیوەستی بـاری کۆمەڵایـەتیو ئـابوریو ئایینیوسیاسـیو ئـەخلاقی کۆمـەڵگا خـۆی بـووە، گوتـار وەکـو رەگەزێکی سەرخانی کۆمەڵایەتی دەربڕینی رەگـەزەکانی نێوخـودی کۆمـەڵگاو هەڵگری مانـاو دەلالاتو مەعریفـەی بـاوی کۆمـەڵ بـووە، لەکاتێکدا سـەرخانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی سەرخانێکی خێڵایەتی ئـایینی بـووە، بـەو پێیـە گوتاری باڵادەستی کوردیش لە قۆناغی دەسـەڵاتی میرنشینی بابانـدا گوتـاری خێڵایەتی بووە، گوتارێك کە بارگاوی کراوە بە روانینو بۆچـوونو لێکدانـەوەی خێڵایەتی بۆ ژیانی کۆمەڵگا، بۆ بەڕێوەبردنو سیاسـەتو دەسـەڵات، بـۆ دابـو نەریتو ئەخلاق، کە ئەویش گوتـارێکی داخـراوی تـاك رەهەنـدی یـەك ئاڕاسـتە بوو، یەك ئاڕاستە بەو مانایەی کە جێگـای بیرکردنـەوەی جیـاواز یـان روانینـی جیاوازی تێدا نەبۆتەوە ئەمەش بەڵگەی ئاشـکرای داخرانـی کـەلتوری کوردییـە کە کەلتورێکە تەنیا بەیەك ئاڕاستە دەجووڵێتو رەوایەتیش بەیەك ئاڕاسـتە لـە روانینو لێکدانەوەو راڤەکردنو بڕیاردان دەدات کە ئـەم جـۆرە کـەلتورەش دوو سەرچـاوەی سـەرەکی هەیـە کـە یەکـەمیان سەرچـاوەی ئـایینو ئەویتریـشیان سەرچاوەی کەلتووری خێڵایەتیە، دیارە مەبەست لـە ئـایینیش تـەنیا پـەیامی ئاسمـانی نییـە، بـەڵکو مەبەسـت هـەر ئایدیۆلۆژیایەکیـشە کـە خاسـیەتی بەئایینبوونی وەرگرتووە.

لەسەردەمی میرنشینی باباندا گوتاری باڵادەستی کوردی گوتارێکی خێڵایەتی ناوچەگەری ئـایینی بـووە، لـەپاڵ ئـەوەدا ئامـادەبوونی گوتـاری تەسـەوف لـە سنووری میرنشینی باباندا شتێکی لەبەرچاو بووە، کە لـەو سـەروەختەدا واتـە لەسەردەمی دەسەڵاتی باباندا هەردوو رێبازی تەسـەوفی قـادریو نەقـشەبەندی بەشێوەیەکی بەربڵاو کوردستانیان گرتۆتەوە، سەربارەی ئـەوەی کـە ئـەم دوو رێبـازە سەرچـاوەکانیان قورئـانو فـەرموودەی پێغەمبـەرە، بـەڵام وەکـو دوو گوتـاری جیـاواز دەردەکـەون بەتایبـەتی لـە ئاستی رووکەشـدا، دیـارە ئـەوە ئاشکرایە کە تەسەوف دەکەوێتە ئەو رووبەرەی ئایینەوە کـە دەشـێ ریفۆرمی

تێدا بکرێتو بوارێکی فراوانە بۆ بەدەستهێنانی توانای بیرکردنەوە یان لێکدانەوە یان تێرامان، ئەمە سەرباری ئەوەی کە تەسەوف بەگشتی جۆرێکە لە ئۆپۆزسیۆن بوون، بەلام ئۆپۆزسیۆنبوونێکی نێگەتیف، ئێستا پرسیار ئەوەیە ئایا گوتاری تەسەوف لەسەر وەختی دەسەلاتی باباندا لە چ ئاستێکدا بووەو سیماو خاسێتەکانی چی بوون؟ هەروەها پەیوەندی گوتاری تەسەوفی سەردەمی بابان لەگەڵ گوتاری خێڵایەتی داخراوی کوردیدا چۆن بووەو لە چ ئاستێکدا بووە؟ ئایا هیچ کام لەو دوو گوتارە بارگاوی کراون بەفیکرو مەعریفە؟ ئایا هیچ کام لەو دوو گوتارە هەلگری ماکی رێنساس و رابوونەوە بوون یان فەزای گۆشەگیریو مانەوە لە پەراوێزیاندا هەلگرتووە؟ ئایا گوتاری ئەم دوو رێبازە بە ئاراستەی کرانەوەو ریفۆرمی ئایینی بوون یان بنەمای پرۆژەی گۆشەگیرکردنی سۆفیانەو سیحری دەروێشانە بوون کە ئەم دوو حاڵەتەش کارکردنن لە دەرەوەی پرۆژەی عەقڵو کارکردنی جدین لەچوارچێوەی وەهمو خەیاڵی دوور لە کارداو بەرهەمهێنانی جۆرێك لە ئینتیمان بۆ کەسێتی شێخو خەلیفەو وازهێنان و دەست شۆردنن لە ئەم دنیای ئامادە بە ئومێدی ئەو دنیای تاکو ئێستا نەهاتووە. بێگومان لەکاتێکدا کە گۆتاری دەسەلاتی بابان گوتارێکی خێڵایەتی ناوچەگەری سنوور داخراوی پشت بەستوو بە خوێنو دەماری خێڵایەتی بووە، لە هەمان کاتدا گوتاری تەسەوفیش لەو سەردەمەدا گوتارێکی داخراوی تاك رەهەندی توندوتیژی دەروێشانە بووە لای رێبازی قادریو گوتارێکی گۆشەگیرانەی هێمنی دەست لەدنیا شۆردوی بەچاوی قوربانی سەیری خۆکردوو بووە لای رێبازی نەقشەبەندی. ئەم سێ ئاراستەش نەیانتوانیووە یەك بگرنەوە، راستە نزیکییەکی تەواو لەنێوان گوتاری دەسەلاتی بابانو گوتاری رێبازی قادریدا هەبووە، بەلام ئەم دوو رەگەزەی گوتاری کوردی ئەو قۆناغە نەیانتوانی نەك لەگەڵ گوتاری رێبازی نەقشەبەندیدا یەکبگرنەوە، بەلکو لەوپەڕی ناکۆکیو ئاڵۆزیشدا بوون، هۆکەشی ئەوەیە تاکو ئەوکاتە رەگەزی یەکبوون کە نەك هەر

بنەمای بەنەتەوەبوونە بەڵکو رەگەزی کۆمەڵایەتی بوونیشە لە کۆمەڵگای کوردیدا لە ئاستی نەبووندا بووە، دیسان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەرچۆن گوتاری خێڵایەتی کوردی گوتارێکی پەرتبووی ناوچەگەری بووە، بە هەمان شێوە گوتاری تەسەوفیش لە کوردستاندا هەڵگری بنەماکانی ریفۆرمی ئایینی نەبووە، بەڵکو بە هەمان رەگەزەکانی خۆیەرەها زانینو خۆ لەسەروی هەموو ئەوانی ترەوە دانان بارگاوی کراوەو تووندرتیژی ئایینیو تووندوتیژی خێڵایەتی کوردیش دەسەڵاتی بەسەردا کردووە.

دیارە کاتێ باسی گوتاری تەسەوف دەکەین لە کوردستاندا، دەبێ چاوەروانی بوونی سیستەمێکی فیکریو مەعریفی بکەینو بۆ ئەو مەبەستەش دەبێ بەرهەمی فیکری ئامادەبوونی هەبێتو دیارە فیکریش دەبێ لەرێگای دەقەوە بگاتە ئێمە، بەڵام ئەو دەقانەی لەبارەی تەسەوفەوە لە کوردستاندا گەیشتوونەتە ئێمە هەمان خاسێتو روانینو بەرنامەکانی تەسەوفیان لە مێژووی تەسەوفی ئیسلامیدا لەخۆگرتووەو تایبەتمەندی کوردییان نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە لەسەر جوگرافیای کوردستانو لەلایەن رابەرانی بە رەگەز کوردەوە لە مێژووی باباندا برەویان پێدراوەو نوێ کراونەتەوە. ئەگەر گوتار گوتەی نووسەر بێت، ئەوە ئەو گوتەیە پێکهاتەیەکە لە فکر[٢]. بەڵام گوتاری تەسەوفی ئامادە لە کوردستاندا لەچوارچێوەی دەقی داهێنراوی کوردیدا بوونی نییە، بەڵکو وەرگیراوە لە دەقی دەرەوەی واقیعی کوردییەوە، بە واتا سەرچاوەی گوتاری تەسەوف لە کوردستاندا سەرچاوەی کوردی نییە، بەڵکو وەرگیراوە لە سەرچاوە گشتییەکانی تەسەوفی ئیسلامییەوە، ئەمەش ناوهێنانی تەسەوفی کوردیو گوتاری تەسەوفی کوردی دەخاتە بەردەم پرسیارو گومانەوە، پرسیار لە شوناسو گومان لە رەسەنایەتی ئەو شوناسە چونکە ئەوە ئاشکرایە ئێمە لەبەردەم پرسیارێکی گرنگی چارەنووس سازداین سەبارەت بە بنەماکانی گوتار، ئەویش ئەوەیە ئایا دەشێ تەسەوری بوونی گوتارێکی خاوەن شوناس بکەین بەبێ بوونی فیکر، بەبێ بوونی روانینو

جیهانبینی، بەبێ بوونی مەعریفەیەك كە ناسنامەی نەتەوەییان هەبێت، بە واتایەكی دی ئایا دەشێت بێ بوونی فیكرێك بەناوی فیكری كوردی، گوتاری كوردی بوونی هەبێت؟ دیارە لەملاو ئەولا هەندێ جار باسی فیكری كوردیو فەلسەفەی كوردیو بیریاری كوردیو فەیلەسوفی كوردی كراوەو دەكرێت لە نێوەندی رۆشنبیری كوردیدا[٣] بەلام ئەمە لەكاتێكدا دەكرێت كە پێناسەی فیكرو پێناسەی فەلسەفەو پێناسەی بیریارو فەیلەسوف غائیبە یان هەر لە بنەڕەتدا پێناسەمان نییە بۆیان، چونكە ئەگەر پێناسەمان بۆ هەریەكە لەو ناوانە هەبوایە، دەمانزانی شتێك نییە بەناوی بیری كوردیو فەلسەفەی كوردی. ئەم سەردەرنەكردنو بێ ئاگاییە لە نێوەندی رۆشنبیری ئێمەدا زۆر هەڵەی فرێداوەتە نێو پانتایی رۆشنبیریمانو جۆرێك لە ونبوونی دروستكردووەو زۆر شتی لە نەبوون راستكردۆتەوە كە لە بنەڕەتدا بوونیان نییەو بوونیشیان لەسەر بنیاد نانرێتو ئێستاش خراونەتە ئاستی شتە پیرۆزەكان بە واتا خراونەتە دەرەوەی بواری ئاخاوتن لەسەركردن، ئەمەش لەخۆیدا كوشتنی توانای عەقڵی ئێمەیە بۆ خوێندنەوەی رابردووی خۆمان.

گوتاری خێڵایەتیو تەسەوفی كوردی بەبێ لێدوانو قسە لەسەر كردن خاسیێتی پیرۆزی پێبەخشراوەو گەیەندراوەتە ئاستێك كە بۆ لێدوان نەشێت، ئەمەش لاوازی ئاستی عەقڵی مرۆڤی كورد نیشان دەدات بۆ خەریك بوون بەخۆیەوە، بۆ خەریك بوون بە لێكدانەوەی رابردوو، ئێستای خۆیەوە. بێگومان ئەمەش خاسیێتی ئەو كەلتورانەیە كە تواناو جورئەتی خۆخوێندنەوەیان تێدا دروست نەبووەو بكەرێكیان بەرهەم نەهێناوە بتوانێت جەستەی پڕ لە شەكەتو بارگاوی كراو بە شكستو لاوازیو گرێی هەست بە كەمی كردن بهێنێتە بەردەم دادگایی كردنو بیدوێنێت. هەر بەو پێیە گوتاری كوردی لە رابردوودا بەگشتیو گوتاری خێڵایەتی تەسەوفی كوردی بەتایبەتی نەخراوەتە بەردەم لێدوانەوە، بەڵكو لە دەرەوەیداو بەشێوەیەكی رووكەشانە خاسیێتی

پیرۆزی پێبەخشراوە، بێگومان هەر شتێکیش خاسێتی پیرۆزی بێبەخشرا مانای وایە دەخرێتە دەرەوەی سنووری لێدوانەوە.

تاکو ئێستا پرسیار لە گوتاری میرنشینی بابان پرسیارێکی سادەیە یان بەراگوزاری کراوە(٤) هەر بەو پێیە ئاخاوتنی سیۆسیۆلۆژی لەبارەی ئەو میرنشینەوە بەجۆرێکی ئەوتۆ نەبووە کە ناسنامەی ئەو میرنشینەو گوتاری ئەو میرنشینە دیاری بکات، دیارە کاتێ ئاخاوتنی هەر کام لە میرنشینەکانی تری کورد دەکەین خاڵێکی هاوبەش دەدۆزینەوە کە بە گشتی میرنشینەکانی کورد دەسەڵاتی پەرسەندوی خێڵایەتی کوردین بەڵام ئەو دەسەڵاتانە هیچیان لە سنووری هەرێمایەتی خێڵایەتی و ئیدارەی خێڵایەتی‌و پەیوەندی کۆمەڵایەتی خێڵایەتی دەرنەچوون بەڵکو دامەزراوی خێڵایەتی ناسروشتی کۆمەڵگای کوردی بوون، هەر بەو پێیەش گوتاری میرنشین‌و گوتاری خێڵایەتی کوردی هەمان گوتارەو هەمان گەوهەرو ماهییەتیان هەیە کە گوتارێکی داخراوەو لەسەر بنەمای خوێن‌و دەمارگیری‌و نەسەب‌و ناوچەگەرێتی‌و بەرژەوەندی باڵای خێڵ دروستبووە.

هاوشێوەی ئەم سروشتەی گوتاری خێڵایەتی، گوتاری تەسەوفیش لە کوردستاندا سەرباری سەرچاوەکانی کە قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەرە خاسێتی خێڵایەتی وەرگرتووە، تەریقەتی قادری تەریقەتی شێخەکانە لە کوردستاندا واتە ئەو عەشیرەت‌و بنەماڵانەی کە خاوەنی درەختی بنەماڵەن‌و خۆیان دەبەنەوە سەر پێغەمبەرو کەس‌و کاری‌و بەو پێیەش لەڕووی رەگەزەوە کورد بوونی خۆیان دەخەنە بەردەم پرسیارەوە، ئەگەرچی لەڕووی راستییەوە ئەو خۆبەستنەوەیە جگە لە جۆرێك لە دروستکردنی مەرجەع هیچی تر نییە هەڵبەت ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو شێخ‌و سەیدەکانی کوردستان قادرین

تەریقەتی نەقشەبەندی لە کوردستاندا زیاتر تەریقەتی خێڵ‌و بنەماڵە، پێکهاتە ناسەیدەکانە، تازەکەرەوەی ئەم تەریقەتە مەولانا خالیدی جاف

مکاڵیـــە، زۆرێـــك لـــە خەلیفەکانیـــشی پەیوەســـتبوونیان بـــە تەریقـــەتی نەقشبەندییەوە ناسنامەی شێخ یان سەیدی بۆ دروستکردون، سەرباری بوونی جیاوازی لە گوتاری ئەم دوو رێبازەدا بەڵام بەپێی گوتاری خێڵو عەشیرەتی کوردی دابەش بوونو هەرچۆن گوتاری خێڵایەتی کوردی نەبۆتە بنەمای یەکگرتنەوە بە هەمان شێوە گوتاری تەسەوفیش بەرجەستەی هەمان حاڵەتی دابەشبوونی کردووە.

کەواتە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بڵێین خێڵایەتی کوردی کەسێتییەکی گۆشەگیری دابڕاوی دواکەوتووی بێ ئاگای قایل بەوەی کە هەیەتیو خۆژێن لەسەر بنەمای ئابوری بەشی خۆکردنی بەرهەم هێناوە، کەسێتییەك کە بە توونـدی پەیوەسـتبووە بـە خـوێنو دەمـارو پەیوەنـدی خزمایـەتیو ناوچەگەرێتییەوە، کەسێتییەکە هەموو پەیوەندیو چالاکییە کۆمەڵایەتیەکانی لە سنووری بنەماڵەو تیرەو خێڵو عەشیرەتو ناوچەکەی خۆیدا بووە، هەموو ئەم بنەمایانەش پێکەوە کەلتورێکیان بەرهەم هێناوە کە یەك روانینو یەك عەقڵو یەك لێکدانەوەی بۆ بوونو ژیان هەبووە کە ئەویش بە پیرۆز دانانو سەیرکردنی خوێنو نەسەبی خۆو بە سووك سەیرکردنی ئەوانی ترە.

لەپاڵ ئەوەدا تەسەوفی کوردیش فەزای گۆشەگیریو داخرانو خۆ خەریك کردن بە تەقسی دەروێشیو فەزای سۆفیانەوە برەوپێداون بە چاوی پیرۆز سـەیری خـۆی کـردووەو ئـەوی تـری بـە لادەرو رێ ونکـەرو بیدعەچـی سەیرکردووە. ئەمەش هاوشانی نێوان گوتاری خێڵایەتیو گوتاری تەسەوف لە مێژووی کورددا نیشان دەدات کە مێژووی ئامادەبوونی ئەم دوو گوتارەش پێکەوە لە سنووری میرنشینی باباندا بووە، دیارە هیچ کام لەو دوو رێبازەو هیچ کام لە دەسەڵاتەکانی خێڵایەتیو میرنشینی کوردیش خاوەنی گوتارێکی بارگاوی کراو بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی نەبووە لە چوارچێوەی دەقی نووسراودا واتە لەرووی بەرجەستەکردنەوە لەرێگای زمانەوە. نەبوونی دەنگ یان دروست نەبوونی دەنگ لەو مێژووەدا کە ئێمە باسی لێوە دەکەین زیاتر

نائامـادەبوونی دامـەزراوی خێڵایـەتیو تەنانـەت تەسـەوفی کـوردیش نیـشان دەداتو بەو پێیەش هەریەکە لـەم دوو دامـەزراوە وڵتـە دامـەزراوی میرنـشینی خێڵایەتیو دامەزراوی رێبازی تەسەوف لەسەر ئاستی ناوخۆ دەمێننەوە.

دیاره ئەوە ئاشکرایە کە نووسین بە کوردی زۆر پێش دروستبوونی دەسەڵاتی بابان دەرکەوتووە، ئەگەر کەمێك بگەڕێینەوە بۆ دواوە ئەوا نووسین بە زاری گۆرانی مێژوویەکی کۆنتری هەیەو هەرچەندە پێشتر نووسینی شیعر بە کوردی لەلایەن بابەتایەری هەمەدانییەوە وەکو سەرەتای نووسین بە کوردی باس دەکرا، بەڵام ئێستا دەرکەوتووە کە پێش بابە تایەریش نووسینی شیعر بە زمانی کوردی هەبووە، بەولتا ئەگەر یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی گوتار زمان بێتو مەبەست لەوەش زمانی نووسین بێتو بەو پێیەش دەقی نووسراو ئامادەبوونی هەبێت، ئەگەرچی ئەو ئامادەبوونە لاوازیش بێت، بەڵام راستیەك هەیە کە دەیسەلمێنێت ئەو پایەیەی گوتاری کوردی لەو قۆناغەوە تاکو سەردەمی دەسەڵاتی شیعری سنووری بابان رەسەنایەتیەکی ئاشکرای کوردی هەبووە ئەویش لەو روانگەیەوە کە شیعری کوردی لە دەرکەوتنیەوە بە زاری گۆرانی یان هەورامی لەسەر کێشی پەنجە بووە کە ئەویش کێشی فۆلکلۆری کوردیو لە هەمان کاتدا کێشی گاتاکانی پەیامی ئایینی زەردەشتییە. ئەمە جگە لەوەی کە شیعری بە زاری گۆرانی نووسراو دەیان رەگەزو هێماو فەزاو دیمەنی زەردەشتیو کوردیو سروشتێ کوردستانی لەخۆگرتووە. کە ئەوانەش دەشێ لە شیکردنەوەدا دەلالەتی فیکریو روانینی پەیوەست بە ژیانی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگای کوردییان هەڵگرتبێتو لەو لایەنەشەوە پەیوەستبوونو رەسانەیەتی ئەو گوتارە سادەیەی کوردی لەو قۆناغەدا بسەلمێنن.

ئەم بارەی نووسن بە کێشی فۆلکلۆری کوردی تا سەرومختی دەسەڵاتی شیعری میرنشینی بابان بەردەوام بووە، بەڵام شاعیرانی بابان کە لەدوای گواستنەوەی دەسەڵاتی میرنشین لە قەڵاچوالانەوە بۆ سلێمانی دەرکەوتوون کودەتایەکی سپیان بەسەر ئەو شێوازەی نووسینی شیعری کوردیدا کردو لەبری ئەوە پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی کێشە عەرەبی و فارسیەکان بەتایبەتی کێشەکانی فەراهیدی کە ئەوەش لە ئاستی یەکەمدا روخاندنی پایەیەکی رەسانەیەتی نووسینی کوردیو پڕکردنەوەی جێگاکەیەتی بە رەگەزو

توخمی کەلتورێکی غەیرە کوردی، دیارە لێرەدا قسە لەسەر بەرزیو ئاستی داهێنانی شیعر نییە لەلای شاعیرانی بابان چونکە ئەوە شتێکە لە دەرەوەی گومان، بەلام ئاخاوتن لەسەر کوردی بوونی پایەکانی گوتاری شیعری شاعیرانی بابانە.

لەڕووی زمانی نووسینەوە بەرهەمەکانی نالیو سالمو کوردی بە شێوازی ئاخاوتنی سلێمانی ئەو سەردەمە بوون، دیارە ئەمانەش وەکو نوخبەی رۆشنبیری قۆناغەکەی خۆیان زمانەکەشیان زمانێکی بەرزتر بووە، بەتایبەتی نالی، دەتوانین بڵێین لەڕووی زاراوەو ڕێزمانیشەوە کوردییەکەیان پەسەندە سەرباری بوونی دەیان وشەی عەرەبیو فارسی، بە واتا پایەی یەکەمی گوتار کە زمانو دەقی نووسراوە لای ئەم شاعیرانە ئامادەبوونێکی تەواوی هەیە. لە هەمان کاتدا لەڕووی بارگاوی کردنی ئەو دەقانەوە بە فیکرو ڕوانینو مەعریفەو جیهانبینی دەتوانین بڵێین ناسنامەی گوتاریان بەسەردا دەسەپێنرێت، بە واتایەکی دی دەتوانین بڵێین شاعیرانی بابان گوتارێکی بەرزی شیعریان بەرهەم هێناوە کە هەڵگری ڕەهەندی جۆراوجۆری ڕوانینو لێکدانەوەی فیکریو مەعریفیو ئێستاتیکیەو تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئێمە بە چاوێکی پڕ بایەخەوە دەڕوانینە ئەو ئەزموونە شیعرییەو وەهاشی بۆ دەچین یان لێکدەدەینەوە کە ئەوە ئەزمونێکی بێ وێنەیەو دووبارەکردنەوەی کارێکی گرانو زەحمەتە یان هەر چاوەڕوان نەکراوە.

ئەوەش ئاشکرایە کە هەریەکە لە شاعیرانی بابان بەجۆرێك شیعریان بۆ میرنشینو دەسەڵاتی بابان نووسیووە. کە پەیوەستبوونی ئەو شاعیرانە بە میرنشینەوە نیشان دەدات، نالی لە چامەکەیدا کە لە شامەوە نووسیوویەتیو لەو شیعرەیدا بۆ وەسفی پاسەوانەکانی ئەحمەد پاشای نووسیووە پەیوەستبوونی تەواوەتی خۆی بە دەسەڵاتی میرنشینی بابانەوە نیشان دەدات، سالم لە قەسیدی "لێم گەڕێن و" وەلامی نامەکەی نالیدا بەتەواوەتی پەیوەستبوونی خۆی بە دەسەڵاتی میرنشینەوە نیشان دەدات، (کوردیش

پەیوەستی خاکی بابان‌و سلێمانیە. لێرەدا ئاخاوتن لەسەر دوو گوتار دێتە ئاراوە، یەکەمیان گوتاری میرنشینی بابان‌و دووەمیان گوتاری شیعری سەردەمی بابان، یەکەمیان واتە گوتاری میرنشین، پێشتر باسمان کرد کە گوتارێکی خێڵایەتی داخراوی تاك رەهەند بووە کە لەسەر بنەمای عەقڵ‌و ستراتیژی خێڵ بەرهەم هاتووەو گوتارێك بووە نەیتوانیووە جێکەوت‌و کاریگەری خۆی لە دەرەوەی سنووری میرنشین دیاری بکات، ئەمەش دەبێتە بە بەڵگە بۆ لاوازی گوتاری دەسەڵاتی بابان لەرووی گواستنەوەیەوە لە گوتاری خێڵەوە بۆ گوتاری نەتەوە.

بەگوێرەی گوتاری شیعری شاعیرانی بابان گوتارێکی مەودا قووڵی رووبەر فراوانە لەرووی بارگاوی بوونی بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینییەوە بە ئەندازەیەك کە لە ئاستێکی دیاردا سیمای گوتارێکی کەونی هەیە ئەویش لەو روانگەیەوە کە گوتارێکی هیومانیستی هەمەلایەنەیە. بەڵام لەو رووبەرەیدا کە پەیوەستە بەدەسەڵاتی میرنشینی بابانەوە، گوتارێکی مەودا تەسکی یەك رەهەندی چەقبەستووە لەسەر دەسەڵاتی میرنشین‌و کەسێتی میرەکان‌و لە باشترین حاڵەتدا جوگرافیای میرنشین کە ئەویش جوگرافیایەکی دیاریکراوەو بەشێکی بچووکە لە هەموو کوردستان، پرسیارێك لێرەدا سەرهەڵدەدات ئەویش ئەوەیە لەکاتێکدا کە گوتاری فیکری، مەعریفی، ئێستاتیکی شیعری شاعیرانی بابان دەبێتە گوتارێکی ئینسانی هەمەلایەن‌و هەموو سنوورە جوگرافی‌و ئیتنیکییەکان دەبەزێنێت‌و مرۆڤایەتی بەگشتی دەگرێتەوەو بەرجەستەی روانین‌و حەزو ئارەزوو چێژو لێکدانەوە شمولیەکانی مرۆڤ دەکات، ئایا بۆچی ئەو ئاراستەی گوتاری شیعری ئەم شاعیرانە کە پەیوەندییان بە دەسەڵاتی بابانەوە هەیە وەکو دەسەڵاتێکی کوردی لەو سەردەمەدا بۆچی ناتوانێت سنووری دەسەڵاتی میرنشین ببەزێنێت‌و ئەو جوگرافیا سنوور تەسکە بەجێبهێڵێت، بپەڕێتەوە بۆ جوگرافیای هەموو کوردستان‌و خاسێتی کوردی بوون یان نەتەوەیی بوون وەربگرێت؟ بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە

کـە هەرچـۆن گوتـاری ئیـداری‌و سیاسـی میرنـشین نـەیتوانیووە سـنووری دەسـەڵاتی میرنـشین بـەجێبهێڵێت، بـە هـەمان شـێوە گوتـاری سیاسـی یـان نەتەوەیی شیعری شـاعیرانی بابانیش پەیوەست بـووە بـە گوتـاری سیاسـی‌و ئیـداری میرنـشینەوەو لـە هـەمان سـنووری داخـراوی میرنـشیندا ماوەتـەوەو نـەیتوانیووە خاسـێتی نەتـەوەیی بـوون وەربگرێـت بـەڵکو گوتـاری شـیعری شـاعیرانی بابـان لـە ڕووی نـاوخۆوە هاوشـێوەی گوتـاری سیاسـی دەسـەڵاتی میرنـشینەو تەنانـەت گوزارشـتکردن بـووە لـە سیاسـەتی میرنـشین‌و ڕەگـەزی زمانانی ئەو ڕوویەرە شیعرییەی بەرهەمی شاعیرانی بابان کە پەیوەستبووە بە دەسـەڵاتی میرنـشینەوە بـە ڕوانـین‌و لێکدانـەوەو سـتراتیژی خێڵایـەتی‌و ناوچەگەرییانەی میرنشین بارگاوی کراوە. تەنانـەت دەشـێ وای بـۆ بچین کـە قەسیدەکەی نـالی بـۆ مەسـتوورەی ئـەردەڵانی جۆرێکـە لـە گوزارشـتکردنی سیاسەتی میرنشینی بابان بەرامبەر بە دەسـەڵاتی میرنـشینی ئـەردەڵان، واتـە ئەو دەقە شیعرییە کە سووکایەتییەکی زۆری بۆ مەستوورە تێدایە لە ئاستێکی قوڵتردا بەرجەستەی ڕوانینی دەسەڵاتی بابانە بۆ دەسـەڵاتی ئـەردەڵان کەواتـە گوتاری شیعری نالی یان بابان لەم ڕوویەرەدا بەرجەستەی سیاسـەتی میرنـشین دەکات کە ئەویش ڕوانین‌و سیاسەت‌و ستراتیژێکی خێڵایەتییە هـەر چـۆن خێـڵ بەچاوی نەیار سەیری هەموو خێڵەکانی تر دەکات، بە هەمان شێوە میرنـشینی بابان سەیری میرنشینەکانی تری کوردی کـردووە، بەتایبـەتی لـەو کاتـەدا کـە میرنشینی ئەردەڵان دەسەڵات‌و نفوزی هەبووە، دەسەڵاتی بابان وەکـو بەشـێك لە دەسەڵاتی نەتەوەیی سـەیری دەسـەڵاتی میرنـشینی ئـەردەڵانی نـەکردووە، بـەڵکو زیـاتر وەکـو نـەیارێك لێـی ڕوانیـووە، دیـاری میرنـشینی ئـەردەڵان‌و دەسـەڵاتی ئـەردەڵانیش هـەر بـە هـەمان ڕوانـین سـەیری دەسـەڵاتی بابـانی کردووەو ئەم جۆرە ڕوانینـەش خاسـێتی دیاری پەیوەندی خێڵایـەتی کـوردی بووە، هەر چـۆن خێڵـی کوردی هەمیشە لەگـەڵ یـەکتر لـە نـاکۆکی‌و ئـاژاوەدا بوون، بە هەمان شێوە گوتاری دەسەڵاتی میرنشینی کوردی گوتاری ململانـێ‌و

ناکۆکیو یەکتر قبوڵنەکردنو پێکەوە نەگونجاندن بووە، ئەمەش خاسیەتی یا سروشتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کوردییەو هەمیشە بزوێنەری یەکگرتنو یەکێتیو یەکبوونو دروستبووکردنی فیدراسیۆن لە ئاستێکی هێجگار لاوازدا بووەو بزوێنەری دابەشبوونو پەرتبوونو یەکتر رەتکردنەوەو پەشێوییو ئاژاوەو یەکتر سڕینەوە لە ئاستێکی بەرزو بەهێزدا بووە. لە گوتاری ئەدەبی شیعری سەردەمی باباندا بەتایبەتی ئەو رووبەرەی کە پەیوەستە بە دەسەڵاتی میرنشینەوە هەمان خاسیەتو ئاڕاستەی روانینی خێڵایەتی ئامادەیەو لەبری پرۆژەی ئێستاتیکای بنیادنانو ئاوەدان کردنەوەو هێمنیو ئاسایشو ژیان دۆستی، بەرجەستەی شەڕو وێرانکاریو ئاژاوەو پەشێوی مەرگ دۆستی دەکەن، بە ولتایەکی دی دەتوانین بڵێین ئەو رووبەرەی گوتاری شیعری سەردەمی بابان کە پەیوەندی بە دەسەڵاتی میرنشینی بابانەوە هەیە گوتارێکی مەرگ دۆستانەیەو رووبەری مەرگو وێرانکردنو لەنێو چوونو سەرهەڵگرتنو ئاوارەبوون بەتەواوی ئەو ئاڕاستەی داگیرکردووە. ئەم ئاڕاستەیەش لەگەڵ رۆحی تاکرەوانەو پەرتبوونو گۆشەگیری گوتاری خێڵایەتیداو لەگەڵ گوتاری گۆشەگیریو چوونە خەڵوەی رێبازێ نەقشەبەندیو گوتاری دەروێشی خۆسپاردن بە شێخو خەلیفەو گەیشتن بە پلەی حاڵ لێهاتن یەکدەگرێتەوە کە لە پشتی هەموویانەوە کەسێتێکی لاوازی نائامادە لەرووی دروستکردنی کردارەوە ئامادەیە، ئەو کەسێتەش کەسێتی کوردە لە مێژوودا، کە کەسێتییەکە هەمیشە لە پەراوێزدایەو نەیتوانیووە لەسەر بنەمای دروستکردنی روداو ئامادەبوونی خۆی بسەلمێنێتو بێتە ناو مێژووەوە.

ئێمە لەکاتێکدا باسی گوتاری ئەدەبی سەردەمی بابان دەکەین مەبەستمان لەو دەقانەیە کە لەو قۆناغە مێژووییەدا پێشکەش کراون، ئەوانیش دەقی شیعرین، دیارە.. دەق پەیامێکە لە نووسەرەوە بۆ خوێنەر ئەوەش گوتارە [٥]، بەڵام دەبێ ئەو دەقە بارگاوی بێت بە فیکر، هەڵبەت ئەوە ئاشکرایە کە شیعر لاوازترین رەگەزی نووسینە یان دەقە بۆ هەڵگرتنی فیکر چونکە پایەکانی

شیعر خەیاڵو سۆزو هەڵچوونەو رووبەری ئیشکردنی عەقڵو بەئاگاییو فیکر لە بەرهەمهێنانی ئەم رەگەزەی نووسیندا زۆر لاوازە. هەر ئەوەش وایکردووە کە گوتاری کوردی سەردەمی بابانو تەنانەت دواتریش لەڕووی فیکرو جیهانبینیو مەعریفەوە لە ئاستێکی لاوازدا بێت. ئێستا ئێمە لەبەردەم ئەو پرسیارەداین ئایا لە سەرەتای دەرکەوتنی نووسین بە کوردی تاکو هەرەسی دوامیرنشینی کوردی کە میرنشینی بابان بووە ئایا گوتاری کوردی بوونی هەبووە یان ئێمە هەوڵدەدەین لە دەهالیزە تاریکەکانی ئەو مێژووەدا لە وەهم سیمایەك بۆ ناوی گوتاری کوردی دروست بکەین، یان لە شیکردنەوەی ئەو مێژووەدا گوتاری کوردی وەکو رەگەزێکی سەربەخۆی خاوەن شوناس بناسێنین یان لە ئەنجامی فشار دروستکردنی رۆشنبیریدا لەسەر واقیعی کۆمەڵایەتی (لە ئێستادا) ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی ئەو سەردەمە بگەیەنرێتە ئاستێك.. کە ئەو واقیعە ئەم راستییەی کە لە بنەڕەتدا بوونی نەبووە واتە (گوتار) بەرهەم بهێنێت ــ کە بوونی ئەو راستیە لە عەقڵی دروستکەرانی ئەو گوتارەدا زیاترە کە هەوڵدەدەن لە هەناوی مێژووە بەرهەمی بهێنن[٦].

مەبەست لەم قسانەش ئەوەیە ئایا واقیعی کۆمەڵایەتیو مێژووی کەلتوری کوردی لە قۆناغی مێژووی زانراوییەوە تاکو هەرەس هێنانی دوامیرنشین توانای بەرهەمهێنانی گوتاری هەبووە، یان لە ئێستادا ئێمە هەوڵدەدەین لە هەناوی ئەو واقیعەوەو لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنندا گوتار بۆ ئەو قۆناغە دروست بکەین.

بێگومان وەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد لە مێژووی زانراوی کوردا هەندێك لە پایەو رەگەزەکانی گوتاری کوردی ئامادەبوونیان هەبووە، بەڵام لە هەمان کاتدا بنەمایەکی سەرەکی گوتار تاکو سەرهەڵدانی نووسین بە کوردی بوونی نەبووە کە ئەویش دەق ی نووسراوە. کاتێکیش کە نووسین بە کوردی دەردەکەوێت، کێشەیەکی تر دێتە ئاراوە کە ئەویش کێشەی فیکرە، ئایا دەقی نووسراو بە هەموو جۆرەکانیەوە دەقێکە کە هەڵگری فیکر بێت، یان دەشێ جۆرێك لە دەق هەبێت کە هەڵگری فیکر نەبێت؟ بەڵێ ئەوە ئاشکرایە کە

ژمارەیەکی زۆر دەقی مردوو لە مێژووی نووسینی کوردیدا هەیە، هەر بەو پێیەش زۆرێك لە دەقەکان هەڵگری فیکرو جیهانبینی نین، بەو پێیەش نابنە بنەمای دروستکردن یان فۆرمولەکردنی گوتار. هەڵبەت زۆرێك لە دەقە شیعرییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی بابان دەقی زیندوونو هەڵگری جۆرێك لە جیهانبینیشن بەتایبەتی جیهانبینی مەودا فراوانی پەیوەست بە مەسەلەکانی بوونو مردنو گەردوونو چێژو جوانی ئێستاتێکا. هەر ئەوەش دەبێتە چوارچێوەیەك بۆ فۆرمەلەکردنی گوتاری ئەدەبی ئەو قۆناغە، ئەمەش لەپاڵ ئەو ئاراستە لاوازەی گوتاری شیعری ئەو قۆناغەدا کە پەیوەستە بە دەسەڵاتی بابانەوە ئەویش هاوشانو هاوشێوەی گوتاری خێڵایەتی تاك رەهەندی پەرتبووی گۆشەگیری مەرگدۆستی میرنشینە.

## سەرچاوەکانی بەشی ( ٦ )

١- عەتا قەرەداغی ـ چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا ـ هەولێر ـ ٢٠٠٤ ل ٨٩ ـ ٩٣.

٢- الدكتور محمد عابد جابري ـ الخطاب العربي المعاصر ـ بيروت: دار الطليعة ـ الطبعة الثانية ١٩٨٥ص٨٠.

٣ـ الدكتور عزالدين مصطفى رسول ـ أحمدي خاني شاعراً و مفكراً و فيلسوفاً ـ بغداد ـ مطبعة الحوادث ـ ١٩٧٩.

٤ـ عەتا قەرەداغی ـ گەڕان بەدوای ناسنامەدا ـ سلێمانی ساڵی ٢٠٠١، ل٩ـ٢٩.

٥- الدكتور محمد عابد الجابري ـ الخطاب العربي المعاصر ـ ص٨.

٦- الدكتور كمال عبداللطيف و الدكتور نصر محمد عارف ـ إشكاليات الخطاب العربي المعاصر ـ دار الفكر المعاصر ـ بيروت ٢٠٠١ ص ٩٣.

تاکو ئێستا مێژوونووسان لەسەر ساڵی دامەزراندنی میرنشینی ئەردەڵان رێک نەکەوتوون، تەنانەت جیاوازی مێژووی دامەزراندنی ئەم میرنشینە لەرای مێژوونووساندا لە دوو سەدە زیاترە. محەمەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێت.. با بە ئەردەڵان لە کۆتایی سەدەی یازدەدا گەیشتۆتە شارەزوور پاشان چووە لای گۆرانەکان و ماوەیەک لەگەڵیاندا کۆچەرەویی کردووە. دوایی لەکاتی هێرشی جەنگیزخاندا بۆ سەر ئێران پشتگیری هێزەکانی مەنگۆلیای کردووەو لەپاداشتی ئەوەدا کراوە بە فەرمانڕەوای شارەزوور[1] ئەم بۆچوونەی ئەمین زەکی بەگ لەلایەن هەندێ لە مێژوونووسانی دواترەوە پشتی پێدەبەسترێت، دیارە ئەم قسەیەی ئەمین زەکی بەگ نزیکە لەوەی کە شەرەفخانی بەتلیسی دەیلێت لەبارەی دامەزراندنی میرنشینی ئەردەڵانەوە کە دەڵێت: بابە ئەردەڵان ماوەیەک لەناو خێڵی گۆراندا ژیاوەو لە کۆتایی رۆژگاری دەسەڵاتی جەنگیزخاندا ناوچەی شارەزووری گرتووەو بابەئەردەڵان لە نەوەی ئەحمەدی کوری مەروانە، یەکەمین سەرداری بنەماڵەی مەروانیان کە لە دیاربەکرو جزیرەدا دەسەڵاتدار بوون، لەبەر ئەوەی بنەماڵەی مەروانیان کە لە دیاربەکرو جزیرەدا دەسەڵاتدار بوون، لەبەر ئەوەی مامی بابە ئەردەڵان ساڵی ١٠٦١ مردووە بۆیە دامەزرێنەری بنەماڵەی ئەردەڵان دەبێ لەماوەی نێوان نیوەی دووەمی سەدەی یازدە تا نیوەی یەکەمی سەدەی دوازدەدا بووبێ[2] محەمەد شەریف قازی سەرەتای حوکمی ئەردەڵانیان بۆ دەوری دەسەڵاتدارێتی تەیموور ١٣٠٥ـ١٣٧٠ دەباتەوە، ئەمان بۆ ناوچەی بالانکان هاتن، ماوەیەک لەوێ لەناو گۆرانەکاندا مانەوە، تەیمووری گورگان شارەزووری بە بابە ئەردەڵان بەخشیو ئەم ماوەیەک تا دوایی ژیانی ئەم ناوچەیەو شارەزووری حوکم کرد[3].

بە هەرحاڵ مێژووی دەسەڵاتی ئەردەڵانیەکان لەنێوان کۆتایی سەدەی پانزەو ناوەڕاستی سەدەی چواردەدا دەست پێدەکات، واتە لە قۆناغێکی دواکەوتووی پەیوەندی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردیداو لەبارودۆخێکدا کە سیماکانی نەتەوە

له کوردستاندا تەنیا لە روانگەی زمان و نەژادەوە بوونی هەبووە. تەنانەت لەو مێژووەدا ئەگەری ئەوەش لە ئاردا نەبووە کە دەسەڵاتی خێڵایەتی کوردی سیستەمێکی یەکگرتووی بەڕێوەبردن دروست بکات و جۆرێك لە فیدراسیۆنی خێڵایەتی پێك بهێنێت و بنەمای دەوڵەتێکی خێڵایەتی دابنرێت.

ئەو رووبەرە جوگرافیاییەی کە دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵانی لەسەر دروست بووە رووبەرێکی فراوانە، سەرەتای دروستبوونی لە شارەزووری پاشانیش دەسەڵاتی پەرەی سەندووە بەڵام ئەو رووبەرە بەرەو تەسك بوونەوە چووە لەگەڵ دروستبوونی دەسەڵاتی بابان و پێشتریش هێرشی حکومەتی جلایری کە فەرمانڕەوایی عێراقی کردووە. میرنشینی ئەردەڵان سەرەتا لە شارەزوور پاشان لە قەڵای حەسەن ئاباد و دواتریش لە شاری سنەوە فەرمانڕەوایی خۆیی کردووە. ئەم دەسەڵاتەش بەردەوام لە پەشێویی و ئاژاوەو ناسەقامگیریدا ژیاوە، ئەویش لەژێر کاریگەری دوو فاکتەردا کە یەکەمیان دەرەکی بووەو کاریگەرییەکی خراپی هەبووە ئەویش دەوری خراپی عوسمانیەکان و فارسەکان بووە، هەم لە هێرش کردنیاندا بۆ سەر ئەم میرنشینەو هەم لە هەوڵیاندا بۆ لاوازکردنی دەسەڵات و نفوزی میرنشین و دروستکردنی ناکۆکی و ئاژاوەی ناوخۆ لە سنووری ئەم دەسەڵاتەدا، دووەمیان هۆکاری ناوخۆیە کە بریتی بووە لە ناکۆکی و ناڕێکی ناو بنەماڵەی میران لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ناکۆکیان لەگەڵ خێڵ و عەشیرەت و میرنشیەکانی تری کورددا بەتایبەتی میرنشینی بابان.

زۆرێك لەو مێژوونووسانەی کە لەبارەی میرنشینی ئەردەڵانەوە دوواون وەکو دەسەڵاتێکی بەهێزو پتەو سەیری دەکەن و تەنانەت هەندێکیان وەکو دەسەڵاتی سەربەخۆ ناوی دەبەن.. حکومەتی ئەردەڵان گاه بە سەربەخۆیی هەندێ جاریش لە رەنگی تابیعدا شەش سەد ساڵێك ژیاوە[٤] بە بەراوردیش لەچاو دەسەڵاتی باباندا، دەسەڵاتی ئەردەڵان، هەم رووبەری دەسەڵاتەکەی فراوانتر بووە، هەم کێشەکانی کەمتر بووە، چ کێشەی ناوخۆیی و چ کێشەی

لەگەڵ دەرەوەدا، لەسەر ئاستی ناوخۆو بۆ دانانی میرەکان کێشەی دروستبوو لەلایەن دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێرانیەوە یەکلایی دەکرایەوە.. میرانی ئەردەڵان بە رەزامەندی شاهەکانی ئێران دادەنران‌و لادەبران[٥] لەسەر ئاستی دەرەوەش میرنشینی ئەردەڵان زیاتر لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا دووچاری شەڕو ناکۆکی بووەتەوە، دیارە سنووری دەسەڵاتی ئەم میرنشینەش تارادەیەکی باش لە قەڵەمڕەوی عوسمانیەوە دووربووەو رەنگە نزیکی میرنشینی ئەردەڵانیش لە دەوڵەتی فارسەوە دەوری هەبوبێت لە مەترسی دانان لەبەردەم دەوڵەتی عوسمانیدا. بۆ ئەوەی نەتوانێت سیاسەتەکانی خۆی بەرامبەر بەم میرنشینە هەمان شێوەی میرنشین بابان جێبەجێ بکات. بە هەر حاڵ میرنشینی ئەردەڵان بە هەموو کێشەکانیەوە توانیویەتی ماوەیەکی تا ئەندازەیەکی درێژی مێژوویی فەرمانڕەوایی جوگرافیایەکی دیاریکراوی کوردستان بکات، راستە بەپێی باسکردنی سەرچاوە مێژووییەکان دروستکردنی ئەم میرنشینە لەلایەن کەسێکەوە بووە کە لە زێد یان سنووری دەسەڵاتی خێڵایەتی خۆی دوورکەوتۆتەوە، کە پێشتر باوباپیرانی فەرمانڕەوایی ئامەد بوون، بەڵام دوای هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتەکەیان بابا ئەردەڵان بەرەو شارەزوور کۆچ دەکات‌و لەوێش پاش ماوەیەك لە قەڵای زەڵم دەسەڵاتی پەیدا کردووەو بووەتە یەکەم فەرمانڕەوای ئەو دەسەڵاتەی کە بە میرنشینی ئەردەڵان بەناوبانگە. ئەم سەرگوزشتەیەش دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە دامەزرێنەری ئەم میرنشینە ئەوەی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدارو نەجیبزادەی ئەو قۆناغە مێژووییەی کورد بووەو لەدوای خۆیشی دەسەڵات کەوتۆتە دەستی نەوەکانی، ئەمەش ئەو راستیە دەسەلمێنێت کە دروستبوونی دەسەڵاتی ئەردەڵان هەمان شێوەی میرنشینەکانی تری کورد بنەمایەکی خێڵایەتی هەبووە لەڕووی رەچەڵەك‌و پێکهاتەی دامەزرێنەرو فەرمانڕەواکانیەوە، هەروەها بنەمایەکی خێڵایەتی هەبووە لەڕووی عەقڵ‌و ستراتیژو سیاسەتی بەڕێوەبردنەوە، دیسان هەمان شێوەی میرنشینەکانی تر دەسەڵاتێکی ناوچەیی بووەو نەیتوانیوە

هەنگاو بە ئاڕاستەی یەککرتن لەگەڵ دەسەڵاتە خێڵایەتیو میرنشینیەکانی تری کوردا بنێتو تەنانەت لەگەڵ دەسەڵاتە دیارە کوردەکانی تری سەردەمەکەی خۆیدا ناکۆکیش بووە، بەتایبەتیش لەگەڵ میرنشینی باباندا. ڕاستە باسی ئەوە دەکرێت کە ئەم میرنشینە دراوی لێدراوەو فەرمانڕەواکانی خوتبەکانیان بەناوی خۆیانەوە خوێندۆتەوەو میرەکانیش هانی کەسانی خوێن: ەواریان داوە بەسەرهاتو ڕووداوەکانی سنووری میرنشینو ئازایەتیو سوارچاکیو لێهاتووی ئەوانی میرو ئەندامانی بنەماڵەی میرنشینو نەجیبزادەکانی بازنەی دەسەڵات بنووسنەوە. بەرهەمەکەی محەمەد شەریف قازی لەساڵی ۱۸۰۰دا تەواو بووە کە ئەوکاتە هێشتا میرنشینی ئەردەڵان لە دەسەڵاتدا مابوو، ئەم بەرهەمەی محەمەد شەریف قازی کە بەشێکی تایبەتە بە والیو میرەکانی ئەردەڵان دەکرێ ناوبنرێ بە یەکەمین تۆماری مێژووی ناوچەیی کە تاکو ئێستا زانرابێ.

مێژووی خرۆنیکای خوسرەو ئیبن محەمەد بۆ ساڵی ۱۸۳۲ـــ۱۸۳۵ دەگەڕێتەوەو نووسەرەکەی نوێنەری لقێکی هەژارىووی ئەردەڵانییەکانە[٦]. گێڕانەوەکانی ئەم نووسەرە جیاوازن لەوەی کە محەمەد شەریف قازی لە زوبدەت ئەلتەواریخی سەنەندەجی دەیگێڕێتەوە. بەڵام ماهشەرەف خانم واتە مەستورە خانمی ئەردەڵانی کە لەنێوان ساڵانی ۱۸۰۵ بۆ ۱۸٤۷ ژیاوە لە مێژووەکەیدا بەناوی مێژووی ئەردەڵان لە هەردوو نووسەری پێشتر زانستیانەتر باسی مێژووی ئەو میرنشینە دەکاتو بەراورد لەنێوان بۆچوونەکانی ئەواندا دەکاتو سەرئەنجامیش بەچاوی ڕەخنەو گومانەوە دەڕوانێتە ئەو سەرچاوە مێژووییانەو زانیاریەکانی ناویان، لێرەدا ڕەگەزێکی نوێ لە نووسین دەربارەی مێژووی کورد دەردەکەوێت کە ئەویش ڕەگەزی بەراوردکاریو هەڵسەنگاندنو ڕەخنەو گومانە. ئەمەش توخمێکی دیاری گوتاری مێژوویيە لای ماهشەرەف خانم. دیارە ئەوە ئاشکرایە کە لەکاتێکدا گوتاری باڵادەست لەسەردەمی میرنشینی باباندا گوتاری ئەدەبیو گوتاری تەسەوف بووە، ئەمە لەپاڵی

گوتاری باڵادەستی خێڵایەتی میرنشیندا، بەڵام گوتاری ئەدەبیو تەسەوفیش لە سنووری دەسەڵاتی ئەردەڵاندا بەو شێوەیە نەبوەتە گوتارێکی باڵادەستو دیار. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە شیعر لە سنووری دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵاندا نەنووسراوە نەخێر ئەوە ئاشکرایە ناوچەی زاری گۆرانی زیاتر لە سنووری قەڵەمڕەوو دەسەڵاتی ئەردەڵانیەکاندا بووەو لەو رووبەرە جوگرافیەو لە مێژووی دەسەڵاتی ئەردەڵانیەکاندا گەلێك شاعیر بە زاری گۆرانی شیعریان گوتووەو بەشێوەیەکی گشتیش شیعری ئەو قۆناغەی زاری گۆرانی پەیڕەو کێشی پەنجەی کردووە کە ئەویش کێشی فۆلکلۆری کوردیو گاتاکاتی ئایینی زەردەشتییە کە ئەو دوو رەگەزەش رەسانایەتییەکی تەواوی کوردییان هەیە، ئەمە جگە لەوەی بەشێکی دیاری قەڵەمڕەوی ئەردەڵان کە هەورامان دەگرێتەوە بە ئاسانی نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری کەلتوری عەرەبی ئیسلامیان کەلتوری تورکییەوە، بەڵکو پارێزگاری لە بوونی خۆیو رەسەنایەتی خۆی کردووە، ئەگەر کاریگەری کەلتوری فارسیش لەسەری دیارو ئاشکرا بووبێت، ئەوا بەگوێرەی کوردو فارس نەك هەر لەڕووی نەژادەوە نزیك بوون لە یەکتر، بەڵکو لەڕووی پێکەوە ژیانو تێکەڵاو بوونو هاوشارستانێتییەوە نزیکی تەواویان هەیەو ناشێت ئەو کاریگەرییانەی فارس لەسەر کەلتوری کوردی شوناسی کەلتوری کوردیو رەسانەیەتی ئەم کەلتورەی شێواندبێت.

بە هەر حاڵ گوتاری کوردی لەڕووی شوناسەوە، لەڕووی جۆری ئەو فیکرە سادەیەی کە لە پشتی دەقە شیعرییەکانو دەقی زارەکی فۆلکلۆرو ئەفسانەو فانتازیاو تەقسە کۆمەڵایەتیو تەنانەت ئایینیەکانیشەوە بووە، بوونی خۆیی لە سنووری میرنشینی ئەردەڵاندا لەدەست نەداوە، رەسەنایەتی گۆرانی کوردی لەو بەشەی کوردستان بەگشتیو لە هەورامان بەتایبەتی پایەیەکی بەهێزی گوتاری کوردیە. پابەندبوون بەو رەسەنایەتیەوە یەکێکە لە خاسێتە دیارەکانی گوتاری کوردی لە سنووری قەڵەمڕەوی ئەردەڵاندا، رەنگە یەکێك لە هۆیەکانی ئەم پابەندبوونە نەك هەر بۆ سەردەمی دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵان لەو

رووبەرە جوگرافیەدا، بەڵکو بۆ ئێستاش بگەڕێتەوە بۆ هەستکردنی خەڵکی کورد لەو رووبەرەدا بەبوونی سەرچاوە کە مەبەست لەوەش سەرچاوەی ئایینی لە پلەی یەکەمدا دێت کە ئەویش ئایینی زەردەشتییە، لە هەمان کاتدا هەستکردنی کورد لەو بەشەی کوردستاندا بە بەشداریکردنیان لە بنیادنانو بەرهەم هێنانی شارستانێتی کۆنی ئێرانیدا، چونکە ئەوە ئاشکرایە بوونی سەرچاوەی بەهێزی رابردوو پاڵنەرێکی گەورەیە بۆ دروستکردنی هەست بەخۆکردن لە ئێستاداو بەو پێیەش رێگاگرتن لە ونبوون.

ئەگەر گوتاری سەردەمی میرنشینی ئەردەڵان خاوەنی ئەم خاسێتی پاراستنی رەسەنایەتیەی کورد بووبێت، ئەوە دەبێ بزانین گوتاری ئیداریو سیاسی میرنشین هەمان شێوەی گوتاری میرنشینەکانی تر گوتارێکی خێڵایەتی دلخراوی ناوچەگەریانەی گوشەگیرو ناکارا بووەو هەرگیز نەیتوانیووە لە عەقڵو ستراتیژی خێڵایەتی کوردی رزگاری ببێت. ئەویش لە دوو لایەنەوە، لایەتی یەکەم لەسەر ئاستی کوردستانو بە ئاراستەی دەرەوەی خودی میرنشین، مەبەست لەم قسەیەش ئەوەیە کە میرنشینی ئەردەڵانیش هەمان شێوەی میرنشینە کوردەکانی تر نەیتوانیووە بەو ئاراستەیە کار بکات کە مادەم وڵاتێك هەیە ناوی کوردستانەو نەتەوەیەك لەسەر دەژی ناوی کوردە هەوڵی نزیك بوونەوەو یەکگرتن لەگەڵ میرنشینو دەسەڵاتە خێڵایەتیەکانی تری کورددا بدات بۆ نموونە لە تەنیشت ئەم میرنشینەدا دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی فارس هەبوون کە هەریەکەیان تاکە دەوڵەتی نەتەوەیەك بوونو سەرجەمی ئەو نەتەوەیەو بگرە هەندێ نەتەوەو ئێتنیکی تریشیان لەژێر سایەی دەسەڵاتی خۆیاندا کۆکردۆتەوەو فەرمانڕەواییان کردوون، بەڵام ئەم جۆرە روانینو بیرکردنەوەیە نە لەلای میرانی ئەردەڵانو نە لەلای هیچ میرێکی تری کوردی دروست نەبوو ئەمە جگە لەوەی کە سەرجەم میرانی کورد لەگەڵ یەکتر ناکۆکو ناتەباو دژ بوونو هەریەکە بەلایەوە پەسەندتر بووە کە خۆی بەتەنیا خاوەنی دەسەڵاتێکی سنووورداری ناوچەیی بێت نەك بەشێك بێت لە دامەزراوێکی گەورەترو لەسەرەوە بەڕێوە ببرێت، بەمانایەکی تر عەقڵی خێڵو

میرنشینی کوردی لەسەر بنەمای ئەو چەمکە خەلدونیە دروستبووەو ئیشی کردووە کە دەڵێت: "من دەسەڵاتی خۆمم دەوێت ئەگەر چی رووبەری ئەو دەسەڵاتە بە ئەندازەی رووبەری بەردێك بێت[٧]" بە مانایەکی دی گوتاری میرنشینی کوردی بەگشتی گوتاری خێڵەو توانای نەبووە لەڕووی یەکگرتنو یەکبوونەوە بپەڕێتەوە بۆ دەرەوەی سنووری میرنشینەکەی یان خێڵەکەی، بەڵکو هەندێ جار هەوڵیداوە لەرێگای شەڕو داگیرکردنەوە رووبەری دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات کە ئەوەش جگە لە ئاڵۆزیو وێرانکاری هیچی تر لێنەکەوتۆتەوە.

دووەم لەسەر ئاستی ناوەوە، واتە لە پێکهاتەی هەرەمی دەسەڵاتی میرنشیندا، ئەوە دەبینرێت کە بنەماڵەی دەسەڵاتداری میرنشین کە بازنەیەکی داخراو بووە خۆیان لە شوێنی نوێنەری خودا لەسەر زەوی داناوەو لە سنووری دەسەڵاتی داخراوی خۆیاندا دەسەڵاتی رەهایان بەسەر پێکهاتەی خوارەوەی میرنشیندا پیادەکردووەو ئەوی خوارەوە لە هەموو مافو ئازادییەك بێبەش بووە، تەنیا مافی خواردن لەپێناوی مانەوەداو خێزان دروستکردن لەپێناوی نەوەخستنەوەیدا هەبووە، ئەویش بە مەبەستی پاراستنی دەسەڵاتی میرنشین، تەنانەت دەتوانین بڵێین یەکێك لە هۆکارەکانی روخاندنی دەسەڵاتە میرنشینیەکانی کورد ناڵسۆزی پێکهاتەی خوارەوەی میرنشین بووە بۆ لوتکەی هەرەمی دەسەڵاتی میرنشین لە ئەنجامی ئەو سیاسەتو رەفتارە توندوتیژو نامرۆییانەی کە لوتکەی دەسەڵاتی میرنشینەوە بەرامبەر بە ئەندامی خوارەوەی سنووری میرنشین پیادەیان کردووەو لە هەمان کاتیشدا لە هەموو مافێك بێبەشیان کردوون، دیارە سوپاو پارێزەری میرنشینیش هەر خەڵکەکەی سنووری دەسەڵاتەکەی بووە، نەك سوپای رێکخراو، ئەم خەڵکەی کە لەژێر باری سەختی بێگارو سەرانەو سورانەو باجو موڵکانەدا چەماوەتەوە، ئامادە نەبوو لەپێناوی پاراستنی ئەو دەسەڵاتە نامرۆییەی سەرەوەیدا خۆی بەخت بکات، بۆیە دەبینین بەگشتی میرنشینەکانی کورد لە شەڕەکانیاندا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی یان فارسی یان هەر لایەکی تردا بەزوویی هەرەسیان

هێناوە، ڕاستە مێژوو گەلێك نموونەی پاڵەوانیو خۆڕاگری میرو خێڵەکانی کورد لەشەڕدا دەگێڕێتەوە، بەڵام ئەم گێڕانەوانە زیاتر بەرهەمی خەیاڵەو لە وەهم دەچن.

بێگومان میرنشینی ئەردەڵانیش وەکو هەموو میرنشینەکانی تری کورد خاوەنی ئەم گوتارە دوو ئاراستەیە بووە لەڕووی بەڕێوەبردنو سیاسەتی میرنشینەوە واتە گوتارێکی داخراوی خێڵایەتی دژ بەوانی دیو ناکۆك لەگەڵ هەمووان‌دا لەسەر ئاستی جوگرافیای کوردستان، هەروەها گوتارێکی داخراوی توندوتیژی داپڵۆسێنەری سەرکوتکەری مەرگ دۆستانە لەسەر ئاستی ناوەوە، ئەم دوو ئاراستەیەش کە پێکەوە کۆ دەکرێنەوە جگە لە مەرگو هەرەسو لەنێو چوون مژدەی هیچ شتێکی تر نابەخشێت بۆیە دەتوانین بە ئاشکرا بڵێین لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەموو ئەو پێکهاتانەی کە نەیانتوانیووە ڕۆحیەتی یەککرتنەوە لەگەڵ ئەوانی دیدار هەڵبگرنو بیکەن بە پرۆژەو هەوڵی جێبەجێکردنی بدەن، ئەگەرچی بۆ قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراویش مابنەوە ئەوە ئەنجام بەبێ ئەوەی بتوانن بوونی خۆیان بسەلمێننو بەشداری بنیادنانی شارستانێتی مرۆڤایەتی بکەن ڕوخاونو بەرەو لەناوچوون ڕۆیشتوون، بە هەمان شێوە هەموو ئەو دەسەڵاتانەی کە نەیانتوانیووە ببنە جێگای ڕازیبوونی ئەو پێکهاتەی کە دەسەڵاتیان بەسەردا کردووەو بەڕێوەیان بردووە، هەمیشە لەبەردەم مەترسی فەوزاو پەشێوەییو ئاڵۆزیدا بوونو زۆر جاریش ئەو ئاڵۆزیو پەشێوییە بەرەو هەرەسمی بردوون، میرنشینەکانی کوردیش لە پلەی یەکەمدا لەژێر هۆکاری ئەم دوو حاڵەتەدا هەرەسیان هێناوە، ئەگەرچی هۆکاری یاریدەدەری تریش وەکو فشارو هێرشی ئەملاولا بوونی هەبوو بێت، میرنشینی ئەردەڵان خاوەنی ئەم گوتارە دلخراوە بووە کە نەیتوانیووە بەرەو بەخۆی بداتو ببێتە خاوەنی گوتارێکی نەتەوەییو بەو پێیەش کەسێتییەکی نەتەوەیی هەبێت.

# سەرچاوەکانی بەشی ( ٧ )

١ـ محمد أمين زكي بك ـ الدول و الإمارات الكردية في العهد الإسلامي ـ الجزء الثاني ـ ص٢٠٤.

٢ـ ی ـ ئی ـ ڤاسیلیڤا ـ کوردستانی خوارووی رۆژهەلات ـ وەرگێڕانی دکتۆر رەشاد میران ـ هەولێر ١٩٩٧ـ ل ٤٦.

٣ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٤٧.

٤ـ سالح قەفتان ـ مێژووی گەلی کورد ـ بەغداد ـ سالی ١٩٦٩، ل٢٨٤.

٥ـ محەمەدی حەمە باقی ـ میرنشینی ئەردەلان، بابان، سۆران لەبەلگەنامەی قاجاریدا (١٧٩٩ـ١٨٤٧) هەولێر ـ سالی ٢٠٠٢، ل٣١.

٦ـ ی.ئی. ڤاسیلیڤا ـ کوردستانی خواروی رۆژهەلات ـ ل١٩.

٧ـ العلامة عبدالرحمن بن محمد بن خلدون ـ مقدمة إبن خلدون ـ دار الجيل بيروت ص.

لە جوگرافیای کوردستاندا سۆران بە ناوچەی نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووك گوتراوە، ناوی میرنشینی سۆرانیش بەو دەسەڵاتە سنوورداره هەرێمایەتیە دەگوترێت کە لەو جوگرافیایەدا دروست بووە بە واتا میرنشینی سۆران لەبری ناوی خێڵێك یان کەسێك ناوی ناوچەیەکی جوگرافیای دیاری وەرگرتووە کە ئەوەش بەلای ئەو لێکدانەوەیەدا دەمانبات کە دامەزرێنەری ئەم میرنشینە پێ ناچێت سەر بە خێڵ یان عەشیرەتێکی دیاری خاوەن نفوزو دەسەڵات بووبێت. هەروەك سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: کەولۆس ناو پیاوێکی کورد لە سەدەی یازدەمینی زاینیدا هاتۆتە هەرێمی هەولێرو لە ناحیەی (ئاوان)دا ناوی پەیدا کردووەو دامەزراوەو یەکێك لە کوڕەکانی بەناوی عیسا بووەتە سەردارو ناوی دەرکردووەو بە میر عیسای سۆران شۆرەتی دەرکردووە[1].

شەرەفنامە (کەولۆس) ناو موهاجرێکی بەغدایی بە جەدی ئومەرای سۆران ئەنوێنێ[2]. دکتۆر فرێج ئەڵێ ئەم ناوی (کەولۆس) لە ناوێکی عەرەب ناکاو ئەبێ کوردی بێ، چونکە بەکوردی ناوەکە بە کەسێك دەگوترێت دانی لە پێشەوەی کەوتبێ‌و پاشاش بێ (کەولۆس ـ کەل)ی پێ ئەڵێن[3].

یەکێك لە کوڕەکانی کەولۆس بەناوی عیسا ناویانگی دەرکردووەو خەڵکی لەخۆی کۆکردۆتەوەو دەوری قەڵای (ئاوان) گرتووەو لەگەڵ هەندێ لە یاوەرانیدا لەسەر هەندێ تاشەبەردی سووری بەرامبەر قەڵاکەوە دەستی کردووە بە شەڕو مودافیعینی قەڵاکەی چاوترسێن کردو خەڵکی قەڵاکە ناویان نان (سووره بەردی)و پاشان نەوەکانی (میرعیسا) بە سۆران شۆرەتیان دەرکرد[4] ئەم میرعیسایە قەڵای (ئاوان) داگیر دەکاتو دەسەڵاتی خۆی دادەمەزرێنێ‌و پاش مردنی خۆی، کوڕو نەوەکانی جێگای دەگرنەوە.

میرنشینی سۆران بەپێی گێڕانەوەکان لەم سەرچاوەوە دروست دەبێتو لە سەرەتای دروستبوونیەوە هەتا هاتنی محەمەد پاشا (١٧٨٨ـ١٨٣٨) بەپێی تواناو دەسەڵاتو لێهاتوویی میرەکان هەندێ جار سنووری میرنشین

فراوانبووەو هەندێ جاریش زۆر تەسك بووەتەوە، بەپێچەوانەی میرنشینی ئەردەڵانو بابانەوە، میرنشینی سۆران کەمتر بووەتە جێگای لێدوانو ئاخاوتنی مێژوونووسانو[٥] تەنانەت وا پێدەچێت لە نەخشەو ململانێی سیاسیو ئیداری ناوچەکەدا رۆڵێکی ئەوتۆ دیاریشی نەبووبێت، هەتا سەردەمی محەمەد پاشا بۆیە کەمتر بووەتە جێگای بایەخی عوسمانیو تەنانەت فارسەکانیش، هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی لەبارەی ئەم میرنشینەوە کاتێ دەردەکەوێت کە سوڵتان سلێمانی قانوونی کە لەساڵی ١٥٢٤داو لەدوای گرتنی بەغداو رێکخستنەوەی دەڤەرە تازە گیراوەکاندا عیزەدینی میری سۆرانی کوشتو کاروباری میرنشینی سۆرانی بە سنجاقی هەولێرەوە لکاندو بە حسێن بەگی (داسنی)ی سپارد کە میرێکی یەزیدی بوو[٦] بەلام دواتر لەناو بنەماڵەی میری سۆراندا میر سەیفەدین توانی دەسەڵاتی حسێن بەگی داسنیێ لە قەڵای هەولێر تێکبشکێنێو دەسەڵاتی میرنشینی سۆران دروست بکاتەوە، لەم کاتە بەدواوە میرنشینی سۆران هەندێ جار دەبێتە جێگای بایەخی عوسمانیەکانو تەنانەت هێرشیشی بۆ دەکەنو میر سەیفەدین ناچاری خۆبەدەستەوەدان دەبێت، لەو کاتە بەدواوە میرنشینی سۆران هەتا هاتنی محەمەد پاشا لە ئاستی نەبوودا بووەو هیچ دەورێکی ئەوتۆی دیاری نەبووە.

محەمەد پاشا کە بە پاشا کۆرە بەناوبانگە توانی رووبەری دەسەڵاتی میرنشینەکەی فراوان بکاتو کاروبارەکانی رێك بخاتەوەو کەسێتی ئەم میرنشینە بەرز بکاتەوە بۆ ئاستێك کە لەسەر گۆرەپانی ململانێو رووداوەکانی ئەو سەردەمە دیار بێت، بەتایبەتی کە پاشا کورە هێزێکی باشی پێکەوە ناو کارگەی باروتو چەکی دروستکردو تاکو ئێستاش لولە تۆپی سەردەمی پاشا کورە لە رەواندوز ماوەتەوە. ئەم کارانەی پاشا کورە بووە جێگای بایەخو لە هەمان کاتدا مەترسی لەلای عوسمانیەکان، بۆیە بە یارمەتی والی بەغداو والی موسڵ لەسەردەمی سوڵتان مەحموددا پەلاماری میرنشینی سۆرانیان داو، میر

محەمەدیش بەبێ شەڕکردن خۆی دایە دەستەوەو رەوانەی ئەستەمبوڵ کرا، بەڵام دواتر لە تەریزون لەسەر داوای عەلی رەزای والی بەغدا کوژرا[1].

ئێستا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا گوتاری میرنشینی سۆران چ جۆرە گوتارێك بووە؟ دەشێ ئەوەش لە دوو ئاڕاستەدا باس بکەین، یەکەمیان گوتاری ئیداریو سیاسی میرنشین، دووەمیان گوتاری رۆشنبیری یان ئەدەبی میرنشین.

دیارە ئەگەر سەرنجی ئەو قۆناغە مێژووییە بدەین کە ئەم میرنشینەی تێدابووە، هەر لە سەرەتایەوە هەتا سەردەمی پاشا کوێرەو رووخاندنی میرنشینەکە کۆمەڵگای کوردی لەبارودۆخێکی دواکەوتوودا بووەو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کوردی پێکهاتەیەکی خێڵایەتی بووەو شێوازی پێکهاتنی میرنشینو عەقڵی بەڕێوەبردنو شێوازی کارکردنی لە کۆمەڵگای کوردی ئەو قۆناغە بەرهەم هاتووە بە واتا دامەزراوێکی خێڵایەتی بووە چ لەڕووی پێکهاتنەوە، چ لەڕووی ناوچەی دەسەڵاتەوە، چ لەڕووی عەقڵو ستراتیژی بەڕێوەبردنەوە، چ لەڕووی ئابووریو کۆکردنەوەی داهاتەوە بۆ میرنشین، تەنانەت ئەم میرنشینە لە بەرزترین ئاستی پەرەسەندنیدا کە سەردەمی دەسەڵاتی پاشا کوێرە بووە، بێ هیچ گوێ پێدانێك خەریکی کوشتنو بڕین بووە.. پاشا کوێرە لەدوای چەند شەڕێك لەگەڵ ئیسماعیل پاشای بادینانا، عەقرەی گرتو لەوێوە چووە سەر عەمادیەو سەعید پاشای حاکمی ئەوێی ئەسیر کردو شارەکەشی زەوت کرد، لە پاشدا رووی کردە یەزیدی تەڕەفی بەعشیقەو کوشتارێکی زۆری لێکردن[1].

ئەمەش بۆمان دەردەخات سەرباری هێزو توانای، پاشاکوێرە، هەڵگری بەرنامەیەکی خێڵایەتی دواکەوتووی مەرگنۆستانە بووەو لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیداو بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی سڵی لە کوشتنو بڕینو وێرانکردن نەکردۆتەوە ـ ئەویش نەك کوشتنی دوژمنو وێرانکردنی وڵاتێکی تر، بەڵکو کوشتنی کورد واتە ئەندامانی نەتەوەکەی خۆیو رووخاندنی دەسەڵاتی

خێڵو دامەزراوە خێڵایەتیەکانی تری نەتەوەکەی خۆی، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە پاشا کورە هەڵگری عەقڵێکی خێڵایەتی هێجگار داخراو بووەو هەوڵیداوە لەڕێگای هێزو کوشتنو برینەوە نفوزو دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت، ئەمەش گوتارێکی داخراوی خێڵایەتی ناسەردەمیانەیەو دەشێ گرێی هەست بەکەمیکردن واتە نەبوونی (چاوێك) لەلایەن میرەوە دەورێکی ئاشکرای بینیبێت لە دروستکردنی کەسێتی توندوتیژی پاشا کورەداو وەکو گرێیەکی دەروونی هەست بە کەمیکردن هەوڵیدا بێت لەڕێگای دەسەڵاتەوە ئەو کەموکرتیە پڕ بکاتەوە. دیارە ئەوە ئاشکرایە لە کۆمەڵگای تەندروستدا مرۆڤی تەندروست دەبێتە فەرمانڕەواو رابەرو بەرپرسیار، واتە کەسێك کە گرێی هەست بە کەمیکردنی نەبێت، دیارە گوتاری پاشا کورە بۆ ناوخۆ چ لە سنووری بنەماڵەکەی خۆیداو بەرامبەر بە مامو ئامۆزاکانی، چ بەرامبەر بە خێڵو عەشیرەتو میرنشینە کوردەکانی تر توندوتیژ بووەو هەمیشە بە کوشتن وەڵامی داوەتەوە، بەڵام بەرامبەر بەوانی غەیرە کورد ئەو توانایەی نەبووە، بۆ نموونە کاتێ لەشکری عوسمانی پەلاماری دەدەن بە بیانووی ئەوەی کە خوێنی مسوڵمانان نەڕژێت خۆی دەداتە دەستی تورکەکانەوەو ئەنجامیش لە ناوی دەبەن، ئەگەر بەراوردی ئەم دوو هەڵوێستە بکەین ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت کە پاشا کورە نە خاوەنی گوتارێکی چەسپاوی خێڵایەتی بووە، چونکە خێڵ لەپێناوی بەرژەوەندی مادیو مەعنەوی خۆیدا ئامادەی خۆبەخت کردنەو هەروا بە ئاسانی سەوداگەری ناکات لەگەڵ ئەوانی تردا، بەڵام بە ئاڕاستەیەکی تر خێڵ لە سنووری جوگرافیای گشتیو لەسەر نەخشەی خێڵایەتی نەتەوەکەیدا ئارەزووی هاریکاریو یەکگرتنو فیدراسیۆن دروست کردنی هەیە. بەڵام دامەزراوی میرنشینی کوردی بەگشتی لەم ئارەزووی بەرەو یەکگرتن لەگەڵ ئەوانی تردا بێبەش بووە، میرنشینی سۆرانیش بە هەمان شێوەی میرنشینەکانی تر بارگاوی کراوە بە ئارەزووی دژایەتی کردنی ئەوانی تر بە ئارەزووی پەرتبوونو دابەشبوون چونکە خاوەنی هەمان کەلتوری

خێڵایەتی کوردی بووە. پاشا کۆرە وەکو میری میرنشینێکی دیار نە هەڵگری پرۆژەیەکی جێگیری پاراستنی بەرژەوەندی مادیو مەعنەوی میرنشینەکەی بووە لە بەرامبەر دەرەوەداو نە لەسەر ئاستی ناوەوەش بڕوای بە ئاڕاستەی پێکەوە ژیانو یەکتر قبوڵکردنو گفتوگۆ هەبووە، لە بەرامبەر دەرەوەدا کە عوسمانییەکان بوون بەبێ تەقە خۆی داوە بە دەستەوەو کۆتایی بە دەسەڵاتی میرنشینەکەی هێناوە، هەرچەندە هەندێ لە مێژوونووسان رایان وایە کە سوپاکەی پاشا کۆرە گوێ رایەڵی پاشا کۆرە نەبوونو شەڕیان نەکردووە، ئەگەر ئەم قسەیەش راست بێت ئەوە دەبێ بزانین هۆکەی توندو تیژی دەسەڵاتی میرنشین بووە لەسەر ئاستی ناوەوەو دیارە ئەو سوپایەش بەزۆرە ملێ کۆکراونەتەوە، بۆیە ئامادە نەبوون لەپێناوی پاراستنی دەسەڵاتی میرنشین دا خەبات بکەن. کەواتە ئێستا دیارە کە گوتاری میرنشینی سۆران گوتارێکی دواکەوتووی خێڵایەتی مەرگدۆستی خۆبەدەستەوە دەریووەو سەرباری کارگەی باروتو چەکو تۆپ نەیتوانییوە بەرگری لەخۆی بکات بەڵکو لەپێش هەر بەرگرییەکدا خۆی داوەتە دەستەوە ئەم نەریتی خۆ بەدەستەوە دانە لە عەقڵی کوردیدا بوۆمتە بارێکی بەردەوامو زۆر جار لە مێژووی کورددا دووبارە دەبێتەوە، میرنشینێك لەسەر ئاستی ناوخۆ وا خۆی نیشان دەدات بەهێزو بە توانایەو لە بەرامبەر دەسەڵاتە هاوشێوەکانی تری کوریدا توندو شەڕەنگێزە، بەڵام لە بەرامبەر ئەوانی غەیری کورددا، یان لە بەرامبەر داگیرکەرانی کوردستاندا لاوازەو بەزوویی خۆی دەدات بەدەستەوە.

لە سنووری میرنشینی سۆراندا گوتارێکی ئەدەبی دیار دەرنەکەوتووەو دەتوانین بڵێین لەکاتێکدا کە سەدەی نۆزدە بەگوێرەی ئەدەبی کوردی یان شیعری کلاسیکی قۆناغێکی گەشە چ لە سنووری میرنشینی باباندا و چ لە شوێنەکانی تری کوردستاندا، بەڵام لە سنووری دەسەڵاتی سۆراندا گوتاری ئەدەبی لە ئاستی نەبوودا بووە.

بە گشتیش جۆرێك لە زیادەڕۆیی قسەکردن لەسەر میرنشینی سۆران هەیە بەوەی کە وەکو دەسەلاتێکی نەتەوەیی باس دەکرێتو پاشا کۆرە وا باس دەکەن کە پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی هەبوبێت، پێم وایە قسەیەکی لەو جۆرە لەڕووی زانستییەوە ناسەلمێنرێت چونکە دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ لە غیابی ناسیونالیزمدا شتێکی مەحاڵەو لەسەر زەمینەی واقیع جێگای نابێتەوە. لەم بارەیەوە جەمال نەبەز دەڵێ: بزوتنەوەی راستەقینەی نەتەوەیی ئەوەیە کە هەوڵدەدات لەپێناوی ئازادیو سەربەخۆییو یەکێتیی نەتەوەدا[9] بەلام ناشێت بەبەلگە ئەوە بسەلمێنرێت کە میرنشینی سۆران لە پەرەسەندوترین قۆناغی گەشەکردنیدا کە سەردەمی میر محەمەدە هەولی یەکێتیی نەتەوەی دابێت چونکە ئەو یەکێتییە پرۆژەی ناسیونالیزمە، لەو کاتەشدا ناسیونالیزمی کوردی دەرنەکەوتووە.

## سەرچاوەکانی بەشی ( ٨ )

١ـ ساڵح قەفتان ـ مێژووی گەلی کورد ـ بەغدا، ١٩٦٩، ل٢٩٥.
ـ هەروەها جمال نەبەز ـ الأمير الكردي ـ مير محمد الرواندزي ـ ترجمة فخري سلاحشور ـ هەولێر ـ ٢٠٠٣ ـ ل٤٣.
٢ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ ـ خولاصەیەکی تأریخی کوردو کوردستان (بەرگی دووەم) ـ سلێمانی ـ چاپی نوێ ـ ٢٠٠١، ل٢٤٢.
٣ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢٤٢.
٤ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢٤٣.
٥ـ جەمال نەبەز ـ کوردستان و شۆڕشەکەی ـ وەرگێڕانی کوردۆ ـ بنکەی چاپەمەنی ئازاد ـ سوید ١٩٨٥.
٦ـ محەمەد حەمە باقی ـ میرنشینی ئەردەڵان، بابان، سۆران لە بەڵگەنامەکانی قاجاریدا (١٧٩٩ـ١٨٤٧)، هەولێر ـ ساڵی ٢٠٠٢، ل١٤٤.
٧ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـل٢٤٧.
٨ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ ـ هەمان سەرچاوەی پێشووتر ٢٤٧.
٩ـ جمال نەبەز ـ الأمير الكردي مير محمد الرواندزي ـ ترجمة فخري سلاحشور ـ هەولێر ـ ٢٠٠٣، ل١٠٧.

لەدوای هەرەس هێنانی بزوتنەوەی بەدرخانیەکان (١٨٤٣-١٨٤٧)و لەدوای هەرەس هێنانی دوا میرنشینی کوردی (١٨٥٠) کە میرنشینی بابان بوو، کوردستان لەژێر سایەی دەسەڵاتی قاجاریو بابی عالیدا جۆرێك لە خامۆشیو کپبوونی بەخۆیەوە بینی، جوڵانەوەیەکی ئەوتۆ کە شایانی باس بێت لەو مێژووەدا بەرچاو ناکەوێت. هەتا سانەوەختی بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری.

شێخ عوبەیدوڵڵا کە لە بنەماڵەی شێخانی نەهرییە پەیڕەوکەری ڕێبازی نەقشەبەندی بووەو لە هەمان کاتدا بنەماڵەکەیان پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیارییان لە ناوچەی شەمزیناندا هەبووەو نفوزی تەریقەتی نەقشەبەندیش زیاتر دەریخستوونو ڕێگاخۆشکەربووە بۆ ئەوەی شێخ عوبەیدوڵڵا ڕابەرایەتی ڕاپەڕین بکاتو جێگای متمانەی خەڵکی بێت، خاڵێکی دیاریش کە جێگای ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا خاسیێتێکی فراوانی کوردستانی بوونی هەبووە لەو ڕوانگەیەوە کە بزوتنەوە یان ڕاپەڕینی ناوچەیەکی تەسکی خێڵایەتی نەبووە، بەڵکو ڕوویەرێکی فراوانی کوردستانی گرتۆتەوە، لەلایەکی ترەوە لە دەسەڵاتی میرنشینی کوردیدا ستراتیژی میرنشینەکان لەبری شەڕی دوژمنانی داگیرکەری کوردستان، شەڕی میرنشینو خێڵو عەشیرەتە کوردییەکانی تریان کردووە، بەڵام بزووتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا شەڕی داگیرکەری کوردستانی کردووە، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری خۆیشی وەکو یەکەم ڕابەری بزوتنەوەی کوردی دەردەکەوێت کە هەم خاسێتی دیاری ڕابەری هەبووە - هەم یەکەم ڕابەری دیاریشە لە مێژووی میرنشینو خێڵایەتیو عەشیرەتایەتی کوردیدا کە بە ڕەچەڵەك شێخ بێتو نوێنەرایەتی دلخوازییەکانی کورد بکات کە ئەمەش وەکو کۆتایی هێنان بە دەوری میرو سەرۆك خێڵو دەستپێکردنی ڕۆڵی شێخو سەیدەکان دەردەکەوێت، ئەمەش لەبەردەم ئەو پرسیارەدا ڕامان دەگرێت ئایا ڕۆڵی شێخو سەیدەکان لە بزوتنەوەی کوردایەتیدا چی بووە؟ ئایا شێخو سەیدەکان سەرباری بوونی

درەختــی بنەماڵــەو پەیوەســتبوونەوەیان بــە پێغەمبــەرو کــەس و کارییــەوە توانیویانە بەشداری بکەن لە بنیادنانی گوتاری سیاسی کوردیدا؟ ئایا ئــەو هۆکارانــە چــین کــە لــە بزووتنەوەکــەی شــێخ عوبەیــدوڵڵا بــۆ دواوە ڕۆڵــی رابەرایــەتی و ســەرکردایەتی دەبەخــشن بــە شــێخ و ســەیدەکان و مــیرو بــەگــو ســـەرخێڵەکان دەخەنـــە دواوە؟ ئایـــا کاریگـــەری هـــەردوو ڕێبـــازی قـــادری و نەقــشەبەندی چــی بــووە لەســەر ئــەم رابــەرو ســەرکردانە کــە بــە گــشتی لــە موریدەکانی ئەو دوو ڕێبازە بوون؟ ئایا ئــەو گوتــارەی لــە بزوتنەوەکــەی شــێخ عوبەیدوڵڵا بۆ دواوە بەرهەم هاتووە چ جۆرە گوتارێکە؟ ئایا سەرچــاوەی ئــەو گوتارە چییە؟ ئایا ئەو گوتارە لە چ ئاستێکدا گوتــاری نەتــەوەیی بــووە؟ یــان باشــتر بڵــێین ئایــا گوتـــاری ئـــەم بزوتنەوانـــە ســـنووری گوتـــاری خێڵیـــان بەجێهێشتووەو بووبن بە گوتاری نەتەوە؟

بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا لەساڵی (١٨٨٠) دەستی پێکرد، وەکو دایڤد ماکدۆواڵ دیــاریکردووە ڕاپەڕینەکــە لــە مــانگی ئــەیلولی ئــەو ســاڵەدا ســەری هەڵداوە[1] مــارتن ڤــان برۆنــسن دەڵێت: شــێخ عوبەیــدوڵڵا دەســەڵاتی بەســەر ناوچەیەکی یەکجار فراواندا کردو مەبەستی بوو کە دەوڵــەتێکی ســەربەخۆی کوردی دابمەزرێنێ، لەساڵی ١٨٨٠دا بەسەرکردایەتی هێزی خێڵەکانەوە بــەرەو کوردستانی ئێران چوو، ویستی ئــەوێ بکاتــە بنکــەی دەوڵەتــە کوردییەکــەی[2] ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیــدوڵڵا کــە لــە ئــەیلولی ســاڵی ١٨٨٠دا دەســتی پێکرد لەلایەن دووەم کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا کــە شــێخ عەبدولقادر بــوو ســەرۆکایەتی کرا، عەبدولقادر لەناو ئێراندا بوو، چونکە ئەو نوێنەری باوکی بوو لــە لادێکـانی سەرسنووردا کە بوو بوونە لایەنگری ساداتی نەهری[3] هەندێ بۆچــوونی تــریش هەیە لەسەر شێوازی ســەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکــەی شــێخ عوبەیــدوڵڵا کــە دەبێتــە بەڵگەی بێبەرنامەیی لە ســەرهەڵدانی ئــەو ڕاپەڕینــەدا، ئــەوەیش گوایــە نێــوانی حاکمی سابلاخ و هەمزە ئاغای ســەرخێڵی مونکبــور تێکدەچێتو دوای ئــەوەی هەمزە ئاغا هەندێ هێزی حکومەتی ئێرانی تێکدەشکێنێت، پاشان حکومەت بە

هێزێکی گەورەوە هێرش دەکاتە سەر هەمزە ئاغا، ئەویش پەنا بۆ لای شێخ عوبەیدوڵڵا دەبات هەتا یارمەتی بدات "شێخ عوبەیدوڵڵا، شێخ عەبدولقادری کوڕی بە هێزێکی ٢٠٠ سوارەوە دەنێرێت بە هانایەوە، سەرۆک خێڵێکی تریش بەناوی کەریم خانەوە ئەدلتە پاڵ هەمزە ئاغا، هەرسێکیان بە هێزێکی (٨٠٠) سوارەوە بەرەو پێشەوە دەڕۆن بۆ بەرەنگاربوونەوەی حاکمی سابڵاخ[٤].

ئێستا ئەگەر سەرنج بدەین سەرەتای سەرهەڵدان و دەستپێکردنی راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا دوو جۆر لێکدانەوەی بۆ دەکرێت، یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو راپەڕینە لە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراودا دەستی پێکردبێت و شێخ عوبەیدوڵڵا خاوەنی روانینێکی دیاریکراوی ئاشکرا بوبێت سەبارەت بە کێشەی کورد و هەوڵیدابێت لە رێگای راپەڕینەکەیەوە بەدوای داواکانی کورددا بچێت. بەلام لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات، ئەگەر شێخ عوبەیدوڵڵا خاوەنی بەرنامەو پرۆژەیەکی نەتەوەیی بوبێت بۆچی لە سنووری دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا راپەڕینەکەی دەست پێناکات و هەوڵی رزگارکردنی ئەو بەشەی کوردستان نادات کە لەژێر سایەی دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە؟ ئەم پرسیارەش بەلای دوو لێکدانەوەدا دەمانبات کە یەکەمیان ئەوەیە شێخ عوبەیدوڵڵا هەستی بە نفوزی بەرپلاوی خۆی کردبێت لە کوردستانی ژێر سایەی دەسەلاتی فارسداو بوونی شێخ عەبدولقادری کوڕیشی لەو بەشەی کوردستان دەبێتە پالپشتی بەهێزکردنی ئەم بۆچوونەو بەتایبەتیش کە رایەکی لەو جۆرە هەیە کە بارودۆخی دەوڵەتی فارس لەو کاتەدا خراپبووەو بۆ شێخ کارێکی ئاسانتر بووە کە راپەڕینەکەی لەوێ دەست پێبکات.. رەنگە چوونە ناوەوەی ئەم دواییانەی شێخ بۆ ناو ئێران بەهۆی ئەو بۆچوونەوە بووبێت کە حکومەتی ئێرانی زۆر بۆگەن تر بوو لەوەی تورکیاو وەدەستهێنانی دەسەلاتێکی سەربەخۆ لەوێ ئاسانتر دەبێ وەك لە تورکیادا[٥].

بۆچوونی دووەم ئەوەیە کە گومانێك لەئارادایە بۆ هاندانی تورکەکان و پاڵپشتکردنیان بۆ ئەو راپەڕینە لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی عوسمانیەکان بە مەبەستی لاوازکردنی دەسەڵاتی فارسەکان.

لێکدانەوەی دووەم بۆ راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا ئەوەیە کە کاردانەوە بێت بەرامبەر بەو هەڵوێستەی کە حاکمی سابڵاخ بەرامبەر بە هەمزە ئاغا وەریگرتووەو، هەمزە ئاغاش پەنای بۆ شێخ عوبەیدوڵڵا هێناوە. ئەگەر لەم روانگەیانەوە سەیری سەرهەڵدانی راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا بکەین ئەوا دەبێتە کاردانەوە، کە ئەوەش راپەڕینەکە لە هەر بەرنامەو پرۆژەو بوونی گوتارێکی نەتەوەیی دوور دەخاتەوە. بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە ناتوانرێت بەبێ ئاخاوتنی مەسەلەی ناسیونالیزم لە کوردستاندا باسی بوونی پرۆژەی نەتەوەیی و گوتاری سیاسی نەتەوەیی کوردی بکرێت.

راستە شێخ عوبەیدوڵڵا هەوڵی کۆکردنەوەی ژمارەیەك لە خێڵ و عەشیرەتەکانی کوردی داوەو نفوزی شێخایەتی و تەسەوفیش رێگا خۆشکەر بووە بۆ ئەو کارە. بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا شێخ عوبەیدوڵڵا رابەری بزوتنەوەیەکی ناسیونالیزمی کوردی بووە؟ ئایا گوتاری بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا گوتارێکی نەتەوەیی بووە؟ ئایا لە قۆناغی مێژوویی سەرهەڵدانی بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا، ناسیونالیزمی کوردی دەرکەوتووە؟ هەموو ئەم پرسیارانە پێویستیان بەوەڵامدانەوە هەیەو وەڵامی ئەم پرسیارانەش پێکەوە لەلایەك ناسنامەی راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا دەردەخات، لەلایەکی ترەوە زەمینە دەرەخسێنێ بۆ گفتوگۆکردنی گوتاری بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا.

شێخ عوبەیدوڵڵا پەیامێك بۆ باڵیۆزی بەریتانیا لە تەوریز دەنێرێت و تیایدا روانینی خۆی دەخاتەروو کە دەڵێت: نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی جیاوازە، ئاینیان لە ئاینی ئەوانی تر جودایە، یاساو نەریتیان جیاوازە[*] سەرۆك و فەرمانڕەوای کوردستان ئەگەر تورك یان فارس بێت، ئەوا یەکێ یان هەموان

یەکگرتوون و رازیین بەوەی کە ئەم مەسەلانە ناشێت بەم جۆرە بەردەوام بن لە نێوان حکومەتی (عوسمانی و قاجەری‌دا)، لەبەر ئەوە بە پێویست دەبێ شتێك ئەنجام بدرێت، حکومەتەکانی ئەورووپاش کە لەو مەسەلەیە تێگەیشتوون، پێویستە بەدوای ئەم حاڵەی ئێمەدا بچن دیسان ئێمە نەتەوەیەکی جیاوازین، دەمانەوێت کاری خۆمان لە دەستی خۆماندا بێت[٦].

دیارە ناوەرۆکی ئەم پەیامەی شێخ عوبەیدوڵا بۆ باڵیوزی بەریتانیا لە تەورێز بایەخێکی گرنگی هەیە چونکە لەلایەك ئەم پەیامە پەیامی رابەری راپەڕینەکەیە، لەلایەکی ترەوە لەکاتی دەستپێکردنی راپەڕینەکەدا ئەم پەیامە نووسراوە. راستە شێخ عوبەیدوڵا لەڕووی درەختی بنەماڵەوە سەیدەو دەچێتەوە سەر بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام. لەلایەکی ترەوە یەکێك بووە لە رابەرە دیاردەکانی رێبازی نەقشبەندی و نفوزێکی بەربڵاوی تەسەوفی هەبووە. لە ئاستی یەکەمدا بوونی درەختی بنەماڵە نەیتوانیووە ببێتە بەربەست لەڕێگای خۆجیاکردنەوەیدا لە عەرەب کە لەڕووی ئەو دۆکیومێنتە مەعنەوییەی درەختی بنەماڵەوە دەچێتەوە سەر ئەوان. لە ئاستی دووەمدا مەسەلەی تەسەوف نەیکردۆتە کەسێکی گۆشەگیری خۆتەرخانکردوو بۆ کاری تەسەوف و خەریکبوو بە پەیوەندی نێوان خۆی و خوای خۆیەوە، بەڵکو لای ئەم تەسەوف بووەتە هێزی جوڵێنەرو پاڵنەر بۆ خۆجیاکردنەوەو گەڕان بەدوای ناسنامەدا کە دەشێ ئەمەش بکرێتە خاڵێکی بەهێز بۆ نزیکی نێوان گوتاری رێبازی نەقشبەندی و گوتاری سیاسی نەتەوەیی کوردی.

شێخ عوبەیدوڵا بەپێچەوانەی میرەکانی پێشترو ئاغاو بەگەکانەوە باسی میرنشین و خێڵ و عەشیرەت و ناوچەو هەرێم ناکات بەڵکو بە وشەی (نەتەوە) دەست پێدەکات، بە واتا لە ئەستی ئەودا کورد هەمووی یەك پێکهاتەیەو یەك ناسنامەی هەیە کە ئەویش پێکهاتەی کوردی و ناسنامەی کوردییە. ئەم پێکهاتەیەش خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی، ئەو تایبەتمەندییەش مەبەست جیاکردنەوەی کوردە لەوانی تر. ئەمەش سەرەتایەکی باشە بۆ زەمینە

رەخساندن بۆ قسەکردن لەسەر ئەگەری دەرکەوتنو سەرهەڵدانی ناسیونالیستو ناسیونالیزمی کوردی، ئەگەرچی لەسەر ئاستی تاکە کەسیش بێت.

شێخ عوبەیدوڵڵا لە پەیامەکەیدا باسی جیاوازی کورد دەکات لەوانی تر لەڕووی ئایینیو دابو نەریتەوە، لەڕووی یاساوە، دروستبوونی هەستو پاشان هوشیاریو بەو پێیەش دروستبوونی عەقڵێك کە لەسەر بنەمای پایەی ئاینو کەلتورو شێوازی ژیان کورد لەوانی تر جیا بکاتەوە، ئەوە دەگەیەنێت کە زەمینەی خۆجیاکردنەوە لە ئارادایەو ئەوەش سەرەتایەکە بۆ لەدایکبوونی ئەو هێزە کۆمەڵایەتیەی کە بەهێزی ناسیونالیزم دەناسرێتو ناسنامەی خۆی لەوانی دی جیا دەکاتەوە.

هەڵبەت شێخ عوبەیدوڵڵا لە پەیامەکەیدا بیانووی رەوا دەهێنێتەوە بۆ جیاکردنەوەی کورد لەوانی تر، ئەویش لە پلەی یەکەمدا جیاواز بوونی کوردە لەوانی تر لەڕووی بنەما ئەنتۆلۆژییەکانی کوردو ئەوانی تریشەوە. لە ئاستی دووەمدا جیاوازی کورد لەوانی تر لەڕووی کەلتوورو پەیامی رۆحیو دابو نەریتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەهێنێتەوە کە دەری بخات مادەم کورد جیاوازە لەوانی تر کەواتە ناشێت لەگەڵ ئەواندا و لەژێر سایەی دەسەڵاتی ئەواندا بژی.

خاڵی گرنگتریش لەوەی سەرەوە باسکرا ئەوەیە کە شێخ عوبەیدوڵڵا دەڵێت ئێمە نەتەوەیەکی جیاوازین کەواتە دەبێ کاروباری خۆمان لە دەستی خۆماندا بێت. بە ولتا مەسەلەی جیاواز بوون لە روانینی شێخەوە بنەمایەکی سەرەکیو لە هەمان کاتدا سروشتیشە بۆ ئەوەی خۆمان بەرپرسیاری چارەنووسو کاروباری خۆمان بین، ئەم پەیامەی شێخ عوبەیدوڵڵا کە وەکو دەقێکی نووسراو ماوەتەوە بە بنەمایەکی دیاری گوتاری راپەرینەکەی شێخ دادەنرێت، چونکە وەکو دەقێکی نووسراو بارگاوی کراوە بە بیری خۆجیاکردنەوە لەوانی تر، هەروەها هەڵگری رەگەزەکانی دروستکردنی ناسنامەو کەسێتییەکی جیاوازە، کەسێتیەك کە خاوەنی تایبەتمەندی خۆی بێت. بەڵام ئەوەی جێگای

لەسەر وەستانە ئەوەیە ئایا شێخ لەو سەروەختەدا هەڵگری ئەم پەیامە بووە یان کۆمەڵی کوردەواری لەو سەروەختەدا گەیشتۆتە ئاستێکی ئەوتۆی پەرەسەندن کە ناسیونالیزم تیایدا بووبێتە هێزێکی کۆمەڵایەتی‌و هەڵگری پرۆژەی ناسیونالیزم کە ئەویش دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییە.

دیارە ئەوە ئاشکرایە شێخ عوبەیدوڵڵا وەکو رابەری بزوتنەوەیەکی بەربڵاو کە زیاتر لە خێڵ‌و عەشیرەت و ناوچەیەکی جوگرافی گرتۆتەوە، بەڵام ئەگەر سەیری واقیعی کوردستان بکەیت لە دواچارەکی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەوا گومانی تێدا نییە کە کۆمەڵگای کوردی لەو مێژووەدا لە بارێکی دواکەوتووی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و کەلتوریدا بووە بە جۆرێکی ئەوتۆ کە سەیرکردنی ئەم پێکهاتە لە روانگەی تیۆرە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەمانخاتە بەردەم گومانکردن لەوەی کە ئەم پێکهاتەیە خاسیەتی کۆمەڵگای هەبێت، هەروەها خاوەنی سیستەمێکی ئابوری‌و ئیداریش نەبووە کە لە روانینی تەقلیدییانەی مارکسییانەوە چینی بۆرژوا دەربکەوێت، هەروەها هیچ بنەمایەکی مۆدێرنێتە لەم پێکهاتەیەدا لەو قۆناغەدا بوونی نەبووە، هەتا ناسیونالیزم وەکو بەرهەمی مۆدێرنێتە دەرکەوتبێت. ئەوە ئاشکرایە کە ناسیونالیزم پەیوەستە بە نەتەوەوەو لە هەمان کاتدا ناسیونالیزم نەتەوە دروست دەکات نەك بە پێچەوانەوە، دەبێت دان بەوەدا بنرێت کە ناسیونالیزم بەشێوەیەکی گوڵبژێرانە فرە رۆشنبیری یاخود سامانی کەلتوری رابردوو دەخاتەگەڕ، کە لەرووی مێژووییەوە بە میرات ماوەتەوەو ئەم دێت لە رەگو ریشەوە دەیانگۆڕێت، ناسیونالیزم گیان بە بەر زمانە مردووەکاندا دەکاتەوە، سەر لەنوێ نەریتەکان دەخوڵقێنێتەوە، پاکژیە رەسەنە خەیاڵئامێزەکان دەگەڕێنێتەوە[٧].

بێگومان لەسەروەختی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا هێشتا کۆمەڵگای کوردی لە یەکەی خێڵ‌و عەشیرەت پێکهاتووەو بەپێی روانینی نوێ بۆ چەمکی نەتەوە، هێشتا نەبۆتە نەتەوە، راستە چەمکی تەقلیدی پێناسەی نەتەوە دەکات بەپێی زمانی هاوبەش‌و خاکی دیاری کراوو ئاین‌و مێژووی هاوبەش ،

بەڵام ئەو پێناسەی کە بەپێی چەمکی تەقلیدییانە بۆ نەتەوە دەکرێت ئەوەیە کە نەتەوە وەکو پێکهاتەیەکی سروشتی پەیوەندیدارو پەیوەست بەیەکەوە سەیر دەکات، کە دەشێ هەمان پێناسە بۆ زیندەوەرانی تری نێو سروشتیش راست بێت لەو روانگەیەوە کە جۆرێك لە کۆمەلایەتی بوونو هاو رەگەزیو هاو خاسێتیو هاونەریتیو هاوبەرژەوەندیان لە نێواندا هەیە. بوونی کورد لە سەرەتای مێژووی زانراوییەوە تاکو ساتەوەختی بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوللاو بۆ دواتریش بوونێکی سروشتیە نەك بوونێکی سیاسی ئایدیۆلۆژیو تەنیا ناسیونالیزم دەتوانێت ئەم پێکهاتەیە بگوازێتەوە بۆ ئاستی نەتەوە، بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوللا سەرباری ویستی نەتەوەییانە بەلام نەیتوانیووە کورد لەو پێکهاتەو یەکە بچوکانەوە بکاتە یەکەو پێکهاتەیەکی گەورەتری یەککرتوو، کە هەلگری پرۆژەی دەولەت بێت. هەلبەت لێرەدا ئاخاوتن لەنێوان دەولەتو نەتەوە یان دەولەتو ناسیونالیزمیشدا دێتە ئاراوە. هەرچەندە ئەوە ئاشکرایە لە رۆژهەلاتدا گەلێك دەولەت بەبێ بوونی ناسیونالیزم دروستبوون. بەلام لە کۆمەلگای کوردیدا ئەوە روویندداوە. ناسیونالیزمیش نەبۆتە هێزی دروستکەری نەتەوەو دەولەت، بە واتا گوتاری کوردی یان گوتاری راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوللا گوتارێکی ناسیونالیزمانە نەبووە، گوتارێك نەبووە کە جەستەی پەرتی خێزان، خێل، عەشیرەتی گواستبێتەوە بۆ تاکە یەك پێکهاتە کە ئەویش نەتەوەیە هەرچەندە زاراوەی نەتەوە بۆ خۆی جێگای گفتوگۆ لەسەرکردنەو پێناسەیەکی چەسپاویشی بۆ ناکرێت بەتایبەتی لەروانگەی تیۆرە کۆمەلایەتییە جیاوازەکانەوە، روانینی جیاوازیش بۆ نەتەوە هەیە ــ بەتایبەتی ئەگەر بروامان وابێت کە ناسیۆنالیزم نەتەوە دروست دەکات، ئەوا ئەو بنەماو پایانەی کە پێشتر بە رەگەزی دروستکردنی نەتەوە دادەنران ئێستا لە ئاستێکی تردا ناسیونالیزم وەکو سەرچاوە لێیان دەروانێت کە لەروانگەی هوشیارییەوە دەشێ ببنە یارمەتی دەری گەرانەوە بۆ پەیوەستبونەوە بەخودی ئەو بنەمایانەوە لەکاتێکدا، ئایدیۆلۆژیای ناسیونالیزم

پەیوەست بە کەلتوری نەتەوەوە دەخوازێ پەیبردن بە مێژووەکەیو بوژانەوەی زمانە میللییەکەی لەڕێگەی بوارەکانی فیلۆلۆژیو لیکسیکۆگرافیو بڕەودان بە کەلتور[٨]، بە هەموو ڕەگەزەکانییەوە بکاتە بنەمایەك بۆ دروستکردنی شوناس، مەبەست لە شوناسیش جیاکردنەوەی خۆیەتی لەوانی تر.

لەبزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵلادا نە ئەو پەیوەستبوونو گەڕانەوەیە بۆ کەلتور هەبووە، نە هوشیاری کۆمەلایەتی بەو جۆرە ئامادەبوونی هەبووە کە بزوتنەوەیەکی سیاسی کۆمەلایەتی بەرهەم هێنابێتو ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی بوبێتە ئایدیۆلۆژیەکی بڵاوو بالادەست لە کۆمەلگاداو نوێنەرایەتی نەتەوەو کەلتوری نەتەوایەتی کردبێت. کە ئەوەش بەرهەمهێنانی گوتاری نەتەوەییە کە مەبەست لە گوتاری نەتەوەیش لێرەدا گوتارێکی کۆمەلایەتی سیاسییەو بارگاوییە بە پرۆژەی ناسیونالیزم کە ئەویش لەچوارچێوەی سەربەخۆییو یەککرتنەوەو دروستکردنی دەوڵەتی یەککرتووی سەربەخۆی کوردیدا خۆی دەبینێتەوە.

بێگومان لە راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلاو لەو قۆناغە مێژووییەی ژیانی کۆمەلگای کوردیدا هیچ کام لەو ڕەگەزو خاسێتانە ئامادەبوونیان نەبووە کە ئێمە بۆ ئاخاوتن لەسەر ناسیونالیزمو گوتاری نەتەوەیی کوردی پێویستمانە، دیارە ئەوەش ئاشکرایە سەرباری بوونی سەرچاوەی ئەفسانەیی بۆ ناسیونالیزم، ناسیونالیزم لەسەر زەمینەی واقیع وەکو هێزو ئایدیۆلۆژیاو بزوتنەوەیەکی سیاسی کۆمەلایەتی دەردەکەوێتو ئامادەبوونی دەبێتو جێکەوت ئاسەواری پرۆژەکەی دەردەکەوێت، ئەویش لەمیانەی کارکردنو جولاندنو هەوڵدانییەوە بۆ پیادەکردنی پرۆژەکەی کە دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیە، یان وەکو هەندێ لە کۆمەڵناسان دەڵێن دروستکردنی نەتەوەیە، لە راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلادا کۆمەلگای کوردی لەڕووی کۆبوونەوەوە وەکو هێزێکی جەماوەری ئامادەبوونی نەبووە، راستە، شێخ توانیوویەتی هەندێ

خێڵو عەشیرەت کۆ بکاتەوە، بەڵام ئەوە دەوری تاکە کەسی شێخ خۆیو نفوزی رێبازی تەسەوفی نەقشەبەندی بووە کە بواری بۆ شێخ خۆشکردووە بتوانێت هێزی خێڵو عەشیرەتەکان کۆبکاتەوە، نەك لە بنەرەتدا ناسیونالیستی کوردی بەجۆرێك دەرکەوتبێت کە بووبێتە هێزێکی کۆمەڵایەتی هوشیاری جەماوەریو وەکو بزوتنەوەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتی راپەڕینی دەستپێکردبێتو هەوڵی جێبەجێکردنی پرۆژەکەی بدات، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو هێزە کۆمەڵایەتیە هوشیارە ئامادەبوونی نەبووە، بەڵکو ئەوەی کە خاوەنی هوشیاریی تەواو بووە بۆ بزاوتنو جوڵاندنی راپەڕینەکە خودی شێخ عوبەیدوڵلا خۆی بووە. "کەسێك دەتوانێت هوشاری نەتەوەیی باشی هەبێت بەبێ ئەوەی کە خاوەنی سیمبۆلیزم یان بزوتنەوە یان ئایدیۆلۆژییەك بێت کە نوێنەری نەتەوە بێت"[9] بێگومان ئەم قسەیە ئەگەر لە مێژووی راپەڕینەکانی کوردیدا لێکدانەوەی بۆ بکەین ئەوە بۆمان دەردەکەوێت وتەیەکە شایانی لەسەر وەستانە چونکە راستییەکی زۆری تێدایە.

دەشێ بەدرخانیەکان لەسەروەختی راپەڕینەکەیاندا کە نزیکەی سێ دەیە زیاترێ پێش راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلا بووە وەکو تاکە کەسێ هەمان هوشیارییان هەبووبێت، شێخ عوبەیدوڵلاش خاوەنی ئەو هوشیارییە تاکەکەسیە بووە کە دەشێ لەسەر ئاستی تاکەکەس وەکو کەسێکی ناسیونالیست لێی بڕوانرێت. بەڵام ئەمە لەکاتێکدایە کە ناسیونالیست وەکو هێزێکی کۆمەڵایەتی سیاسی ئامادەبوونی نییە، هەر بەو پێیەش گوتاری ناسیونالیزم غائیبە. ئەمەش ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی کۆمەڵگای کوردی سەردەمی راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلایە، دیارە هۆیەکی سەرەکی هەرەسی راپەڕینەکانی کورد لە رابردوودا ئەوە بوو کە نفوزی تاکە کەسی رابەر یان سەرکردە کۆکەرەوەی هێزی جەماوەری بووە بۆ راپەڕینەکان نەك هۆشیاری کۆمەڵایەتیو پاڵنەری ئایدیۆلۆژیو سیاسی. ئەمە جگە لەوەی کە هۆکارێکی تری راپەڕینەکانی کورد کاردانەوە بووە بەرامبەر بە سیاسەتی توندو تیژوو

درێندانەی داگیرکەرەکانی کوردستان. تەنانەت یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا خراپتربوونی بارودۆخی کوردستان بوو لەدوای شەڕی عوسمانیو ڕوسیا لەساڵی (١٨٧٧ــ١٨٧٨)و بەشداریکردنی شێخ عوبەیدوڵڵاو بەشێك لە خێڵو عەشیرەتەکانی کورد لەو شەڕەدا ـ دیارە چ شێخ عوبەیدوڵڵاو چ ئەو خێڵو عەشیرەتە کوردانەی تریش کە بەشداری ئەو شەڕەیان کرد لەسەر داوای سوڵتان عەبدولحەمید بوو.

لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە شێخ عوبەیدوڵڵا هێندە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا ناکۆك نەبووەو ئامادە بووە لە سەنگەری ئەم دەوڵەتەدا شەڕ بەدژی دەوڵەتی ڕوسی بکات. تەنانەت بەڵگەی ئەوەش هەیە کە شێخ عوبەیدوڵڵا مەیلی ئەوەی هەبوویێت کە بەدڵسۆزی بۆ دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتی عوسمانی بمێنێتەوەو لەسایەی قەڵەمڕەوی عوسمانیەکاندا کاروباری کوردستان یان بەشێك لە کوردستان بەڕێوە ببات. لە ڕۆژی (٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨٠دا کاپتن کلاتین بۆ مەیجەر ترۆتەر دەنووسێت: سامیح پاشان، پێی ڕاگەیاندم کە شێخ عوبەیدوڵڵا سوێندی بە قورئان خواردووە کە دڵسۆزیێت بۆ سوڵتان[10] لێرەدا دەشێ وای لێکبدەینەوە کە شێخ بە هیوای ئەوە بوویێت بە پشت بەستنو دڵسۆزی بۆ سوڵتانو دەوڵەتی عوسمانیو لەسایەی ئەو دەوڵەتەدا هەوڵبدات لە ناوخۆی کوردستاندا دەسەڵاتێك بگرێتە دەست، دیارە شوێنو جوگرافیای دەستپێکردنی ڕاپەڕینەکەش کە سنووری دەسەڵاتی ئێرانی بووە دەبێتە بەڵگەی سەلماندنی ئەو بۆچوونەی کە شێخ نەیوویستووە پشت بکاتە تورکەکان. لێرەوە گوتاری کوردی لەسەردەمی بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا دەکەوێتە بەردەم پرسیاری یەکلاکەرەوەوە. پرسیار لە شوناسی ئەو گوتارەو بەستنەوەی بەو شێوەیەی سیاسەتکردنی شێخ عوبەیدوڵڵاوە، کە ئەویش پشت بەستن یان بەلایەنی کەمەوە دۆستایەتی کردن یان دژایەتی نەکردنی داگیرکەرێکی گەورەی کوردستان کە شێخ خۆی لەو جوگرافیایەدا ژیاوەو لەبری ئەوە ڕاپەڕین لە بەشێکی تری کوردستان بکات

بۆچی ئێی دەوڵەتی داگیرکەری سەر ئەو بەشە راپەڕین ناکات کە خۆیی لێ دەژی؟، ئایا ئەمە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە فاکتەری مەزهەب لە پشتی ئەو هەڵوێستەو راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵاوە بوویێتو فاکتەری هوشیاری نەتەوەیی‌و ناسیونالیزمی کوردی‌و بەو پێیەش گوتاری ناسیونالیزمی کوردی لە ئاستی نەبووندابووبێ.

بێگومان هەندێ لەوانەی لەسەر راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵایان نووسیووە پێیان وایە راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لە بزووتنەوەی کوردیدا.. خەباتی گەلی کورد بە رابەری شێخی نەهری چووە قۆناغێکی نوێوە کە دەگونجێ بە سەرەتای گۆڕانی هەستی نەتەوەیی کورد بۆ هۆشی نەتەوەیی‌و دانانی بناغەی سەرەتا گشتییەکانی چوارچێوەی ستراتیژی کاری نەتەوەیی کورد لەپێناوی رزگاری‌و یەکگرتنەوەو پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆدا دابنرێت[11]. لەژێر فشاری بەریتانیاو روسیادا، تورکیا هاریکاری کرد لەگەڵ ئێراندا (فارس)داو هەوڵی شێخ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کۆتایی پێهات[12] شێخ عوبەیدوڵڵا لە کۆتایی مانگی تەمموزی ساڵی (١٨٨٠)دا لەشەمدینان کۆبوونەوەیەکی بۆ سەرجەمی سەرۆکەکانی کوردستان (سەرخێڵ‌و سەرۆك عەشیرەتەکان) رێکخست کە تیایدا مەسەلەی یەکێتیی هەموو خێڵەکانی کورد خرایە روو[13]. هەر لەوێوە داوای دروستکردنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆی کوردییان لە ئێران کرد تاکو ببێتە ناوکێك لە داهاتوودا هەموو خاکی کوردستانی تورکیا پەیوەستبێت پێیەوە[14]. شێخ عوبەیدوڵڵا لای زۆر کەس وەکو یەکەم ناسیونالیستی گەورەی کوردی دەمێنێتەوە(١٥).

ئەگەر سەرنجی ئەم چەند وتەیە بدەین ئەوا جۆرێك لە نزیکی لەنێوانیاندا هەیە کە ئەویش وەکو خاڵی هاوبەشی نێوانیان دەردەکەوێت کە بەگشتی پێیان وایە شێخ عوبەیدوڵڵا رابەرێکی نەتەوەیی کورد بووەو هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی داوە. ئەم قسەیە بۆ کەسێتی شێخ روویەکی

راستی هەیە، بەڵام ناشێت تەسەوری بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بکرێت لە دەرەوەی بوونی ناسیونالیزم، هەروەك بەبێ بوونی ناسیونالیزمیش ناکرێت تەسەوری بوونی گوتاری نەتەوەیی بکرێت، شێخ وەکو تاکەکەس هوشیاری نەتەوەیی هەبووە، بەڵام لە واقیعێکدا ژیاوەو ویستویەتی راپەڕین بکات کە ناسیونالیزم دەرنەکەوتووەو کورد لە پێکهاتەی پەرتبووی خێڵو عەشیرەتەوە نەگواستراوەتەوە بۆ یەکەیەکی یەکگرتوو کە نەتەوەیە بەواتا لەسەردەمی راپەڕینەکەی شێخی نەهریدا کورد وەکو نەتەوە پێکنەهاتووە.

دیارە کۆکردنەوەی سەرخێڵو سەرۆك عەشیرەتو رابەری رێبازی تەسەوف، بەبێ بوونی ناسیونالیزم بەهێزێکی کۆمەڵایەتی جەماوەری ناتوانێت بەلوای داواو ویستە ناسیونالیستییەکاندا بچێت. راستە شێخ عوبەیدوڵڵا هەوڵیداوە پشتگیری خێڵو عەشیرەتەکان بەدەست بهێنێتو هێزی خێڵو عەشایەری ئەوان کۆبکاتەوە بۆ راپەڕینەکەی، بەڵام ئەو قۆناغەی کە راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا تیایدا سەری هەڵداوە قۆناغێکە لە کوردستاندا خێڵو عەشیرەت تموحی دروستکردنی میرنشینی نەماوە چونکە ئەو قۆناغە بەسەرچووە هەروەك تموحی یان توانای دروستکردنی دەوڵەتی خێڵیش نەماوە چونکە خێڵی کوردی نە لە رابردوداو نە لەسەردەمی راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا نەیتوانیووە فیدراسیۆن دروست بکاتو لەرووی ویستێکی ئازادانەوە نەیویستووە یان نەیتوانیووە بەرەو یەکگرتن بچێت، بۆیە ئەو هەوڵەی شێخ عوبەیدوڵڵاش بۆ کۆکردنەوەی خێڵو عەشیرەتەکان جگە لە شتێکی کورد تەمەنی کاتی بێ بەرهەم هیچێکی تر نەبووە، ئەمەش بەرەو ئەو بۆچوونە دەمانبات کە گوتاری کوردی لەسەردەمی راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا گوتارێکی خێڵایەتی پەرتی گۆشەگیری داخراو بووە کە فەزای ناوچەیی دەسەڵاتی بەسەردا کردووەو رۆحی جوڵاندنیشی کاردانەوە بووە نەك پرۆژە، چونکە لە زەمینەیەکدا کە ناسیونالیزم ئامادە بوونی نەبێتو فیدراسیۆنی خێڵایەتی نەیتوانی بێت دەوڵەتی خێڵ دروست بکاتو پەیامی ئایین نەیتوانی

بێت ببێته بنەما بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئایینیو کۆمەڵگا لە دابەشبوونو زۆر دەستەیدا مابێتەوە ناتوانرێت باسی بوونی گوتاری نەتەوەیی بکرێت چونکە لە ئاستی یەکەمدا گوتاری نەتەوەیی پەیوەستە بەبوونی نەتەوەوە، نەتەوەش بەپێی روانینی مۆدێرنێتە ناسیونالیزم دروستی دەکات، کە ئەوەش نەك بۆ ئەو سەردەمە بەڵکو بۆ ئێستاش لە کوردستاندا مایەی گومانە.
بێگومان لەدوای شکستی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا، شێخ خۆی بەرەو چارەنووسێکی نادیار چووە، بە کۆتایی هاتنی خۆیشی هەموو ئەو خێڵو عەشیرەتانەی کە پێشتر کۆبوونەوەیان لەگەڵ شێخ کردبوو، هێزی بەشێك لەو خێڵو عەشیرەتانەش بەشداربوون لە راپەرینەکەدا، کەچی لەگەڵ نەفی کردنی شێخ بۆ ئەستەمبوڵو پاشانیش گەیشتنی بە حیجازو مردن یان کوشتنی لەوێ، سەرجەم ئەو خێڵو عەشیرەتانە پاشەکشێیان لێکرد، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بیروباوەڕ یان ئایدیۆلۆژیا یان تەموحی نەتەوەیی لەنێو هێزی راپەریوو لەنێو کۆمەڵگای کوردی ئەوکاتەدا ئامادەبوونێکی ئەوتۆی نەبووە کە لەلایەك مۆتیڤی بزوێنەری راپەرینەکە بووبێتو لەلایەکی تریشەوە بووبێتە پاڵنەر بۆ دروستکردنی هێزێکی جەماوەری هوشیار کە بشێت ناوی بزوتنەوەی لێ بنرێت، ئەمەش هەڵهێنجراوی واقیعی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیو کەلتوری دواکەوتووی ئەوکاتەی کوردستانە، کە ناسیونالیزم بوونی نەبووەو بەو پێیەش گوتاری نەتەوەیی لە ئاستی نەبووندا بووە.
ئەم بارودۆخە دواکەوتووەو غیابی ناسیونالیزمو غیابی پرۆژەی کورد تەنانەت ئەگەر پرۆژەی خێڵایەتی کوردیش بوایە وایکردووە هەموو راپەرینەکە لە کەسێتی شێخ عوبەیدوڵڵادا کۆببێتەوە هەر بۆیە بە نەفی کردنی ئەو وەك سەرکردەی راپەرینەکە ئیتر شتێك نامێنێتەوە بەناوی هێزی راپەریو کوردییەوە، کەواتە ئەو گۆڕانکارییە چییە کە هەندێ نووسەری کورد پێیان وایە راپەرینی شێخ عوبەیدوڵڵا سەرەتایەکی نوێیە لە مێژووی کورددا. راستە هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی خێڵو عەشیرەتی کوردیو تەموحی دروستکردن

دەسەڵاتێکی کوردی لەسایەی دەسەڵاتی سوڵتانداو رەنگە لەپشتی ئەوەشەوە ئارەزووی سەربەخۆیی لای شێخ عوبەیدوڵلا خۆی وەکو تاکەکەس هەبووبێت، بەڵام لەسەر ئاستی جەماوەرىو لەرووی هوشیاری کومەڵایەتییەوە راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەو بەرێوەبردنو روانینی سەردەمی میرنشینی کوردی دا کە هەرەسی هێناوە ئیتر جەماوەری بەدەورەوە نەبووە، بە هەمان شێوە راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلاش لەگەڵ شکست هێنانو دەستگیرکردنو دوورخستنەوەی رابەرەکەیدا ئەویش کۆتایی پێهاتووە بۆیە لەرووی پێکهاتەی کومەڵایەتیو بەرنامەو لەرووی ئامادەنەبوونی ناسیونالیزمو نەبوونی پرۆژەی ناسیونالیزمو دروست نەبوونی نەتەوەوە کورد لەو قۆناغەدا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووەو خودی راپەرینەکەش بە هەموو پێوانەیەك راپەرینێکی خێڵایەتی شێوەکاردانەوەی بێ بەرنامەی ناجەماوەری خاڵی لە پرۆژەو لە هوشیاری سیاسیو نەتەوەیی بووە.

بەدوای شکستی ئەم راپەرینەدا قۆناغێکی ترسناکتر لە مێژووی کورددا دەست پێدەکات کە قۆناغی پاڵدانە بە ئەوی داگیرکەرەوە، قۆناغی خۆسپاردنە بەوی داگیرکەرو کار بۆ کردنو گوێ رایەڵییە بۆ هەموو فەرمانو بەکارهێنانێك کە ئەوەش لە مێژووی سیاسی کوردیدا بە زاراوەی (جاشێتی) ناوەبرێت. دەرئەنجامی ئەو بۆشاییەی کە لە روخاندنی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلاوە دروستبوو، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم پرۆژەیەکی ترسناکی بەگوێرەی کورد خستە بواری پراکتیکەوە ئەویش دروست کردنی سوارەی حەمیدییە بوو، لەساڵی ۱۸۹۱دا سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانی دروستکردنی هێزێکی سوارەی غەیرە نیزامیدا لە ئەنادۆڵ کە بەناوی خۆیە، ناوی سوارەی حەمیدییەیان لێنرا[١٦] سوڵتان بەناوی ئیسلامبوونی هەمووانەوە هەوڵی دامەزراندنو کۆکردنەوەی گەورەترین ژمارەی کوردیدا لەچوارچێوەی سوارەی حەمیدیەدا کە ئەویش لە هەڵبژاردەیەك لە خێڵە کوردە سونییەکان پێکهات.

ئەمەش لەلایەك دابەشكردنی كورد بوو بۆ سوننەو شیعەو لە هەمان كاتیشدا هەوڵێك بووە بۆ ئاراستەكردنی كوردی سوونە بەدژی دەسەڵاتی شیعەی فارسیو تەنانەت كوردی شیعەش. كە ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو لێكدانەوەیەی كە دەشێ بڵێین لە بنەڕەتدا راپەڕینەكەی شێخ عوبەیدوڵڵاش لە سنووری دەسەڵاتی فارسەكاندا توركەكان هاندەرو دروستكەری بووبن، یان بەلایەنی كەمەوە دژی نەبووبنو ئاراستەوخۆ وەكو بەشێك لە سیاسەتو ستراتیژی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بە فارسەكان سەیریان كردبێت. هەرچەندە بۆچوونی لەو جۆرەش هەیە كە پێی وایە سوارەی حەمیدیە قۆناغێكی تری ناسیونالیزمی كوردییە[٢٧] بە هەر حاڵ سوارەی حەمیدیە دوورو نزیك گوزارشت لە بوونی ناسیونالیزمی كوردی ناكات بەڵكو بە پێچەوانەوە. دروستبوونی سوارەی حەمیدیە بەڵگەیەكی ئاشكرایە بۆ دروست نەبوونی ناسیونالیزمی كوردی بۆیە ژمارەیەكی گەورەی كورد لەژێر كاریگەری پڕوپاگەندەی ئیسلامبوونی هەمووماندا چ بۆ دەوڵەتی عوسمانی هەڵدەگرنو دەبنە بەشێك لە هێزی سەركوتكەرو داپڵۆسێنەری ئەو دەوڵەتە، دوای یەك سەدەی تەواو (١٨٩١_١٩٩١) دەوڵەتی نوێی تورك هەمان سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دووبارە دەكاتەوە بە دروستكردنی پارێزەرانی گوند لە كوردەكان، ناسنانەی پارێزەرانی گوند ناسنامەی جاشێتییە بە زاراوەی باوی نێو كۆمەڵگای كوردی، بە هەمان شێوە سوارەی حەمیدیەش جۆرێك بوون لە جاش. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە نەك لەدوا دەیەی سەدەی نۆزدەیەمدا، بەڵكو لەدوا دەیەی سەدەی بیستیشدا ناسیونالیزمی كوردی بەتەواوی وەكو هێزێكی جەماوەری دەرنەكەوتووە، بە هەر حاڵ گوتاری كوردی ئەگەر لەسەر وەختی راپەڕینەكەی شێخ عوبەیدوڵڵادا گوتارێكی خێڵایەتی گۆشەگیری پەرتی كاردانەوە بووبێت، ئەوا ئەو گوتارە لە دروستبوونی سوارەی حەمیدەدا گوتارێكی خۆبەدەستەوەدەری پشتكردوو لە نەتەوە بووەو گوتارێك بووە هەوڵیداوە

خۆی لەنێو گوتاری پان تورك ئیسلامی دەوڵەتی عوسمانیدا بتوێنێتەوە. ئەمەش دیاردەیەکە تەنیا لە غیابی ناسیونالیزمو گوتاری نەتەوەییدا روو دەدات. بۆیە دەتوانین بڵێین قسەکردن لەسەر گوتاری نەتەوەیی لەسەردەمێکدا کە ناسیونالیزم ئامادە بوونی نەبێت وەکو جۆرێك لە گومان سەیر دەکرێت.. گوتار تەسەورێك یان تیۆرییەك پێکناهێنێت، بەڵکو بریتییە لە سیستەمێك یان پراکتیك کردنێك کە ملکەچی یاساو رێسای تایبەتیو پێوانەی جێگیرە[18] ئێستا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا ئەوەی کە ئێمە بە گوتاری نەتەوەیی ناوی دەبەین نەك بۆ سەردەمی شێخ عوبەیدوڵلاو سوارەی حەمیدیە بەڵکو ئێستاش لە نێوەندی سیۆسیۆ رۆشنبیری کوردیدا بوونی هەیە؟

لێرەدا پرسیارێکی تر سەبارەت بە گوتاری دوای هەرەسی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلا سەرهەڵدەدات، ئایا ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی گوتاری شکست کە دواتر گوتاری خۆبەدەستەوەدانو تواندنەوەی لەنێو گوتاری تورکی ئیسلامیدا بەرهەم هێنا بۆ قۆناغەکانی دواتر چی بوو؟ لە بەشەکانی دواتردا دەشێ ڕەهەندەکانی بخرێتە سەر وەلامی ئەم پرسیارە چونکە ئەم ئاراستە ئیشکردنە ئامادەبوونێکی بەردەوامی هەبوو لە مێژووی سیاسی کورداو بەو پێیەش لە گوتاری کوردیدا ئامادەبوونی هەیە.

# سەرچاوەکانی بەشی (٩)

1- David McDowall – A Modern History of the Kurds – London, 2000, p.53.
2- Martin Van Brinessen – Agha, Shaikh and State Zed Books- London – New Jersey, 1992-p 23.
3- David MacDowall- A Modern History of the Kurds p.53.

٤- لە تاریکییەوە بۆ رووناکی ـ بەڵگەنامەکانی شۆرشی ١٨٨٠ ـ وەرگێرانی جەمال عەزیز ـ سلێمانی ١٩٩٩ ـ ل٤٦.

٥- هەمان سەرچاوە ـ ل٢٩.

6- David MacDowall – A Modern History of the Kurds p.53.

٧- رەهەندەکانی ناسیونالیزم ـ وەرگێرانی ئارام جەمال ـ سلێمانی ٢٠٠٤ ـ ل١٢٢.

٨- ئەنتۆنی دی سمس. نەتەوەخوازی ـ وەرگێرانی هوشیار سیوەیل هەولێر ـ ساڵی ٢٠٠٠ ل١٦.

٩ـ هەمان سەرچاوە. ل١٥.

١٠ـ لە تاریکییەوە بۆ رووناکی ـ و. جەمال عەزیز ـ ل٢٩.

١١ـ ساڵح محەمەد ئەمین ـ کوردو عەجەم (مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێمان ـ بەغداد ـ ١٩٩٢ ـ ل١٥٢).

12- Derk kinnance- The Kurds and Kurdistand, ondon- 1964- p.24.

١٣- م.س. لازاریف ـ المسألة الكردية (١٨٩١-١٩١٧) ترجمة. أكبر أحمد سليمانية ـ ٢٠٠١ ـ ص٥٢.

14- David MacDowall – A Modern History of the Kurds p.53.

15- MacDowall – A Modern History of the Kurds -- p.53.

16- Ibid. p.59.

١٧- رۆبێرت ئۆلسن ـ راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ـ وەرگێڕانی ـ ئەبوبەکر خۆشناو ـ سلێمانی ـ ١٩٩٩ ـ ل ٢١.

١٨ـ محمد شوقي الزين ـ تأويلات و تفكيكات ـ المركز الثقافي العربي ـ بيروت ٢٠٠٠ ـ ص١١٧.

لەبەر ئەوەی زۆرێك لەوانەی باسی هەستو هوشیاری نەتەوەیی کوردیان کردووە[1] یان باسی دەکەن حاجی قادر بە رابەری ئەو مەسەلەیە دەزانن[2].
بۆیە جێگای خۆیەتی لە روانگەی ناسیونالیزمو گوتاری نەتەوەیی کوردییەوە ئاخاوتنی شوێنی حاجی قادر لەسەر جوگرافیای سیۆسیۆ رۆشنبیری کوردیدا بکەینو ئاستی ئامادەبوونی ئەو لە پێشکەشکردنی دەقی زیندووی بارگەکراو بە فیکرو جیهانبینی دیاری بکەین، ئەوەش بەبێ بەستنەوە بەو دەقانەوە کە بەرهەمی هێناون ناگاتە ئەنجام، هەروەك ناشکرێت حاجی قادر لەو قۆناغی مێژووییە پەرت بکرێت کە تیایدا ژیاوە، بەڵکو دەبێت لە چوارچێوەی ئەو قۆناغە مێژووییەدا قسەی لەبارەوە بکەین کە کۆمەڵگای کوردی تێدا بووە.

حاجی قادر کە لە دەوروبەری ساڵی (١٨١٦)دا لە گوندی گۆڕقەرەجی سەروشارۆچکەی کۆیە لەدایکبووەو ئاشکراشە ئەم مێژووە ئاخاوتنی زۆری لەسەرە، حاجی قادر لە مزگەوتەکانی کوردستان خوێندویەتیو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو ماوەیەکی زۆر لە رۆژهەڵاتی کوردستان ماوەتەوەو پاشان گەڕاوەتەوە شارۆچکەی کۆیەو لەوێشەوە بەیەکجاری سەفەری کردووە بۆ ئەستەمبوڵو نەگەڕاوەتەوە.

ئەوە ئاشکرایە کە تەمەنی هەرزەکاری حاجی کە لە کوردستان بووە هەردوو میرنشینی بابانو ئەردەڵانو میرنشینی سۆرانی سەردەمی پاشا کۆرە لە دەسەڵاتداربوون، ئایا پەیوەندی حاجی بەم سێ دەسەڵاتەوە چی بووە، کە سۆرانو بابان نزیك زێدو شوێنی ژیانی ئەوبوونو پاشانیش حاجی بۆ خوێندن چووەتە سنووری دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵان، ئایا حاجی پەیوەندی چۆن بووە لەگەڵ ئەم دەسەڵاتە ناوچەییانەی کورددا؟ ئایا روخاندنی ئەم دەسەڵاتانەی کورد هیچ کاریگەرییەکی لەسەر حاجی هەبووە، لەکاتێکدا کە لەسەروەختی روخاندنی ئەو میرنشینانەدا حاجی هەستی بە بوونی ئەو دەسەڵاتە کوردییانە کردووە.

بێگومان لەبەرهەمی شیعری حاجی دا بەتایبەتی ئەو کاتەی کە لە کوردستان بووە هیچ بەڵگەیەك بۆ خۆشوویستن یان پەیوەستیبوون بەو دەسەڵاتانەوە نابینرێت، ئەوەش جێگای پرسیارە ئەگەر حاجی قادر کەسێکی هەستیارو روناکبیری سەردەمەکەی خۆی بوویێت بۆچی دەبێت هیچ بەڵگەیەکی شیعری لەئارادا نەبێت کە پەیوەستبوونی ئەو بەو دەسەڵاتانەوە بخاتەروو، یان لەبارێکی تردا ئایا دەشێ سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی لای تاکو کۆمەڵیش لە چرکەساتێکدا دروست ببێتو پەیوەندی نەبێت بە پێشینەی مێژوویییەوە، کانت پێی وایە "پێشینە وەکو چەمکێك چوارچێوەیەکی وێنەیی‌و پێویستو گشتگرە بۆ هەموو ئەزموونێکی شیاو[3] پێشینە هەمیشە دەکەوێتە پێش ئەزموونەوەو وەکو مەرجێکی سەرەکی ئەزموون سەیر دەکرێت بە جۆرێك کە دەتوانرێت بگوترێت: ئەوە پێشینەیە کە ئەزموون بنیاد دەنێت[4] لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو لێکدانەوەیەی کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی پێشترو ئاستی پەرەسەندنی کەلتوری‌و ئامادەبوونی هەستو هوشیاری‌و بوونی جۆرێك لە هەستو هوشیاری نەتەوەیی‌و سیمای بوونی ناسیونالیزم با لاوازیش بێت وەکو پێشینە سەیر بکەن سەبارەت بەوەی کە حاجی قادر وەکو خاوەن ئەزموونی ناسیونالیزم لە نێوەندی سیۆسیۆ رۆشنبیری کوردیدا دادەنرێت. بێگومان ئەو پێشینە کۆمەڵایەتی‌و مێژوویی‌و کەلتورییە ئامادەبوونی نەبووە، لە هەمان کاتدا لەسەر ئاستی تاکەکەسی خۆیشی حاجی قادر هەتا لە کوردستان بووە کە تەمەنی لە چل ساڵان تێپەڕی کردووەو جۆرێك لە جووڵەو ململانێ لە کوردستاندا هەبووە لەنێوان میرنشینەکانی بابان‌و سۆران‌و ئەردەڵان لەلایەکو تورك‌و فارسەکانیش لەلایەکی ترەوە، ئەو هیچ ئامادەبوونێکی نەبووەو تەنانەت نە لەنێو دەقەکانیداو نە لە دەرەوەی دەقەکانیشیدا هیچ هەڵوێستێکی لایەنگرانەی بۆ ئەو دەسەڵاتە کوردیانە نییە کە ئەوە بەلایەنی کەمەوە دەشێ جۆرێك لە هەستی لاوازی نەتەوەیی نیشان بدات، وەکو چۆن لای نالی لە چەند شیعرێکداو لای سالمیش بە ئاشکراتر ئەو هەستە دەردەکەوێت.

نالی‌و سالم سەرباری ئەوەی کە کەمێك پێش حاجی قادر بوون بەڵام چاودێرو بگرە بەشداریش بوون لە ململانێ‌و کێشەکانی سنووری میرنشینی بابانداو روخاندنی میرنشینەکەش وەکو کارەسات‌و ترازیدیایەکی ترسناك باس دەکەن لە هەردوو چامەکەیانداو تەنانەت سالم دیارترین شیعری باسی وێرانبوونی قەڵەمڕەوی بابان دەکات. ئایا نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی بەشداری‌و ئامادەنەبوونی حاجی لەو قۆناغەدا سەلماندنی ئەوە نییە کە حاجی لەسەر ئاستی تاکەکەسیش هیچ پێشینەیەکی نەبووە بۆ ئەوەی ئەزموونی لەسەر بنیاد بنێت؟

بە هەر حاڵ ئەوەی حاجی قادر لە نالی‌و سالم جیا دەکاتەوە سەرباری ئاستی جیاوازی داهێنان کە حاجی ئاستێکی لاوازی شیعری هەیەو لەبەرهەم هێنانی شیعریەتدا زۆر لە خوار ئاستی نالی‌و سالمەوەیە دیسان ئەوەیە کە نالی‌و سالم لەسەر خاك‌و زێدی خۆیان پەیوەستبوونی خۆیان بەدەسەڵاتی میرنشینەوە نیشانداوە، بەڵام حاجی هەتا لەسەر خاکی خۆی‌و لە زێدی خۆیدا بووە هیچ پەیوەستبوونێکی بە دەسەڵاتەکانی ئەوکاتەی کوردەوە نیشان نەداوە، لە هەمان کاتدا هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆش لە شیعری ئەو قۆناغەی حاجیدا بەدی ناکرێت کە هێشتا لە کوردستان بووە، لە مەسەلەی نەتەوە دوا بێت واتە ئاستێکی بەرفراوانترو رووبەرێکی بەرفراوانتری لەچاو رووبەری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی سنوورداری میرنشیندا گرتبێتەوە، بە واتایەکی دی ئەگەر حاجی لەبەر ئەوە بووایە کە پەیوەستبوون‌و لایەنگیری بۆ دەسەڵاتی میرنشینەکانی سەردەمی خۆی نیشان نەدایە چونکە ئەو بڕوای بە دەسەڵاتی ناوچەگەری‌و سنوور تەسکی میرنشین نەبووایەو وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو سەیری نەتەوەی بکردایەو شیعرەکانیشی هەڵگری گوتاری نەتەوەیی بوونایە، ئەوە دەشیا حاجی وەکو شاعیرێکی ناسیونالیست سەیر بکەین‌و گوتاری شیعری حاجی بەگوتاری نەتەوەیی کوردی ناوببەین. بێگومان لە بەرهەمی شیعری حاجیدا بۆ ئەو قۆناغەی ژیانی کە لە کوردستان بووە هیچ بەڵگەیەك بۆ رەتکردنەوەی

دەسەڵاتی خێڵایەتی میرنشینو داکۆکیکەری دروستکردنی یەک دەسەڵاتی کوردی لەسەر ئاستی نەتەوەی نابینرێت، بە واتا لەو کاتەدا کە نالیو سالمو کوردی بەرهەمهێنی گوتارێکی سیاسی بوون کە خاسێی ناوچەگەریو رووبەری تەسکی قەڵەمڕەوی بابانی هەبووە، حاجی خاوەنی گوتارێکی رووبەر فراوانی نەتەوەیی نەبووە. تەنانەت حاجی لەو شیعرەیدا کە بەناوی (شەهسەواری بەلاغەتی کوردان)ەو تیایدا ناوی ئەو شاعیرانە دەهێنێت کە ناسیوونی یان بەرهەمی خوێندونەتەوە زیاتر لەسەر ئاستی ناوچەییو پەیوەستبوونیان بەخێڵو ناوچەی جوگرافیەوە باسیان دەکات، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە حاجی لەکاتو سەردەمی وتنی ئەم شیعرەدا بەچاوی ناوچەو خێڵو عەشیرەت سەیری کوردی کردووە.

**شەهسەواری بەلافەتی کوردی**
**یەککە تازی فەصاحەتی (بابان)**
**یەکێ رەنجووری ئەهلی کەرکوکە**
**فیکری بیکری هەموو وەکو بووکە**
**یەکی تریان (ئەمین بەگ) دزەیی**
**دز نییە شاعیرێکە جەربەزەیی**
**لە جزیرە یەکێکە (شێخ ئەحمەد)**
**صاحیبی ناوو مورشیدی ئەرشد**
**شاعیری جافو نەزمی ئەترافی**
**مەولەویو خانە کافیمو شافی**
**شاعیری زەنگەنە نییە حەددی**
**وەکو شوجعانی ناکرێ عەددی**
**هەمەوەندیش کە خزمی خۆمانن**
**شاعیری زۆرە پاکی دەیزانن**
**دەشتی کەرکووکو کێوی هەورامان**
**شاعیری زۆرە بێ حەدو پایان**

بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە لە ئاستی نەگوتراودا حاجی دەیەوێت باسی بەهرەی کوردیو توانای کورد بکات لەبواری شیعر نووسینداو ئەو بەهرەو توانایەش لە ئاستێکی تردا بەراورد دەکات بە بەهرەو توانای شاعیرانی نەتەوەکانی تر، دیارە ئەمە رووبەکی ئاشکرای بنەمای گوتاری شیعری حاجی قادرە، کە ئەو وای دەبینێت ئەم توانا شیعرییە کە لەلای کورد هەیە لەلای ئەوانی تر هیچ ئامادەبوونێکی ئەوتۆی نییە چونکە شیعری کوردی کورد نووسیوویەتیو بە زمانی کوردیش نووسراوەو خاوەنی ئەو زمانەش لەڕووی ئامادەبوونی سیاسییەوە هیچ ئامادەبوونێکی نییە چونکە نەیتوانیوە بوونی خۆی بسەلمێنێتو سەربەخۆییو دەوڵەتی هەبێتو بەشداری بکات لەبەرهەمهێنانی شارستانێتیدا. لەکاتێکدا کە لە ئاستی نەگوتراودا ئێمە ئەم لێکدانەوەیە بۆ شیعری حاجی دەکەین ـ ئەوا لە ئاستی دیاردا حاجی لەسەر ئاستی خێڵو ناوچەو تایەفەو عەشیرەت ناوی شاعیرەکانی کورد دەهێنێت، بێگومان یەکێك لە خاسێتەکانی دروستبوونی هوشیاری نەتەوەیی بەزاراوەی مارکسیانە دەرکەوتنی ناسیونالیزمەو بە زاراوەی نوێ هەڵوەشاندنەوەی عەقڵو کەلتورو روانینی خێڵایەتیو ناوچەگەرییانەیە. لەسەردەمی حاجی قادردا نەك روانینو عەقڵی خێڵایەتی هەڵنەوەشاوەتەوە بەڵکو لای خودی حاجی خۆیشی کاری پێدەکرێت، هەر لێرەوە مەسەلەی هوشیاری نەتەوەیی لای حاجی دەکەوێتە بەردەم پرسیارەوە، پرسیار لەوەی ئایا کەسی هوشیار بە مەسەلەکانی نەتەوەو ناسیونالیزم دەبێ بە روانینی خێڵایەتی پۆلێنی شاعیرانی نەتەوەکەی بکات؟ یان ئەوەتا حاجی سەرباری بوونی هەستی نەتەوایەتی نەیتوانیوە بە پێچەوانەوی واقیعی باوی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردییەوە کار بکات.

بێگومان ئەوەی ئاشکرایە حاجی قادر هەتا لە کوردستان بووە هیچ بەشدارییەکی نەبووە لە بەرهەمهێنانی گوتاری کوردیدا کە جیای بکاتەوە لە شاعیرانی تری پێش خۆی ــ بەڵکو بەپێچەوانەوە بەو ئەندازەیی کە نالیو

سالمو مەولەوی هەریەکە لە روویەکەوە بەشداری بەرهەمهێنانی ئەو گوتارەیان کردووە لەسەر خاکی خۆیان ئەم ئەو بەشدارییەشی نەکردووە. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لەو قۆناغە مێژووییەدا کە سێ چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەیەمە، کۆمەڵگای کوردی لەبارودۆخێکدا بووە نەهەستی نەتەوایەتی‌و نەناسیونالیزمی کوردی وەکو دیاردەیەکی گشتی جەماوەری ئامادەبوونیان نەبووە، چونکە لەو قۆناغەدا کۆمەڵگای کوردی لەبارودۆخێکی دواکەوتووی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و کەلتووری‌و عەقڵیدا بووە، نە سیستەمێکی بەرهەمهێنانی دیاری هەبووە، نە سەرەتاکانی تەکنۆلۆژیا تیایدا سەری هەڵداوە، نە چینی بۆرژوای پیشەسازی یان بۆرژوای نیشتمانی تیایدا دەرکەوتووە، نە لەڕووی کەلتوورییەوە مەسەلەکانی رۆشنگەری‌و عەقڵانیەت ئامادەبوونیان هەبووە، بەگشتیش کۆمەڵگای کوردی لە سەدەی نۆزدەدا وەکو کۆمەڵگای دەرەوەی نووسین سەیر دەکرێت، کە ئەوەش خاسێتی کۆمەڵگای سەرەتاییە، بە واتا هەموو ئەم رەگەزانەی کە لە سەرەوە باسکران‌و لە کۆمەڵگای کوردی سەدەی نۆزدەو سەردەمی حاجی قادردا ئامادەبوونیان نەبووە لە بنەماو رەگەزە پێویستەکانی دەرکەوتنی ناسیونالیزمن لەکاتێکدا کە زەمینەی سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لە کۆمەڵگای کوردی سەدەی نۆزدەیەمدا ئامادەبوونی نەبووبێت ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە کە ئێمە داوا لە حاجی قادر یان هەر کەسێکی تر بکەین کە ناسیونالیست بێت‌و گوتاری نەتەوەیی بەرهەم بهێنێت. دەشێ لەسەر ئاستی تاکە کەس‌و لەژێر کاریگەری دەرەوەی واقیعی ئەو کۆمەڵگایەدا شتی وا روو بدات، بەلام ناسیونالیزم کاتێ بایەخی مێژوویی‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌و کەلتووری خۆیی دەبێت کە بووبێتە بزوتنەوەیەکی جەماوەری کۆمەلایەتی.

بە هەر حاڵ وەك گوتمان حاجی قادر هەتا لە کوردستان بووە کوڕی واقیعی کۆمەلایەتی کۆمەڵگای کوردی بووەو هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی نەتەوایەتی کوردییەوە نەبووەو نەیتوانیووە گوتارێکی سیاسی کوردی بەرهەم

بهێنێت، بەڵکو لەڕووی نووسینەوە هەمان ئەو گوتارەی بەرهەمهێناوەتەوە کە شاعیرانی پێش خۆی بەرهەمیان هێناوە لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا ئەگەر حاجی قادر سەفەری نەکردایە بۆ ئەستەمبوڵو هەر لە کوردستان بمایەتەوە شیعرەکانی هەر لەسەر هەمان شێوەی ئەو شیعرانەی دەبوو کە پێشتر لە کوردستان نووسیوونی یان هەمان گۆڕانکارییان بەسەردا دەهات؟ ئایا ئەگەر حاجی واقیعی شاری ئەستەمبوڵو ژیانی نێو شاری نەبینایە شیعرەکانی چیان بەسەر دەهات؟ ئایا ئەگەر حاجی نەچوایەتە لای بنەماڵەی بەدرخانیەکانو لەگەڵ ئەواندا نەمایەتەوە ئەو هەستی نەتەوایەتیەی لا دروست دەبوو؟ ئایا ئەوەی لای حاجی دروستبووەو لەو شیعرانەیدا کە لە مەنفا نووسیوونی رەنگی داوەتەوە هەڵقوڵاوی هوشیارییەکی نەتەوەییە یان لەژێر کاریگەری هەستکردن بە ئاوارەیدا بەرهەم هاتوون نیشتمان کە پێشتر لە ئەستی ئەوداو لەسەر خاکی خۆی ئەو ئامادە بوونەی نەبووە ئێستا دەیلاوێنێتەوە، بە واتا هەستی نۆستالجیا پاڵنەری سەرەکی بووە بۆ ئەوەی لەوێوە بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان؟ بێگومان دەبێ ئەوەش بزانین کاتێ مرۆڤ دەچێتە دەرەوەی نیشتمانی خۆی هەموو نەتەوەو نشتمان وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو دەبینێت بۆیە لەبری ناوچەو خێڵو عەشیرەت زیاتر ناوی نەتەوەو نیشتمان دەهێنێت. بەگوێرەی ناوی کوردو کوردستان لە شیعرەکانی دوایی حاجیدا بەشێکی لەژێر کاریگەری هەستی نوستالیجیادا بووەو بەشێکی تری بەهۆی بینینی باروتۆخی ئەستەمبوڵەوە بووە وەکو شار لەو کاتەدا کە وڵاتەکەی حاجی لە قۆناغێکی دواکەوتوودا بووەو ئەوێ واتە ئەستەمبوڵ یەك خاسێتی هەبووە کە شارێکی تورکیەو خاوەنەکەی گەلی تورکە نەك خێڵو عەشیرەت، جگە لەوە حاجی خۆی لەڕووی رەگو ریشەی بنەماڵەوە دیار نییە کە سەر بە خێڵ یان عەشیرەتێکی دیارو ناسراوی کورد بێت بۆیە باسی خێڵو عەشیرەتەکەی ناکات، رەنگە ئەگەر حاجی سەر بە خێڵی جاف یان هەمەوەند یان زەنگەنە یان سەیدی بەرزنجە بوایە بەڕێزەوە باسی خێڵ یان

عەشیرەتەکەی خۆیی بکردایە، بێگومـان نـەبوونی هێـزی مەعنـەوی خێـڵو عەشیرەت لـە کۆمـەڵگای خێڵایـەتی وەکو کۆمـەڵگای کوردیدا وا دەکـات کـە مرۆڤی هوشیاری وەکو حاجی بەدوای هێزێکـی گـەورەتری مەعنەویـدا بگـەڕێت لەچاو هێزی مەعنەوی خێڵو عەشیرەتدا کە ئەویش هێـزی مەعنـەوی نەتـەوەو نیشتمانە.

دیـارە هۆیـەکی ئاشـکرای دروسـتبوونی هەسـتی نەتەوایـەتی لای حـاجی کاریگەری بنەماڵەی بەدرخانییەکان بووە لەسەری چونکە بەدرخانیـەکان جگـە لـەوەی پـەروەردەی ژیـانی شـارە دیارەکـانی تورکیـا بـوون، شـارەزای ژیـانی ئـەوروپاو شـارە دیارەکـانی ئـەوروپاش بـوون کـە لـەو قۆناغـەدا مەسـەلەی ناسـیونالیزمو دەوڵـەتی نەتـەوەیش دیاردەیـەکی لەبەرچـاو بـووە، بنەماڵـەی بەدرخانیەکان وەکو نوخبەیەکی خوێنەوار زوو کەوتوونەتە ژێر کاریگـەری ئـەو دیـاردە کۆمەڵایـەتیو بزوتنـەوە جەماوەرییـەوە کـە مـۆتیڤی جوڵانـدنی ناسـیونالیزمو پـرۆژەی ناسـیونالیزم بـووە ــ سـەرهەڵدانی بزوتنـەوەی بەدرخانیـەکان لـە سـاڵانی چلەکانی سـەدەی نـۆزدەداو دەرکردنـی یەکـەم ڕۆژنامـەی کـوردی لەلایـەن ئـەو بنەماڵەیـەوەو پـەروەردەکردنی حـاجی قـادرو کەسانی تریش لەژێر کاریگەری هوشیاری ئەو بنەماڵەیەدا بـووە بـە کاریگـەری ژیانی ئەوروپاو شارەکانی تورکیا. بـەڵام ئـەوە ئاشـکرایە کـە ئـەو بەئاگاییـەی بنەماڵـەی بەدرخانیـەکان نـەیتوانیووە جێکـەوتی خـۆی لـەواقیعی کۆمەڵایـەتی کۆمەڵگای کوردی ئەو سەروەختەدا دیاری بکـاتو بزوتنەوەیـەکی جـەماوەری ئامادە بکات و بیخاتە جوڵە بەڵکو تەنیا لەچوارچێوەی چـەند ئەنـدامێکی ئـەو بنەماڵەو کەسانی نزیك لـەوانی وەکو حـاجی قـادردا ماوەتـەوە، هـەر ئـەوەش وایکردووە کە ڕاپەڕینەکانی کورد بە ئاسانی هەرەس بهێنن چونکە مۆتیڤی ئەو ڕاپەڕینانە پرۆژەی ناسیونالیزم نەبووە بەڵکو پاڵنەرێك دروستی کردوون کە لـە سنووری تاکە کەسی هوشیار تێپەڕ ناکات، دیارە ئەوەش ئاشکرایە مەسـەلەی

ناسیونالیزم هەتا نەبێتە هێزێکی ئەوتۆ کە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی جەماوەری بەرهەم بهێنێت هیچ دەرئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت.

لە مێژووی کورددا لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە تاک و تەرا کەسانێك دەرکەوتوون کە هەستی نەتەوایەتیان هەبوو بێت وەکو بەشێك لە ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانیەکان و شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لەژێر کاریگەری هەمان باروودۆخدا کە ئەو هەستە سادەیەی نەتەوایەتی لای کەسانی کەمی کورد لە سنووری قەڵەمڕەوی عوسمانیدا دروستبووە، حاجی قادرو نوخبەیەکی تر لەو کوردانەی کە چ لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیو چ لەسەرویەندی دروستبوونی دەوڵەتی نوێی تورکیادا چوونەتە تورکیا کەوتوونەتە ژێر کاریگەری باروودۆخی تورکیاو کاریگەری ناسیونالیزمی تازە دەرکەوتووی تورکەوە. بۆ نموونە جەنەڕاڵ شەریف پاشا، پیرەمێرد، ئەمین زەکی بەگ شێخ مەحمودی حەفیدو مستەفا پاشای یامولکی، بە هەمان شێوەی ئەوان حاجی قادری کۆییش هەستی نەتەوایەتی لادروستبووەو چاوکەوتنی بە تورکەکان کە چۆن دەوڵەتی خۆیان هەیەو نەك هەر فەرمانڕەوای خۆیانن بەڵکو فەرمانڕەوایەتی گەلانی تریش دەکەن و خاوەنی دامەزراوی بەڕێوەبردن و دەسەڵاتی خۆیانن و نەك هەر خۆیان یەکگرتوون بەڵکو توانیویانە نەتەوەکانی تریش بهێننە ژێر سایەی دەسەڵاتی خۆیانەوە. ڕوانین بۆ تورك لەو ئاستەداو کوردیش لە ئاستێکی زۆر لاوازو نائامادەدا جۆرێك لە بەراوردی لای حاجی قادر دروستکردووە، کە لەو بەراوردکردنەشدا کورد دواکەوتوو، پەرت و دابەش بوو نائامادە دێتە پێش چاو، هەر لەوێرەوەیە حاجی قادر لەلایەك رەخنە لە کورد دەگرێت بۆ دواکەوتوویی و دابەشبوون و بێ دەسەڵاتی و لە هەمان کاتیشدا داوای یەکبوون و خۆخوێندەوار کردن و دروستکردنی دەسەڵاتی کوردی دەکات. واتە دروستبوونی جۆرێك لە بەراورد لەنێوان کوردو ئەوی تردا کە تورکە لای حاجی وەها لێکدەدرێتەوە کە لە بۆچوونی حاجیدا ئاراستەی بەرەو جیاکردنەوەی کورد سەرهەڵدەدات کە ئەوەش بنەمایەکە بۆ گەڕان لە دوای

شوناس. بەڵام ئەم ڕوانینەی حاجی تەنیا لە سنووری خەیاڵدا ماوەتەوەو حاجی تەنیا لەڕووی یادەوەرییەوە گەیشتۆتەوە بە کوردستان و لەڕووی پراکتیکەوە نەگەڕاوەتەوە بۆ زێدی خۆی و بەشداری ژیانی واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردستانی نەکردووە، بەڵکو لە سنووری خەیاڵدا وێنەی کوردستانی کێشاوەو لەڕێگای یادەوەرییەوە بۆی گەڕاوەتەوە بۆیە گوتاری حاجی قادر گوتارێکە لە سنووری خەیاڵدا بنیادنراوەو لە زەمەنێکدا بەرهەم هاتووە کە زەمینەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی هیچ ئامادەگییەکی بۆ بەرهەمهێنانی گوتاری نەتەوەیی تێدا نەبووەو خودی ئەو گوتارەش کە حاجی لەدوای بەجێ هێشتنی کوردستان بەرهەمی هێناوە لەژێر کاریگەری گوتاری نەتەوەیی تورکدا بەرهەم هاتووە، ئەمەش هەمان شێوەی ئەو گوتارەیە کە شیوعییەکانی کوردستان لە چارەکی دووەمی سەدەی بیستداو لەبارودۆخی دواکەوتووی کوردستاندا بانگەشەیان بۆ دەکرد کە گەوهەرەکەی بنیادنانی کۆمەڵگایەکی سۆشیالیستی بوو بە واتا خواستنی گوتاری دەرەوەی واقیعی کۆمەڵگای کوردی بووە.

ڕوویەکی تر دەمێنێتەوە بۆ قسە لەسەر کردن لە گوتاری حاجی قادری کۆیی لەدوای سەفەرکردنی، حاجی قادر لە سنووری جۆرە دەقێکدا باسی کوردو کوردستان و یەکبوون و دەوڵەتی کوردی دەکات کە دەقی شیعرییە بەڵام لەڕووی شیعریەتەوە ئەو دەقانەی لاوازن و زیاتر شێوازی دروشم یان ئامۆژگارییان وەرگرتووە، ئایا نەدەشیان ئەو بۆچوون و ڕوانینەی لە دەقی پەخشانیدا بەرجەستە بکردایە کە لە یەکەمیاندا واتە لە شیعردا خەیاڵ و ئەندێشەو سۆزو هەڵچوون کار دەکەن و لە دووەمیشیاندا لێکدانەوەو عەقڵ و فیکر کار دەکەن، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە ناسیونالیزم و بەو پێیەش گوتاری نەتەوەیی کە بووبێتە گوتارێکی سیاسی جەماوەری بەرهەمی مۆدێرنێتەن، یان لەشێوەیەکی ئاشکراتردا بڵێین بەرهەمی شارو کۆمەڵگای شارن، لە شارو کۆمەڵگای شاریشدا مەودای کارکردنی خەیاڵ و ئەندێشەو

هەڵچوون تەسک دەبێتەوەو مەودای کارکردنی عەقڵو فیکرو تێڕامانو لێکدانەوە فراوانتر دەبێتو رووبەری کارکردنیش بۆ عەقڵو فیکرو تێڕامانو لێکدانەوە نووسینی پەخشانییە نەک دەقی شیعری. بە واتایەکی دی دەتوانین بڵێین گوتاری سیاسی ناسیونالیزم گوتارێکە پێویستی بە بوونی دەقی پەخشانی بارگەکراوە بە فیکرو مەعریفەو پرۆژەی ناسیونالیزم، ئەگەرچی تاکو ئێستا ناسیونالیزم وەکو دیاردەیەک پێناسەیەکی جێگرو فەیلەسوفی تایبەتی خۆیی نییەو بەشێوەی پەرتو بڵاو باسی لێوە دەکرێت. بە مانایەکی تر ئێمە دەمانەوێت بڵێین نە حاجی قادرو نە هیچ کەسێکی تر لەوانەی کە لە مێژووی ئەدەبی کوردیداو لە نێوەندی سیۆسیۆ رۆشنبیری کوردیدا بە رابەری مەسەلەی نەتەوایەتی کوردی باس دەکرێن خاوەنی دیدێکی فەلسەفیانە نەبوون بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی کوردیو نەیانتوانیووە (تنظیر) بکەن، یان فیکر بەرهەم بهێنن، یان لە روانینێکی ئاشکراداو لە دەقی نووسراودا بەرجەستەی ئەو روانینە بکەن کە گوزارشت لە روانینێکی هەمەلایەنی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردی بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە ئەحمەدی خانییەوە بۆ حاجی قادرو بۆ دواتریش ئەوەی باسی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردی کردووە یان لەژێر کاریگەری بۆچوونی دەرەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا ئەو باسەی کردووە یان لە ئەنجامی بینینی واقیعی دەرەوەدا بەبێ لێکدانەوەی باروئۆخی کۆمەڵگای کوردی هاتووە کۆمەڵگای کوردی هاوشێوە کردووە لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تردا یان لە بنەڕەتدا دروستبوونی بۆچوونی نەتەوایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا دوور لە دەرکەوتنی ناسیونالیزمو گوتاری نەتەوەیی وەکو کاردانەوە بۆ سیاسەتی توندوتیژی داگیرکەرانی کوردستان دروستبووە، دیارە کاردانەوەش لەژێر کاریگەری فاکتەری سۆزو هەڵچووندایە نەک لەژێر کاریگەری فاکتەری عەقڵو بیرکردنەوەدا، کاتێ دیاردەیەک لە ئەنجامی کارکردنی عەقڵو فیکرو تێڕامانو لێکدانەوەدا دەربکەوێت ئەوە خاسێتی پرۆژەی دەبێتو ئاسۆی روانینی بۆ ئێستاو ئایندە روون دەبێت، بەلام ئەو

دیاردەیەی لەژێر کاریگەری سۆزو هەڵچوونو کاردانەوەدا دروست دەبێت، لە شێوازێکی نارێکخراوو پەشێوو بێ بەرنامەدا دەردەکەوێتو بە لاوازبوونی ئەو فشارەی کە کاردانەوەکەی دروستکردووە ئەویش پاشەکشە دەکات، بەگشتی راپەرینو بزوتنەوەکانی کورد لەژێر کاریگەری ئەم ئاراستە ئیشکردنەدا دروستبوونو مۆتیڤی دروستکەریان سۆزو هەڵچوونو کاردانەوە بووە بۆیە زوو هەرەسیان هێناوە، چونکە ئاشکرایە لە مێژووی کورددا بەگشتیو لەو قۆناغەشەوە کە باس لە بزوتنەوەو راپەرینی نەتەوەیی دەکرێت هیچ پرۆژەیەکی نەتەوەیی دەرنەکەوتووە، چونکە پرۆژەی نەتەوەییو بنیادنانو جێبەجێ کردنی ئەرکی ناسیونالیستە نەبوونی پرۆژەی نەتەوەیی بەڵگەی سەلمێنەرە بۆ نەبوونی ناسیونالیزم وەکو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی جەماوەری لەکاتێکدا پرۆژەی نەتەوەیی بوونی نەبێت، قسەکردن لەسەر گوتاری نەتەوەییش شتێکە لە سنووری وەهمدا دەمێنێتەوە ـ دەرکەوتنی بۆچوونی تاکەکەسی وەکو ئەحمەدی خانیو سالم و نالیو حاجی قادری کۆییش لە چوارچێوەی شیعرو لەژێر هۆکاری کاردانەوەو کاریگەری ئەوانی تردا نەیتوانیووە لەنێوەندی سیۆسیۆ رۆشنبیری کوردیداو لەسەروەختی خۆییو دواتریشدا هیچ ئامادەبوونێکی کۆمەڵایەتی هەبێت چونکە ناسیونالیزم لە کۆمەڵگای کوردیدا نەدەرکەوتووەو نەبووەتە هێزێکی کۆمەڵایەتی. ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو بۆچوونەی کە ناسیۆنالیزم پێش ئەوەی گوتاری تاکەکەس بێت گوتاری کۆمەڵایەتییەو هێزێکی جەماوەری بەرهەمی دەهێنێت، رەنگە هەر ئەم هۆکارەش بێت وایکردبێت لەسەر ئاستی سیوسیۆرۆشنبیریو فیکرو فەلسەفەش لە جیهاندا ناسیونالیزم فەیلەسوفی تایبەتی خۆیی نەبێت، بەڵکو وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی جەماوەری دەریکەوێتو پرۆژەی تایبەتی خۆیی هەبێت بۆ دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوە.

گوتاری حاجی قادری کۆیی دوای سەفەرکردنیو دوور لە واقیعی کوردستان لەژێر کاریگەری دەرەوەو گوتاری ناسیونالیزمی تورکیو هەستی نۆستالجیادا

ســـــەری هەڵداوەو بەرهەمی دەرکەوتنی ناسیونالیزمی کوردی نییە، بۆیە نە لەو کاتەداو نەدوای خۆیشی پاش تێپەڕبوونی سەدو دە ساڵ هێشتا ناسیونالیزمی کوردی نەبۆتە بزوتنەوەیەکی جەماوەری کۆمەڵایەتیو خاوەنی پرۆژەی سیاسی نەتەوەیی، چونکە گوتاری نەتەوەیی بەبێ پرۆژەی نەتەوەیی بوونی نییەو پرۆژەی نەتەوەیش بەبێ بوونی ناسیونالیزم قسەکردنە لە سنووری وەهمدا، هەڵبەت بێ بوونی ناسیونالیزمیش ناتوانرێت باس لە بوونی نەتەوە بکرێت، کەواتە لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو بۆچوونە باوەی کە سەبارەت بە نەتەوەو ناسیونالیزم لە شۆڕشی فەرەنسی بەدواوە سەری هەڵداوە کە ئەویش روانینی مۆدێرنێتەیە بۆ چەمکی نەتەوە کە پێی وایە ناسیونالیزم نەتەوە دروست دەکاتو بەو پێیەش گوتاری نەتەوەیی ئەو دەقە یان پرۆژە نەتەوەییە دەنوێنێت کە بارگاوی کراوە بە ویستەکانی نەتەوە بۆ خۆجیاکردنەوە لەوانی ترو دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ کە ئەمەش لە کۆمەڵگای کوردی سەردەمی حاجی قادرداو بۆ دواتریش نەبۆتە پرۆژەو بەو پێیەش کورد وەکو نەتەوە تەنیا لە ئاستی سروشتی بووندا بوونی هەبووە کە ئەویش بریتییە لە مادە خاوەکانی یان رەگەزە مادییەکانی نەتەوە واتە پێکهاتەی بایۆلۆژیو زمانو خاکو دابو نەریت، کە ئەمەش تەنیا لە پێش شۆڕشی فەرەنسیدا نەتەوەیان پێ دەپێورا، بەڵام لەو سەروەختە بەدواوە ئامادەبوونی ناسیونالیزم بەرهەمهێنی پرۆژەی نەتەوەییو خودی نەتەوەو گوتاری نەتەوەیشە، بۆچوونی ناسیونالیزمانەی تاکە کەسیش بەتایبەتی لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی هیچ کاریگەرییەکی نابێتو تەنانەت نابێتە دەنگیش بەجۆرێك کە ئەوانی تر ببیستنو رێگا بۆ خۆجیاکردنەوەو بەدەستهێنانی شوناس خۆش بکەن.

# سەرچاوەکانی بەشی (١٠)

١ـ مەسعود محەمەد ـ حاجی قادری کۆیی ـ بەرگی یەکەم ـ بغداد.

٢ـ فازیل کەریم ئەحمەد ـ حاجی قادری کۆیی و پرۆسەی وێستەر نیزیشن ـ سلێمانی ـ ساڵی ٢٠٠٤.

٣ـ محمد شوقي الزين ـ تأويلات و تفكيكات ـ المركز الثقافي العربي بيروت ـ ٢٠٠٠ ص١٣٢..

٤ـ محمد شوقي الزين ـ نفس المصدر ـ ص١٣٢.

٥ـ عەتا قەرەداخی ـ ستراتیژو کەسێتی نەتەوەیی کورد ـ سلێمانی ١٩٩٨.

لە ڕۆژی ۲۲ی نیسانی ساڵی ۱۸۹۸دا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان لە دەرەوەی جوگرافیای کوردستانو لەلایەن میقداد مەدحەد بەدرخانەوە دەرچوو. ڕۆژنامەی کوردستان لەکاتێکدا دەرچوو کە لە کوردستاندا ڕاپەڕینێکی دیار بوونی نەبوو، واتە لەدوای ئەو خامۆشیە دەرچووە کە لە شکستی بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهرییەوە دروستبوو. هەرچەندە لەو قۆناغەدا سوڵتان عەبدولحەمید بەشێکی زۆری کوردەکانی بەناوی هاوئاییینیەوە فریووداو لە ڕیزی سوارەی حەمیدیەدا ناونووس کرانو لەگەڵ ناکۆکیو ئاژاوەی سنووری قەڵەمڕەوی ئیمپراتوردا بۆ دژایەتی ئەرمەنیەکان بەکارهێنران.

بە هەر حاڵ بارودۆخی کوردستان هەرچۆن بووبێت یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە دەرەوەی واقیعی کوردستان دەرچوو، ئێستا چەند پرسیارێك پەیوەست بەم ڕۆژنامەیە سەرهەڵدەدات. ئایا دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بەناوی کوردستان بەرهەمی سەرهەڵدانو پەرەسەندنی ناسیونالیزمی کوردی بووە وەك دیاردەو بزوتنەوەی جەماوەری کۆمەڵایەتی سیاسی یان بەرهەمی عەقڵو هوشیاری تاکەکەس بووە؟ ئایا ناوی (کوردستان) وەکو ناوی ڕۆژنامەکە چ گوزارشتێك دەکاتو چ پەیوەندییەکی بە ناشیونالیزمی کوردیو پاشانیش بە گوتاری کوردییەو هەیە؟ ئایا ئەم ڕۆژنامەیە دەربڕی ڕاستەقینەی داوا ناسیونالیستییە کانی کورد بووە یان هەوڵیداوە لەسایەی دەوڵەتی عوسمانیدا کوردیش پەرە بە ڕۆشنبیریو کەلتوری خۆی بدات؟ ئایا لەڕووی زمانو نووسینەوە ڕۆژنامەی کوردستان چ کاریگەرییەکی لەسەر بنیادنانی گوتاری نەتەوەیی کوردی هەبووە؟ ئایا نووسینی پەخشانی کە لە ڕۆژنامەی کوردستانەوە بە ئاشکرا دەست پێدەکات بە گواستنەوەی کارکردنی کورد لە هەستو هەڵچوونی شیعرییەوە بۆ لێکدانەوەو بیرکردنەوەو کاری عەقڵ دادەنرێت؟

هەڵبەت ئەوەی ئاشکرایە یەکەم ڕۆژنامەی کوردی دوای یەکەم ڕۆژنامەی تورکیو عەرەبی دەرچووە، ئەمەش پەیوەندی بە ئاستی هوشیاریو ئاستی خوێندەوارییەوە هەبووە، ئەمە سەرباری ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە

کەلتوری کوردی پێیدا تێپەڕیووە کە ئەویش بارودۆخی کۆلۆنیالیکردنی ئەم کەلتوریە بۆ ماوەی دووروودرێژو هەوڵی بەردەوامی ئەوانی دی دەسەڵاتدار لە کوردستاندا بۆ لەنێو بردنی ئەو کەلتورەو ڕێگا گرتن لەبەردەم ڕێنسانسی کەلتوری کوردیدا، چونکە ئاشکرایە کە ڕێنسانسی کەلتوری مۆنیفو جوڵێنەری ڕێنسانسی گشتگرو هەمەلایەنە لە کۆمەڵگادا. زمانی کوردی وەکو یەکێك لە رەگەزە گرنگەکانی کەلتور لە مێژووی زانراوی کوردەوە بەجۆرێك رەفتاری لەگەڵ کراوە کە ڕۆحی خۆزیندووکردنەوەو رابوونەوەی لێ سەندراوەتەوە، هەر ئەوەش وایکردووە کە نووسین بەکوردی لە قۆناغێکی درەنگدا دەریکەوێتو ئەو دەرکەوتنەش لەچوارچێوەی شیعردا بێت، بێگومان درەنگ دەرکەوتنی نووسین بەکوردی هۆکارێکی دەرکەوتنی ڕۆژنامەی کوردییە لە قۆناغێکی درەنگدا.

لێرەدا پرسیارێکی تر سەرهەڵدەدات کە ئەویش ئەوەیە ئایا دەشێت لە کۆمەڵگایەکدا ناسیونالیزم سەری هەڵدابێتو بزوتنەوەی ناسیونالیزمی بووبێتە هێزێکی جەماوەری سیاسیو خەباتی بۆ سەربەخۆیی کردبێت، بەلام هێشتا لەو کۆمەڵگایەدا نووسین بە زمانی نەتەوە ئامادەبوونی نەبێت، ئەگەر ئێمە بەو جۆرە سەیری بزوتنەوەی بەدرخانیەکانو راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلا بکەین کە بزووتنەوە یان راپەڕینێکی نەتەوەیی بووین، ئەوا دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین ئایا دەشێت نەتەوەیەك گەیشتبێتە ئەوەی کە راپەڕین بکاتو داوای سەربەخۆیی بکات بەلام لە ئاستی هوشیارییەوە نەگەیشتبێتە ئەو ئاستەی بە زمانی نەتەوەیی خۆی بنووسێت، یان زمانی نەتەوەیی خۆی بەکاربهێنێت لە خوێندنداو توانای ئەوەی نەبێت کە هیچ بڵاوکراوەیەکی هەبێت گوزارشت لە بوونی نەتەوەیی خۆی بکات.

بە هەر حاڵ تاکو ساتەوەختی دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان، نووسین بە کوردی تەنیا لە شێوازی شیعردا بووە کە ئەوەش بنەمایەکی لاوازە بۆ فۆرمەلەکردنی گوتار بەتایبەتی گوتاری نەتەوەیی چونکە کاتێك باسی گوتار

دەکەین، باسی دەقێك دەکەین کە بارگاوی کرابێت بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی، فیکرو مەعریفەو جیهانبینیش بەرهەمی عەقڵن، هەر کاتێك عەقڵ ئامادەبوونی هەبێت‌و کار بکات، ئەوە دەشێ جۆرێکی تر لە دەق یان نووسین بەرهەم بێت کە زیاتر عەقڵ لە پشتییەوەیەو هەڵگری فیکرو مەعریفەیە، ئەویش دەقی پەخشانیە، کەواتە غیابی دەقی پەخشانی قسەکردنی ئێمە لەبارەی گوتاری نەتەوەیی کوردییەوە دەخاتە بەردەم پرسیارێکی گوماناوییەوە، ئایا دەشێت فیکرو مەعریفەو لێکدانەوە ئامادەبوونیان نەبێت بەڵام دەقێکمان هەبێت کە سەلمێنەری بوون‌و نیشکردنی بکەرێك بێت کە بکەری ناسیونالیستەو پرۆژەی سەربەخۆیی‌و دروستکردنی دەوڵەتی هەبێت؟ بێگومان هەتا دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان ئێمە وەکو کورد خاوەنی دەقێکی نووسراوی غەیری شیعر نین کە هاوشان بێت لەگەڵ ئەو زەمینەی کە گوایا ناسیونالیزمی کوردی تیایدا سەری هەڵداوەو؛ بزووتنەوەی بەدرخانیەکان‌و راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلایان خستۆتە جووڵە.

بەهەرحاڵ رۆژنامەی کوردستان وەکو یەکەم رووبەری فراوانی نووسینی پەخشانی کوردی سەیر دەکرێت کە لەلایەك ئەو سەرەتایە کە زمانی کوردی تیایدا بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکاردێت، لەلایەکی دی لە ئازادی‌و سەربەخۆیی‌و کێشەی کورد دەدەوێت، لەلایەکی تریشەوە رۆژنامەکە (کوردستان) بریتییە لەو زاراوەیەی کە ماناو دەلالەتی ناسیونالیزمانەی هەیە، بە واتایەکی تر ناوی رۆژنامەکە (کوردستان) لە عەقڵێکەوە سەرچاوەی گرتووە کە کوردستان وەکو یەك نیشتمان‌و کورد وەکو یەك نەتەوەو یەك پێکهاتە دەبینێت، ئەمەش لە ئاستێکی تردا ئەو پرۆژەیە کە دەشێ ناسیونالیزمی کوردی لە هەوڵی جێبەجێ کردنیدا بێت. ناوی رۆژنامەکە بە روانینی من پەیوەندی نییە بە ئاستی دەرکەوتن‌و گەشەکردنی ناسیونالیزمی کوردییەوە بەڵکو بەرهەمی عەقڵی تاکەکەسی ناسیونالیستی هوشیارو بەئاگایە، تاکە کەسێك کە توانیوویەتی رۆژنامەکە دەربکات، کە ئەویش یەکێك لە ئەندامە

دیارەکانی بنەماڵەی بەدرخانیەکانە کە ئەو بنەماڵەیە وەکو پێشتر گوتمان بەکاریگەری ئەورووپاو ژیانی شارە گەورەکانی تورکیا هەستی ناسیونالیستیان لەلا دروست بووەو وەکو نوخبەیەکی رۆشنبیرو بە ئاگا ویستوویانە کوردیش بگات بە ئاستی نەتەوەکانی تر. بێگومان رۆژنامەی کوردستان سەرەتا لە قاهیرەو دواتریش لە ژنێڤو لەندەنو فۆلکستۆنو دیسانەوە لە ژنێڤو قاهیرە دەرچووە. پێنج ژمارەی یەکەمی کوردستان میقداد مەدحەت بەدرخان دەری کردووەو لە ژمارە شەشیشەوە عەبدولرەحمان بەدرخان (کوردستان)ی دەرکردووە. ئاشکرایە کە ئەم دوو کەسێتە کە هەردووکیان سەر بە بنەماڵەی هوشیاری بەدرخانیەکان بوون لە ئاستێکی بەرزی بەئاگاییو هوشیاری نەتەوەیدا بوونو هەر ئەو هوشیارییو بەئاگاییەش هۆکاری سەرەکی بووە بۆ ئەوەی پەنا بەرنە بەر دەرکردنی رۆژنامە.

رۆژنامەی کوردستان رۆژنامەیەکی گشتی بووە، لەبارەی سیاسەتو ئیدارەو کێشەی کۆمەلایەتیو بەرێوەبردنو ئەدەبەوە دواوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە ژمارەکانی سەرەتاوە بایەخدانی ئەم رۆژنامەیە بە کێشەی کوردەوە دەردەکەوێت لە پاشکۆی ژمارەیەکدا کە بە زمانی فەرەنسی دەرچووە میقداد مەدحەت دەڵێ: لەپێناو ئەوەدا کە نەتەوەکەم بۆ خوێندەواریو فێربوونو بە زانستەوە خەریك بوون هان بدەم، لە قاهیرە ئەم رۆژنامەیەم دەرکرد، بۆ ئەوەی گەلەکەم شارەزای شارستانییەتی هاوچەرخو ئەدەبی خۆی بێت، ئاواتەخوازم کە ببینم کوردستان بەرەو پێشەوە بچێت بەم رۆژنامەیە دەمەوێ خزمەتی نەتەوەکەم بکەم، هیوامە ببینم ئاستی رۆشنبیری نەتەوەکەم بەرزبۆتەوە[1] ئەگەر سەیری ئەم وتەیە بکەین ئەوا دەبینین کە پەیوەستبوونێکی تەواو بە نەتەوەوە هەیەو لە هەمان کاتدا نووسەر ئامانجێکی ئاشکرای هەیە لە دەرکردنی رۆژنامەیەك بۆ نەتەوەکەی ئەویش هاندانی نەتەوەکەیەتی بۆ خوێندەوارییو فێربوونی زانستو زانیارییو شارەزابوونی شارستانێتی هاوچەرخ، ئەوە ئاشکرایە کە خوێندەوارییو فێربوونو

شارەزابوونی شارستانێتی هاوچەرخ لە بنەماکانی ئەو زەمینەیەن کە دەبێ نەتەوەیەك یان کۆمەڵگایەك هەیبێت بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ گۆڕانکاریو جوڵاندنی بەرەو پێشەوە، میقداد مەدحەت بەدرخان دەزانێت کە ناشێت کۆمەڵگایەکی نەزانو دەرەوەی نووسین بتوانێت بوونی خۆ بسەلمێنێتو شوناس بەدەست بهێنێت لە هەمان کاتدا ئەوەی لەم وتەیەی سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستاندا گرنگە ئەوەیە کە کورد وەکو نەتەوەیەك بەجیاواز لە تورکو ئەوانی دی سەیر دەکاتو ئومێدی ئەوەش بۆ ئەم پێکهاتەیە دەخوازێت کە هەنگاوی بەرەو پێشەوە چوون بنێت، ئایا هەنگاوی بەرەو پێشەوە چوون ئەوەیە لە سایەی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا کورد بەرەو پێشەوە بچێتو گۆڕانکاری بەسەردا بێت، یان مەبەست لە بەرەو پێشەوە چوون ئەوەیە کە کورد قەوارەی سەربەخۆی خۆی دروست بکاتو لە تورکەکان جیا ببێتەوە، ئەوەی مایەی لەسەر وەستانە لەم وتەیەی میقداد مەدحەتدا ئاماژەی دروستبوونی سەربەخۆییو قەوارەی سەربەخۆی کوردی بەرچاو ناکەوێت، ئەوەش گوتاری سیاسی نەتەوەیی رۆژنامەی کوردستان دەخاتە بەردەم پرسیارەوە. هەرچەندە گرنگی ئەم رۆژنامەیە تەنیا بەند نییە بەو دەربڕینە راستەوخۆیەوە کە وەکو ئایدیۆلۆژیای ناسیونالیزمی کوردی دەردەکەوێتو ئەویش لەچوارچێوەی سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییدا بەرجەستە دەبێت، بەڵکو دەرکردنی رۆژنامەیەك لەو قۆناغەدا بە زمانی کوردیو بەکارهێنانی زمانی نەتەوایەتی بۆ کاری نووسینو بڵاوکردنەوەو قسەکردن لەسەر کوردو کێشە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانیو بڵاوکردنەوەی ئەدەبەکەی خۆی لەخۆیدا جێبەجێ کردنی هەندێ لەو ئەرکانەیە کە ناسیونالیستی نەتەوەیەك ئەنجامی دەدات، بۆیە سەرباری نەبوونی گوتارێکی سیاسی نەتەوەیی راستەوخۆ، رۆژنامەی کوردستان گوتارێکی نەتەوەیی ناڕاستەوخۆو هێمن بنیاد دەنێت.

لەلایەکی ترەوە ئایا رۆژنامەی کوردستان وەکو لەسەرەوەش ئامازەمان بۆ کرد وەکو بنەمای پرۆژەیەك بۆ جیاکردنەوەی گوتاری کوردی لە گوتاری تورکی عوسمانی سەیر دەکرێت، ئایا برتییە لە هەوڵێك بۆ جێگاکردنەوەی گوتاری کوردی لەچوارچێوەی گوتاری ئیسلامی فرە ئێتنیکی ئیمپراتۆری عوسمانیدا؟

ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی رۆژنامەی کوردستان بکەین ئەوا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە رۆژنامەی کوردستان ویستوویەتی لەلایەك کورد خاوەنی ناسنامەی خۆی بێتو ئەو ناسنامەیەش لەچوارچێوەی گوتاری ئیمپراتۆردا جێگای بکرێتەوەو بپارێزرێت بەتایبەتی پەیوەستبوونی رۆژنامەی کوردستان بە چوارچێوەی ئیسلامو ئامازەکردن بۆ ئایەتو فەرموودەکانی پێغەمبەرو نزیکی رۆژنامەی کوردستان لە تورکە لاوەکانەوە راستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت، (کوردستان)یش وەکو تورکانەکانی (تورکانی لاو) بۆ هەر مەسەلەو رووداوێك ئایەتێکی قورئان یان حەدیسێکی دەهێنایەوە[٢].

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە رۆژنامەی کوردستان ویستوویەتی لەلایەك هانی کورد بدات بۆ خوێندنو فێربوونو پێشکەوتن، لەلایەکی ترەوە پەیوەستبوونی خۆی بە ئایینی ئیسلامەوە نیشان دەدات، ئەمەش وای لێدەکات کە وەکو پرۆژەیەك سەیر بکرێت بۆ زیندووکردنەوەی کەلتووری کوردیو بەو پێیەش کەسێتی کوردی لەنێو کەلتورو کەسێتی ئیسلامیدا، کە ئەمەش وای لێدەکات کە بەو چاوە سەیری سوڵتانی عوسمانی بکات کە ئەگەر هەندێ گۆڕانکاری لەکاری بەڕێوەبردندا بکات ئەوا کوردیش وەکو نەتەوەیەکی ئیسلام دەتوانێت بە مافە سروشتییەکانی خۆی بگات، عەبدولرەحمان بەدرخانی سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستان مەیلی بەلای تورکە لاوەکانەوە بوو کە داوای دامەزراندنی رژێمێکی دەستوورییان لە تورکیادا دەکردو لەو پێناوەدا خەباتیان دەکرد، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە سەرنووسەری رۆژنامەی کورستان دروستکردنی رژێمێکی دەستووری لەسایەی ئیمپراتۆرێتی

عوسمانیدا وەکو چارەسەر بۆ مەسەلەی کوردو ئەوانی تریش سەیر دەکات کە ئەمەش لە خۆیدا جۆرێکە لە هەوڵی تواندنەوەی گوتاری کوردی لەنێو گوتاری تورکی ئیسلامیو ئیمپراتۆری عوسمانیدا. بەتایبەتی لەسەردەمی سەرنووسەرێتیو خاوەندارێتی عەبدورەحمان بەدرخاندا ئاراستەی کارکردنی رۆژنامەکە زیاتر کارکردن بووە بۆ گۆڕانکاری لەچوارچێوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانیدا بەگشتیو لە کەسێتی سوڵتاندا بەتایبەتی بۆیە: داوای سوڵتانێکی دادپەروەری دەکرد کە رەوشتی لە هی خەلیفەکانی ئیسلام بچێت[٣] ئەگەر سەرنجی ئەم روانینانەی دوو توێی لاپەڕەکانی رۆژنامەی کوردستان بدەین ئەوا وەکو جۆرێك لە هەوڵی یەکگرتنەوەی گوتاری کوردیو گوتاری ئیسلامی سەیر دەکرێت، ئەوەش لە دوو ئاراستەی جیاوازو تەنانەت دژ بە یەکتریشەوە سەیر دەکرێت. ئاراستەی یەکەمیان ئەوەیە کە ئایا ئەدەشیا کورد لەسایەی ئیسلامو گوتاری ئیسلامیدا ببوایەتە خاوەنی گوتارێکی ەتەوەیی ئایینی یان گوتاری کوردی ئیسلامیو لەوێوە بەرەو دامەزراندنی ،ەوڵەتێکی ئیسلامی هەنگاوی بنایە.

ئاراستەی یەکەم ئایا دەشێ گوتاری نەتەوەیێ کورد لە چوارچێوەی گوتاری یسلامیدا جێگای ببێتەوە یان لە سادەترین حاڵەتدا گوتاری نەتەوەیی کوردی ز سەلماندنی خۆی پێویستی بەوەیە لە هەموو ئەوانی تر یان لە هەموو ُوتارەکانی تر خۆی جیا بکاتەوە. ئەمەش بەرەو پرسیاری تر رامان ەکێشێت ئایا گوتاری نەتەوەیی کوردی گوتارێکی ئایینی دەبێت یان وتارێکی عەلمانی؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە راستەوخۆ رووناکی دەخاتە ـەر وەڵامی پرسیارەکانی پێشتر. ئەگەر گوتاری نەتەوەیی کوردی گوتارێکی یینی بێت یان بارگاوی کرابێت بە فیکرو روانینو مەعریفەی ئایینی ئەوا ەشێ بەشێوەیەکی سروشتی لەگەڵ گوتاری ئیسلامی تورکی یان فارسی یان ەرەبیدا یەکبگرێتەوەو تەنانەت لەنێو ئەو گوتارانەدا بتوێتەوەو تایبەتمەندی ـۆی کە پەیوەستە بە کوردەوە لە دەست بداتو لەگەڵ ئەوانی تردا

یەکبگرێت و بچێتە چوارچێوەی گوتاری تەوحیدی ئیسلامیەوە، یان بۆ دواترو لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتانی نوێی عەرەبو تورکو فارسداو لەگەڵ دابەشکردنی کوردستان بەسەریاندا گوتاری نیشتمانی عێراقی یان تورکی یان ئێرانی لەگەڵ گوتاری هەریەکە لەوانەدا پێکبهێنێت.

ئاراستەی دووەم ئەوەیە ئەگەر گوتاری کوردی گوتارێکی عەلمانی بێت ئەو ئەگەری یەکگرتنەوەی‌و تێکەڵاوبوون‌و تواندنەوەی لە نێوگوتاری نەتەوەیی ئەوانی تردا کارێکی زەحمەتە چونکە بۆ قۆناغی رۆژنامەی کوردستان گوتاری نەتەوەیی هەریەکە لەو نەتەوانە واتە تورکو فارس‌و عەرەب زیاتر بنەمایەکی ئیسلامی هەبووەو بە عەقڵی تەوحیدو روانینی تەوحیدو ئامانجی تەوحید دروستکردنی ئیمپراتۆریێتێکی تێئۆکراتی فرەئێتنیکی بارگاوی کراون. ئە تێڕوانینەش باڵادەست بووە، تەنانەت لەلای خێزانی بەدرخانییەکان‌و شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری‌و پێشتریش لای مەولانا خالیدی نەقشەبەندی ئامادەبووە هەبووەو کاری بۆ کراوە واتە کارکردن بۆ دروستکردنی گوتاری کورد لەسایەی گوتاری ئیمپراتۆریێتی عوسمانیدا. بە هەمان روانینەوە میقد مەدحەت بەدرخان وەکو پیاوێکی منەوەری سەردەمەکەی خۆی کە بڕوا وابووە کۆمەڵگای کوردی بە خوێندەواری‌و شارەزابوون دەتوانێت بوونی خۆ بسەلمێنێت، بەلام لەچوارچێوەی پەیرەوکردن‌و خۆبەستنەوەیەک راستەقینەوە بە ئایینی ئیسلام‌و بەدەسەلاتی ئیمپراتۆریێتی ئیسلامیەوە بە لەسایەی دەستورو دەسەلاتی سوڵتانێکدا کە بەڕاستی لە خەلیفەکانی راشد بچێت، بە واتا لە روانینی رۆژنامەی کوردستان‌و هەردوو سەرنووسە خاوەنەکەیەوە واتە میقداد مەدحەت‌و عەبدوڕەحمان بەدرخانەوە بوو خەلیفەیەکی یان سوڵتانێکی دادپەروەرو دامەزراندنی رژێمێکی دەستووری ‌ هەمان داوای تورکە لاوەکان بوو کێشەی کورد چارەسەر دەکرێت.

لێرەوە پرسیار لە گەوهەری گوتاری رۆژنامەی کوردستان سەرهەڵدەدات ئا دەشێ ئەو گوتارەی رۆژنامەی کوردستان بەرهەمی دێنێت بۆ پێکەوە ژی

لەگەڵ تورکو ئەرمەنو ئەوانی تردا لەسایەی رژێمێکی دەستووریو لەژێر سایەی دەسەڵاتی سوڵتانێکی دادپەروەردا کێشەی کورد چارەسەر بکات یان ئەوە بەگشتی کردنی ئەو تێڕوانینەیە کە پێشتر سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بەناوی هاوئاییینییەوە ژمارەیەکی زۆری لە کوردەکان کۆکردەوەو سوارەی حەمیدییەی لێدروستکردنو هەندێ کەسیش پێیان وایە سوارەی حەمیدیە قۆناغێکە لە ژیانی ناسیونالیزمی کوردی[1] کە لە راستیدا دروستکردنی سوارەی حەمیدیە ئەو پرۆژە ترسناکەی کارکردنی دوژمنانی کوردە بۆ داگیرکەرانی کوردستان کە تاکو ئێستاش لە ئەستی کۆیی کۆمەڵگای کوردیدا ئامادەبوونی هەیە. دروستکردنی پاسەوانانی گوند پاشی یەك سەدە لە دروستکردنی سوارەی حەمیدیە دووبارە کردنەوەی هەمان سیاسەتو هەمان پرۆژەیە، دروستبوونی هێزی کورد بەناوی غەیرە نیزامی یان جاشەوە لەلایەن دەوڵەتی عێراقی داگیرکەری کوردستان لە سالانی شەستەکانەوە هەتا ڕوخاندنی رژێمەکەی سەدام حسێن هەمان سیاسەتو هەمان پرۆژەیە کە سوڵتان عەبدولحەمید داینا.

بەلام پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایا گوتاری رۆژنامەی کوردستان گوتارێکی جیاوازە لە گوتاری سوارەی حەمیدیە یان هەمان گوتارە؟ سوارەی حەمیدیە بەناوی هاوئایینیەوە دروستکراو ئەو روانینەش لەلایەن خودی سوڵتانەوە لەنێو کوردەکاندا برەوی پێدرا کە تورکو کوردو عەرەبو هەموو ئەوانی تریش موسڵمانن‌و سوڵتانیش سوڵتانی هەموو موسوڵمانانەو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش ئیمپراتۆریتی هەموو گەلانی موسوڵمانە، رۆژنامەی کوردستانیش لەلایەك داوای جیابوونەوەی کورد لە ئیمپراتۆریتی عوسمانی ناکات، لەلایەکی ترەوە پێی وایە کوردو تورکو ئەوانی تریش هەموویان موسوڵمانن‌و خودی رۆژنامەکەش بۆ سەر ئاخاوتن‌و مەبەستێك گەڕاوەتەوە بۆ ئایەتی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەر کەواتە رۆژنامەی کوردستان هەوڵی بنیادنانی گوتارێکی کوردی ئیسلامی لەسایەی ئیمپراتۆریتی عوسمانیدا داوە، بەلام ئەم واتە رۆژنامەی

کورستان پێی وابووه که سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم سوڵتانێکی دادپەروەر نەبووە بۆیە ئەم ڕۆژنامەیە لەسەر زارو بە پێنووسی سەرنووسەرەکەی داوای سوڵتانێکی دادپەروەر دەکات، بەڵام سوارەی حەمیدیە نەیتوانیووە بیر لەوە بکاتەوە کە دادپەروەری چییەو چ سوودێکی دەبێت. سوارەی حەمیدییە بوونە بەشێك لە هێزی پارێزو بەرگریکەر لە ئیمپراتۆر بەڵام ڕۆژنامەی کوردستان لەبری ئەوە داوای گۆڕینی دەسەڵاتی ئۆتۆکراتی سوڵتانی دەکرد بۆ ڕژێمێکی دەستووری‌و کوردیش لەچوارچێوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆردا دەمایەوە، لێرەوە بە ئاشکرا گەوهەرو ماهییەتی گوتاری کوردی ڕۆژنامەی کوردستان دەردەکەوێت کە گوتارێکی ئایینی تەوحید خوازی نێوان تورك‌و کوردو تەنانەت ئەرمەنیشە. گوتاری کوردی لەسەردەمی ڕۆژنامەی کوردستاندا نەبۆتە گوتارێکی ناسیونالیزمانە کە بارگاوی کرابێت بە ویست‌و داو ناسیونالیزمیەکانی کورد. لێرەوە تێدەگەین کە گوتاری ڕۆژنامەی کوردستان گوتارێك نییە کە بارگاوی کرابێت بە توخم‌و ڕەگەزەکانی گۆڕانکاری‌و خۆی لە گوتاری ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵاو تەنانەت لە گوتاری سوارەی حەمیدییەش جیا بکاتەوە، بەڵکو ئەوەی کە وەکو سیمای جیاوازی گوتاری کوردی پێشترو گوتاری ڕۆژنامەی کوردستان دەردەکەوێت، ئەوەیە کە (کوردستان) وەکو یەکەم هەنگاو سەیر دەکرێت لەبواری گەڕانەوە بۆ نێو کەلتوری کوردی لەو ڕوانگەیەوە کە زمانی کوردی لە شێوازی نووسین تۆمارکردندا دەخاتە کارەوەو هەر بەو زمانەش لە کێشەی کوردو ئەدەبی کوردی دەدوێت، بۆیە دەتوانین وەها سەیری کوردستان بکەین کە زمانی کوردی بۆ نووسین لە زمانی شیعرەوە گواستەوە بۆ زمانی پەخشان، بەوەش هەڵچوون‌و سۆزو وروژانی شیعری بەرەو لێکدانەوەو تێڕامان‌و بیرکردنەوە دەچێت.

# سەرچاوەکانی بەشی ( ١١ )


١ـ جەلیلی جەلیل ـ هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو کەلتوری کورد ـ وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد ـ سلێمانی، ٢٠٠٦ ـ ل٢٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢٩.

٣ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٤٠.

٤ـ ڕۆبەرت ئۆڵسن ـ ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ـ وەرگێڕانی ـ ئەبوبەکرد خۆشناو ـ سلێمانی ١٩٩٩، ل-٢٧.

دوای تێپەڕبوونی (دە) ساڵو چەند مانگێك بەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستاندا کۆمەڵەی (کورد تەعاونو تەرەقی جەمعیەتی) لە ئەستەمبوڵ دروستبوو کە ئەویش لەلایەن نوخبەیەکی دیاری کەسایەتی کوردییەوە دروستکرا، لە پاییزی ساڵی ١٩٠٨دا شێخ عەبدولقادرو ئەمین بەدرخان لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵەی (کورد تەعاونو تەرەقی جەمعیەتی) یان دامەزراند بۆ ئەوەی ڕابەرایەتی خەباتی سیاسیو ڕۆشنبیری هەموو چینو بەرەو تاقمەکانی بکات [١] ساڵی ١٩٠٨ بنەماڵەی بەدرخانو جەنەراڵ شەریف پاشای خەڵکی سلێمانی چەند یانەیەکی ئەدەبیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیان دروست کرد کە لە ماوەی کورتی پەیوەندی خۆشی نێوان کوردو تورکدا چالاکانە کاریان دەکرد[٢] هەروەك لازاریفیش دەڵێت: لە پایزی ساڵێ ١٩٠٨ لە ئەستەمبوڵ لەلایەن ئەمین عالی بەدرخانو شەریف پاشاو عەبدولقادرە (مەبەست شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریە) کۆمەڵەیەکی سیاسی ڕۆشنبیری بەناوی (تەعالیو تەرەقی کوردستان) دامەزرا[٣] دایڤد ماکدۆواڵیش دەڵێت: دەستەیەك لە نوخبەی کوردی ڕۆشنبیری ئەستەمبوڵ ژمارەیەك کۆمەڵەی کوردییان پێکهێنا، کە یەکەمیان (کۆمەڵەی تەعالیو تەرەقی) بوو ـ لەنێو دامەزرێنەکانیدا ئەمین عالی بەدرخانو شێخ عەبدولقادری نەهریو جەنەراڵ موحەممەد شەریف پاشا بوون[٤].

ئەگەر سەرنجی ئەو وتانەی سەرەوە بدەین لەسەر دامەزراندنی (کورد تەعاونو تەرەقی جەمعیەتی) ئەوا دوو خاڵی ئاشکرا دەبینین یەکەمیان لە دامەزرێنەرە سەرەکیەکانی ئەم کۆمەڵەیەدا نوخبەی سیاسیو ڕۆشنبیریو بنەماڵە یان ناوچەی جوگرافی دەردەکەوێت کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری ڕابەری ڕاپەڕینی ساڵی ١٨٨٠ کە خۆیشی بە عەمەلی بەشداری کردووە لە ڕاپەڕینەکەداو سەرکردایەتی کردووەو نوێنەری باوکیو ڕێبازی نەقشەبەندی یان شێخانی نەهری بووە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان واتە شێخ عەبدولقادر لەلایەك کوڕی ڕابەری یەکێ لە دیارترین ڕاپەڕینەکانی کورد بووەو لە هەمان

کاتیشدا بنەماڵەکەیان و خۆیشی یەکێك بوون لە پایەو رابەرە دیارەکانی رێبازی نەقشەبەندی، دیارە پەیوەندی و نزیکی ئەم رێبازەش هەم بە مەسەلەی کوردو هەم بە مەسەلەی رۆشنبیرییەوە ئاشکرایە.

کەسێکی تر لە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە ئەمین عالی بەدرخانە کە لە بنەماڵەی بەدرخانیەکانەو دوای شکستی راپەڕینی دووەمی بەدرخانیەکان کە لەلایەن هەردوو کوڕەکەی بەدرخانەوە (حسەین و عوسمان/ لەساڵی ١٨٧٨[٥] رابەرایەتیکرا، ئەمین عالی بەدرخان و مەدحەت بەدرخان هەوڵیاندا جارێکی تۆ هێزی خێڵەکان کۆبکەنەوەو راپەڕین بکەنەوە کە ئەمەش لەساڵی ١٨٨٩دا بوو، بەڵام هەوڵەکەیان سەری نەگرت چونکە کارەکەیان ئاشکرابوو، پێش ئەوەی هێزەکانیان کۆبکەنەوە دەستگیرکران[٦] کەواتە ئێستا ئاشکرایە کە ئەمین عالی بەدرخان لەلایەك لە خێزانی بەدرخانیەکانەوە وەك خێزانێکی هوشیار لەلایەکی تریش خۆی بە کردەوە بەشداری خەباتی کردووەو هەوڵی کۆکردنەوەی هێزی داوە بۆ راپەڕین لە سنووری دەسەلاتی سوڵتاندا.

شەریف پاشای خەندان کە ساڵی ١٨٦٥ لە ئەستەمبوڵ لەدایك بووەو بە ئەسڵ خەڵکی سلێمانییەو پەیوەندی بە سوپاوە کردووەو تا ئەنجام پلەی جەنەراڵی وەرگرتووەو لە تەمەنی (٤٣) ساڵیدا بەشداری لە دروستکردنی کۆمەڵەی (تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی)دا کردو پاشانیش رۆڵێکی زۆر گرنگو پڕ بایەخی لەپێناوی کوردو کوردستاندا بینیوە.

وەکو لە سەرەوە باسمان کرد خاڵی یەکەم ئەوەیە کە ئەم سێ کەسێتیە دیارەی کە بەشداری دامەزراندنی کۆمەڵەی (تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی)یان کردووە. لەلایەك لە بنەماڵە دیارو بەنفوزەکانی کورد بوون لەلایەکی ترەوە لەو کەسانە بوون کە لە نزیکەوە پەیوەست بوون بە مەسەلەی کوردەوە. خاڵی دووەمیش ئەوەیە کە ئەم کەسێتیانە هەرسێکیان ماوەی بوورو درێژ لە ئەستەمبوڵو شارەکانی تردا ژیاون و ژیانی شارو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی

شار کاری لێکردوون و ئەوەش دەوری هەبووە لە هوشیارکردنەوەیانداو لە دروستکردنی هەستی نەتەوەیی لەلایان.

ئێستا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا لەژێر چ کاریگەرییەکدا ئەم کۆمەڵەیە دروستبووە؟ ئایا گوتاری ئەم کۆمەڵەیە چ جۆرە گوتارێك بووە؟ ئایا گوتاری ئەم کۆمەڵە گوتارێکی نەتەوەیی بووە؟ یان بەشێوەیەکی تر گوتارێك بووە کە خۆی لە گوتاری تورکی یان گوتاری ئیسلامی تورکی ئیمپراتۆر جیا کردبێتەوە؟ مەبەست لە گوتاری تورك، گوتاری ناسیونالیزمی تورکیە کە تورکە لاوەکان پرۆژەی بنیادنانیان هەبوو، مەبەست لە گوتاری ئیسلامی تورکی ئیمپراتۆریش ئەو گوتارە گشتگرە بووە کە ئیمپراتۆریێتی عوسمانی بنیادی نابوو، بارگاوی کرابوو بە توخمەکانی هاوئایینیو هاوچارەنووسیو هاوبەرژەوەندیێتی لە گەوهەریشدا گوتارێکی چەقبەستووبوو لەسەر بە سەنتەرکردنی تورکیایەتیو ئیسلامێتی لەو روانگەیەوە کە بەرژەوەندییەکانی سوڵتانو مانەوەی ئیمپراتۆرێتەکە بپارێزرێت.

نزیکەی بیست ساڵێك پێش دروستکردنی (کورد تەعاونو تەرەقی جەمعیەتی رێکخراوێکی نهێنی لە تورکیا پێکهاتو دواتر لەژێر ناوی ئیتحادو تەرەقیدا کاری کردو ئەم رێکخراوە لەپێناوی تەسککردنەوەی دەسەڵاتی سوڵتانو ریفۆرمکردنو چاکسازی لە دەستورو بەدیهێنانی ئازادیدا کاری دەکرد. ئەم کۆمەڵەیە کە لەساڵی ١٨٨٩دا لەلایەن چوار خوێندکاری خوێندنگای پزیشکی سەربازییەوە دامەزرا کە یەکێکیان ئەسپانیو، یەکێ تریان سێرکاسیو دوو کوردیشیان لەگەڵ بوو[٧] بەڵام ئەم رێکخراوە هیچ پەیوەندییەکی بە کوردو مەسەلەی کوردەوە نەبوو، هەرچەندە جارویار ئەوە دەبیستین کە ئەو دوو کوردەی لە دامەزراندنی ئەم رێکخراوەدا بەشدار بوون وەکو کەسانی ناسیونالیستی کوردی سەیر دەکرێن، کە ئەو دوو کەسێتیەش بریتی بوون لە عەبدوڵڵا جەودەتو ئیسحاق سکوتی.

بەلام بەرنامەی ئەم ڕێکخراوە کە باسی چاککردنی دەستووری کەمکردنەوەی دەسەلاتی سولتان عەبدولحەمیدو ئازادی بیروڕای دەکرد تـوانی نوخبەیـەك لـە ڕۆشنبیرانو کەسانی دیاری تورکو کوردو ئەرمەن کۆبکاتـەوە، هەرچەنده لـە سەرەتاوە ئەم ڕێکخراوە سیمای پـان تـورکێتیو تورکچێتی بـە ئاشـکرا پێـوە دیار نەبوو، بەلام لەگەڵ پەرەسەندنو بەهێزبوونیدا زیاتر سیمای ناسیونالیزمی تورکی پێوە دەرکەوت بەجۆرێك کـە هـەوڵی ئـەوە بـدات کـە سـیمای تـورکێتی عوسمانی بە پرۆژەی خۆی ببەخشێتو لەو پێناوەشدا ئـەم کۆمەڵەیـە لەسـاڵی (١٩٠٧)دا لەگـەڵ کۆمەڵـەی ئـازادی عوسمانیـدا بوونـە یـەكو دواجـاریش لـە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا لە پـاریس دووەم کـۆنگرەی لایەنـە نـەیارەکانی دەسـەلاتی سـولتان گـیرا. کـە لێـرەوە بۆچـوونو ڕوانینـی تورکـانی لاو بـەرەو پەرەسـەندنو گەشـەکردن چـوو کـە ئـەوەش شۆڕشـی تورکـانی لاوی سـاڵی ١٩٠٨ی بەدواداهات. زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە ڕیزی ئیتحادو تەرەقیدا بوون بەشداری شۆڕشی تورکە لاوەکانیان کرد، تەنیا جەنەراڵ شەریف پاشـانە بێـت کە لە بەرنامەی ڕووخاندنی سولتان پاشگەز بووەوە. دیارە جەنـەراڵ شـەریف پاشا پیاوێکی وریـاو بـەئاگابووەو بـاش لـەوە تێگەیشتووە کـە پـرۆژەی پـان تـورکێتی تورکـە لاوەکـان سـەبارەت بـە کـورد زۆر ترسـناکترە لـە سیاسـەتو بەڕێوەبردنی سولتان عەبدولحەمید. بێگومان کۆمەڵەی (کورد تـەعاونو تـەرەقی جەمعیەتی) لە بارودۆخێکدا دروستبوو کە تورکە لاوەکان سەرگەرمی بنیادنانی گوتاری ناسیونالیزمی تورکی بوون کـە ئـەو گوتـارەش هـەر لـە سـەرەتاوە بـە ڕەگەزەکانی شۆڤێنیزمی تورکیو عەقڵی پان تورکێتی بارگاوی کرابوو. بـەلام گوتـاری ئـەم کۆمەڵـە کوردییـە نـەبووە گوتـارێکی ناسـیونالیزمی هاوشـێوەی گوتاری تورکە لاوەکان یان گوتاری ئیتحادو تەرەقی لە قۆناغی پـێش شۆڕشـی سـاڵی ١٩٠٨دا، بـەڵکو گوتـاری ئـەم کۆمەڵەیـە زیـاتر لـەژێر کاریگـەری بۆچوونەکانی شەریف پاشادا فۆرمەلە بووە کـە پێـی وابـوو مانـەوەی سـولتان عەبدولحەمیـد دوای هەنـدێ گۆڕانکـاری لـە دەسـتوورو دابـین کردنـی ئـازادی،

باشتره له پرۆژەی تورکه لاوەکان، بۆیه بـه ئاشـکرا دەبینن کـه گوتـاری ئـەم کۆمەڵەیـە سـەرباری داواکـاری خوێنـدنو گەشـەکردنو پەرەسـەندنی زانسـتو زانیاری لـه کوردسـتاندا گوتـارێکی ناسیونالیزمی نـەبوو بـەو مانایـەی کـه بـه توخمو رەگەزەکانی ناسیونالیزمی کوردی بارگاوی کرابێت، بەڵکو لـه بنەڕەتـدا پـرۆژەی نەتـەوەیی لـەو قۆناغـەدا ئامـادەبوونی نـەبوو چونکه ناسیونالیستی کوردی مەگەر لەسەر ئاستی تاکه کەس ئەگینا لـه ئاسـتێکی زۆر لاوازدا بـووە، تەنانەت ئەوەشی کـه هەسـتی پێکراوەو دەرکـەوتووە زیـاتر لـەژێر کاریگـەری پرۆژەی ئیتحادو تەرەقیو تورکـه لاوەکانـدا بـووە، بـه واتایـەکی دی نـاتوانین بڵـێین (کـورد تـەعاونو تـەرەقی جەمعیـەتی) هـەڵگری پـرۆژەی نەتـەوەییو بەرهەمهێنی گوتاری نەتەوەیی بووە، لەلایـەك لەبـەر ئـەوەی لـەژێر کاریگـەری سـەرهەڵدانی ناسیونالیزمی تورکیداو دواتـریش لـه ئـەنجامی بـێ ئومێـدبوونی بەشێك له نوخبەی رۆشـنبیری کـوردی ئەوکاتـەی ئەسـتەمبوڵو لـه شـارەکانی تری ئیمپراتۆردا له بەرنامەی تورکه لاوەکان ئەم کۆمەڵەیە دروستبوو، بـه واتـا لەلایەك دروستکردنی ئەم کۆمەڵەیە جۆرێك لـه لاسـایی کردنـەوەی تورکـەکانی تێدا بوو، لەلایەکی تریشەوە پەرەسـەندنو دەرکـەوتنی ناسـیونالیزمی کـوردی ئەم کۆمەڵەی دروست نەکردبوو، دیسان دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیـە کـه سـێ کەسێتی جیاوازو له هەمان کاتیشدا نـاکۆکو لەگـەڵ یـەکتر نـەگونجاو لـه رووی مێژووییـەوە، تەسـەوری ئـەوە نـەدەکرا کـه هـاوبیروڕایو هاوبۆچـوونی کـۆی کردبنەوەو پەرەسـەندنی هەسـتو هوشـاری نەتـەوەییو ئینتیمـا بـۆ نەتـەوەو نیشتمان هەموو ناکۆکییە خێڵایـەتیو هەرێمایەتیـەکانی سڕیبێتەوەو کردبنیـە هێزێکی یەکگرتوو که هەڵگری یەك پرۆژە بن که پرۆژەی کوردایەتی بێتو بـەو پێیەش خاوەنی یەك گوتار بن که ئەویش گوتاری نەتەوەیی کوردی بێت.

ئەگەر سەرنجی بەرنامەی (کورد تـەعاونو تـەرەقی جەمعیـەتی) بـدەین ئـەوا خـاڵێکی سـەرەکی لەبەرنامەکەیـدا گوتـاری کۆمەڵەکـە دیـاری دەکـات ئـەویش ئەوەیە کـه (ئەنـدامانی کۆمەڵەکـە، لایـەنگری دروشـمە گشتییەکانی تورکـانی

لاوبوون، داكۆكییان له مەسەلەی یەكێتیی میللەتانی ناو دەوڵەتی عوسمانیو دەستووری ساڵی ١٨٧٦ دەكرد[٨]. ئەگەر له سادەترین پێناسەی گوتاری نەتەوەیی بڕوانین ئەوا دەڵێین گوتاری نەتەوەیی ئەو گوتارەیە كە بارگاوی كراوە بە رەگەزو توخمو ویستەكانی ناسیونالیزمی ئەو نەتەوە كە ئەویش لە پلەی یەكەمدا سەربەخۆییو دروستكردنی دەوڵەتی نەتەوەییە كە ئەوەش لەگەڵ پێكەوە ژیان لەگەڵ نەتەوەكانی تردا یان ژیان لە سایەی ئیمپراتۆریێتی نەتەوەیەكی تردا ناگونجێت. بەرنامەی ئەو كۆمەڵە كوردییە جیاواز نەبوو لە بەرنامەی توركە لاوەكانو نەك داواكاری جیابوونەوەی كورد نەبوون بەڵكو داكۆكیشیان لە یەكێتیی نەتەوەكانی سنووری قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی كردووە. لێرەوە بە ئاشكرا دەردەكەوێت كە دوو هۆكاری سەرەكی دەوری ئاشكرایان هەبووە لە فۆرمەلە لەبوونی بەرنامەی ئەم كۆمەڵەیەدا كە یەكەمیان عەقڵو روانینو ستراتیژی ناسیونالیزمی توركییە كە لە بەرنامەی ئیتحادو تەرەقیو توركە لاوەكاندا دەركەوتووەو بووەتە هۆی دروستكردنی ئەو بۆچوونە لای ئەو نوخبە رۆشنبیرەی كورد كە ئەم كۆمەڵەیان دروستكردووەو بە هەمان عەقڵییەتی ئەوان كاریان كردووەو بیریان كردۆتەوە كە ئەوەش لە ئاكامدا لە بەرژەوەندی ئەوان بووە، هۆكاری دووەم رۆڵی ئاینی ئیسلام بووە كە هەوڵی دروستكردنی ئەو بۆچوونەی داوە كە مسوڵمانان هەموویان برای ئاینی یەكترنو هەمان بەرژەوەندیو چارەنووسیان هەیەو دەوڵەتی عوسمانیش دەوڵەتی تورك نییە بەتەنیا بەڵكو دەوڵەتی نەتەوە مسوڵمانەكانەو ئەركی هەمووشیانە پارێزگاری لێ بكەنو بیپارێزن.

گوتاری (كورد تەعاونو تەرەقی جەمعیەتی) بریتی بووە لە گوتاری پاراستنی یەكێتیی خاكو گەلانی سنووری قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریێتی عوسمانیو هەوڵدان بۆ جۆرێك لە ریفۆرمو گۆڕینی دەسەڵاتی ئۆتۆكراتی سوڵتان بۆ دەوڵەتی دەستووریو لە هەمان كاتدا هێشتنەوەو بەهێزكردنی گوتاری ئاینی ئیمپراتۆرو پشتگوێ خستنی گوتاری عەلمانی، لە هەموو ئەمانەشدا ئەم

کۆمەڵەیە پێویستی بەوە نەبووە بگەڕێتەوە بۆ نێو کەلتوورو دابو نەریتو ڕەسەنایەتی کوردی، بەواتایەکی دی ئەم کۆمەڵەیە بیری لە گەڕانەوە بۆ ئەو ڕەگەزو توخمو پایە سەرەکیانەی کەلتوری کوردی نەکردۆتەوە کە گوتاری نەتەوەیی کوردییان لەسەر بنیاد دەنرێت.

لێرەدا دەتوانین بڵێین گوتاری ئەم کۆمەڵەیە هاوشێوەی گوتاری ناسیونالیستی تورکی بووەو مەبەستی ئاشکرا کارکردنی پەیوەستبووە بە تورکو یەکێتیی میللەتانی ژێر سایەی دەسەڵاتی تورکەوە، کە ئەمەش پێمان دەڵێت لە ڕاستیدا گوتاری ئەم کۆمەڵەیە گوتارێکی نامۆ بووە بە کوردو هەمان سروشتی گوتاری تورکانی لاوو ناسیونالیستە تورکەکانی هەبووە. هەرچەندە لە بەشێکی بەرنامەی ئەم کۆمەڵەیەدا باسی خوێندن بە کوردیو بەکارهێنانی زمانی کوردی کراوە واتە بەرنامەی ئەم کۆمەڵەیە هەوڵدان بوو بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە: کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەکانی کوردستاندا، دانانی فەرمانبەرو کاریەدەستی کورد لە داموو دەزگا ئیدارییەکاندا، بەڕەسمی کردنی زمانی کوردی، کردنەوەی زانکۆیەك لە کوردستاندا، ڕێگەی دەرکردنی گۆڤارو ڕۆژنامە بەزمانی کوردی، دیاریکردنی نوێنەرانی هەمیشەیی لە مەجلیسدا، هەوڵدانو کارکردن بۆ بوژاندنەوەی باری ئابوری کوردستان[٩]. بێگومان ئەم خاڵانەی نێو بەرنامەی کۆمەڵەی کورد تەعاونو تەرەقی جەمعیەتی بایەخی تایبەتی خۆیان هەیەو لەو پایەگرنگانەن کە بوونی سروشتی نەتەوە وەکو مادەی خاوی ناسیونالیزم بەرجەستە دەکەن، هەرچەندە ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەین کە ناسیونالیزم نەتەوە دروست دەکات، بۆیە بێ بوونی ناسیونالیزم نەتەوە جگە لە پێکهاتەیەکی سروشتی کە زیاتر خاسێتی بایۆلۆژی هەیە شتێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت. ئەو بایەخ پێدانەی ئەم کۆمەڵەیە بەو خاڵانە لە پلەی یەکەمدا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە ویستوویانە لەسایەی دەسەڵاتی تورکیدا ئەو مافە سادانە بەدەست بهێنن کە ئەوەش بەڵگەی نەبوونی گوتاری ناسیونالیزمە بەگوێرەی کورد لەو

قۆناغەدا چونکە گوتاری ناسیونالیزم بەرهەمی ناسیونالیزمەو لەپلەی یەکەمدا دروستکردنی گوتارێکی شەرمنی ریفۆرمکردنە بەگوێرەی کورد لەچوارچێوەی برِوابوون بە ژیان لەسایەی دەوڵەتی ئەویتردا کە ئەوەش ناکۆکە لەگەڵ گوتاری نەتەوەییدا.

هەر ئاخاوتن و قسەکردنێك بەگوێرەی کورد بۆ مانەوەو پێکەوە ژیان لەسایەی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستاندا چ بۆ سەردەمی رابردووی نزیك کە دوو ئیمپراتۆرەکەی عوسمانی و فارسی دەسەڵاتیان بەسەر کوردستاندا کردووە کە ئەو قۆناغەش بەتایبەتی دوا سەدەی دەسەڵاتیان کە سەردەمی دەرکەوتنی ناسیونالیزم بووە لە ئەورووپادا بۆ کورد قۆناغی دروستبوونی هەستێکی پتەوی پێکەوە ژیان بووە لەگەڵ نەتەوەکانی ئەو دوو ئیمپراتۆریتەدا بە مەرجێ هەندێ ریفۆرم بکرێت و دەسەڵاتی ئۆتۆکراتی بگوازرێتەوە بۆ دەسەڵاتی دەستووری کە ئەمەش هەمان ویست و داوای ناسیونالیستی تازە دەرکەوتووی تورك و فارس بووە، دیارە بۆ تورك و فارس خۆیان ئەوان دەوڵەتیان هەبووە، ناسیونالیستی ئەم دوو نەتەوە گرفتیان دروستکردنی دەوڵەت نەبووە بە ئەندازەی ئەوەی کە مەبەستیان چاکسازی و ریفۆرمکردن بووە لە پێکهاتەو بەرنامەی ئەو دەوڵەتەدا بەڵام بەگوێرەی کورد هیچ دامەزراوێکی سەربەخۆی بەرێوەبردنی نەبووە هەتا هەوڵی چاککردن و ریفۆرم تیاکردنی بدات بۆ بەرزکردنەوەی ئەو دامەزراوەو گەشەپێدانی بۆیە بەرزکردنەوەی دروشم و هەوڵدان بۆ کارکردن بە بەرنامەی ئیتحادو تەرەقی و تورکە لاوەکان بەگوێرەی کورد بەگشتی و کۆمەڵەی (کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی) ئەوە نیشان دەدات کە ئەم کۆمەڵەیە وەکو وێنەی هاوشێوەی ئیتحادو تەرەقی دروستبووەو لە بنەرِەتیشدا هەڵگری گوتاری ئەوان بووەو گوتاری نەتەوەیی کورد لای ئەم کۆمەڵەیە لە ئاستی نەبووندا بووە.

## سەرچاوەکانی بەشی (١٢)


1- A. Safrastian – Kurds and Kurdistan – London – 1948- p.26.

(لە جەلیلی جەلیل ـ هەندێ سیمای) وەرگیراوە.

٢- نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆنەتەوایەتی کورد ـ وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی ـ سلێمانی ٢٠٠٥ـ ل١٧٨.

٣- م.س. لازاریف ـ المسألة الكوردية(١٨٩١ـ١٩١٧) ترجمة ـ أكبر أحمد ـ سليمانية ـ ٢٠٠١ ـ ص٢١٦.

4- David MacDowall . A Modern History of The Kurds. London – 2000, p.93.

٥ـ م.س. لازاريف ـ المسألة الكوردية ـ ص٥١.

6- David MacDowall. A Modern History of the Kurds. P.90.

7- Ibid-p.88.

٨- جەلیلی جەلیل ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل٦٧.

٩- جەلیلی جەلیل ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ـ ٦٧ ـ ٦٨.

دوای ئەوەی تورکە لاوەکان هیچ کام لە بەڵێنەکانی خۆیانیان سەبارەت بە کورد جێبەجێ نەکرد، هەندێ لە ئەندامە کوردەکانی نێو پێکهاتەی تورکە لاوەکان یان لایەنگرانیان لەوە بێ ئومێد بوون کە تورکە لاوەکان سیاسەتێکی باشتریان لەچاو دەسەڵاتی سوڵتاندا بەرامبەر بە کورد هەبێت، هەندێ لەو کەسانە لە جووڵەو هەوڵی خۆیان لەپێناوی کورددا بەردەوامبوون، کوڕانی بنەماڵەی بەدرخان‌و شێخ عەبدولقادرو سەید تەهاو مەلا سەلیم‌و چەندانی تر لە خەباتی خۆیان دەستبەردار نەبوون.

لەساڵی ۱۹۱۱ بۆ دواوە هەتا هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی تورکیا لەلایەك لەناوخۆدا دوو چاری کێشەی گەورەی دەسەڵات هاتبوو هەموو لایەن‌و ڕەنگەکانی ناو تورکیا دژایەتی تورکە لاوەکانیان دەکرد، ئەوەش بارودۆخێکی خراپی بۆ دەوڵەت هێنایە ئاراوە بەجۆرێك کە نەتوانێت جڵەوی دەسەڵات بەتووندی بگرێت، لەلایەکی ترەوە لەم قۆناغەدا تورکیا دووچاری چەند شەڕێکی دەرەکی بوو کە لەوانەشدا تووشی تێکشاندن هات. لەساڵی ۱۹۱۱ شەڕی تورکیاو ئیتالیا سەری هەڵدا کە تیایدا دەوڵەتانی ئیمپریالی لایەنگری خۆیان بۆ ئیتالیا دەربڕی. لە ئاکامدا تورکیا دووچاری تێکشکان هات‌و ئەوەی لەباکوری ئەفەریقا لەدەستیدا مابوو تەرابلوس‌و قەیرەوان بوو ئەویشی دۆڕاند[1] هەروەها لەساڵی ۱۹۱۲دا تورکیا لەگەڵ دەوڵەتانی بەلقاندا کەوتە شەڕەوەو لەئاکامدا سوپای تورکی بەتەواوەتی تێکشکا. هەروەك لە تەمموزی هەمان ساڵدا هاوپەیمانان حکومەتی تورکە لاوەکانیان ڕوخاندو خۆیان دەسەڵاتیان گرتە دەست، بەڵام ئەمانیش هەمان عەقڵیەت‌و سیاسەتی ئەوانیان هەبوو بۆیە بارودۆخی ناوەوەو دەرەوەی وڵات سات لەدوای سات خراپتر دەبوو لەم بارودۆخە ناهەموارەی تورکیادا هەڵبژاردەیەك لە خوێنەوارو پیاوانی کورد چ لە کوردستان یان لە پێکهاتەی دەسەڵاتی دەوڵەتدا یان لە پایتەختەکانی ڕۆژئاوا لە جوڵەی بەردەوامدا بوون بۆ کۆکردنەوەو یەکخستنی کورد یان پاڵپشت پەیداکردنی دەرەوە بۆ داواکانی کورد کە لەو نێوەندەشدا

ئارەزووی رووکردنە روسیاو هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری روسیا ئاشکرابوو. عەبدولڕەزاق بەدرخان بە هەموو شێوەیەك هەوڵیدەدا کە پشتگیریو یارمەتی روسیا بۆ راپەڕینی کورد بەدژی بابی عالیو دەسەڵاتی والییەکانی تورك بەدەست بهێنێت، سیاسەتی خراپی دەوڵەتو زیادکردنی باج لەسەر کوردەکان بەناوی باجی ئاژەڵانەو کشتوکاڵو هەروەها راپێچکردنی خەڵك بۆ شەڕی بەلقانو شەڕی ئیتاڵیا لە باکوری ئەفەریقاو گرتنو دوورخستنەوەی بەردەوامی پیاوانی دیاری کورد لەو هۆکارانە بوون کە بەردەوام پیاوانی نوخبەی کوردیان هاندەدا بۆ راپەڕین بەدژی دەسەڵاتی دەوڵەت. لە بەهاری ۱۹۱۳ سەرکردە کوردەکان لە ناوچەی شیرڤانی سنجاقی سێرت کۆبوونەوەو باسی دامەزراندنی ئەمارەتێکی کوردی سەربەخۆیان کرد[٢] جێگری قونسوڵی روسیا لەشاری وان نووسیوویەتی: دوو رێباز لەناو کوردەکاندا هەیە، یەکەمیان رێبازی ئەو کوردانەیە کە هەستێکی نەتەوایەتیان هەیە، دووەمیان رێبازی دژایەتی ئەرمەنە. عەبدورەزاق سەرکردایەتی رێبازی یەکەم دەکات، بەڵام هی دووەمیان ئەو کەسانەن کە پروپاگەندەی پان ئیسلامیزم بڵاودەکەنەوەو بە فروفێڵی حکومەتی تورکیا هەڵخەڵەتاون[٣].

کەواتە ئاشکرایە لەم قۆناغەدا کورد بەگشتیو نوخبەی خوێندەوارو پیاوانی دیاری بەتایبەتی دابەشبوون بە دوو ئاراستە:

ئاراستەی یەکەم کە ئاراستەی راستو دروستە ئەو ئاراستەیە کە هەستی نەتەوایەتیان هەیەو لەپێناوی دروستکردنی ئیمارەتێکی کوردیدا خەبات دەکەن، بەڵام لە بەرامبەر ئەم ئاراستەیەدا ئاراستەیەکی تر هەیە کە ئەویش وەها سەیری دەوڵەتی تورك دەکات کە دەوڵەتی هەموو مسوڵمانانەو بڕوای بەجیاوازی ئیتنیکی نییە بەڵکو بڕوای بە جیاوازی ئایینی هەیە، هەر بۆیە دژایەتی کردنی ئەرمەنی لەپێش هەموو شتێکی ترەوە داناوە. ئەمەش سەلمێنەری ئەو راستییە کە لەو قۆناغەدا هەستی نەتەوایەتی کوردی زۆر لاواز بووەو نەبووەتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیو نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە

کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی داگیربکاتو لەوێشەوە ئەو هەستە ببێتە مۆتیڤی یەکخستنو یەکگرتنو دروستکردنی جوڵەیەکی کۆمەڵایەتی سەرتاپاگیر کە هەموو رووبەری کوردستانو هەموو جەستەی نەتەوەیی کورد بگرێتەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لەو قۆناغەدا گوتارێکی سیاسی کوردی ئەوتۆ بوونی نەبووە کە بتوانرێت بەگوتاری سیاسی نەتەوەیی ناوببرێت یان پێناسە بکرێت.

لەو بارودۆخەدا کە دەوڵەتی تورك لەلایەك بەدەستی تێکشکاندنیەوە لە بەلقانو لە باکوری ئەفەریقادا دەیناڵاندو لەلایەکی تریشەوە لە قەیرانێکی ناوخۆی بەهێزدا بوو، لەلایەکی تریشەوە روسەکان لەلایەکو ئینگلیزەکانیش لەلایەکی ترەوە هەریەکە تەموحی جێگا پێکردنەوەی خۆیی راستەوخۆو ناراستەوخۆ لەنێو ئەو رووبەرە جوگرافیە فراوانەی قەڵەمڕەوی عوسمانیدا هەبوو کاریان بۆ دەکرد. دەوڵەتی تورکی خستبووە حاڵەتێکی شلۆقەوە، بوونی هەستێکی لاوازی نەتەوەیی لای نوخبەیەکی کەمی کوردی رێگا خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە کورد جۆرێك لە راپەڕین دەست پێبکات هەرچ هیچ نەبێت دەوڵەت بخاتە بارێکی شلۆقو نائارامیەوە. راپەڕینی بەتلیس لەساڵی ١٩١٤دا دەرئەنجامی ئەم هۆکارانەی سەرەوە بوو.

ولایەتی بەتلیس کە هەمان بارودۆخی پەشێوی کوردستانی ژێر سایەی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو، بێزاری خەڵکەکەی لەدەست باجو مەڕانەو راپێچکردنی پیاوانی گەنج بۆ سەربازی ئەوەندەی تر بارودۆخەکەی ئاڵۆزکردبوو، روو لە تەقینەوە بوو، لەم کاتەدا، والی بڕیاری گرتنی مەلا سەلیمی دا، ئەم پیاوە یەکێك بوو لە سەرکردەی بزوتنەوەی کوردەکان(٤) لە تۆڵەی ئەمەدا کوردێکی چەکداری زۆر لە گوندی ئارەزنیك بۆسەیەکیان نایەوە. دوای تەقو تۆقێکی کەم خایەن، جەندرمەکانیان راوناو مەلا سەلیمیان رزگار کرد(٥). دایڤد ماکدۆوال دەڵێت: ئەوە ئاشکرایە کە مەلا سەلیم بەشێوەیەکی بەئاگایانەو بە مەبەستەوە شێخەکانی ناوچەی خێزانی هانداو جوڵاندوونی بۆ

راپەڕین لەدژی حکومەت[6] لە مانگی ئازاری (١٩١٤)دا دەسەڵاتداران هەوڵیان دا بەریەستی ئەو چالاکیانەی مەلا سەلیم بکەن و ڕێگا لە هەر جۆرە جوڵەو راپەڕینێك بگرن، بۆ ئەو مەبەستە: هەوڵیان دا مەلا سەلیم دەستگیر بکەن، لەو کاتەدا شێخەکانی خێزان بڕیاریان دا بکەونە کار، یەکێکیان داوای لە والی بەتلیس کرد کە بگەڕێنەوە بۆ کارکردن بە شەریعەت و هەموو فەرمانبەرە بێ دینەکان لاببەن. لە ئەنجامی پشتگوێخستنی ئەو داوایەدا راپەڕوانی کورد دەستیان بەسەر بەشێکی بەتلیس دا گرت[7] بە هەر حاڵ راپەڕینەکە زۆری نەخایاند کە دەوڵەتی تورك بەکۆکردنەوەو هێنانی هێز لە شوێنەکانی ترەوە توانی راپەڕینەکە دابمرکێنێتەوەو مەلا سەلیمیش جەماوەرەکەی بەتەنیا بەجێهێشت و لە باڵیۆزخانەی روسیا هەوڵی ئەوەی دا مافی پەنابەری بدرێتێ.

ئێستا ئەو پرسیارانە سەرهەڵدەدەن ئایا ناسیونالیزمی کوردی هیچ بوونێکی هەبووە لە پشتی راپەڕینەکەی بەتلیسەوە؟ ئایا ئەم راپەڕینە خاوەنی هیچ بەرنامەیەکی دیاریکراو بووە وەکو هەندێ کەس پێیان وایە لە چەند ساڵێك پێش راپەڕینەکەوە سەرکردەکانی کورد کۆبوونەوەیان کردووەو هەوڵی یەکخستنی و ڕێکخستنی هەڵوێستیان داوەو جەماوەریان ئامادەکردووەو بەرنامەیان دارشتووە، بەڵام دەستگیرکردنەکەی مەلا سەلیم بەرنامەکەی تێکداوە؟ ئایا دەشێ بزوتنەوەی ناسیونالیستی لە ناوچەیەکی لادێ نشینی دووریەری بەتلیسەوە دەست پێ بکات؟ هەروەك ماکدۆناڵ دەڵێت: دانیشتوانی شاری بەتلیس هیچیان لەگەڵ راپەڕینەکەدا نەکرد[8]؛ لەکاتێکدا هەموو بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی بەرهەمی کۆمەڵگای شارە.

بێگومان لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە لەپشتی راپەڕینەکەی بەتلیسەوە ناسیونالیستی کوردی مەگەر وەکو تاکە کەس ئەگینا لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی بوونی نەبووە، واتە راپەڕینی بەتلیس راپەڕینی کوردی ئەو ناوچەیە بووە لە سەروەختێکدا کە ناسیونالیزمی کوردی غائیب بووە.

# سەرچاوەکانی بەشی سیانزە


١ـ م. س. لازاريف ـ المسألة الكردية ـ ترجمة أكبر أحمد ـ السليمانية مركز كردستان للدراسات الستراتيجية. ٢٠٠١ ص٢٨٩.

٢- جەلیلی جەلیل ـ هەندێ سیمای ژیانی کۆمەلایەتیو سیاسیو کەلتوری کورد ـ وەرگێڕانی ئەنوەر قادر ـ محەمەد سلێمانی ـ ٢٠٠٦ـ ل١٤٩.

٣ـ هەمان سەرچاوە ـ ل١٥١.

٤ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٥٥.

٥ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٥٥.

ئەوە ئاشکرایە کە کوردستان نزیکەی چوار سەدە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی لەنێوان تورکو فارسەکاندا دابەشکرا ئەویش لەدوای جەنگی چالدێران، کوردستان سەرباری دواکەوتوویی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، ئەو دابەشبوونەش ئەوەندەی تر باری کوردستانی ئاڵۆزکردو کەسێتی کوردی بەرەو تێکشاندن برد، ئەویش لەو روانگەیەوە کە جەستەی مادیو مەعنەوی کوردی دابەشکرد بۆ دوو جەستەو لەسەر بنەمای ئەو دابەشبوونەش کەلتورو عەقڵو دابو نەریتی کوردەواری کەوتە ژێر کاریگەری دوو کەلتورو عەقڵو دابو نەریتی جیاوازەوە کە ئەوانیش کەلتورو عەقڵو دابو نەریتی فارسیو تورکی بوون. ئەم بارودۆخە هەتا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی بەردەوام بوو، بەڵام لەدوای جەنگو لە ئەنجامی تێکشکاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا بەگوێرەی کورد بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو چونکە لە ئاکامی شکستی دەوڵەتی عوسمانیدا کوردستانی ژێر سایەی قەڵەمرەوی عوسمانی بۆ سێ بەش دابەشکرا، بەشێکی خرایە ژێر سایەی دەسەڵاتی دەوڵەتی نوێی تورکەوە، ولایەتی موسڵ خرایە سەر ئەو دەوڵەتە نوێیەی کە بەناوی عێراقەوە دروستکرا، باشووری بچوکی کوردستانیش خرایە سەر دەوڵەتی تازە دروستکراوی سوریا. ئەمەش بووە هۆی زیاتر دابەشکردنی ئیداریو سیاسی کوردستانو بەو پێیەش ئاراستەی دابەشبوون لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کورددا جێگای خۆی گرت، بەتایبەتیش لەگەڵ رۆیشتنی کاتداو لەبەر لاوازی ناسیونالیزمی کوردی هەستی پەیوەستبوونی کورد بەو دەوڵەتانەوە کە بەسەریدا دابەشکرا بەرەو بەهێزبوون چووە.

بێگومان هەر لە سەرەتاو دەستپێکی جەنگی جیهانی یەکەمدا هەریەکە لە تورکەکانو روسەکان بەجۆرێك هەوڵیانداوە کوردەکان بەلای خۆیاندا رابکێشنو لە جەنگدا بەکاریان بهێنن ــ تورکەکان پاڵنەری ئایینی واتە مسوڵمانبوونی کوردیان وەکو هاندەرێك بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی وا لە کوردەکان بکەن بەشداری شەڕ بکەنو لە ریزی سوپای تورکیادا بەشێوەی بەربڵاو دەوری

خۆیان ببینن، لە ڕۆژی وازۆکردنی ڕێکەوتندا لەگەڵ ئەڵمانیادا لەپاڵ بەیانی ڕەسمی حکومیدا لەبارەی بێ لایەن نەبوونەوە، فەرمانی نیمچە ئامادەکردن دەرکرا، ئەم فەرمانەش لە ئاستی یەکەمدا پەیوەستبوو بە سوارەی حەمدییەوە، هەروەها فەرمان بۆ خێڵە کوردەکانو سوارەی حەمیدیە دەرچوو لە ولایەتی ئەرزەڕۆم بۆ پاراستنی سنووری ڕوسیا[1] بۆ ئەم مەبەستەش تورکەکان زیاتر لە هەر شتێ پەنایان بۆ سیاسەتی هەڵخەڵەتاندنی کوردەکان دەبرد بەناوی شەڕی ئیسلامو کوفارەوە، دیارە ئەمەش ڕێگایەکی باش بووە بۆ ئەوەی کوردەکان بکەنە پاڵپشتی خۆیان.

لەلایەکی ترەوە ڕوسەکان کە لە شەڕدا دژی تورکەکان بوون، ئەمانیش دەیانویست سوود لە هێزی کوردەکان وەریگرنو بە لایەنی کەمەوە بەدژی تورکیاو بۆ ئاڵۆزکردنی بارودۆخی ناوخۆی تورکیا بەکاریان بهێنن، زۆرێك لە کوردەکان لە مەسەلەی خۆئامادەکردنی سەربازی بێزار بوون بەتایبەتی لە گواستنەوەی پێکهاتە عەشائیرییەکان بە سنوورەکانی ڕوسیاو ئێرانداو ڕایانگەیاند لە حاڵەتی هەڵگیرسانی ئاگری شەڕدا لایەنگری ڕوسیا دەکەن[2].

هەرچەندە زۆرێکیش لە کوردەکان لە ڕوسیا بێ ئومێد بوونو چاوەڕوانی ئەوەیان لێ نەدەکرد هیچ پاڵپشتییەکی کێشەی کوردو داواکانی کورد بکات. لە هەمان کاتدا زۆرێك لە پیاوە دیارەکانی کورد لە ولایەتی موسڵ ڕازی نەبوون بچنە ڕیزی هۆردوی عوسمانییەوەو هەندێکیان بە ناچاری ڕایانکرد بۆ ئێرانو هەندێکی تریشیان ئامادەی هاریکاریکردنی ڕوسەکان بوون دژی عوسمانییەکان. تورکەکانیش لە سیاسەتی خراپیان لە دەستەمۆکردنی هێزی کوردەکانی سنووری دەسەڵاتی خۆیان بێ ئومێدی کردبوون، پەنایان برد بۆ بەدەستهێنانی لایەنگری کوردی ژێر سایەی دەسەڵاتی ئێرانی کە سیاسەتی خراپی ڕوسەکان بێزاری کردبوونو ئاسان دەخرانە کار بەدژی ڕوسەکان. لەم سەرو بەندەدا کە کوردەکان بوو بوونە دوو بەش لە لایەنگریکردنی لایەنە شەڕکەرەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا کوردستان بووە زەمینەی شەڕ لەنێوان

تورك‌و روسه‌كاندا له‌لایه‌كه‌وه‌و له‌لایه‌كی تریشه‌وه ئینگلیزه‌كان كه له باشوری عێراقه‌وه هێرشیان هێنا له ماوه‌یه‌كی كورتدا گه‌یشتنه سنووری ولایه‌تی موسڵ. هه‌رچه‌نده به‌گوێره‌ی كوردستانی ژێر سایه‌ی ده‌سه‌ڵاتی تورك‌و به‌شێكی فراوانی كوردستانی ژێر سایه‌ی ده‌سه‌ڵاتی فارس ــ كورده‌كان به‌گشتی خۆشییان له چاره‌ی تورك‌و روسه‌كان نه‌ده‌هات، به‌ڵام له به‌شی كوردستانی ژێر ده‌سه‌ڵاتی فارسدا باروذۆخێكی هێجگار جیاواز هاته ئاراوه، لێره ململانێ كه ره‌هه‌ندێكی مه‌زهه‌بی به‌هێزی هه‌بوو، له‌لایه‌ك كه روسیا هیچ پێشوازییه‌كی لێ نه‌ده‌كرا، له هه‌مان كاتدا پێشوازیش له توركه‌كان نه‌ده‌كرا كه سوونه بوون[٣]. به هه‌ر حاڵ له‌و ئاقاره‌شدا وڵاته‌كه كه به‌ده‌ست هه‌ژاری‌و نه‌دارییه‌وه ده‌یناڵاندا ئه‌وه‌نده‌ی تر وێران بوو. ئینگلیزه‌كان له میزۆپۆتامیاوه به‌ره‌و كوردستان هاتن، روسه‌كان له‌ساڵی ١٩١٧دا ئه‌رزه‌رۆم‌و هه‌مه‌دان‌و كرماشان‌و قه‌سری شیرین‌و وان‌و، چه‌ند ناوچه‌یه‌كی تریان خسته ژێر ده‌سه‌ڵاتی خۆیانه‌وه، هه‌رچه‌نده شۆڕشی به‌لشه‌فیك له ئۆكتۆبه‌ری ساڵی ١٩١٧دا چالاكییه‌كانی هێزی سه‌ربازی روسیای له‌كارخست‌و هێزه‌كانی عوسمانی توانیان هه‌ندێ ناوچه‌ی ژێر سایه‌ی ده‌سه‌ڵاتی خۆیان بپارێزن یان له روسه‌كانی بسه‌ننه‌وه، له گه‌رمه‌ی شه‌ڕدا زۆرینه‌ی كورده‌كان پشتگیری توركه‌كانیان كرد، وه‌ك پێشتر گوتمان هۆی ئه‌و پشتگیرییه‌ش له‌لایه‌ن كورده‌كانه‌وه پاڵنه‌ری ئایینی‌و فریودانیان بوو به چه‌مكی جیهادو غه‌زا، به وڵتا ئه‌وان بوونه یاریده‌ده‌ری سوپای ئیسلام دژی سوپای كافران.

مسته‌ر مارلینگ له رۆژی ١٦ی ته‌مموزی ١٩١٦دا له نامه‌یه‌كیدا وتوویه‌تی: ساتێك روسه‌كان به سه‌ركردایه‌تی جه‌نه‌راڵ باراتۆف چوونه ناو خاكی ئێرانه‌وه‌و هێزه‌كانیان گه‌یشتنه خانه‌قین‌و قه‌سری شیرین، له ئه‌نجامی ئه‌و هه‌موو ره‌فتاره ناله‌بارانه‌ی كه روسه‌كان كردبوویان كه بریتی بوو له راوڕوتكردن‌و تاڵانی‌و ده‌ست درێژیكردن، ئیتر كورده‌كان له رقی ئه‌و هه‌ڵوێسته‌ی روس بوون به لایه‌نگری عوسمانیه‌كان[٤]. كه‌وابوو لێره‌دا ده‌توانین

بلـێین سـەرباری هۆکـاری هاوئـاینی کـوردو تـورکو برەودانـی تورکـەکان بـە چـەمکی غـەزاو جیهـاد بـۆ بەدەسـتهێنانی لایـەنگری کوردەکـان سیاسـەتی دڕندانەی ڕوسەکانیش هۆکارێکی تر بووە بۆ ئەوەی کوردەکان ببنـە لایـەنگری تورکەکان لەشەڕدا.

لەلایەکی ترەوە کاتێ لەشکری ڕوس گەیشتە مـەریوان، دەست دڕێژییـەکی زۆریان کردبووە سەر خەڵکو شارەکەیان تالآن کردبوو، عوسمانیـەکان داوایـان لە شێخ مەحمودی حەفید کرد کە بەرپەرچی ئەو هێرشەی ڕوسەکان بداتـەوە، شـێخ مـەحمود لەشـکرێکی کـۆکردەوەو هێرشـی کـردە سـەر ڕوسـەکان لـە مەریوانو توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێـت[*] لێرەدا دەردەکـەوێت کـە ئـەو دەمە شێخ مەحمود خاوەنی نفوزو کەسێتییەکی دیاری باشوری کوردستان بووەو لای تورکەکان پلـەو پایەیـەکی دیـاری هـەبووەو زانیوویانـە کـە پێگـەی کۆمەلایەتی تا چەندێ لەناو خەڵکدا بـەهێزە بۆیـە داوایـان لـەو کـردووە، هێـز کۆبکاتـەوەو هێـرش بکاتـە سـەر ڕوسـەکان، بـەلآم لێـرەدا قسەکردن لەسـەر هەستی نەتەوایەتی و مەسەلەی ناسیونالیزمی کوردی لەو کاتەدا دێتـە ئـاراوە. ئایا شێخ مەحمود لەژێر کاریگەری هەستو هوشیاری نەتەوەییدا ئەو هێرشەی بۆ سەر هێـزی ڕوس لـە مـەریوان کـردووە یـان لەسـەر داوای تورکـەکان؟ ئایـا تورکەکان لەپێناوی کورددا داوایان لە شێخ مەحمود کردووە کـە هێـرش بکاتـە سەر ڕوسەکان کە شاری مەریوانی کوردستانیان داگیرکردووە یان وەکو بەشێك لە بەرگری کردن لە دەوڵەتی عوسمانیو دەسەلآتی ئەو دەوڵەتە ئەو دلوایـەیان لـە شـێخ مـەحمود کـردووەو شـێخ مـەحمودیش لەسـەر ئـەو بنەمایـە هێـزی کۆکردۆتـەوەو هێرشـی کردۆتـە سـەر ڕوسـەکان. پێـشتریش لـەژێر کاریگـەری پروپاگەندەی تورکەکانـدا بـۆ جیهـادو غـەزا شـێخ مـەحمودی حەفیـد هێزێکـی باشی کۆکردەوەو لەگەڵ تورکەکاندا بەشداری شەڕی شوعەیبەی کـرد لـەنێوان (١١/١٢/١٩١٥) بـۆ ١٤ی هـەمان مـانگ ئینگلیزەکـان توانیـان سـوپای تـورکو لایـەنگرەکانیان لەوانـەش کوردەکـان بـە سـەرۆکایەتی شـێخ مـەحمود تێکبشکێنن.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کوردستان بووەتە زەمینەی بەشێکی دیاری ئەو شەڕە لەنێوان تورکو ئەڵمانەکان لەلایەکو روسو بەریتانیەکانیش لەلایەکی ترەوە، کوردەکانیش لەبەر پەرشو بڵاویو نەبوونی یەکێتیی نەتەوەییو یەکێتیی نیشتمانیو نەبوونی بڕیار هەریەکە بەپێی لێکدانەوەی خۆی لایەنگری یەکێك لەو دوو لایەنە شەڕکەرەی کردووە بێ ئەوەی بزانێت بەرژەوەندی خۆی لەکوێدایە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە هەریەکە لەو دوو لایەنە شەڕکەرەش هەوڵیانداوە کوردەکان بەلای خۆیاندا رابکێشنو لەشەڕدا بەکاریان بهێنن. لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا لەماوەی جەنگی یەکەمدا هیچ بزوتنەوەیەکی دیاری کوردی هەبووە کە هەڵگری داوا نەتەوەییەکانی کورد بوبێت؟ ئایا کورد بۆ خۆی لەو قۆناغەدا بە چەمکی نوێ سیمای نەتەوەی هەبووە لەو روانگەیەوە کە نەتەوە یەکەیەکی یەککگرتووە؟ ئایا ناسیونالیزمی کوردی لەو قۆناغەدا بووەتە هێزێکی کۆمەڵایەتی جەماوەری کە توانیبێتی ئینتیما بۆ نەتەوەو نیشتمان بەسەر ئینتیما بۆ خێڵو هەرێمدا زاڵ بکات؟ ئایا کورد بە هەموو پێکهاتە خێڵایەتیو عەشائیرەییەکانیەوە توانیویەتی بەرژەوەندی خۆی وەکو نەتەوە تێبگاتو نەکەوێتە ژێر کاریگەری هاندانی داگیرکەرانەوە؟ ئایا کورد وەکو نەتەوەیەکی مسوڵمان لەو قۆناغەدا توانیویەتی لە روانگەی پەیوەسبوونیەوە بە بەرژەوەندییە باڵاکانی نەتەوەوە سەیری پەیوەستبوونی بە ئایینو بە دەوڵەتی عوسمانیشەوە بکات؟ وەڵامدانەوەی سەرجەمی ئەو پرسیارانە لەوەدا کۆ دەبنەوە کە کورد لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا پێکهاتەیەکی خێڵایەتی دواکەوتوویی لەبەریەك هەڵوەشاوە بووە لەڕووی کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیەوە، ناسیونالیزمی کوردی هیچ ئامادەبوونێکی نەبووە، هەر بەو پێیەش گوتاری نەتەوەیی کوردی ئەگەرچی لە روکەشدا هەندێ سیمای لاوازی هەر لە پێشترەوە دیاری بوو، بەڵام نەبووەتە گوتارێکی خاوەن شوناس، ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو بۆچوونەی کە کورد نەیتوانیووە خۆی لەوانی تر جیا بکاتەوە. هەر ئەوەش وای لێکردووە کە لە جەنگی یەکەمدا

رۆڵی پاشکۆی هێزەکانی تورکی هەبێت، راستە روسەکانیش هەوڵیانداوە لەو شەڕەدا کوردەکان لایەنگری ئەوان بن‌و ئومێدی نوخبەیەکی خوێنەواری کوردیش کە لایەنگری روسەکان بوون بەوەی روسەکان پشتگیری داواکانی کورد بکەن هاندەر بووە بۆ ئەوەی ئاراستەیەکی لاواز لەنێو کوردەکاندا مەیلیان بەلای روسەکاندا بوویێت، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە کورد لە هیچکام لەو دوو سەریازگەیەدا بوونی کەسێتییەکی خاوەن ناسنامەی نەبووەو بە بەرنامەو پرۆژەوە بەشداری ئەو شەڕەی نەکردووەو نەیشزانیووە بەرژەوەندییەکانی خۆی وەکو نەتەوە لەکوێدا دەدۆزێتەوە.

هۆکاری هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی کەسێتی نەتەوەیی کوردو دواکەوتوویی‌و نەبوونی هەستو هوشیاری نەتەوەیی کە ئەوەش وەکو بەرهەمی ناسیونالیزم سەیر دەکرێت، نەبوونی ناسیونالیزمی کوردی بە هێزێکی جەماوەری کۆمەڵایەتی، لاوازی کەسێتی کوردی دەرخستووەو لەبری نەتەوە وەکو چەند خێڵ‌و عەشیرەتێك نیشانی داوەو بەوپێیەش گوتارێك بەرهەم نەهاتووە کە ناوی گوتاری نەتەوەیی کورد بێت، بەڵکو هەر خێڵەو هەر دەستەو پێکهاتەیەك گوتاری ناوچەیی خۆیی هەبووە کە دەشێ لەگەڵ گوتاری ئەوانی تردا دژیوویێت یان نەگونجاو بوویێتو بەو پێیەس نەبوویێتە بنەما بۆ گوتاری نەتەوەیی، بە واتایەکی دی گوتاری کوردی لەسەر وەختی شەڕی یەکەمی جیهانیدا گوتاری خێڵایەتی‌و ناوچەیی‌و ئایینی‌و مەزهەبی بووە، هەر ئەوەش وایکردووە کە هەر لایەك ویستبێتی کوردی بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکارهێناوە، دەشێ وەهایشی لێکبدەینەوە کە قۆناغی چوار ساڵی شەڕ ئەزموونێك بوویێت بۆ هەڵسەنگاندنی کورد کە لەو ئەزموونەدا بەدڵخەوە کورد نەینوانییوە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت نەك لە بەرامبەر تورك‌و ئینگلیزو روسەکاندا بەڵکو لە ئاستی ناوخۆیشدا، واتە نەیتوانیووە لەو قۆناغەدا وەکو نەتەوەیەکی خاوەن بڕیارو یەکگرتوو خۆی نیشان بدات، کاتی کورد لەم دۆخە نالەبارو پەرتو بڵاوەدا بوویێت، گوتاری کوردیش هەمان سروشتی ئەو دۆخەی هەبووە کە کۆمەڵگای کوردی تیا ژیاوە.

# سەرچاوەکانی بەشی (١٤)


١- م. س. لازاريف ــ المسألة الكردية (١٨٩١ــ١٩١٧)، ترجمة أكبر أحمد، سليمانية ــ مركز كردستان للدراسات الستراتيجية - ٢٠٠١ ــ ص٤١٦.

٢- نفس المصدر ــ ص٤١٧.

3- David MaCDowall. Modern History of he Kurds, London, 2000, p. 106.

٤- محەمەد رەسوڵ هاوار ــ سمکو (ئیسماعیل ئاغای شکاك/ و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد ــ سلێمانی ــ ٢٠٠٥، لل ٥٨ــ٥٩.

٥- محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ بەرگی یەکەم ــ ١٩٩٠ ل٢٨٤.

له شه‌وی ٣٠ی تشرینی یه‌که‌م سالّی ١٩١٨دا به‌ریتانیا موسلّی داگیر کرد پێش داگیرکردنی موسلّیش هێزه‌کانی به‌ریتانیا شاره‌کانی تری باشوری کوردستانیان داگیر کردبوو به‌تایبه‌تی شاره‌کانی که‌رکوکو سلێمانیو خانه‌قین، ئه‌وه‌ی له‌وکاته‌دا ده‌بینرا هێشتا هه‌لّوێستی سیاسی به‌ریتانیا پشتکردن نه‌بوو له‌کورد به‌لّکو به‌پێچه‌وانه‌وه "سیاسه‌تی به‌ریتانیا لایه‌نگرو ئاره‌زوومه‌ندی دامه‌زراندنی ناوچه‌یه‌کی ئیداری بوو له کوردستاندا که سه‌رکرده ناوخۆییه‌کان بکات به به‌ڕێوه‌به‌ری به‌لاّم له‌ژێر سه‌رپه‌رشتیو چاودێری به‌ریتانیادا بنو ناوچه‌که‌ش له‌ژێر ده‌سه‌لاّتی به‌ریتانیادا بێت"[1].

لێره‌وه تا ئه‌ندازه‌یه‌ك ئه‌وه ئاشكرا ده‌بێت كه به‌ریتانیه‌كان وه‌كو بوارێك بۆ تاقیكردنه‌وه‌و ئه‌زموونگه‌ری سه‌یری كوردو ئه‌وانی تریشیان كردووه‌و ویستوویانه له‌وه تێبگه‌ن تا چه‌ندێ كوردو ئه‌وانی تریش له ناوچه‌كه‌دا ئاماده‌باشی ئه‌وه‌یان هه‌یه ئه‌ركی به‌ڕێوه‌بردنی خۆیانیان پێبسپێرن. ده‌شێ سه‌ریاری له‌به‌رچاوگرتنی به‌رژه‌وه‌ندی سیاسیو ئابووریو ستراتیژی خۆیان به‌ریتانیه‌كان هه‌ندێ پێوانه‌ی تریشیان هه‌بووبێت بۆ هه‌ر بڕیاردانێكی چاره‌نووس سازانه‌ی ناوچه‌كه به‌گشتی، كوردستانیش كه مه‌به‌ستی قسه‌كردنی ئێمه‌یه به‌تایبه‌تی. له‌م سه‌رووبه‌نده‌دا ده‌بێ له كوردستاندا دوو ئاستی بۆچوون له یه‌كتر جیا بكه‌ینه‌وه كه یه‌كێكیان بۆچوونی نوخبه‌ی ڕۆشنبیرانی وه‌كو جه‌نه‌راڵ شه‌ریف پاشایه كه به ئاشكرا هه‌ستی نه‌ته‌وایه‌تی لایان گه‌شه‌ی كردووه‌و ویستێكی ناسیونالیستانه‌یان هه‌بووه‌و له خه‌ونی به‌ده‌ستهێنانی سه‌ربه‌خۆییو دروستكردنی ده‌وڵه‌تی كوردیدا بوون. جه‌نه‌راڵ شه‌ریف پاشان له گفتوگۆیه‌كیدا كه له مانگی حوزه‌یرانی ١٩١٨دا له‌گه‌ڵ سێر پێرسی كۆكسدا كردوویه‌تی. ده‌شێ به‌ته‌واوی وه‌كو خستنه‌ڕووی ئه‌و بیروڕایه وه‌ربگیرێت كه بیروڕای زۆربه‌ی ڕۆشنبیرو منه‌وه‌ره‌كانه[2] كه خه‌وتی سه‌ربه‌خۆییان هه‌بووه.

ئاستی دووه‌م ئه‌وه‌یه ئایا جه‌ماوه‌ری خه‌ڵكی كوردستانو سه‌رخێڵو شێخو ئاغاو به‌گه‌كان تا چه‌ندێ بوونه‌ته هه‌ڵگری بیروڕای نه‌ته‌وه‌ییو خه‌ونی

سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی کوردیان لا دروست بووە؟ بەوڵتایەکی دی دەتوانین بڵێین بەو ئەندازەوی کە سیمای ناسیولیزم لای نوخبەیەکی کەمی کوردی سەری هەڵداوە، لە بەرامبەردا کومەڵگا بەگشتی لە ئاستێکدا بووە کە بێ ئاگا بووە لەو مەسەلەیە.

بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە کوردستان لەسەروەختی هاتنی ئینگلیزدا پێکهاتەیەکی خێڵایەتی پەرشو بڵاوی دابەشبوویوو بەجۆرێك هەر سەرخێڵێك دەسەلاتداری سەر رووبەری جوگرافیای خۆی بوو، هیچ پەیوەندییەکی رۆحیو مەعنەوی ئەوتۆ کە پاڵنەرەکەی یەك رەگەزیو یەك زمانیو یەك بەرژەوەندی بێت بوونی نەبوو. ئینگلیزەکانیش باش لەو راستییە تێگەیشتبوون بۆیە زیاتر لەسەر بنەمای ئەو یەکە بچووکانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کورددا کردووە. بۆ نموونە ئەوەندەی باسی خێڵەکانی کوردو سەرخێڵەکانی دەکەن ئەوەندە باسی کورد وەکو نەتەوەیەك ناکەن بەتایبەتی لە سنووری جوگرافیای خێڵەکاندا تەنیا ناوی خێڵو سەرخێڵو بەرژەوەندییە مادیو مەعنەوییەکانی خێڵ جێگای ئاخاوتنو باسکردن بووە. رەنگە تەنیا لە سلێمانیدا وەها سەیریان کردبێت کە لەبری ئەوەی راستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ خێڵ بکەن، مامەڵە لەگەڵ پێکهاتەیەك بکەن کە پێی دەوترێت کورد، هەرچەندە لە سلێمانیشدا گەڕاون بەدوای دیارترینو بە نفوزترین کەسدا کە ئەویش شێخ مەحمودی بەرزنجییە کە هەم لە شێخانی بەرزنجەیە کە لە دیارترین سەیدەکانی کوردستانو بەپێی درەختنی بنەماڵەکەیان، هەم نەوەی شێخ مارفی نۆدێیەو سەرباری نفوزی شێخایەتیو بنەماڵەکەیان نفوزی تەریقەتی قادریشی هەبووە کە ئەوەش لەڕووی مەعنەوییەوە لەنێو خێڵو عەشیرەتەکانی کوردستاندا پلەو پایەیەکی دیاری بۆ دروستکردون. بە واتا لە کوردستاندا لەسەروەختی کۆتایی هاتنی جەنگدا نەك هەر بزووتنەوەیەکی ناسیونالیزمی لە کوردستاندا بوونی نەبووە بەڵکو لاوازترین خاسیێتی ئەو چەمکە لەنێو کومەڵگادا بەرچاو نەکەوتووە، کاتێ ئینگلیزەکان کوردستان بە سلێمانیشەوە داگیر دەکەن، کوردەکان لە

حاڵەتێکی بێ ئاگایدان و هەندێ لایەنگری تورکەکانن و هەندێکی تریش هەست دەکەن بەرژەوەندییان لەگەڵ ئینگلیزەکان باشتر دەگونجێت، بۆیە نابنە خاوەنی بزووتنەوەیەکی نیشتمانی بەرفراوان کە بەلایەنی کەمەوە هەموو باشووری کوردستان بگرێتەوە، بەڵێ راستە راپەڕین و بزووتنەوەی کورت تەمەنی چەکداریش دروستبووە، بەڵام ناشێت وای بۆ بچین کە بزوێنەرو دروستکەری ئەو راپەڕینانە رۆحی کوردایەتی و هێزی ناسیونالیزمی کوردی بوویێت.

سادەترین خاسیێتی بزووتنەوەی ناسیونالیزمی ئەوەیە کە هەموو نەتەوە کۆبکاتەوەو وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو نیشانی بدات کە خاوەنی یەک سەرکردایەتییەو ئامانجی سەرەکیش سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییە، لەسەر جوگرافیایەک کە جوگرافیای هەموو نەتەوەیە واتە نیشتمان. ئەگەر لەم روانگەیەوە سەیر بکەین ئەوا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو جوڵانەوانەی لەو سەروەختەدا سەریان هەڵداوە لە ناوچەی جوگرافی تەسکی خێڵایەتیدا بوون و جگە لە کاردانەوە یان رۆیشتن بەدوای هەندێ بەرژەوەندی تەسکی خێڵایەتی و ناوچەییدا هیچی تریان نەبووە، هەر ئەوەش وایکردووە کە ئەو بزوتنەوانە بە بزوتنەوەکەی شێخ مەحمودیشەوە نەتوانێت خاسیێتی نەتەوەیی وەربگرێت و نەشتوانێت درێژە بە مانەوەی خۆی بدات.

بەریتانیەکان لە سەرەتاوە کە مەیلداری ئەوە بوون دەسەڵاتێکی کوردی بۆ بەڕێوەبردنی باشووری کوردستان دابمەزرێنن بەتایبەتی لە سلێمانیدا کەسی لە شێخ مەحمود دیارتریان نەدۆزییەوە هەرچەندە شێخ مەحمود نەیارو مونافیسیشی هەبوو بەڵام ئەو لەبارترین کەس بووە بۆ ئەو ئەرکە، دوای ئەوە بەریتانیا شێخ مەحمودی دانا بە حاکمی سلێمانی و بەڵێنی پشتگیریکرنیشی پێدا[٣]. بەڵام ئایا ئەو دەسەڵاتدارییەی شێخ مەحمود دەسەڵاتدارییەکی خێڵایەتی ناوچەیی داخراو بوو کە عەقڵی خێڵ و بەرژەوەندی خێڵ و ستراتیژی

خێڵ کاری تێدا دەکردو ئینگلیزەکانیش مەیلداری ئەوە بوون کە لەجیاتی دەسەلآتی نەتەوەیی دەسەلآتی خێلآیەتی لە کوردستاندا بالآدەست بێت یان بەپێچەوانەوە شێخ مەحمود وەکو ئەندامێکی نوخبە هەلگری پرۆژەی نەتەوایەتی کوردی بوو، بڕوایەکی تەواوی ناسیونالیزمی هەلگرتبوو وڵتە باشتر وایە بلێین ئایا شێخ مەحمود سەرکردەیەکی ناسیونالیستی بوو کە لە پشتییەوە بزووتنەوەیەکی ناسیونالیزمی بوونی هەبوبێت ئامانجی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی بووبێت یان وەکو هەر سەرخێڵ و ئاغاو شێخێکی تر دەیویست ئەمەیش دەسەلآتێکی ناوچەیی خۆیی هەبێت، لەکاتێکدا ئەم ئەو دەسەلآتە جەماوەرییەی نەبوو کە جافو زەنگەنەو باجەلان هەیان بوو، ئایا ئەوە هەلێکی لەبار نەبوو کە بە پالپشتی ئینگلیزەکان ئەمیش دەسەلآتو نفوزی خۆی فراوان بکات؟ بێگومان ئەمانە کۆمەلێ پرسیارو بۆچوونن ئەگەر لە روانگەی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردیو ناسیونالیزمی کوردییەوە سەیری بکەین ئەوا خودی دەسەلآتدارییەکەو سروشتو شێوازی پێکهاتنو کارکردنیشی زیاتر وەکو هەر دەسەلآتێکی خێلآیەتی دەردەکەوێت.
لە تەمموزی سالی ١٩١٨ ژمارەیەك سەرخێلی کوردستانی ژێرسایەی دەولەتی فارس مەسەلەی کوردستانێکی سەربەخۆیان لەژێر چاودێری بەرتانیادا گفتوگۆکرد، موکری کە گرنگترین خێلی ناوچەی ساوج بلاخ بوو پێشنیاری ئەمەی بۆ بالیۆزی حکومەتی خاوەن شکۆ لە کرماشان کرد کاتێ لەسەر بورجێکی نزیك سەقزو گەیشتە ئەوەی کە ئامازە بۆ ئەوە بکات کە کوردستان لە دەستی کورددا بێتو ئازاد بێت لە دەسەلآتی لاوازو نیمچە دەسەلآتی حکومەتی فارسی[4] ئەمە تێروانینی سەرخێلە کوردەکانی رۆژهەلآتی کوردستانە گومان لەوە ناکرێت کە جۆرێك لە هەستی نەتەوایەتی لەپشتی ئەم هەلوێستەوەیە بەلآم ئەوەی جێگای پرسیارە ئایا ئەو هەستە گەیشتۆتە ئەو ئاستەی دەوری پالنەرو بزوێنەری جەماوەری خەلکی کوردستان ببینێت لەپێناوی جیاکردنەوەی ناسنامەی خۆیان لەوانی تر واتە لەو نەتەوانەی کە پێشتر پێکەوە لەژێر سایەی ئیمپراتۆرێتێکی ئایینی خێلآیەتی گەورەدا ژیاون؟

ئایـا لـه کوردسـتاندا ئـهم بۆچـوونهی سـهرخێڵهکانی کـوردو نوخبـهی خوێندهواریش که ههمان روانینیان ههبووه بووهته بۆچوونێکی جهماوهریو بهو پێیهش وهکو پرۆژهیهك ههوڵ بۆ جێبهجێ کردنی درابێت؟

بێگومان دهرئهنجامهکان روناکی دهخهنه سهر گهوههری ئهم پرسیارانهی سهروه بهوهی که چ لهکانی جهنگو چ دوای جهنگو تهنانهت تاکو ئێستاشی لهگهڵدا بێت مهسهلهی سهربهخۆیی کوردستانو دروستکردنی دهوڵهتی کوردی نهبووه به پرۆژهیهکی جهماوهریو تهنانهت نهبووهته پرۆژهو بهرنامهی کارکردنی بزوتنهوه چهکدارییهکانی کورد ههر لهسهردهمی شێخ مهحمودهوه، تاکو ئێستاشی لهگهڵدا بێت، ئهوهش دهری دهخات که ئهو بۆچوونانهی نوخبهی خوێندهوارو ئهو سهرخێڵانهی که وهکو نوخبه بیریان کردۆتهوه تهنیا له رووبهرێکی تهسکدا دهنگدانهوهی ههبووهو بیستراوه. واته ئهو ههستهی لای نوخبهی خوێندهوار سهری ههڵداوه لهنێو واقیعی کۆمهڵایهتیدا بوونی نهبووه، ههر بۆیه دهشێ له سهروبهندی کۆتایی هاتنی جهنگدا تهسهوری بوونی نوخبهی ناسیونایست یان کهسانی ناسیونالیست بکرێت بهبێ بوونی ناسیونالیزم، بێگومان ناشێت تهسهوری ئهوه بکهین که بهبێ بوونی ناسیونالیزم ناسیونالیست بتوانێت پرۆژهی ههبێت چونکه له بنهڕهتدا کاتێ پرۆژهی نهتهوهیی بوونی ههبووه ئهوه مانای وایه ناسیونالیزم له پشتی ئهو پرۆژهیهوه دهبێت. به ههر حاڵ نهبوونی پرۆژهی سهربهخۆییو دروستکردنی دهوڵهتی کوردی له مێژووی کورددا پهیوهسته به نهبوونی ناسیونالیزمی کوردییهوه.

جگه لهوهی که جهماوهری خهڵکی کوردستان لهلایهك جهنگ ماندوو شهکهتی کردبوو، ئهو گرانیهشی که شهڕ دروستی کرد بوو بههۆی مردنی ژمارهیهکی زۆری خهڵکو لهلایهکی تریشهوه ههژارییو نهداری وای له خهڵك کردبوو تهنیا له ههوڵی ئهوهدا بێت بژی، له سهروبهندی کۆتایی هاتنی شهڕدا ساڵی ۱۹۱۷ خهڵکی زۆرێك له ناوچهکانی کوردستان بۆ نموونه له دهورووبهری مههابادو سلێمانی له برسا مردن، له تشرینی دووهمی ساڵی ۱۹۱۸دا دانیشتوانی

سلێمانی کە پێش جەنگ ۲۰۰۰۰ کەس بوو، ۲۵۰۰ کەسیان بە زیندوویی مابوونەوە(*). لە هەموو لایەکی کوردستان خەڵك لە برسا دەمردن. مەبەستمان لەم گێڕانەوەیە ئەو بارودۆخە ترسناكو ناڵەبارە بوو کە لەسەرڕوبەندی کۆتایی جەنگدا کوردستانی پیا تێدەپەڕی. ناشێت وای بۆ بچین کە لە وڵاتێکی وێرانو دواکەوتوو لە برسا مردووی چۆڵ لەڕووی دیمۆگرافییەوە، دواکەوتوو لەڕووی پیشەسازییەوە نەخوێندەوار بە ڕێژەیەکی بەرز، داخراوو بێ ئاگا لە دنیا لەڕووی سیاسیو ڕۆشنبیرییەوە، ناسیونالیزم بووبێتە بزووتنەوەیەکی جەماوەریو هەڵگری پرۆژەی ناسیونالیزم بووبێت. ئەگەر بزووتنەوەیەکی لەو جۆرە لە کوردستاندا هەبوایە ئەوا ئینگلیزەکان پەنایان بۆ پەیوەندیکردن بە ئاغاو بەگو شێخو سەرخێڵەکانەوە نەدەبردو ڕاستەوخۆ مامەڵەیان لەگەڵ ئەو بزوتنەوەیەدا دەکرد. تەنانەت کاتێ مێجەرنۆئێل هاتە خوارووی کوردستان بە مەبەستی نیشاندانی ڕاوبۆچوونی بەریتانیا سەبارەت بە دروستکردنی کوردستانێکی یەکگرتوو بزوتنەوەیەکی وا دیار لەئارادا نەبوو کە وەکو نوێنەری کورد دەربکەوێت. تەنانەت.. تا ئەو کاتە بەریتانیا نەیتوانیبوو سەرکردەیەك بدۆزێتەوە کە جێگای متمانەی هەموو کوردەکان بێت، هەرچەندە شێخ مەحمود لەبارترین کەس بوو بۆ ئەم دەست نیشان کردنە، بەڵام بەریتانیا ئاگاداری ئەوەش بوو کە بەشێك لە سەرخێڵەکان ئینتیدابیان بەلاوە پەسەندترە تاوەکو دروستکردنی حکومەت(٦).

ئەمەش دەری دەخات کە تەنانەت بەشێك بەسەر خێڵە کوردەکان هەستو هوشیاری نەتەوەییان نەبووە یان لاواز بووە لەو قۆناغەدا لەکاتێکدا ئەمانە لە چاو جەماوەری خێڵو عەشیرەتەکانیاندا جیاواز بوونو دەشێ وەکو بەشێك لە نوخبەی ئەو سەردەمە سەیر بکرێن، کەچی ئینتیدابیان لە حکومەتی کوردی بەلاوە پەسەندترە ـ ئەمەش پرسیار لە ناسنامەی ناسیونالیستی کوردی ئەو قۆناغە دەخاتە بەردەم گومانەوە. ئایا کاتێ سەرخێڵو ئاغاو بەگو سیاسی کوردی کە لە سنووری پێکهاتەی خێڵو عەشیرەتی کوردیدا دەسەڵاتدار بوون

ویستو ئارەزووی دروستکردنی حکومەتی کوردییان نەبێت داخۆ جەماوەری هەژارو نەزانو دواکەوتوو چ جۆرە هەستو تێگەیشتنو لێکدانەوەیەکیان هەبوویێت؟ بۆیە جێگای خۆیەتی بە واقیعیانە بڕوانینە کۆمەڵگای کوردیو بەسۆزو هەڵچوونو عاتیفە بڕیار نەدەینو پێمان وابێت کۆمەڵگای کوردی لە ریزی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندایەو هەر بەو پێیە چۆن لە کۆمەڵگا پێشکەوتوو پەرەسەندووەکاندا باسی ناسیونالیزم دەکرێت بەو شێوەیەش بەهەمان شێوەکردن باسی ناسیونالیزمی کوردی بکەین. بەتایبەتی بۆ قۆناغی دوای جەنگی جیهانی یەکەم کە لەڕووی تیۆرەکانی کۆمەڵناسییەوە ناشێت هەروا بە ئاسانی کورد وەکو کۆمەڵگایەکی خاوەن شوناسو بنەماو خاسیەتەکانی کۆمەڵگا سەیر بکەین.

بە هەر حاڵ سەرباری پەیوەندی ناجێگیری سەرخێڵو سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا لەنێو تورکەکانو ئینگلیزەکانداو بە هەمان پێودانگیش هەوڵی هەریەکە لەو دوو هێزە بۆ راکێشانی سەرخێڵو سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان لە نێویشیاندا شێخ مەحمود، هێشتا لە کوردستان کورد خۆی ئەو ئامادەییەی نەبووە کە بتوانێت بەپێی بەرژەوەندییەکانیانی خۆی هەڵوێست وەربگرێتو لەوە تێبگات کە چۆنی یاری سیاسی بەپێی بەرژەوەندی خۆی بکات، هۆکەشی ئەوەیە کە ستراتیژی نەتەوەیی بوونی نەبووە چونکە ستراتیژی نەتەوەیی و عەقڵی سیاسی نەتەوەیی بەرهەمی ناسیونالیزمن. ئەو ناسیونالیزمەی کە خاوەنی پرۆژەی سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییە کەواتە لێرەدا دەتوانین بڵێین راستە لەسەرووبەندی کۆتایی هاتنی جەنگدا تاکە کەسی ناسیونالیست لە کۆمەڵگای کوردیدا هەبووە بەڵام ناسیونالیزم بوونی نەبووەو ناسیونالیستیش هێزێکی جەماوەری نەبووە، هەر ئەوەش هۆکاری شکستی راپەرینەکانی شێخ مەحمود بووە لە خوارووی کوردستانو راپەڕینی بەشەکانی تری کوردستانیش هەر لەژێر کاریگەری هەمان هۆکاردا هەمیشە شکستیان هێناوە.

# سەرچاوەکانی بەشی (١٥)

١ـ نادر ئینتیسار ـ ئیتنونەتەوایەتی کوردی ـ وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی سلێمانی ٢٠٠٥ـ ل١١٢.

2- Kurdistan During The great war- London, 1919, p.8.

3- Hassan Arafa- The kurds, London- p.111.

4- Kurdistan During The Great war, London, 1919. p.8-9.

5- David MacDowall – A Modern History of the Kurds, 2000, p-108.

6- Ibid – p.119.

جەنەراڵ شەریف پاشا کە ساڵی ١٨٦٥ لەشاری ئەستەمبوڵ لەدایك بووەو لە ئەسڵدا لە رەگو ریشەوە خەڵکی سلێمانییەو لە دەوڵەتی عوسمانیدا گەلێك پۆستی دیاری وەرگرتووە کە دوایینیان وەزیری مفەوەزی دەوڵەتی عوسمانی بووە لە ستۆکهۆڵم. لە کارە دیارەکانی شەریف پاشا پێشکەشکردنی یاداشتنامەیەکە بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لەساڵی ١٩١٩دا. سەبارەت بە مافەکانی کورد، یەکەم نیشانەکانی بەرهەڵستکاریی شەریف پاشا دژی دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵمدا دەردەکەوێ، شەریف پاشا لەکاتێکدا نوێنەرو باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانییە لە سوید، لەژێرەوە پێوەندی بە حیزبی ئیتحادو تەرەقییەوە دەبەستێتو هاوکارییان دەکات(١) لە ئایاری (١٩١٩)دا شەریف پاشا باڵوێزخانەی بەریتانیای لە پاریس ئاگادارکردەوە کە ئامادەیە بەرپرسیارێتی میرنشینێکی کوردستانی سەربەخۆ بگرێتە ئەستۆو بە سەرۆکایەتی کۆمیتەیەکی فیدراڵی سەرخێڵەکان وڵات بەرێوە ببات(٢)، سێرکراو لە پاریسەوە لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٩دا بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ئایرل کیرزن دەنووسێت شێوەی ئەو نامە بڵاو نەکراوەیەتان بۆ دەنێرم کە لەنێوان نوێنەری کوردەکان بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس شەریف پاشاو فوریس ئەدامس ناردویانە سەبارەت بە ئاواتی کوردەکان. شەریف پاشا لە زاری (فوریس ئەدامس) وە دەڵێ کە ئەو (ئەدامس) پێی راگەیاندووە کە یاداشتێك پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی بکات سەبارەت بە مەسەلەی کورد، لەو یاداشتەدا داوا بکات کە ئینتیدابێکی بەریتانی بەسەر کوردستاندا فەرز بکرێ[٣].

بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە جەنەراڵ شەریف پاشا ویستوویەتی لە دەرەوەی کوردستانو لەسەر ئاستی کۆنگرەو کۆبوونەوە نێودەوڵەتیەکاندا کێشەی کورد بخانە روو، داواکانی کورد بەرز بکاتەوە، بێگومان ئەم ئاراستە نیشکردنەش بایەخی تایبەتی خۆیی هەیە، ئێمە تاکو ئێستاش گلەیی ئەوە دەکەین کە

کورد لەرووی دیبلۆماسییەوە نەیتوانیووە داواکانی خۆی بەرز بکاتەوەو لایەنگرو پاڵپشتی بۆ پەیدا بکات.

ئایا ئەوەی شەریف پاشا داوای دەکاتو کاری بۆ دەکات لە روانگەی بەرنامەو پرەنسیپی ناسیونالیزمەوە لە چ ئاستێکدایە؟ بێگومان ئەوەی هەستی پێدەکرێت ئەوەیە کە شەریف پاشا ئارەزووی ئەوەی هەیە کە کورد بەگشتیو کوردی باشووری کوردستان بەتایبەتی ببنە خاوەن دەسەڵاتی خۆیانو ئامادەباشی خۆیشی نیشان دەدات کە سەرۆکایەتی دەسەڵاتێکی سەربەخۆی کوردی بگرێتە ئەستۆ، ئەم داوایەش لە دەرەوەی کوردستان بەرز دەکاتەوە، بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا خەڵکی کوردستان ئەو سەرۆکایەتییەی ئەویان بەلاوە پەسەندە؟ ئایا کاتێ ئەو داوایەکی لەو جۆرە بەرز دەکاتەوە هەڵوێستی سەرخێڵو شێخو ئاغاکانی کوردستان بە شێخ مەحمودی حەفیدیشەوە چۆن دەبێت؟ راستە پێشتر کوردەکان ئەم کەسێتە دەناسنو شوێنی دیاریشی هەبووە لەلای نوخبەی روناکبیرو سیاسیو پیاوە دیارەکانی کوردستان بەتایبەتی ئەم کەسێتیە وەکو نوێنەری دیاری نوخبەی خوێندەواری کورد راوبۆچوونەکانی قوڵترو پڕ ماناتر بووە، شەریف پاشا زۆر لە سەرۆکە بێ سەرویەرەکانی خێڵەکانی کوردستان نەدەچوو، ئەو یەکێك بوو لە پیاوماقوڵە خوێندەوارو پەروەردەکراوەکان کە بە ژیانی جێگیرو ئیستراحەت راهاتبوون[٤].

دیارە لەم روانگەیەوە دەشێ ئاستی روانینی شەریف پاشا لە زۆر لە کەسێتە دیارەکانی کورد فراوانتر بووبێتو کارکردنی پێشتریشی لەگەڵ (ئیتحادو تەرەقی)دا دەوری ئاشکرای هەبووە لە فۆرمەلەکردنی هەستی ناسیونالیستانەی شەریف پاشاداو دەشێ مانەوەی زۆری لە پایتەختی عوسمانیو لە سویدو پایتەختەکانی تری ئەوروپاداو بینینی سیاسەتی دەوڵەتە نەتەوەییەکانو گەشەسەندنی ناسیونالیزمی هەندێ لە وڵاتانی ئەوروپا لەو قۆناغەداو دەرکەوتنو گەشەکردنی ناسیونالیزمی تورکیش بەتایبەتی دەوری

کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی هەستی ناسیونالیستانەی شەریف پاشا هەبوویێت.

دیارە شەریف پاشا لەسەر پەیوەندی بوونی بە ئیتحادو تەرەقیەوە کە ئەو پەیوەندییەش زیاتر لە سوید دروستبووەو پەرەی سەندووە، لەلایەن سولتان عەبدولحەمیدەوە فەرمانی ئەوەی بۆ دەردەکرێت کە مافی گەڕانەوەی نییە بۆ ئەستەمبوڵ بەڵام دوای ئەوەی کە ئیتیحادو تەرەقی بە سەرۆکایەتی ئەنوەر پاشاو تەلعەت پاشاو جەمال پاشا جڵەوی حوکمی دەستووری لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەگرنە دەست، هەلێك بۆ شەریف پاشا دەڕەخسێت کە بگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ[5]. ئەم گەڕانەوەیەی شەریف پاشا هەلی ئەوەی بۆ دەڕەخسێنێت کە زیاتر بگەڕێتەوە بۆ ئەسڵی خۆیو وەکو کوردێك هەڵوێست بنوێنێتو لەو سەروبەندەدا لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخانو شێخ عەبدولقادری شەمزینیو، چەند کەسێکی تردا کۆمەڵەی کورد تەعالیو تەرەقی دروست دەکەن. دەتوانرێت ئەمە بە مێژووی دەرکەوتنی شەریف پاشا وەکو کوردێك دابنرێتو هەڵوێستە گرنگەکانی دواتریشی پەیوەست بە کورد لێرەوەوە سەرچاوە دەگرن. ئەوەی کە زیاتر شوناسی ئیتحادو تەرەقیەکان بەرامبەر بە کورد دەردەخات ئەوەیە کە لەساڵی ۱۹۰۹دا رازی نەبوون شەریف پاشا کە هاوکاریان بوو بیێنەوە باڵیۆزی تورکیا لە پارس ئەوەش زەنگێکی وریاکردنەوە بوو بۆ شەریف پاشا کە سەرباری هاریکاریکردنو چالاکی زۆری لەگەڵ ئیتحادو تەرەقیەکاندا کەچی هێشتا ئەوان بە جیاواز لە خۆیان سەیری دەکەن چونکە ئەم لە ئیتنیکێکی ترە. ئەگەرچی هێشتا شەریف پاشا بڕوای بە دەوڵەتی عوسمانی هەیەو لەدژی ئیتحادو تەرەقیەکان بانگەشەی گێڕانەوەی دەسەلاتی عوسمانی دەکات، بەڵام ئەو بانگەشەیە لە سنووری خەیاڵدا دەمێنێتەوە. سەرباری ئەوەی کە پێشتر پەیوەندی لەگەڵ بەشێك لە پیاوە دیارەکانی کورددا هەبووە، بەڵام تاکو ساڵی ۱۹۱٤ لە هیچ برگەو وتارێکی بڵاوکراوەی نێو گۆڤارەکەیدا باسی سەربەخۆیی کوردستانو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی

ناکات[٦]. ئەگەر کەمێك بە وردی سەرنجی تەمەنو کەسێتی شەریف پاشا بدەین ئەوا لەساڵی (١٩١٤) دا تەمەنی لە دەوروبەری پەنجا ساڵیدا بووە. بەڵام هێشتا وەکو کەسێکی ناسیونالیست دەرناکەوێت، کەواتە دەتوانین بڵێین گۆڕانکارییە خێراکانی نێوان ساڵی ١٩١٤ بۆ کۆتایی هاتنی جەنگ لەساڵی ١٩١٨دا کاریگەری دیاریان لەسەر کەسێتی شەریف پاشا هەبووەو لە کەسێکی رادیکاڵی عوسمانیەوە دەگۆڕێت بۆ ناسیونالیستێکی کوردی. ئەمەش بە ئاشکرا لەساڵی ١٩١٨دا دەردەکەوێت. دکتۆر فەرهاد پیربال دەڵێت: لەساڵی ١٩١٨دا پێوەندی دەبەستێت بە سەرکردە چەکدارەکانی کوردستان: سمکۆی شکاك، شێخ مەحمودی نەمر، سەید تەهای نەهری، راوێژیان لەگەڵ دەکات لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیدا[٧].

ئیتر لێرە بەدواوە شەریف پاشا دەکەوێتە جوڵەو چالاکی لە پێناوی دۆزی کورداو بەتەواوی وەکو ناسیونالیستێکی کورد دەردەکەوێت، تواناو لێهاتوویی لەبواری دیپلۆماسیو زمانو پلەو پایەی پێشتریشی لە دەوڵەتی عوسمانیدا یارمەتیدەری باش دەبن بۆ ئەوەی بتوانێت لە هەندێ دەرگای سەخت بداتو ئەو دەرگایانەش لە روویدا بکرێنەوە. بەتایبەتیش هەڵوێستە دیارەکانی شەریف پاشا پەیوەست بە کورد کاتێ دەست پێدەکات کە لەناوخۆی کوردستانیش جموجۆڵی ئاشکرای چەکداری دەست پێدەکاتو کوردەکان بە ئاسانی بەو بارودۆخە رازی نابن کە ئەمری واقیع دروستی کردووە، هەڵوێستی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریو ئەمین عالی بەدرخان بەناوی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) کە رایدەگەیەنێ شەریف پاشا بۆی هەیە لە کۆنفرانسە نێودەوڵەتیەکاندا ببێە نوێنەری کوردو داخوازییەکانی کورد بەرز بکاتەوە، لەلایەکی ترەوە شێخ مەحمودی بەرزنجیش مەزبەتەیەك بە پیاوماقوڵانی بەشێك لە خوارووی کوردستان دەکاتەوەو پێیان مۆر دەکات کە بەپێی ئەو مەزبەتەیە شەریف پاشای کوردی دانیشتووی پاریس کرا بە

نوێنەری کوردەکان لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس بۆ داواکردنی حقووقی یارمەتی دەری شەریف پاشا دەبن قەومی کورد[٨].

بێگومان ئەو هەڵوێستانەی ناوەوەی کوردستان پاڵپشتێکی بەهێز بوون بۆ جەنەراڵ شەریف پاشاو زیاتر بەهێز بوونی لەڕووی مەعنەوییەوە. دیارە گومان لەوەش ناکرێت کە شەریف پاشا بووەتە خاوەنی هەستێکی نەتەوەیی و کەسێکی ناسیونالیست کە کارەکانی تا ئەندازەیەکی ئاشکرا هەوڵدان بووە بۆ فۆرمەلەکردنی گوتاری سیاسی نەتەوەیی کورد کە گەوهەری ئەو گوتارە لە سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەتی کوردیدا خۆی دەبینێتەوە. هەڵوێستەکانی شەریف پاشا هەڵگری ئەو گوتارەن، ئەگەرچی زیاتر مەیلداری دروستکردنی دەسەڵاتی کوردی بووە بۆ خوارووی کوردستان و ئەوەی لای ئەو بە بایەخەوە وەرگیراوە خوارووی کوردستانە، هەرچەندە پێشتر ئەم تێکەڵاویی لەگەڵ نوخبەی رۆشنبیری باکوری کوردستاندا زیاتر بووە، بەڵام دوای جیابوونەوەی لە ئیتحادو تەرەقیەکان ئەو خوازیاری گێڕانەوەی دەسەڵاتی عوسمانی بوو، لایەنگری چارەسەرکردنی کێشەی کوردیش بوو لە سایەی ئەو دەوڵەتدا، بەڵام لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ هەستی ناسیونالیستانەی شەریف پاشا ئاشکراتر دەبێتو دەبێتە هەڵگری گوتاری کوردی، بۆچوونی شەریف پاشا لە کۆنگرەی ئاشتی بەدواوە خۆی لە سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەتی کوردیدا دەبینیەوەو خەیاڵی ئەوەشی هەبوو کە خۆی سەرۆکی ئەو دەوڵەتە بێتو رایشی دەگەیاند کە کوردەکان ئەویان بە سەرۆکی خۆیان قبوڵە. بەڵام لەدوای ئەوەی کە رێکەوتننامەی لۆزان خاڵەکانی رێکەوتننامەی سیڤەری پەیوەست بە کوردی هەڵوەشاندنەوەو پێشتریش هەڵوێستی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا بەجۆرێك شەریف پاشایان بێزارکرد کە لەلایەك پاشەکشە لە نوێنەرایەتی کورد بۆ کۆنگرەی ئاشتی بکاتو لەلایەکی تریشەوە بکشێتەوەو تا سەرەبەندی کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی دەرنەکەوێت. لەوڵتەرسمارت باسی یاداشتنامەی شەریف پاشا دەکات لە

(١٩٤٥/١١/٢٦)دا. كه تیایدا دەردەكەوێت شەریف پاشا بڕوای بەوە لەق بووە كە بتوانرێت لە هەموو بەشەكانی كوردستاندا دەوڵەتێكی سەربەخۆی كوردی دروست بكرێت، بۆیە باس لەوە دەكات كە هێشتا ئەگەری ئەوە هەیە لە كوردستانی عێراقدا كوردەكان ببنە خاوەنی مافی خۆیان، شتێكی گرنگ كە ئەمڕۆ لە توانادایە ئەوەیە كە كوردستانی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە بكرێ بە شورەیەكی پۆلایینی ئەوتۆ كە بەر لە هاتنی روسەكان بگرێ[9]. كوردستانی عێراق ئەگەر حوكمی ئۆتۆنۆمی بدرێتێ لەوانەیە ببێتە مەلبەندێك بۆ گواستنەوەی بزوتنەوەی جیابوونەوە لە كوردستانی ئێرانو توركیادا[10].
لێرەدا دەردەكەوێت كە شەریف پاشا لە كۆتایی تەمەنیدا زیاتر خەیاڵی بەلای كوردستانی عێراقدا چووە، لە هەمان كاتدا شەریف پاشا بە قوڵی بایەخی بە داهاتووی باشووری كوردستان دەدا[11]. لێرەوە دەبینین پاشەكشێیەك لە گوتاری شەریف پاشادا دەبینرێت لە داواكردنی سەربەخۆیی هەموو كوردستانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئۆتۆنۆمی بۆ خوارووی كوردستان. ئەمەش دواچالاكی سیاسی شەریف پاشایە كە لە تەمەنی هەشتاساڵیدا دەینوێنێت.

لێرەوە ئەگەر سەرنجی درێژەی ژیانی شەریف پاشا بدەین ئەوە لە ماوەی پێنج ساڵی نێوان كۆتایی شەڕو رێكەوتننامە لۆزانەدا هەڵوێستێكی ناسیونالیستانەی هەبووەو هەڵگری گوتاری كوردی بووە. لە كۆتایی جەنگی دووەمیشدا جارێكی تر لەسەر مەیدانی سیاسیو دیپلۆماسی دەردەكەوێتەوە بەڵام ئەمجارەیان لەبری سەربەخۆیی كوردستان لایەنگری لە ئۆتۆنۆمی بۆ خوارووی كوردستان دەكات، دیارە شەریف پاشا سەربای دووری لە باشوری كوردستانەوە بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی بە رەگەز خەڵكی سلێمانی بووە زیاتر پەیوەستی رۆحی بەم بەشەی كوردستانەوە هەبووە.

وێنەی شەریف پاشا لە مێژووی ناسیونالیستی كوردیدا وێنەیەكی ناسراوە لەو روانگەیەوە كە بە هەڵوێستی ناسیونایستانە دەست پێدەكاتو هەڵگری گوتاری سیاسی نەتەوەیی دەبێت بەڵام لەگەڵ رۆیشتنی كاتدا رەگەزەكانی

گوتاری نەتەوەی کاڵ دەبێتەوەو گوتارێکی هەرێمگری یان ناوچەیی هەڵدەگرێت کە تەنیا پەیوەستە بە باشوری کوردستانەوە ئەویش لە سنووری ئۆتۆنۆمیدا دەمێنێتەوە. دیارە ئەوەش ئاشکرایە کە ئۆتۆنۆمی داوایەکی کەمترە لەوەی کە ناسیونالیست داوای بکاتو خەباتی بۆ بکات. هەر بەو پێیە گوتاری شەریف پاشا لە قۆناغەکانی دوایی تەمەنیدا گوتارێکی نەتەوەیی نییە بەڵکو دەچێتەوە سەر ئەو بۆچوونەی کە پێشتر پێی وابوو باکوری کوردستان لەژێر سایەی گێڕانەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لیبراڵی دەستووریدا بە مافەکانی خۆی بگات.

سەریاری ئەوەش ئەگەر لە روانگەیەکی واقعیانەوە سەیر بکەین ئەوا سەریاری بڕوابوونمان بە هەستو هەڵوێستی ناسیونالیستانەی شەریف پاشا بەتایبەتی لە وەستاندنی جەنگی یەکەمەوە هەتا کۆنگرەی لۆزان، دەبێ پێ لەو راستیە بنێین کە هەستی ناسیونالیستانەی ئەو قۆناغەی شەریف پاشا بەرهەمی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی نەبووە بەو ئەندازەی کە کاریگەری تورکە لاوەکانو ناسیونالیستی تورکیو ناسیونالیستی رۆژئاوا دەوریان هەبووە لە سەری.

لەلایەکی تریشەوە شەریف پاشا کەسێکی دوور بووە لە زێدو نیشتمانی خۆیو تەنانەت لە کوردستانیش لە دایک نەبووە، ئەمە سەرباری ئەوەی هەرگیز لە کوردستانیش نەژیاوە بە واتا ئەو پیاوێك بووە لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵگای کوردی ئەوە راستە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا نوخبە پێش ئاستی پەرەسەندنی گشتی کۆمەڵ دەکەوێتو دەشێ ئەو نوخبەیە دەوری کاریگەریش ببینێت لە گۆڕانکارییە مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا. بەڵام هەروا ئاسان نییە کەسێك با لە ریزی پێشەوەی نوخبەشدا بێت. بەڵام بەبێ بوونی ئامادەبوونو رەگو ریشە لەنێو کۆمەڵگاکەی خۆیدا بتوانێت رۆڵی دیاری ئەوتۆ ببینێتو بەتایبەتیش خۆی وا نیشان بدات کە دەتوانێت سەرکردایەتی کۆمەڵگا یان وڵات بکات، شەریف پاشا ئەندامێکی بە

ئەورووپایی بووی کۆمەڵی کوردەوارییەوەو هەر لەسەردەمی منداڵییەوە لە کوردستان نەبووە لەبەر ئەوە لەو ئاستەدا نەبوو کە ڕێنومای لەسەر مەسەلە زۆر ناوخۆییەکانی کوردستان بکات[١٢].

بە واتا ئەم کەسێتیە دیارەی کورد کە لە قۆناغێکی حەساسی گۆڕانکاری سیاسیو جیۆپۆلەتیکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا دەردەکەوێت تواناو لێهاتووییەکی بەر بڵاوی دیبلۆماسیو هەستێکی پتەوی ناسیونالیستانەی هەبووە، لەبەر دوو هۆکار نەیتوانیووە لەسەر زەمینەی واقیعی کوردستان دەورێکی ئەوتۆی هەبێت یەکەم لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای کوردی لەو قۆناغەدا لەبارێکی دواکەوتوودا بووەو ناسیونالیزمی کوردی دەرنەکەوتووە، بۆیە نوخبەی بە ژمارە کەمی ناسیونالیست دووچاری بێ ئومێدی بوون چونکە ویستو ئایدیاو بەرنامەی ئەوان نەبۆتە ویستو بەرنامەو ئایدیای جەماوەرو بزوتنەوەیەکی جەماوەری لە دەوری کۆبووبێتەوە کە خەبات بکات لەپێناوی جێبەجێ کردنی ئەو بەرنامەیەدا. دووەم لەبەر ئەوەی شەریف پاشا لە دەرەوە بووە لەلایەك ئەم لە کۆمەڵگای کوردی بێ ئاگا بووە بەجۆرێك ئەم وەکو ڕاعی بێ ڕەعیەت دەرکەوتووە بێگومان لە مەسەلەی سیاسیو ستراتیژیشدا تاکە کەس چەندێ لێهاتوو بەهێز بێت، ئەگەر خاوەنی جەماوەر نەبێتو لەنێو واقیعی کۆمەلایەتیدا ئامادەبوونو ڕەگو ریشەی نەبێت، ئەوا ناشێت بتوانێت جێگای خۆی بکاتەوە، هەر بۆیە شەریف پاشا وەکو ناسیونالیستێك لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵگای کوردیدا دەمێنێتەوەو گوتارەکەشی ئەگەرچی لە قۆناغی ڕاستەوخۆی دوای شەڕدا گوتارێکی ناسیونالیزمییە بەلام لەم زەمینەیەدا جێگای نابێتەوە تەنانەت ئەو بزوتنەوانەی کوردیش کە لەو قۆناغەدا هەبوون نابنە هەڵگری گوتارەکەی ئەوو کار بۆ سەربەخۆیی کوردستان ناکەن، بەلام ئەو گوتارەی کە لەدوای وەستانی جەنگی دووەم بانگەشەی بۆ دەکرد کە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق بوو، تاکو ئێستاش لە کۆنەستی سیاسی

سەرکردەو حیزبو ڕێکخراوەکانی کوردستاندا ئامادەیەو کاری بۆ دەکرێت. بە هەر حاڵ شەریف پاشا وەکو کەسێکی ناسیونالیستی دوای جەنگی یەکەم لەبەر ئەوەی لەلایەک لە دەرەوەی واقیعی کوردستان بوو، لەلایەکی تریشەوە واقیعی کوردستان ئامادەگی بۆ بزوتنەوەیەکی ناسیونالیزمی نەبوو، بۆیە شەریف پاشا وەکو ناسیونالیستێك لە دەرەوەی واقیع دەمێنێتەوە.

# سەرچاوەکانی بەشی ( ١٦ )

١- دکتۆر فەرهاد پیربال ـ ژانراڵ شەریف پاشا ـ سلێمانی، ٢٠٠٢، ل-١٩.

2- David MacDowall- A Modern History of the Kurds- London, 2000, p-121.

٣- دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبکر ـ کوردستان لەسەردەمی ئاشتیدا ـ سلێمانی ٢٠٠٠ ل/٦.

4- David MacDawall – A Modern History of the Kurds London, 2000, p-121.

٥- دکتۆر فەرهاد پیربال ـ ژانەراڵ شەریف پاشا ـ ل٢٠.

٦- هەمان سەرچاوە ـ ل٢٢.

٧- هەمان سەرچاوە ـ ل٢٥.

٨ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢٧.

٩- دکتۆر وەلید حەمدی ـ کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا ـ وەرگێڕانی محەمەد نوری تۆفیق ـ سلێمانی ١٩٩٩ ـ ل٢١١.

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل٢١١.

11- Southern Kurdistan During the Great war by office of civil commissioner -1919-p.8.

12- Ibid. p.8

شێخ عەبدولقادر کوڕی دووەمی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کە یەکێك بووە لە شێخانی تەریقەتی نەقشەبەندیو رابەری راپەڕینی ساڵی ١٨٨٠ بوو لە مێژووی کورددا. ئەم بنەماڵەیە بەڕێزەوە سەیر دەکرێنو زیاترین قوربانیان داوەو باوكو کوڕ هەردووکیان گیانیان بەخشیووەتە گەلو نەتەوەکەیان.

شێخ عەبدولقادر لە راپەڕینەکەی ساڵی ١٨٨٠دا کە باوکی سەرکردایەتی دەکرد دەوری کاریگەری هەبوو، شێخ عەبدولقادر پێش راپەڕینەکە چوویووە ئێرانو وەکوە نوێنەری باوکی لەو گوندانەی سنوور دەژیا کە دەسەلاتی شێخەکانی نەهرییان قبووڵ کردبوو[1]. شێخ عەبدولقادر لە سنووری ئێرانەوە راپەڕینی دەستپێکرد، میستەر تۆمسن لە ٨ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٠دا بە بروسکە بە ئێرل گرانفیل رادەگەیەنێت: ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە بۆ زانیاری بە جەنابتان رابگەیەنم ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان وەك راگەیەندراوە (١٥٠٠٠)کەس بە هێزی سەر بە خێڵی هەمە جۆرو دانیشتووی هەردوولای سنووری تورکیا - ئێران بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا سەرۆکە ناودارەکەی تورکیاو سەرۆك خێڵێکی ئێران دەوری شارو ناوچەی سابڵاخیان گرتووە[2]. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە شێخ عەبدولقادر هەر لە سەردەمی باوکییەوە لە دیارترین بزوتنەووەی نەتەوەیی کورددا بەشداری کردووەو دەوری سەرکردایەتی بینیووە. راستە راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری دەیویست دەسەلاتێکی کوردی لەژێر چاودێری عوسمانیەکاندا دابمەزرێنێت بەلام هێشتا بەپێی ئەو قۆناغە مێژووییەی کە تیایدا سەری هەڵداوە لەڕووی نەتەوەییەوە بایەخێکی زۆری هەیەو دەشێ وەکو راپەڕینی ناسیونالیست لەسەردەمی غیابی ناسیونالیزمدا سەیر بکرێت، شێخ عەبدولقادر هەڵگری گوتاری بزوتنەوەکەی ساڵی (١٨٨٠)یە کە دەشێ بە گوتاری نەتەوەیی دابنرێت ئەگەرچی گوتارێکی پێگەیشتوو هەمەلایەنو گشتیگر نەبوو، بەلام بۆ کەسێتی شێخ عەبدولقادر کە لەوێوە دەستی پێکردووە ئایا لە قۆناغەکانی دواتری ژیانی خۆیدا دەشێ زیاتر وەکو

ناسیونالیستێکی تەواو دەربکەوێت و ببێتە هەڵگری گوتاری نەتەوەی رەهەند دیارو خاوەن شوناس یان ئایا پاشەکشە دەکات و پاشگەز دەبێتەوە؟.

لەدوای هەرەسی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵاو دەستگیرکردنی شێخ خۆی و رەوانەکردنی بۆ حیجازو وەفاتکردنی لەوێ خامۆشییەک باکوری کوردستان دەگرێتەوە هەمان شێوەی بەشەکانی تری کوردستان و هەرچەندە لە کۆتایی هەشتاکاندا هەندێ جوڵانەوەی سادەو هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی هێز جارێکی تر روودەدات بەلام کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێت، بە هەر حاڵ بارودۆخی دوای شکستی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا سوڵتان عەبدولحەمیدی خستە سەر رێگای هەوڵدان بۆ نزیک کردنەوەی خێڵ و عەشیرەتە کوردەکان و سەرئەنجام سوارەی حەمیدیەی لێدروستکردن، لەلایەک بۆ رێگاگرتن لە سەرهەڵدانی هەر راپەرینێك لە کوردستاندا، لەلایەکی تریشەوە بە مەبەستی بەکارهێنانیان بەدژی ئەرمەن و ئینگلیزەکان. بەلام لەسەرویەندی شۆرشی تورەکە لاوەکاندا لەساڵی ١٩٠٨، نوخبەی رۆشنبیری کورد لە باکورو بەتایبەتیش لە ئەستەمبوڵ (کۆمەڵەی تەرەقی و تەعاونی کوردی)یان دامەزراند، لەنێو دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەدا میر ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری نەهری کوری شێخ عوبەیدوڵڵاو ژەنەراڵ موحەمەد شەریف پاشاو گەلێ روناکبیری تر هەبوون[٣] دیارە شێخ عەبدولقادر دوای مردنی باوکی مۆڵەت درا بگەرێتەوە ئەستەمبوڵ، نەك بۆ کوردستان[٤] شێخ عەبدولقادر لە گەرانەوەیدا بۆ ئەستەمبوڵ و بەشداریکردن لە چالاکی سیاسی رێگایەکی بۆ بەرزە فرییەکانی خۆی پەیداکرد، ئەویش وەکو جەودەت و سکوتی بە کۆمیتەی ئیتحادو تەرەقییەوە پەیوەست بوو[٥] (سەید نورسی)یش وەك شێخ عەبدولقادر هەر بۆ یەکپارچەیی عوسمانی وەفادار بوو[٦] شێخ عەبدولقادری کوری شێخ عوبەیدوڵڵای سەرکردەی راپەرینەکەی ١٨٨٠ کە ساڵی ١٨٨١ دەرکرابوو، دەورێکی دیارو باڵای هەبوو، دوای راپەرینەکەی (بۆلی) گەرایەوە ئەستەمبوول و بە یەکێك لە داکۆکیکەرانی دەستوور لە وڵاتدا ناسرابوو[٧] سەید عەبدولقادر خودموختاری

کوردستانێکی یەکگرتووی لە کوردستانێکی پارچە پارچەو چەند پارچە پێ باشتر بوو. سەید عەبدولقادر بە هیوابوو کە (وا دیار بوو بە یارمەتی ئینگلیزەکان) لە هەل‌و مەرج‌و بوارێکی گونجاودا بتوانێ بکاتە کوردستانێکی یەکگرتوو[8]. شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان بەناوی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) لەڕێگای کۆمیسارێای ئەمەریکی‌و ئینگلیزی‌و فەرەنسییەوە لە ئەستەمبوڵ رادەگەیەنن کە شەریف پاشا بۆی هەیە لە کۆنفرانسە نێودەوڵەتیەکاندا ببێتە نوێنەری داخوازییەکانی گەلی کورد[9] لەساڵی (١٩٢٠)دا شێخ عەبدولقادر، کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری دەستی کرد بە بروسکە ناردن بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس‌و داوای ئۆتۆنۆمی کرد لەجیاتی پێکهێنانی دەوڵەتە سەربەخۆکەی شەریف پاشا[10].

سەرەتا ئەوەی دەبێ ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە شێخ عەبدولقادر لەسەردەمی لاوێتیدا سەرکردایەتی بەشێکی گرنگترین راپەرینی لە مێژووی کورددا کردووە کە ئەو راپەرینە سەرباری غیابی ناسیونالیزمی کوردی تا ئاستێکی دیار هەلگری گوتاری نەتەوەیی کوردی بووە. بەو پێیە شێخ عەبدولقادر لەو سەرەتایەوە دەستی پێکردووەو گومانیشی تێدا نییە کە لەو سەردەمەدا بەتەواوەتی لەژێر کاریگەری عەقل‌و بەرنامەو رێبەرایەتی ناسیونالیستی باوکیدا بووە.

بەلام لەدوای شکستی راپەرینەکەو کۆچی دوایی باوکی بۆ نزیکەی بیست‌و پێنج ساڵێك شێخ عەبدولقادر دەورێکی دیاری نەوتۆی نابێت کە شایانی باس بێت، بەلام لەگەڵ دەرکەوتنەوەیدا لەساڵی ١٩٠٨دا وەکو ئەندامێکی دیاری ئیتحادو تەرەقی دەردەکەوێتو زیاتریش لایەنگری یەکپارچەی خاکی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی بوو، ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە شێخ عەبدولقادر لەم قۆناغەدا هەلگری گوتاری نەتەوەیی کوردی نییە چونکە گەوهەری ئەو گوتارە بریتییە لە سەربەخۆیی‌و دروستکردنی دەوڵەتی یەکگرتووی کوردی. رەنگە ئەو پرسیارەش سەرهەلبدات کە ئایا بۆچی شێخ

عەبدولقادر داوای یەکپارچەیی خاکی عوسمانی دەکات؟ بێگومان دەشێ هۆکاری زۆر بۆ ئەو هەڵوێستە بدۆزرێتەوە بەڵام هۆکاری سەرەکی لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە لەڕووی هەستی ناسیونالیستییەوە شێخ عەبدولقادر لە بارێکی لاوازدا بووەو زیاتر لەوەی وەکو ناسیونالیستێکی کورد بیر بکاتەوە وەکو کوردێکی مسوڵمانی بڕوابوو بەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتی هەموو مسوڵمانانە بیری کردۆتەوە. بەشداریکردنیشی لە ئیتحاد و تەرەقیدا لە روانگەی بڕوابوونەوە بووە بە چاکسازی دەستووری لە دەوڵەتی تورکدا بەجۆرێك کە هەمووان بە یەکسانیی و پێکەوە لەسایەی ئەو دەوڵەتەدا بژین.

هەرچەندە رای ئەوەش هەیە کە شێخ عەبدولقادر خودموختاری کوردستانێکی یەکگرتووی لە کوردستانێکی پارچە پارچەکراو پێ باشتر بووە بێگومان ئەوەش رایەکی پەسەندە چونکە ئەگەر هەموو کوردستان پێکەوە نەك دەوڵەت بەڵکو خودموختاری هەبووایە ئەوا لە مەسەلەی دابەش بوون دوور دەکەوتەوەو ئەوەش کوردی لە زۆر ئاسەواری نێگەتیڤی دابەشبوون دوور دەخستەوە. هەر لێرەشەوە باسی ئەوە دەکرێت کە شێخ عەبدولقادر مەیل و ئارەزووی دروستکردنی کوردستانێکی یەکگرتووی هەبووە، ئەم قسەیەش لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ رێگای تێدەچێت چونکە هەر لەو سەرو بەندەدا شێخ عەبدولقادر بەوە رازی دەبێت کە جەنەراڵ شەریف پاشا نوێنەرایەتی کورد بکات لە کۆنگرەی ئاشتیدا. ئەگەر لەم روانگەیەوە سەرنجی شێخ عەبدولقادر بدەین ئەوا وەکو ناسیونالیستێك دەردەکەوێت کە هەڵگری گوتاری کوردی بێت، بەڵام ئەوەی کە مایەی لەسەر راوەستانە ئەوەیە کە لە مێژووی دەرکەوتنی هەستی ناسیونالیستی کوردیدا بەشی هەرە زۆری تاکە دیارە ناسیونالیستەکان نەیانتوانیووە بە جێگیری لەسەر بیروباوەڕی خۆیان یان لەسەر هەڵوێستی خۆیان بمێننەوە. ئەمەش دیسان لاوازی ئاستی بە ناسیونالیستی بوونی کورد نیشان دەدات چونکە ناسیونالیزم نەبووەتە ئایدیۆلۆژیایەکی جەماوەری لە کۆمەڵگای کوردیدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ

کە مادەم ناسیونالیزمی کوردی دەرنەکەوتووەو نەبۆتە پرۆژە کەواتە بوونی تاکی ناسیونالیستیش بوویەکی تەواو کامڵ نابێتو هەمیشە لە باری ڕاڕایی‌و ناجێگیریدا دەبێتو هەمیشەش لەبەردەم مەترسی پاشگەزبوونەوەو هەڵوێست گۆڕیندا دەبێت.

لەکاتێکدا کە شێخ عەبدولقادر لایەنگری خۆی بۆ شەریف پاشا نیشاندا کەچی هەر بە ماوەیەکی کورت دوای ئەوەو لەساڵی ١٩٢٠دا کەوتۆتە بروسکە ناردن بۆ کۆنگرەی ئاشتی کە تیایدا داوای ئۆتۆنۆمی دەکرد بۆ کوردستان‌و رایدەگەیاند کە چیتر لایەنگری لە داواو ویستەکانی جەنەراڵ شەریف پاشا بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی ناکات. ئەم گۆڕانکارییانە لە هەڵوێستی شێخ عەبدولقادردا سەلمێنەری ڕاستی ئەو قسانەی سەرەوەمانن سەبارەت بە هەڵوێستی ناجێگری شێخ عەبدولقادر کە لەساڵی (١٨٨٠)ەوە بۆ ساڵی ١٩٢٠ چەند جارێك گۆڕانکاری بەسەردا دێت لە نێوان هەڵوێستی ناسیونالیستانەوە کە ڕابەرایەتی بەشێك لە بزوتنەوەیەکی نەتەوەییانە دەکات، بۆ هەڵوێستی دەستووردخوازانەو داکۆکیکەر لە یەکێتی خاکی عوسمانی‌و پاشانیش گەڕانەوە بۆ داواکردنی خودموختاری کوردستانێکی یەکگرتوو لەوێشەوە بۆ داواکردنی سەربەخۆیی‌و هەڵوێستی پشتگیری کردنی شەریف پاشا لە داواکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان. بێگومان لێرەوە دەردەکەوێت کە شێخ عەبدولقادر خاوەنی گوتارێکی جێگیری نەتەوەیی کوردی نەبووە، بەڵکو لەنێوان گوتاری نەتەوەیی‌و گوتاری عوسمانلیدا یاری کردووە کە ئەمەی داواییان لەو سەردەمەدا گوتارێکی شمولی بووە لەنێوان گوتاری ئیسلامی‌و تورکێتیدا.
بێگومان لەگەڵ ئەم هەڵوێستانەشدا شێخ عەبدولقادر دواتر هێشتا دەستەبەرداری ئەو پەروەردە بنەڕەتییە نەبووە کە لە سەردەمی باوکیدا وەریگرتووە، ئەویش پەروەردەکردن بووە بە ڕۆحێکی کوردانە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ناسیونالیستی بوون لە مێژووی ڕابردووی کورددا یان لە پەروەردەی خێزانەوە دەستی پێکردووەو دروستبووە یان بەکاریگەری ژیان لە

دەرەوەی واقیعی کوردستاندا، کە ئەوەش حاڵەتی بوونی تاکی ناسیونالیستی بەبێ بوونی ناسیونالیزم بەرهەم هێناوە واتە تاکێك کە بەتەنیا لە کاتو شوێنی جۆراو جۆردا هەڵوێستی جۆراوجۆری هەبووەو بەدرێژایی ژیانی ئەو کەسە بووەتە هەلگری گوتاری نەتەوەیی، ئەم قسانە نەك بۆ شێخ عەبدولقادر بەڵکو بۆ زۆربنەی تاکی ناسیونالیستی کوردی راستە.

دیارە شێخ عەبدولقادر سەرباری هەڵوێستی بەرامبەر بە نوێنەرایەتی جەنەراڵ شەریف پاشاو داکۆکی کردنی لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لەبری دەوڵەت، بەلام لە ساڵی ١٩٢٥ لایەنگرو بەشداریکی چالاکی راپەرینەکەی شێخ سەعیدی پیران بوو، تەنانەت لە شکستی ئەو راپەرینەدا شێخ عەبدولقادرو زۆرێکی تر لەسەرکردەکانی ئەو راپەرینە لە سێدارە دران. بێگومان ئەوە راستیە کە رێزی مێژووی شێخ عەبدولقادر پێویستە بگیرێت وەکو خەباتگێرێكو وەکو کەسێك کە خوێنی بەخشیوە. بەلام ئەوەش ئاشکرایە کە هەڵوێستی شێخ عەبدولقادر هەڵوێستێکی ناجێگیر بووەو هەندێ جار وەکو ناسیونالیستێكو هەندێ جاریش وەکو کەسێکی میانرەو دەردەکەوێت کە داخوازیکەری یەکێتیی خاکی عوسمانییە یان خوازیاری ئۆتۆنۆمییە.

بۆیە ناتوانین وەها سەیری شێخ عەبدولقادر بکەین کە هەلگری گوتاری نەتەوەیی کوردییە. هەرچەندە هەندێ لەو رۆژهەلات ناسانەی کە لەسە کێشەی کوردیان لەسەرو بەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا نووسیووە وای بـ دەچن کە لەو قۆناغەدا ناسیونالیزمی کورد دەرکەوتووەو ئەو راپەرینانەش وەکو راپەرینی ناسیونالیزمی کوردی سەیر دەکەن، بەلام بە روانینی من لە قۆناغەدا شتێك نییە کە ناوی ناسیونالیزمی کوردی بێت بەو مانایەی ک ناسیونالیزم هەلگری پرۆژەی دەوڵەتە. دەبینین جگە لە بۆچوونی تاک ناسیونالیستەکان، پرۆژەیەکی گشتی جەماوەری بۆ دروستکردنی دەوڵەتێک سەربەخۆی کوردی کە هەموو جوگرافیای کوردستان بگرێتەوە بوونی نەبووە.

# سەرچاوەکانی بەشی ( ١٧ )


1- David MacDowall. A Modern History of the Kurds London – 2000, p. 53.

٢– لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی ـ بەڵگەنامەکانی شۆڕشی ١٨٨٠، وەرگێڕانی: جەمال میرزا عەزیز ـ ١٩٩٩ ـ ل ٢٠.

٣– ڕۆبەرت ئۆڵسن ـ ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ـ وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو ـ سلێمانی ١٩٩٩ ل٢٤.

4- David MacDowall – A Modern History of The Kurds. P.90.

5- Ibid, p.90.

6- Ibid, p.93.

٧– جەلیلی جەلیل ـ هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو کەلتوری کوردی ـ وەرگێڕانی ئەنوەر قادر محەمەد ـ ٢٠٠٦، ل٦٥.

٨ـ ڕۆبەرت ئۆڵسن ـ ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ـ ل٤٥.

٩ـ دکتۆر فەرهاد پیرباڵ ـ شەریف پاشا ـ سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٦ـ٢٧.

١٠ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٣٠.

مێژووی بنەماڵەی بەدرخانیەکان، مێژوویەکی دیارو گەشە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەو چارەکی یەکەمی سەدەی بیستدا پێشتر لەبارەی راپەرینی بەدرخانیەکانەوە لەسالآنی چلەکانی سەدەی نۆزدەو دەرکردنی یەکەم رۆژنامەی کوردش لەلایەن ئەم بنەماڵەیەوە دواین بەتایبەتی وەکو بنەماڵەیەکی نوخبەی خوێندەوار لە مێژووی کورددا ئامادەبوونێکی دیارییان هەبووە.

عەبدولڕەزاق کوڕی نەجیب پاشای کوڕە گەورەی بەدرخانە لەساڵی ١٨٤٦ لە گەرمەی راپەرینی بەدرخانیەکاندا لەدایك بووەو بەهۆی باروبۆخی گوزەرانی خێزانەکەیانەوە توانیوویەتی بخوێنێتو هەندێ زمانی دیار فێر ببێت. عەبدولڕەزاق یەکێکە لەو کوڕانەی بنەماڵەی بەدرخان بەگ کە لە سەردەستی حاجی قادری کۆییدا فێری خوێندنو خوێندەواری بووە، حاجی قادر تەئیسیرێکی دیاری کردبووە سەر عەبدولڕەزاقی لاو[1].

عەبدولڕەزاق بەدرخان لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیادا فەرمانبەر بوو، دوایی کرایە سێیەم سکرتێری بالیۆزی تورکیا لە پیتەربۆرگ[2] پاشان بووەتە بالیۆز لە تاران بەڵام دواتر سوڵتان عەبدولحەمید دەیگێڕێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ، پاشان توانی بە یارمەتی بالیۆزی روسیا لە تورکیا هەڵبێتو بگاتە تفلیس دوای ئەوە عەبدولڕەزاق توانی لە روسیاوە بگاتە ئینگلتەراو پەیوەندی لەگەڵ نەیارانی تورکیادا پەیدا بکات، بەڵام سوڵتان توانی بەهۆی نەجیب پاشای باوکی عەبدولڕەزاقەوە، عەبدولڕەزاق بهێنێتەوە بۆ ئەستەمبوڵو کردیان بە سەرۆکی تەشریفاتی کۆشکی سوڵتان بەڵام دواتر بەهۆی کوشتنی رەزوان پاشای سەرۆکی پاسەوانەکانی سوڵتانەوە دەستگیر کراوەو رەوانەی تەرابلوس کراوە. بەڵام دوای شۆڕشی تورکە لاوەکان، عەبدولڕەزاق لەساڵی ١٩١٠دا رێگای پێدرا بگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ. پاش ماوەیەك عەبدولڕەزاق بەدرخان جارێکی تر چووەوە سنووری روسیاوە بەو ئومێدەی خۆی لە مەترسی دەوڵەتی تورك بپارێزێتو لە هەمان کاتیشدا ئومێدی ئەوەی هەبوو کە روسەکان پشتگیری مەسەلەی کورد بکەن. بە واتایەکی دی ئەم کەسێتییە کە هیچ بڕوایەکی بە

تورکه لاوەکانو بە ڕۆژئاواش نەبوو هیوا خوازی ئەوە بوو کە ڕوسیا ببێتە پاڵپشتو یاریدەدەری کورد لەپێناوی گەیشتنیدا بە مافەکانی، لە ساڵی (۱۹۱۷)دا لە بروسکەیەکی نهێنیدا باڵیۆزی ڕوسیا لە تورکیا دەڵێت: عەبدولڕەزاق پێی ڕاگەیاندم نیازی هاندانی کوردەکانی تورکیاو ئێرانی هەیەو دەیەوێ لەدژی تورکیا ڕاستیان بکاتەوەو دەستیان پێ هەڵبگرێ لە تاڵانو بڕۆی ناوچە مەسیحی نشینەکانی ئێران[۳]. عەبدولڕەزاق لە مانگی مارتی ۱۹۱۱دا لە سنووری تورکیاوە پەڕییەوەو لە شاری وان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو سەری هەڵدا، لە ماوەی مانەوەیدا لە وان، توانی زۆربەی پیاوە ناودارە کوردەکانی تورکیا ببینێو تێیان بگەیەنێت کە دەیەوێت، لە دژی حکومەتی تورکیاو لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا بجەنگێ[٤] لە مانگی مارتی ساڵی ۱۹۱۱دا عەبدولڕەزاق سەفەری کرد بۆ (ماکۆ)و لەوێشەوە گەیشتە (کۆتور)و لەماوەی ئەو سەفەرەیدا گفتوگۆی لەگەڵ سەرۆکە کوردەکاندا کرد بۆ ئەوەی پشتگیری ئەوان بەدەست بهێنێت بۆ دروستکردنی یەکێتییەك کە لایەنگری ڕوسیا بێتو لە خێڵە کوردییەکانی تورکیاو ئێران پێکبێت[٥] عەبدولڕەزاق ڕایگەیاند: من ئێستا نیازم بەشداریکردنی سمکۆیە بۆ دەست بەسەردا گرتنی دیلمانو پێشنیارکردن بۆ فارسەکان کە دانم پێدا بنێن وەکو پارێزگاری ورمیەو پاراستنی سنوورم پێبسپێرن[٦] بێگومان لە ئەنجامی بەدیهاتنی ئەم بەرنامەیەیدا عەبدولڕەزاقدا دەیتوانی بە چاکی لایەنگرىو دڵسۆزی خۆی بۆ ڕوسیا بسەلمێنێت.

هەروا هەبوو لەناو کوردەکانا لە پێوەندیکردن لەگەڵ ڕوسدا تەنها مەبەستیان دەستگیربوونی سوودو قازانجی تایبەتی خۆیان بوو هی واش هەبوو هەروەکو عەبدولڕەزاق بەدرخانو عەبدولقادر شەمزینیو سەید تەها شەمزینیو هەندێك ڕۆشنبیری تر، قووڵتر سەیری هەڵوێستیان دەکردو ویستبوویان کورد لە کوردستانی ئێراندا یەك بگرێ بەجۆرێك کە کوردی تورکیاش بگرێتەوە[٧].

ئەگەر سەرنجی ئەو قسەنانەی سەرەوە بدەین، ئەوا دەبینین کە عەبدولڕەزاق بەدرخان وەکو تاکەکەسی نوخبە بنەمایەکی خوێندەواری

رۆشنبیری هەبووەو لەنێو خێزانێکیشدا پەروەردە بووە کە ژیانی ئەستەمبوڵو شارە دیارەکانی ئەوروپا کاریگەری لەسەریان هەبووەو بەپێی مێژووی دواکەوتووی کۆمەڵگای کوردی لەڕووی پەرەسەندنەوە لەو کاتەدا وەکو نوخبەی ناسیونالیست دەرکەوتوون لە غیابی ناسیونالیزمدا. عەبدولڕەزاق وەکو خوێنەوارێك هەر لە سەرەتاوە بڕوای بە تورکە لاوەکان نەبوو، بە هەمان ئەو شێوەیەی کە بڕوای بەوە نەبوو کە ئینگلیزەکانیش هیچ پشتگیرییەی کێشەی کورد بکەن. ئەم روانینەی وای لێکردبوو بەدوای هێزو نفوزێکی تردا بگەڕێت کە ئەویش روسیا بوو، عەبدولڕەزاق ئەوەندەی بڕوای بە دەرەوەو بە یارمەتی دانی هێزی دەرەکی هەبوو، ئەوەندە متمانەی بە هێزی خۆیی کورد نەبوو. رەنگە ئەمەش پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە نوخبەی خوێندەوار لە کۆمەڵگای دواکەوتوودا نابێتە خاوەنی هێزی جەماوەرییو رەگو ریشەی بەهێزی نییە لەنێو کۆمەڵگادا، عەبدولڕەزاق هەمان شێوەی ئەندامانی تری بنەماڵەی بەدرخانییەکان سەرباری خوێندەوارییو بەئاگایی نفوزێکی ئەوتۆیان لەنێو جەماوەرو خێڵو عەشیرەتەکانی کوردستاندا نەبوو، بۆ نموونە ئەو نفوزو دەسەلاتە جەماوەرییەی کە شێخ عەبدولقادر بەهۆی پێگەی عەشیرەتایەتیو پێگەی تەریقەتەوە هەیبوو، نە عەبدولڕەزاقو نە شەریف پاشاو نە عەبدوللا جەوجەدت نەیانبوو. بۆیە ئەمانە زیاتر لە هێزی جەماوەرییو فشاری ناوخۆ لەپێناوی بەدەستهێنانی مافەکانی کورددا، بڕوایان بە جوڵەی دیپلۆماسیو پاڵپشتی دەوڵەتانەی دەرەوە هەبوو.

لەڕووی داواکارییەوە عەبدولڕەزاق وەکو ناسیونالیست داوای سەربەخۆییو دەوڵەتی کوردی دەکرد لەژێر چاودێری روسەکاندا، لەلایەك بە ئومێدی یارمەتی روسەکان بوو، لەلایەکی تریشەوە هەوڵیدەدا کە پاڵپشتیو هێزی سەرخێڵو پیاوماقولانی بە نفوزیش بۆ لایەنگری روسیا بەدەست بهێنێت لەپێناوی مافەکانی کورددا. ئەوەی لەبارەی عەبدولڕەزاقەوە دەگوترێت ئەوەیە کە جۆرێك لە بەرنامەی هەبوو، بەڵام بەرنامەکەی لە سنووری وەهمدا بوو، کاتێك بە ئومێدی ئەوە بوو پشتگیری سمکۆی شکاکو سەردار ماکۆ

بەدەست بهێنێتو ببێتە پارێزگاری ورمیەو لەوێشەوە رێگای بۆ خۆش بێت هەم دڵسۆزیو لایەنگری بۆ روسیا بسەلمێنێت، هەم دەرگای کارکردنی بۆ نێو تورکیا بۆ بکرێتەوە کە دواییش لە واقیعدا دەرکەوت ئەوە بەدی نایەت چونکە روسەکانیش لەلایەك بە گومانەوە سەیری عەبدولڕەزاقیان دەکرد، لەلایەکی تریشەوە بەو جۆرە سەیریان نەدەکرد کە بتوانێت کاریگەری ئەوتۆی لەسەر دەوڵەتی تورك هەبێت.

بەلام لە ڕووی گوتاری نەتەوەییەوە دەبێ ئەوە بڵێین کە عەبدولڕەزاق وەکو هەڵگری گوتاری کوردی دەردەکەوێت، بەلام گوتارێك کە بۆ جێبەجێ کردنی دەبەوێت پشت بەوانی دی ببەستێت، ئەمەش خاڵێکی لاوازە لە گوتاری عەبدولڕەزاقدا چونکە دەبێ گوتاری نەتەوەیی پایەکانی لەنێو نەتەوەدا بێتو تایبەتمەندییەکانی نەتەوە لە خۆیدا کۆ بکاتەوەو هەڵگری داولو ویستەکانی نەتەوە بێتو بە ویستو خەونو ئاواتو داواکانی نەتەوەو بە فیکرو مەعریفەو فەنتازیاو خەیاڵی نەتەوە بارگاوی کرابێتو بکەری هەڵگریو جێبەجێ کەریشی هەر هێزی جەماوەری نەتەوە بێت. لەم روانگەیەوە گوتارەکەی عەبدولڕەزاق وا دەردەکەوێت لەلایەك هێزی جەماوەری نەتەوەیی نەبێتو لەلایەکی تریشەوە لەسەر بنەمای وەهم بکەری بۆ دروست بکرێتو لە بنەڕەتدا بکەرێکی دیار یان ئامادە بۆ هەڵگرتنو جێبەجێ کردنی ئەو گوتارە بوونی نەبێت.

گوتاری عەبدولڕەزاق بەدرخان بۆ دەستپێکردنی راپەڕین لە کوردستانی ژێر دەسەلاتی فارسەوە دەمانگێڕێتەوە بۆ هەمان گوتاری شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، بەلام جیاوازییەکە لەوەدایە کە شێخ عوبەیدوڵڵا هەم خاوەنی بنکەیەکی جەماوەری فراوانبوو بەهۆی پێگەی عەشیرەتایەتیو پێگەی تەریقەتی نەقشەبەندییەوە، هەم لە نێو خێڵو عەشیرەتەکانی کورددا کەسێتییەکی دیار بوو، دەیتوانی سەرۆك خێڵو شێخو پیاوانی دیار بهێنێتە سەر هێڵی کارکردنو هاوکاریکردن لەگەڵ خۆیدا. بەلام ئەم بنەمایانە هیچیان لە کەسێتیی عەبدولڕەزاقدا ئامادەبوونێکی ئەوتۆیان نەبوو.

بێگومان بەگشتی ڕاپەڕینەکانی کورد لە ڕابردووەوە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەوڵیان داوە لە فەزاو لەژێر سایەی لایەنگریو پاڵپشتی ئەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەتدا بن کە ئەمەش خاڵێکی لاوازە لە گوتاری سیاسی کورددا، بەڵام پرۆژەو بەرنامەکەی عەبدولڕەزاق بەتەواوەتی وەکو بەرنامەی ڕووسیا دەردەکەوێت کە هەوڵبدات لەڕێگای ئەم کەسێتەوە کورد بەکار بهێنێت لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا.

تەنانەت عەبدولڕەزاق بەدرخان سەرباری ئەوەی وەکو کەسێکی ڕۆشنبیر ئەو بنکەو پێگە جەماوەرییەی نەبوو لەنێو خەڵکی کوردستاندا. لە هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکەو چۆنێتی دەستپێکردنی ڕاپەڕینەکەشدا نەیتوانی بەشێوەیەکی بابەتی هەموو لایەنەکانی ئەو واقیعە هەڵبسەنگێنێتو لەو بوارەشدا نەکەوێتە ژێر کاریگەری سۆزو عاتیفەوەو لە سنووری وەهمدا قسە نەکات. لازاریف دەڵێت: عەبدولڕەزاق لە ئاستی یەکەمدا موبالەغەی کرد بە یەکێتیی‌و ڕێکخستنی خێڵە کوردەکانەوە، چونکە کوردەکان هەموویان ئامادە نەبوون بۆ خەباتکردنی دەست بەجێ لەپێناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی یەککگرتوودا. بەڵکو هێشتا لە دوژمنایەتی بەهێزی خێڵایەتیو کوشەگیری دەرەبەگایەتیدا بوونو زۆرێك لە دەرەبەگە دیارەکان وایان دەبینی کە لە هەموو شتێ گرنگتر ئەوەیە لایەنگری دەوڵەتی تورك یان ئێران بکەن[٨].

لێرەوە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە واقیعی ئەو سەردەمەی کوردستان واقیعی ڕاپەڕین نەبووە، ڕاپەڕینێك کە پرۆژەی سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی هەبێت، هۆی ئەمەش ئاشکرایەو لە پلەی یەکەمدا دەگەڕێتەوە بۆ دەرنەکەوتنو ئامادەنەبوونی ناسیونالیزمی کوردی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گوتاری کوردی بەو مانایەی کە گوتارێکی جەماوەری سیاسی بێت بوونی نەبووە، بەڵکو لە دەرەوەی کۆمەڵگا عەبدولڕەزاق وەکو تاکە خوێندەوارەکانی تر هەڵگری گوتارێك بووە سەرباری لاوازیو کەموکورتییەکانی دەشێ بەگوتاری سیاسی کوردی ناوببرێت، بەڵام ئەم گوتارە لەسەر ئاستی

جەماوەری گۆشەگیر کراوو بێ لایەنگریووە، لەبەر ئەوەی ئەگەری جێبەجێ کردنی زۆر لاواز بووە، بۆیە دەشێ وەکو سەرکردەیەکی پەرتکراو یان پەرتبوو لە واقیعو کۆمەڵگا سەیری عەبدولڕەزاقو زۆرێک لە نوخبەی ڕۆشنبیری چارەکی یەکەمی سەدەی بیستی کوردستان بکرێت. لەوەشدا ئەم تاکە کەسانە وا دەردەکەون ئەوەندەی لە وەهمی سەرکردایەتیو دروستکردنی سەربەخۆییدا دەژین، ئەوەندەش لە واقیع دوورن.

# سەرچاوەکانی بەشی (١٨)


١ـ محەمەدی مەلا کەریم ـ حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە ـ بەغداد ـ ١٩٦٠ ـ ل٨.

٢ـ جەلیلی جەلیل ـ هەندێ سیمای کۆمەڵایەتیو سیاسیو کەلتوری کوردی، وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد ـ سلێمانی ٢٠٠٦، ل٨٨.

٣ـ هەمان سەرچاوە، ل١١٥.

٤ـ هەمان سەرچاوە، ل١١٧.

٥ـ م. س، لازاریف ـ المسألة الکردیة (١٨٩١ـ ١٩١٧) ترجمة أکبر أحمد، مرکز کردستان للدراسات الستراتیجیة ـ ٢٠٠١، ص٢٣٦.

٦ـ المصدر السابق ـ ص ٢٣٧.

٧ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ـ سمکۆو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٥٢.

٨ـ م. س. لازاریف ـ المسألة الکردیة، ص٢٣٨.

سمكۆ (ئیسماعیل ئاغای شكاك) كە سەر بە خێڵی شكاك بوو لەدوای كوشتنی جەعفەر ئاغاو مردنی محەمەد ئاغای باوكی بەتەواوی سەركردایەتی ئێلی شكاكی گرتە دەستو بوو بە كەڵەسوارو شۆڕەسواری ناو شكاكو ناوچەكەی خۆی كە ماوەی دە دوازدەساڵ حكومەتی ئێرانو توركی شڵەژان[1]. بەپێی بۆچوونەكان ئیسماعیل ئاغای شكاك لەساڵی ١٨٨٩ یان ١٨٨٧ لەدایك بووە[2] دكتۆر جەمال نەبەز دەڵێت سمكۆ لەساڵی ١٨٧٥ لەدایك بووە[3].

ئیسماعیل ئاغا كوڕی محەمەد ئاغای شكاكە، لەساڵی ١٩٢٠دا خێڵەكەیان دەورویەری دوو هەزار خێزان دەبوو، هەموو خێڵەكەی ئیسماعیل ئاغایان بە سەرۆكی خۆیان قبوڵ بوو[4]. سمكۆ سەرۆك خێڵی شكاك بوو كە دەسەڵاتی بەسەر ناوچەی رۆژئاوای دەریاچەی ورمیەدا كردو هەوڵی سەربەخۆیی كوردستانیدا، سمكۆ دوای ئەوەی كە دەسەڵاتی خۆی بەسەر خێڵەكانی دراوسێدا سەپاند، توانی دەسەڵات بەسەر بەشی زۆری كوردستانی ئێراندا بكات ئەوەش لە ماوەی ساڵی ١٩٢٠ بۆ ساڵی ١٩٢٤ بوو[5] سمكۆ وەك پێش شەڕ بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ئێرانو روسیا كەڵكی لە بێ سەرویەری بارودۆخی ناوچە سنوورییەكان وەرگرتبوو[6] لە ساڵی ١٩١٨ بەدواوە دەرگای بواره سیاسییەكان بەرووی سمكۆدا كرانەوەو هەوڵی بەهێزكردنی پەیوەندییەكانی خۆیی لەگەڵ شێخ تەهادا داو كەوتە پتەوكردنو بەهێزكردنی پێگەی خۆی[7] لە وڵاتی شوكاك لە (چاریە ـ چەهریق) لە بناری (زۆزان) هەر لە پێش ١٩١٤دا سمایل ئاغای سمكۆ ناوو ناوبانگی دەركردبوو، هەستێكی میللیەتو قەومیەت كەوتبووە كەللەیوە[8] لە ساڵی ١٩١٩دا سمكۆ سەركەرمی ئامادەكردنو خۆشكردنی زەمینەیەك بوو تا سەربەخۆیی كوردستانی پێ مسۆگەر بكرێتو بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی بە سەرۆك عەشیرەتەكانی كوردەوە كرد بۆ خۆئامادەكردن، سەید تەها كە ژنبراو دۆستو هاوكاری سمكۆ بوو چووە بەغدا بۆ هەوڵی مسۆگەركردنی پشتیوانیكردنی ئینگلیز بۆ

دەستگیربوونی سەربەخۆیی کورد(٩) زۆرینەی دانیشتوانی خوارووی کوردستانی ئێران لایەنگری ئەوەن کە لەگەڵ ئەو بزووتنەوەیی سمکۆدا بن ئەگەر هاتوو بەریتانیا پشتگیری بکا، بەڵام ئەوانە هەتا بەتەواوی لەوە دڵنیا نەبن بە هیچ جۆرێك ناجوڵێنەوە[١٠] هەواڵێك گەیشت کەوا سمکۆ پەیوەندی بە گەلێك کوردی ناسراوەوە کردووە بۆ ئەوەی بە هەموویان هەوڵ بدەن بە یارمەتی دەوڵەتێکی بێگانە کورد لەدەست فارس رزگار بکەن[١١] لەدوای جەنگی جیهانی سمکۆ بووە دیارترین کەس لە خەباتی رزگاریخوازی کوردی ئێراندا کە ناوەرۆکی ئەو خەباتەی قوڵکردەوەو زیاتر ئامانجەکانی دیاریکرد[١٢].

بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە سمکۆ سەر بە خێڵی شکاکە ئەم خێڵە لەدوای دەسەڵاتی زەندییەکان لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا بەتەواوی دەرکەوتوون و لە راستیشدا لە زۆر هەل و مەرجدا تووندو تیژبوون بەرامبەر بە هاووڵاتیانی کوردی خۆیان و هەروەها بەرامبەر بە ئەوانی تریش. تەنانەن جگە لە کوشتنی مار شەمعون لەلایەن سمکووە، پێشتریش کوشتنی محەمەد خانی قاجاری لەساڵی ١٧٩٧دا لەشاری شوش لەناو چادرەگەی خۆیدا دراوەتە پاڵ سادق خانی شکاك. محەمەد رەسوڵ هاواری دەڵێت: بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئەوانە (بەشێك لە پیاوە دیارەکانی شکاك) بە پیلانی کاربەدەستانی ئێران گیراون و کوژراون یان بۆسەیان بۆ نراوەتەوەو کوژراون[١٣] لەوانەش ئیسماعیل ئاغای باپیرە گەورەی سمکۆ لە ساڵی ١٣٢٥ لەلایەن عەسکەرخانی قاجارییەوە. عەلی ئاغای کوڕی ئیسماعیل ئاغا لە زینداندا لە زەمانی ضیاء الدولەدا مردووە. جەعفەر ئاغا لەساڵی ١٩٠٥دا لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە بەشێوەیەکی زۆر ناجوامێرانە کوژراوە. ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ) کە ئەویش لە شنۆ لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە بۆسەی بۆ نرایەوەو لەساڵی ١٩٣٠دا کوژرا[١٤]).

خێڵی شکاك خێڵێکی دەست رۆیشتوو ئازاو چاو نەترس بوون، لەسەردەمی خۆیدا سادق خانی شکاك چاوی لە کورسی دەسەڵاتی عەرشی ئێرانی بووە: بەولاتا ئەم خێڵە لەرووی پێکەی خێڵایەتی و لەرووی لێهاتوویشەوە دیارو

لەبەرچاو بوون. هەر لەپێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا کە هێشتا مەسەلەی ناسیونالیزم نەك هەر لە کوردستان بەڵکو لەو وڵاتانەشدا کە چوار دەوری کوردستانیان داوە دەرنەکەوتبوو، شان بەشانی نوخبەی بە ژمارە کەمی خوێندەواری کورد، هەندێك لە ئەندامانی خێڵی شکاكو بەتایبەتی ئەندامانی بنەماڵەی سەرخێڵ لە جموجوڵدا بوونو هەمیشە ویستو ئارەزووی فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی خۆیانیان هەبووە: مینۆرسکی دەڵێت: جەعفەر ئاغا لەناوچەی سەلْماس ئەژیا، ئەو جەعفەر ئاغایە بە هیچ جۆرێك لە دەسەڵاتدارێتی فارسەکان نەئەترساو لێیان نەدەسڵەمیەوە، جارویار لە شاخ ئەهاتە خوارەوە لەناو دۆڵەکاندا تاڵانیو ڕاوڕووتی ئەکرد، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو.. کە جەعفەر ئاغا دەوڵەمەندەکانی تاڵان ئەکردو بەشێکی ئەو تاڵانییەی بەسەر هەژارەکانی ناوچەکەدا دابەش ئەکرد[١٥] هەر لەبەر ئەوە هەژاران خۆشیان دەویستو ڕێزیان لێدەگرت، حکومەتی ئێران هەروەکو ڕەوشتی کۆنی خۆی جەعفەر ئاغای کرد بە لێپرسراوی سەرسنوری ئێرانو عوسمانی. دواجار لەساڵی ١٩٠٥دا جەعفەر ئاغا کوژرا، کوشتنی جەعفەر ئاغا زیاتر سمکۆی بزواندو وای لێکرد هەندێ جار بە توندوتیژی ڕەفتار بکات، چونکە سەرباری ئەوەی کە سمکۆ هەر لە لاوێتییەوە هەستی نەتەوایەتی دەیجوڵاند، مەسەلەی بە نامەردانە کوشتنی جەعفەر ئاغاش زیاتر تووڕەی کردو هەمیشە جۆرێك لە گیانی تۆڵە سەندنەوە دەیبزواند.

سمکۆ هەر لە پێش دەستپێکردنی شەڕدا کەوتبووە بەرچاوو سەرباری کەمی تەمەنی بەڵام وەکو کەسێتییەکی دیاری ڕۆژهەڵاتی کوردستان ناسرابوو. سمکۆ لەلایەك لە بەرامبەر ئەرکی تۆڵەکردنەوەی جەعفەر ئاغادا خۆی دەبینیەوە لەلایەکی ترەوە ئومێدی ئەوەی هەبوو کە دەسەڵاتێکی کوردی دابمەزرێنێ، پێشتر عەبدولڕەزاق بەدرخان پەیوەندی بە سمکۆوە کردو بە ئومێدی ئەوە بوو کە سوود لە نفووزی خێڵایەتیو جەماوەری سمکۆ وەربگرێت، سمکۆ خۆیشی وەکو پیاوێکی وریا هەوڵی دا هاریکاری لەگەڵ سەید تەهای شەمزینی بکات

چونکە دەیزانی سەید تەها نفوزێکی عەشیرەتایەتیو ئایینی یان تەسەوفی بەربڵاوی هەیەو دەشێ هاریکاری هەردووکیان پێکەوە دەورێکی باشتری هەبێت بۆ فراوانکردنی نفووزو دەسەڵاتیان تا بتوانن کوردستانێکی ئازاد دروست بکەن.

سمکۆ سەرەتا لەگەڵ روسەکان کوك بوو پاشان بووە لایەنگری تورکەکان، بەڵام کاتێ شۆرشی ئۆکتۆبەر روویدا لایەدایەوە بەلای یەکێتی سۆڤێتدا. سەرباری ئەم هەڵوێست گۆرینەی سمکۆ بەپێی کات، کێشەی گەورەی سمکۆ هەر ئەوە نەبوو لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانیدا هەیبوو بەڵکو ناکۆکیو ململانێی لەگەڵ فەلەکاندا دیارو لەبەرچاو بوو کە مار شەمعون سەرۆکی رۆحیو سیمای فەلەکان بوو، هەر ئەو ناکۆکیەش دەشێ هۆکاری سەرەکی بووبێت بۆ ئەوەی سمکۆ بەشێوەیەکی ناجوامێرانە مارشەمعون بکوژێت، هەرچەندێ هەندێ لە نووسەرانی کورد پاساو بۆ ئەو کارەی سمکۆ دەهێننەوە، بەڵام دەبێ بزانین هەرچۆن کوشتنی جەعفەر ئاغای شکاکو خودی سمکۆش لەلایەن دەسەڵاتی ئێرانیەوە ناجوامێرانە بوو، بە هەمان شێوە کوشتنی مارشەمعونیش کارێکی نابەجێ بوو.

سمکۆ توانی روویەرێکی تا ئەندازەیەك فراوانی کوردستان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، لەنێوان سنووری ئێرانو تورکیادا جۆرێك لە ئازادی هاتو چۆی هەبوو، واش پێدەچێت کە تورکەکان ترسێکی ئەوتۆیان لە سمکۆ نەبووبێت چونکە ئاراستەی کارکردنو چالاکییەکانی بەرەورووی دەسەڵاتی ئێرانی بوو. سمکۆ لەساڵی ۱۹۲۰ بۆ ۱۹۲٤ لە راپەرینێکی بەردەوامدا بوو، بەلا، ئەوەی کە جێگای سەرنج لێدانە ئەوەیە سمکۆ خاوەنی هێزێکی چەکداری عەشایەری بوو، سەرباری ئەوەشی کە خۆی پیاوێکی ژیرو وریاو ئازاو نەخوێندەوار بوو، دەیزانی کە نەتەوەکەی ئەویش هەمان شێوەی نەتەوەکانی تر مافی سەربەخۆیو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیی هەیە چالاکییەکانی سمکۆو بەرزبوونەوەی ناوو دەسەڵاتی بوو بووە جێگای مەترسی

لای ئێرانیەکان و تورکەکانیش. تەنانەت ئینگلیزەکانیش بە وریاییەوە سەیری سمکۆیان دەکرد. سمکۆ سەرباری دەسەڵات و نفوزی بەربڵاوی لەسەر وەختی خۆیدا بەڵام جێگیر نەبوو، ئەو نەیتوانی بوو وەکو شێخ مەحمود دەسەڵاتێکی ئیداری دابمەزرێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سمکۆ هەستێکی سادەی کوردایەتی هەبوو. لەپێناوی کورددا خەباتی دەکرد، ئەگەر سەرنجی ئەو قسانە بدەین کە لە سەرەوە لەسەر سمکۆو هەڵویستی سمکۆو بیرکردنەوەی کراون، ئەوا دەتوانین بڵێین سمکۆ ئەو سەرخێڵە هوشیارو بەئاگایە بوو کە سەرباری ئازایەتی و چاونەترسی و توونـدو تیـژی هەسـتێکی کوردایەتیـشی هەبوو هەرچەندە سمکۆ وەکو عەبدولڕەزاق بەدرخان یان تەنانەت وەکو شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری یان شێخ مەحمود خاوەنی بەرنامەیەکی دیار نەبوو سەبارەت بە کورد، بە واتایەکی دی سەرباری ئەوەی کە سمکۆ وەکو ناسیونالیستێک دەردەکەوت لەغیابی ناسیونالیزمدا بەڵام لە بوون و ماهییەتی خۆشیدا خاوەنی بەرنامەو پڕۆژە نەبوو بەقەد ئەوەی بە سروشتی هەستێکی خاوێنی نەتەوەیی هەبوو، خۆی لەو ئاستەدا دەبینی کە دەبێ لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوەکەیدا کار بکات. بێگومان لەو پێناوەشدا ئەرکی زۆری کێشاوەو خەباتی سەختی کردووەو باشیش لەوە تێگەیشتووە کە بۆ ئەوەی بتوانێت ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتەکەی بەدەست بهێنێت دەبێ لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەکانی تر پێکبێت، ئەمەش دەرەنجامی عەقڵێکی فراوانە کە لەوە تێدەگات تەنیا بە یەکێتیی و یەکبوون دەشێ ئەو هێزە پێکبێت کە بتوانێت بەرگری لە مافەکانی کورد بکات، بە واتا بەر لە هەر شتێک سمکۆ بڕوای بە یەکێتی خودی کورد هەبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی کە بڕوای بەوەش هەبوو کە پشتگیری و یارمەتی دەرەوەش بەدەست بهێنێت، هەر لەو پێناوەدا سەید تەهای شەمزینی ناردە بەغدا بەو ئومێدەی پشتگیری ئینگلیزەکانی دەست بکەوێت، کەواتە سمکۆ لەسەر بنەمای گوتارێکی دوو ئاڕاستەکاری

کردووە کە گوتارەی ناوەوە (گوتاری خۆیی بوون)و گوتاری دەرەوەیی بووە. ئەمەش دەرئەنجامی عەقڵێکی وردو کراوەبووە.

ئێستا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات کە مەبەستی سەرەکی ئاخاوتنی ئێمەیە لەسەر بزوتنەوەکەی سمکۆ ئەویش ئەوەیە ئایا سمکۆ هەڵگری گوتاری نەتەوەیی کورد بووە؟ ئایا ئەو گوتارە بووەتە گوتاری ناسیونالیزمی کوردی؟ ئایا سمکۆ چۆن کاریکردووە لە روانگەی مەسەلەی ناسیونالیزمی کوردییەوە لە سەردەمێکدا کە ناسیونالیزم هێشتا لە ئاستی ناپیاردا بووە؟

ئەبێ ئەو راستیە بزانین کە لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا هێشتا کوردستان لە بارێکی دواکەوتووی خێڵایەتیدا بووە، دەشێ هەستی نەتەوایەتی بە کاریگەری دەرەوە لای تاکەکەس وەکو نوخبە دروست بوبێت و هەر لە ئەنجامی ئەوەشدایە کە تاکە کەسی ناسیولیستیش بەپێی تێگەیشتن و توانا پێ شکانی خۆیان هەوڵیانداوە، ئەو تاکە کەسانەی کە پێگەی خێڵایەتی و عەشیرەتایەتی و ئایینی یان تەسەوفی بەهێزیان هەبووە توانیوویانە جەماوەری خێڵ و عەشیرەت یان جەماوەری تەریقەت لە خۆیان کۆبکەنەوە، بەلام بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە خاسیێتی بزوتنەوەکانیش بەتەواوەتی خێڵایەتی بووە. ئەم دیمەتە لە بزوتنەوەکەی سمکۆدا ئاشکراتر بووە چونکە خێڵی شکاك خێڵێکی بەژمارە زۆرو بە رووبەری جوگرافی فراوان و بە سروشتی ئازاو چاونەترس بوون بۆیە سەرباری دەرکەوتنی سمکۆ وەکو سەرکردەیەکی ناسیونالیست بزوتنەوەکە زیاتر سیمایەکی خێڵایەتی هەبووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مادەم رووی کوردایەتی هەبووەو هەوڵێك بووە بۆ خۆجیاکردنەوە لە فارس و تەنانەت لە فەلەو ئاسوری و ئازەرییەکانیش دەبێ بزانین بنەمایەکی نەتەوەیی ئامادەبوونی هەبووە، بەلام ئەوەی ئاشکرایە کە گوتاری نەتەوەیی هەڵگری فیکری دروستکردنی دەوڵەت و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەیە، سمکۆ هەوڵی لەپێناوی سەربەخۆییدا داوە بەلام سنووری ئەو سەربەخۆییە دیاریکراو بووەو تەنیا ئەو رووبەرەی کوردستانی گرتۆتەوە کە کەوتۆتە ژێر سایەی

قەڵـەمڕەوی فارسـەوە، کـە لەوەشـدا هـەموو ئـەو بەشـەی کوردسـتانی نەگرتۆتەوە. بەڵکو زیاتر ناوچەکانی قەڵەمڕەوی خێڵی شکاکو هەندێ بەشـی تری گرتۆتەوە، بۆیە لە باشترین وەسفکردنی گوتاری سمکۆدا دەتـوانین بڵێین گوتارێکی هەرێمایـەتی بـووە. کـە ئـەویش هاوشێوەی گوتـاری میرنشین یـان گوتـاری دەسـەڵاتدارییەکەی شـێخ مـەحمود بـووە. دیـارە ئـەوەش سـەرباری هەندێ رووی نەتەوەیی ناشێت بە گوتارێکی گشتگیری نەتەوەیی دابنرێت. بـە واتایـەکی دی ناشـێت گوتـاری بزوتنەوەکـەی سمکـۆ بـە گوتـاری نەتـەوەیی هەمەلایەنە دابنێین.

تەنانەت لە هەندێ هەڵوێستدا سمکۆ ئەوەندە بە توندی رەفتاری کردووە کـە بەپێچەوانەوە شکاوەتەوەو ئـەوەی نیشان داوە کـە گوتـاری ئـەم سـەرکردەو بزوتنەوەکەی لەبری ئـەوەی کـە گوتـارێکی هێمنـی پـڕ لـە بنـەماکانی ئاشـیو لێبوردن بێت، بارگاوی کراو بووە بە رەگەزەکانی توندڕەویو هەنـدێ جاریش شۆڤێنیەت، تەنانـەت لـە هەنـدێ شوێندا باسـی نەتـەوەی فـارس بـە سـووك دەکاتو وا دەڕوانێـت بـۆ ئـەوەی کورد هـەبێتو ئامـادەبوونی هـەبێتو ببێتـە خـاوەنی مـاف دەبـێ فـارس نـەمێنێت. ئەمـەش زیـاتر لـەو ناونیـشانەدا دەردەکەوێت کە بۆ بڵاوکراوەی راپەڕینەکەی داناوە کە بریتیی بوو لـە ((رۆژی کوردو شەوی عەجەم[١٦])). یان لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ فەلەکانو لە کوشتنی مـار شـەمعوندا، بـە هـەرحاڵ سـەرباری لاوازی گوتـاری سمکـۆو بزوتنەوەکـەی دەبێ بە گرنگو بەهادار سـەیری ئـەم سـەرکردەو بزووتنەکـەی بکرێـتو وەکـو ئەوەی هـەبوو لێ بڕوانرێـت نـەك وەکـو بزووتنەوەیـەکی ناسیونالیزمی کـوردی سەیر بکرێت چونکە بزوتنەوەکەی سمکـۆ لـەڕووی مەسـەلەی نەتـەوەوە لاوازو بێ بەرنامە بووەو زیاتر ویستو ئارەزووی سمکۆ دەردەخات بـۆ سـەرکردایەتی لەبری ئەوەی وەکو سەرکردەیەك دەری بخات لەپێناوە نەتەوەکەیدا.

# سەرچاوەکانی بەشی ( ١٩ )

١- محەمەد رەسوڵ هاوار ـ سمکۆی شکاک و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد ـ سلێمانی ٢٠٠٥، ل٢٥٥.

٢- هەمان سەرچاوە ـ ل٢٥٥.

٣ـ دکتۆر جەمال نەبەز ـ شۆڕشەکانی کورد ـ وەرگێڕانی د. کوردۆ عەلی، ل١٢٤.

٤ـ حەسەن ئەرفەع ـ کوردەکان، وەرگێڕانی سەردار محەمەد ـ سلێمانی ل٨١.

٥ـ نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی ـ وەرگێڕانی: عەتا قەرەداخی، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٣٥.

6- David MacDowall – A Modern History of the Kurds,London,2000, p.215.

7- Ibid. p.216S.

لە مانگی شوباتی ١٩٢٥دا لە ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستانی (لکێندراو) تورکیادا ئاگری راپەڕینێك هەڵگیرسا. ئەو شارو شارۆچکانەی دامەزراوەی بەڕێوەبردنی تورکیان تیابوو، داگیرکران، کارمەندانی حکومەت گیران یان راونران، رابەرو پێشەوای ئەو راپەڕینە شێخ سەعید بوو کە شێخێکی نەقشبەندی خاوەن پلەو پایەو دیار بوو، لە ناوچەکەدا دەسەڵاتێکی بەربڵاوی هەبوو. ئامانجی ئاشکرای ئەو راپەڕینە دامەزراندنی کوردستانێکی ئازادو سەربەخۆ بوو[1] راپەڕینی شێخ سەعید لە شوباتی ساڵی ١٩٢٥دا دەستی پێکرد بە هێزێکی راپەڕیوی کوردەوە کە ژمارەکەی بە پانزە هەزار کەس دادەنرا[2] سەرباری ماوەی کورتی، راپەڕینی شێخ سەعید هێڵی جیابوونەوەی پەیوەندییەکانی تورکو کوردی کێشاو وای لە حکومەتی تورك کرد کە پێودانگێکی توندو تیژ دژی بڵاوبوونەوەی کەلتووری کوردیو ناسیونالیزمی کوردی لەبەر بگرێت[3] راستە بزووتنەوەی ساڵی ١٩٢٥ بە رێبەرایەتی شێخێك دەستی پێکرد بەڵام ئەو بزوتنەوەیە زۆرتر لەوەی شێخ سەعید ئارەزووی دەکرد یان دەیویست تێکەڵ بە بیروباوەڕی نەتەوەیی بوو، لەلایەن نیشتمانپەروەرانەوە پشتیوانی لێدەکرا[4] شێخ سەعید بۆ وەدەست خستنی پشتیوانی خەڵکی بەیاننامەیەکی دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیو گێڕانەوەی خەلافەت دەرکردو دواتریش بە راگەیاندراوێك یەکێك لە کوڕەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدی بە سوڵتانی کوردستان دانا(٥) لە راپۆرتەکانی نوێنەرانی سۆڤێت لە تورکیاوە دەردەکەوێت سەرکردەکانی راپەڕینەکەی شێخ سەعید لە مێژەوە خەریکی ئامادەکردنو رێکخستن بوون واتە پاش پەیمانی لۆزانو جێبەجێ نەکردنی پەیمانی سیڤەر بوو، کە هیچ داخوازییەکی گەلی کورد نەهاتەدی(٦) لەم چەند وتانەی سەرەوەدا گەوهەرو بەرنامەو ستراتیژو گوتاری راپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران ئاشکرا دەبێت. بێگومان ئەم راپەڕینە لە بارودۆخێکی ئاڵۆزی کوردستانو ناوچەکەدا سەری هەڵدا. کۆتایی هاتنی جەنگو هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەكو دەرکەوتنی سەرکردەی

ناسیونالیستی تورك كەمال مستەفا ئەتاتورك لەلایەكی ترەوەو هەڵوەشاندنەوەی بەندەكانی پەیمانی سیڤەری پەیوەست بە كوردو چارەنووسی كوردستان لە پەیمانی لۆزاندا باروبۆخێكی ناهەمواری لە كوردستاندا دروستكرد، بەتایبەتی نوخبەی رۆشنبیرو ناسیونالیستی كورد كەوتە بەردەم بەرپرسیارێتییەكی گەورەوە كە نەیدەتوانی بە ئاسانی چاو لەو ناهەقیانە بپۆشێت كە بە ئاشكراو لەشێوەی بەرنامەی دارێژراودا بەرامبەر بە نەتەوەكەی دەكرا.

لەلایەكی تریشەوە دەركەوتنی كەمال ئەتاتوركو هەستی توركێتی زیاتر جیاوازی توركو نەتەوەكانی تری بەكوردیشەوە نیشان دەدا. تاكە هوشیارەكانی كورد بە ئاشكرا ئەو جیاوازییانەیان دەبینی، لەلایەكی تریشەوە ئاراستەیەكی تری تێكەڵاو لە مەسەلەی نەتەوایەتی كوردیو مەسەلەی ئایینی ئاشكرابوو بوو، كەوای بۆ دەچوو كەمالیستەكان یان تێزی (توركی) مۆدێرن بەو ئەندازەی دژی دەسەڵاتی خەلافەت بوو، بەو ئەندازەش دژی دەوڵەتی ئایینییەو خوازیاری عەلمانیەتە، هەندێ لە كەسانی دیاری كورد كە زیاتر شێخو رابەرە ئاینییەكان بوون خوازیاری پاراستنێ بنەمای ئایینی دەوڵەتو گێرانەوەی دەسەڵاتی خەلافەت بوون چونكە پێیان وابوو سوڵتان كە جێگرەوەی خەلیفەی مسوڵمانانە نوێنەری هەموانە بەبێ جیاوازی زمانو ئیتنیك، كەسێتی شێخ سەعیدی پیران هەمان شێوەی كەسێتی شێخ عوبەیدوڵای نەهری مەسەلەی كوردو ئیسلامی دەبەست بەیەكەوە. بێگومان ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لەو باروبۆخەدا كە راپەرینی شێخ سەعیدی پیران دەستی پێكرد باروبۆخی كوردستان بە ئەندازەیەك ناجێگیر بوو كە دەشیا هەر هاندانێك یان هەر هەوڵێك بۆ دژایەتی كردنی دەوڵەتانی داگیركەری كوردستان بە توركو فارسو عێراقی تازە دروستكراویشەوە بە ئاسانی زۆرێك لە خەڵكی كوردستانی بجوڵاندایە بۆ بەرگریكردنو داواكردنی مافەكانیان كۆی

بکرێنایەتــەوە، ئەمـە ســەربارى سیاسـەتى دژو نادۆسـتانەى بـەریتانیا چ لـە باشوورى کوردستان چ لە پەیمان و ڕێکەوتنە نێودەوڵەتیەکاندا.

دیارە ڕاپەڕینەکەى شێخ سەعیدى پیران لەکاتێکدا بوو کە ئەو ئومێدەى ڕێکەوتننامەى سیڤەر دابووى بە کورد، ڕێکەوتننامەى لۆزان هەڵیوەشاندەوەو جارێکى تر کوردستانى بۆ زەبرو زەنگى دەوڵەتانى ناوچەکە بەجێهێشت، بەتایبەتیش بەهێزبوونى هەستى تورکایەتى و باڵادەستبوونى کەسێتییەکى ناسیونالیستى تورکى وەکو کەمال مستەفا زیاتر کوردەکانى بێ ئومێدکرد، چونکە ئەو کوردە مسوڵمانانەى کە پێشتر لەژێر سایەى دەوڵەتى خەلافەتدا هەستیان بە چەوساندنەوە دەکرد هێشتا پێیان وابوو کە ئەو دەوڵەتە لەڕووى ئاینییەوە دەوڵەتى ئەوانە، بەڵام هاتنى دەوڵەتى نوێى ناسیونالیستى عەلمانى تورک زیاتر ئەو گومانەى لاى کوردەکان دروستکرد کە ئەمان ڕابردوویان دۆڕاندووەو هەم لەڕووى ئایینى و هەم لەڕووى نەتەوەییەوە دەوڵەتى نوێى تورک دژو دوژمنى ئەمانە. تەنانەت سەربارى بەشێك لە نوخبەى ڕۆشنبیرى کورد، بەشێك لە ئەفسەرانى کورد لە تورکیا ئەو هەستەیان لا دروست بوو کە دەبێ هەرچۆن تورك پەیوەستبوون بە کەسێتى و بە ناسنامەى تورکێتى خۆیانەوە، دەبێ ئەمانى کوردیش بگەڕێنەوە بۆ نێو مێژووى کەلتورو بوون و ناسنامەى خۆیان، هەستکردن بە پێویستى بوونى جیاوازى، ئەو هەڵوێستەى دروستکرد کە ئەنجام ڕێکخراوێکى نەتەوەیى کوردى دروستبکەن بەناوى "جیهاتا ئازادى کورد" و دواتریش ئەم ناوەگۆڕا بۆ "جیهاتا (خۆسەریا کورد) واتە کۆمەڵەى سەربەخۆیى کورد یان ئازادى یان سەربەخۆیی[٣] دیارە ئەم ڕێکخراوە جێگاى بایەخ پێدانێکى زۆرە چونکە لە پشتى ڕاپەڕینەکانى پێشترى کوردەوە ڕێکخستن بوونى نەبووە، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات، ڕێکخستن کە یەکێکە لە خاسیتەکانى بزووتنەوەیەکى بەرنامە بۆ ڕێژکراو دەبێ جۆرێك لە پرۆژەى هەبێت و لەبرى کاردانەوەو کارى عەفەویانە بەپێى بەرنامەو پرۆژە کار بکات. ئەمە جگە لەوەى لە پێکهاتەى ڕێکخراوو حیزبدا ڕۆڵى کۆمەڵە خەڵك و

ئیشی بە کۆمەڵو بەرهەمی عەقڵی کۆو دەستەجەمعی دەردەکەوێت. ئەمە جگە لەوەی کە کاری ڕێکخستنو دروستکردنی ڕێکخراو وەکو بەرهەمی کاری نوخبەی خوێندەوار سەیر دەکرێت. ڕێکخراوی جیهاتا خۆسەریا کورد لەساڵی ١٩٢٢دا دامەزرا بەڵام ئەو کەسە کوردانەی کە پایەی سەربازییان هەبوو لە ڕاپەڕینی ٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٤ی (بەیتوشەباب)دا بەشدارییان کردبوو لە ڕاپۆرتەکانیاندا بۆ دەزگای هەواڵگری بەریتانیا گوتویانە ئەم ڕێکخراوە لەساڵی (١٩٢١)دا لە ئەرزەڕۆم دامەزراوە[8] بە هەر حاڵ ئەم ڕێکخراوە لە هەر کاتێکی پێش ڕاپەڕینەکەدا دروست بوویێت هیچ لە ڕۆڵو بایەخی ئەم ڕێکخراوە کەم ناکاتەوە لە ئامادەبوونیدا لە پشتی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیرانەوە. بەڵام بەپێچەوانەوە ڕۆڵی ئاشکرای ئەم ڕێکخراوە لە گەوهەرو ماهییەتی گوتاری ئەم ڕاپەڕینەدا دەردەکەوێت. تەنانەت ئەو ئەفسەرانەی کە لە چوارچێوەی ئەم ڕێکخراوەدا بوون بڕوایان وابوو کە بۆ سەرهەڵدانی هەر ڕاپەڕینێك لەلایەك هەستی نەتەوایەتیو لەلایەکی ترەوە بەشداری فراوانی جەماوەری خەڵکی کوردستان گرنگو پڕ بایەخە. هەر لەو ڕووەشەوە ئەم ئەفسەرانە بڕوایان وابوو کە کورد لەو قۆناغەدا گەیشتۆتە ئاستی ئامادەگی بەشداری کردنی لە ڕاپەڕیندا هەبێت، "ئەفسەرانی کورد دڵنیابوون کە تەواوی هۆزەکانی کورد بەهۆی هەستی نەتەوەییو ئایینییەوە پشتیوانی لە (ئازادی) دەکەن[9] لێرەوە دەگەینە ئەو بۆچوونەی کە ڕێکخراوی (جیهاتا خۆسەریا کورد) هەرچەند لە بارودۆخێکی ناهەمواری ژیانی کۆمەڵگای کوردیدا دامەزراوەو دڵنیایشین لەوەی کە لەو سەروەختەدا هەستی نەتەوەیی لە کۆمەڵگای کوردیدا لە ئاستێکی زۆر لاوازدا بووەو مەسەلەی خێڵایەتیو ئایینی بەتەواوی کۆنترۆڵی کۆمەڵگای کوردیان کردووەو بەو پێیەش گوتاری باڵادەست لە کۆمەڵگای کوردیدا گوتاری خێڵایەتی ئایینی بووە، بەڵام ئەم ڕێکخراوە لەبەر ئەوەی بەرهەمی عەقڵی نوخبە بووە بەجۆرێك پەیوەست بووە بە مەسەلەی کوردو کوردستانەوە، بۆیە گوتاری ئەم ڕێکخراوەیە بەشێکی دیار لە

رەگــەزەکانی گوتــاری نەتــەوەی کــوردی تێدایــە، ئێــستا ئــەو پرســیارە سەرهەڵدەدات ئایا تا چ ئاستێك گوتـاری ڕێکخراوی (جیهاتـا خۆسـەریا کـورد) بووەتە گوتاری ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران؟

پێش گەڕان بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا جێگای خۆیەتی ئاماژە بۆ چەند دیاردەیەکی تری سیاسی بکەین لە سنووری دەوڵەتی هەڵوەشاوەی عوسمانیو دەوڵەتی تازە دروستبووی تورکدا. ئێمە پێشتر گوتمان دەوڵەتی نوێی تـورکی کە لەسـەر دەسـتی کـەمال مـستەفا ئـەتاتورك دامـەزرا دەوڵـەتێکی نەتـەوەیی عـەلمانی تـورکی بـوو، هـەر بـەو پێیـەش دوو بنـەمای پێـشتر کـە دەوڵـەتی عوسمانی لەسەر بیناکرا بوو هەڵوەشانەوە کە یەکـەمیان بنـەمای ئـایین بـوو، ئەو ئیمپراتۆریێتە بریتی بوو لە ئیمپراتۆرێتێکی ئـایینیو خـۆی بـە جـێگیرەوەو درێـژەکراوەی دەوڵــەتی ئیـسلامی دەزانـی، دووەم بـەپێی چـەمکی ئـایینو پەیوەسـتبوون بـە بنــەماکانی ئیـسلامەوە ئـەو دەوڵەتـە دەوڵـەتێکی فـرە نەتـەوەیی بـوو. بـەڵام ئـەم دوو بنەمایـە هـەردووکیان لەگـەڵ دروسـتبوونی دەوڵـەتی نوێـدا هەرەسـیان پێهێنـراو ڕایـەڵی برایـەتی کـوردو تـورکیش لـەو ئاقەرەدا پچڕاو بەرەو تەواوبوون چوو. لەگەڵ کۆتایی هاتنی خەلافەتدا لەساڵی ١٩٢٤دا هێمای بانگەشەی برایەتی تورکو کورد هەرەسی هێنا، ئیتر دەتـوانرا حکومەتی تورك لە ئەنقەرە بە دوژمنو دژی ئایین ناوببرێتو بـە کـافر تاوانبـار بکرێتو ئەو هەنگاوانەی کە حکومەت لەو بوارەدا نای یارمەتی دەربوون بۆ ئەو تۆمەتبارکردنانە. ئەو بیانووە بـۆ گـەلێك کـوردی ئیمانـدارو بـڕوادار لـە هـەموو بیانوویـەکی تـر کاریگـەرتر بـوو، ئەگـەر ئـەو تۆمەتانـە ڕاسـت بـن، تـرس لـە ناسیونالیزمی کورد، هـانی حکومـەتی ئەنقـەرە دەدات کارێـك بکـات، پـشکۆی بیری ناسیونالیزمی کوردی. زیاتر بگەشێنێتەوە(١٠) دیارە ئـەم هەڵچوونەش چ لەلایەن دەوڵەتی ناسیونالیزمی تورکەوەو چ لەلایەن نوخبەی کوردەوە لـەپێش دەستپێکردنی ڕاپـەڕینی شـێخ سـەعیدی پیرانـدا بـوو، بـە واتـا لەلایـەك لەلومەرجی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵـەتی عوسمـانی ڕووخانـدنی ڕایـەڵی برایـەتی

ئایینی ئیتنیکە جیاوازەکانو لەلایەکی تریشەوە دەرکەوتنی ناسیونالیزمی تورکیو جێبەجێ نەکردنی خاڵە پەیوەستەکان بە کورد لە ڕێکەوتننامەی سیڤەرداو بەهۆی کاریگەری ناسیونالیزمی تورکییەوە دروستبوونی جۆرە هەستێکی لاوازی نەتەوەیش لای نوخبەی کورد، هەموو ئەمانە پێکەوە هۆکارو بزوێنەری راپەڕینەکەی شێخ سەعید بوون. لە هەمان کاتدا دەوڵەتی تازە دروستبووی ناسیونالیزمی تورکی لە قۆناغی یەکەمدا ئەو ئەفسەرە کوردانەی لە سوپا دەرکرد کە ئەندام یان لایەنگری (جیهاتا خۆسەریا کورد) بوون. شێخ سەعید خۆیشی لەبەردەم مەترسی گرتندا بوو چونکە یەکێك بوون لە لایەنگرانی گێڕانەوەی دەسەڵاتی خەلافەت. لێرەشەوە لەبەردەم پرسیارێکدا رادەوەستین ئایا ئەم هەڵوێستە تەنیا پەیوەندی بە خودی شێخ سەعیدەوە هەبوو یان دەشێ وەکو گوتاری تەریقەتی نەقشبەندی لەو قۆناغەدا لێ بڕوانین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا دەدەینەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بزانین نفوزی تەریقەتی نەقشەبەندیو خراپی پەیوەندی نێوان ئەم تەریقەتەو عەلەوییەکانیش پەیوەندییان بە بۆچوونەکانی شێخ سەعیدو راپەڕینەکەشیەوە هەیە.

راپەڕینەکەی شێخ سەعید کە لە ٨ی شوبات دەستی پێکردو لە سەرەتادا زۆر ناوچەی گرتەوە، بەلام لە ئەنجامدا سوپای تورك توانیان راپەڕینەکە دابمرکێننەوەو لە کۆتایی نیسانی هەمان ساڵدا هێزەکانی تورکیا هەموو ناوچەکانیان خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیانو شێخ سەعیدو نۆ کەس لە هاوکارە دیارەکانی دەستگیر کرانو درانە دادگای دەوڵەتو لە ٢٩ی حوزەیراندا لەسێدارە دران.

بێگومان ئەوەی دەبێ ڕێزی لێبگیرێت ئەوەیە کە شێخ سەعید بە تەمەنێکی زۆرەوە بە هەر پاڵنەرێك بێت وەکو سەرکردەیەکی کورد راپەڕین بەرپا دەکاتو ئەگەر راستەوخۆش پاڵنەری راپەڕینەکە هەستێکی ناسیونالیستانە؛ تەواو نەبێتو بەرگری کردن لە ئایینو گێڕانەوەی دەسەڵاتی خەلافەتیش لـ

هۆكاره گرنگەكانی ئەو راپەڕینە بنو لە هەمان كاتیشدا راپەڕینەكە لەبری هێزی جەماوەری هەموو كورد زیاتر پشتی بە هێزی خێڵو عەشیرەتەكانو بەتایبەتیش پشتی بە موریدەكانی شێخ خۆیی‌و موریدو لایەنگرانی نەقشەبەندی بەستبێت هێشتا ئەم بزوتنەوەیە بە بەشێك لە توخمو رەگەزەكانی كوردایەتی بارگاوی كراوەو هەر بەو پێیەش گوتاری ئەم بزوتنەوەیە هەڵگری بەشێك لە رەگەزەكانی گوتاری كوردی بوو سەرباری بالادەستی رەگەزی ئاینیی‌و رەگەزی خێڵایەتی لەو گوتارەدا، ئەمە جگە لەوەی كە یەكێك لە هۆكارە سەرەكییەكانی ئەو راپەڕینە لە بری پرۆژەو بەرنامە كاردانەوە بووە بەرامبەر بە هەڵوێستی توندی ناسیونالیزمی تورك‌و جێبەجێ نەكردنی بەندەكانی رێكەوتننامەی سیڤەر كە كورد ئومێدێكی زۆری لەسەر بنیادنابوو. رەنگە ئەو پرسیارەش جێگای خۆی بێت كە دەپرسێت بۆچی راپەڕینەكانی كورد هەر لە راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلای نەهرییەوە تاكو راپەڕینەكەی شێخ سەعیدو تەنانەت ئەوانەی دواتریش لە ماوەیەكی كورتدا هەرەسیان هێناوەو نەیانتوانییوە بەردەوامی بە خۆیان بدەن؟ بێگومان لە سادەترین لێكدانەوەدا دەتوانین بڵێین لەبەر ئەوەیە كە هیچ كام لەم راپەڕینانە خاوەنی بەرنامەو پرۆژەو گوتاری چەسپاو نەبوون، بەڵكو تێكەڵاوێك بوون لە كاردانەوەو لە تموحی دەسەڵاتی شێخایەتی‌و خێڵایەتی‌و ناوچەگەری‌و ئاینیی‌و بە گشتیش راپەڕینی قۆناغێكن لە مێژووی كورددا هەرچەندە ناوی راپەڕین‌و بزوتنەوەی نەتەوەییان لێنراوە بەڵام بەگشتی راپەڕینی سەردەمی غیابی ناسیونالیزمی كوردین، هەر بۆیە نەبوونەتە هەڵگری گوتاری نەتەوەیی كوردی، هەرچەندە دەزانین كە بەشێك لە رەگەزو توخمەكانی گوتاری نەتەوەییش چوونەتە نێو گوتاری ئەم راپەڕینانەوە. هەر بە هەمان پێودانگو بە پشت بەستن بە تێڕوانین‌و كاركردن‌و هەڵوێستی شێخ سەعیدو راپەڕینەكەی دەتوانین بڵێین ئەم راپەڕینەش نەبۆتە هەڵگری گوتاری كوردی، بەو پێیەی كە هەڵگری پرۆژەی كوردی نەبووە. بە واتایەكی دی گوتاری ئەم راپەڕینە هەڵگری فیكرو

مەعریفەی ناسیونالیزمی کوردی نەبووەو بارگاوی نەکراوە بە فیکرو مەعریفەی جیاکردنەوەی کورد لە رەگەزو ئیتنیکە مسوڵمانەکانی ترو کۆکردنەوەی هەموو جەماوەری کوردیو ئاڕاستەکردنیان لەپێناوی یەکگرتنەوەو سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی کوردیدا.

# سەرچاوەکانی بەشی (٢٠)

1- Martin Van Brunssin: Agha, Shaikh and state ZedBooks, 1992, p265.

2- Robert Olson. The Emergence of Kurdish Nationalism, and Sheikh Said Rebllion, (1925)- Austin – Tx University of Texas press – 1989 p.107.

٣- نادر ئینتیسار - ئیتنۆنەتەوایەتی کورد ــ وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٨٣.

4- Robert Olson – The Emergence of Kurdish, Nationalism, p.26.

5- David Macdowall- A Modern History of the Kurds, London, 2000, p.194.

٦- دکتۆر ئەفراسیاب هەورامی - شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانو سۆڤێت سلێمانی ٢٠٠٢، ل٨.

7- Martin Van Bruinessen – Agha, Shaikh and state, ZedBooks, London, 1992, p302.

8- Ibid p.

9- Robert Olson – The emergence of Kurdish Nationalism, p.47.

10- Martin Van Brinessen- Agha, Shaikh and state p.284.

کاتێ دەربارەی ڕاپەڕینی ئاگری داخی ١٩٣٠ دەدوێین دەبێ ڕۆڵی کاریگەرو لەبەرچاوی ئیحسان نوری پاشا لەلایەکو دامەزراندنی (خویبوون) لەلایەکی ترەوە لەبەرچاو بگرین و بەرنامەو پرۆژەو جوڵەو گوتاری هەریەکەیان بخەینە بەردەم لێدوانەوەو لەسەر ئەو بنەمایەش هەوڵی دیاریکردنی خاسیەتەکانی گوتاری ڕاپەڕینی ئاگری داخ بدەین.

ئیحسان نوری پاشا ساڵی ١٨٩٢ لە شاری بەدلیسی باکوری کوردستان لەدایك بووەو هەر لەو شارە خوێندوویەتی و پاشان بۆ خوێندن چووەتە ئەستەمبوڵ و دواتر چووەتە ریزی سوپاوەو تا گەیشتۆتە پلەی جەنەراڵ. لە ئەنجامی شکستی ڕاپەڕینەکەی بەیتوشەباب دا ئاودیوی سنووری عێراق دەبێت. بەڵام دواتر لە ڕاپەڕینی (ئاگری داخ) وەکو سەرکردەو ڕێبەرێکی دیاری ئەو قۆناغە دەردەکەوێت.. ئیحسان نوری پاشای کونە ئەفسەری لەشکری تورکیا کە لە ڕووداوی بەیتوشەباب دا یاخی بوو بوو، بە فەرماندەی گشتی لەشکری نیشتمانی کوردستان دامەزرا[1] ئیحسان نوری دوای تێکشکانی یاخی بوونی بەیتوشەباب لە عێراق خۆی پەنادا تا (ئەیلول ١٩٢٤)، پاشان هاتە ئێران، لەمیانەی یاخی بوونی شێخ سەعیددا چووە تورکیا، بەڵام گەڕانەوەی هاوکاتی تێکشکانی یاخی بوون بوو، جارێکی دیکە گەڕایەوە ئێران[2].

لە کۆتایی هاوینی ١٩٢٧دا بانگهێشت کرا بۆ کۆنگرەی خۆیبوون.. بەڵام ئیحسان نوری لە نامەیەکدا شێخ عەلی رازەیی کوڕی شێخ سەعیدی پیرانی بە نوێنەری خۆی داناو چووە ئارارات[3] ئیحسان نوری کۆمەڵەیەکی بچووکی لە کەسانی مەشق پێکراوو شارەزایی چەکی مۆدێرن و تاکێکی شەڕی کۆکردەوەو بردنیە ئارارات تا پەیوەندی بەو خێڵانەوە بکەن کە پێشتر لەوێ سەنگەریان گرتبوو[4] ئیحسان نوری ئەفسەرێکی پێشتری سوپای تورکی بوو کە سەرکردایەتی ڕاپەڕینی ئاگری داخی کرد[5]. بێگومان ئێستا ژیان و کەسێتی ئیحسان نوری پاشامان بۆ دەرکەوت کە ئەفسەرێکی بە رەگەز کورد بووەو لە

سوپای تورکدا کاری کردووەو لەسەردەمی دەرکەوتنی ناسیونالیزمی تورکیو دەرکەوتنی مستەفا کەمالدا ئەم لە ریزی سوپادا بووەو یەکێك لە ئەفسەرە هاوکارەکانی ئەو بووە. لە مانگی ئابی ساڵی ۱۹۲٤دا ئیحسان نوریو رەزای برای یوسف زیاو بەگو.. بە مەبەستی سزادانی ئاسورییە نەستورییە سەرکێشە یاخی بووەکانی هەکاری نێردران، کە سەرپێچیان لە ئەنجامدانی فەرمانەکانی حکومەتدا دەکرد(٦) ئیحسان نوری بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی سەرەوەی خۆی دەچێتە ئەو ناوچەیە ئەگەرچی باسی ئەوە دەکرێت کە هەوڵو تەقەلایەك بۆ راپەرین لەکاتێکی دواتردا لە ئارادا بوبێت، بەڵام نکوڵی ئەوە ناکرێت کە ئەم کەسێتیە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەربازی خۆی بەپێی فەرمانی دەوڵەت هەڵسوڕاوە ئەمەش لەبەردەم ئەو پرسیارەدا رامان دەگرێت ئایا ئەو ئاسورییە نەستوریانە لەسەرچی راپەریوونو لەبەرچی دەبێ سزا بدرێنو تەمێ بکرێن؟ بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارانەش ئاسانە چونکە ئەمانە لەگەڵ ئەوەی داوای مافی رەوای خۆیان کردووە دەوڵەتی ناسیونالیزمی تورك هەوڵی سەرکوتکردنی داون، بۆ ئەو مەبەستەش ئیحسان نوری پاشاو رەزای برای یوسف زیا دژیەكو ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی نێو سوپای تورکی بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژێردراون. دیارە ئەم هەڵبژاردنەش لەخۆوەو بێ ئامانج نەبووە. بەڵکو هەوڵێکی تر بووە بۆ دروستکردنی ناکوکیو ئاژاوە لەنێوان کوردو ئاسورییە نەستورییەکاندا، هەمان شێوەی تاوانبارکردنی کورد لە کوشتاری ئەرمەندا. بەڵام ئایا دەبێ هەستو هوشیاری ئیحسان نوریو ئەو ئەفسەرە کوردانەی تری لەگەڵیدا بوون لەو ئاستەدا بوو بێت کە پەی بەو راستییە ببەن یان بێ بیرلێکردنەوە وەکو ئەفسەرێکی دڵسۆزی دەوڵەت رێگای جێبەجێ کردنی فەرمانی سەرەوەیان گرتۆتەبەر.

بە هەر حاڵ دوای گەیشتنی ئەو هێزە سەربازییە بۆ ناوچەی ئاشورییە نەستورییەکان بەمەبەستی سەرکوتکردنو سزادانیان لەپای ئەو یاخی بوونەی کە ئەنجامیان دابوو.. کاتێك دەگەنە بەیتوشەباب لەرێگای جفرەوە

بروسکەیەکی یوسف زیایان پێدەگات کە تیایدا سەرنجو بۆچوونەکانی خۆی بۆ نووسیوون، ڕەزای برایو ئەفسەرە کوردەکانی تر بە هەڵە لە مەبەستەکانی گەیشتبوونو وای لێ تێگەیشتبوون کە ئەوە نیشاندانێکە بۆ ڕاپەڕینی گشتی. بۆیە لەوێ ڕاپەڕین(٧) بەلام دیارە بەدحاڵی بوون لەو ڕاپەڕینەدا هەبووەو ئەم هێزە سەربازییەی کە ئیحسان نوری پاشا فەرماندەیی دەکردن هەرچەندە چەکو تەقەمەنی باشیان پێبوو بەلام بەزوویی لەبەردەم هێزەکانی سوپای تورکدا تێکشکانو پاشان ئیحسان نوری پاشا ناچار بوو بەرەو عێراق رابکات.

ئەگەر تا چرکەساتی ڕاپەڕینەکە بوونی ئیحسان نوری پاشا لەنێو سوپای تورکدا وەکو ئەفسەرێکی دیار جێگای قسەکردن بێتو وەها لێی بڕوانرێت کە مەیلداری بەرنامەو پرۆژەی پان تورکێتی مستەفا کەمال بوویێت، ئەوا لە چرکەساتی ڕاپەڕینی خۆیو ئەو ئەفسەرو سەبازە کوردانەی کە لەگەڵیدا بوون لە بەیتوشەباب هەموو ئەو گومانانە دەڕەوێنەوەو هەڵوێستی ئیحسان نوری دەبێتە هەڵوێستی کوردێکی ناسیونالیستو لەنێو پرۆژەو ستراتیژی تورکێتییەوە دەگەڕێتەوە بۆ نێو ڕوویەرێکی تر کە ڕوویەری کوردایەتیو کوردبوونیەتی کە ئەوەش بەگوێرەی ئەم کەسێتییە هەنگاوێکی گرنگو پڕ بایەخەو دەشێ وای لێ بڕوانین ئەوە چرکەساتێکە کە تیایدا مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ نێو بوونو بنەمای ئەنتۆلۆژی خۆیو لەوێڕا هەست بە پێویستبوونی جیاوازی ناسنامەو جیاکردنەوەی خۆی لەوانی تر دەکات، لێرەوە هەڵوێستی ئیحسان نوری لەڕووی جەسەدیو ئامادەبوونی خودی خۆیەوە دەبێتە هەڵوێستێك کە لەسەر جوگرافیای نەتەوە ئامادە دەبێتەوەو لەڕیشەوە بوونی ئەو بەرەگەزەکانی گوتاری کوردی لەڕووی هەڵوێستو جوڵەو کارکردنەوە بارگاوی دەکرێت، بەلام ئایا لەڕووی فیکرو مەعریفەو جیهانبینیو ستراتیژی نەتەوەیی کوردەوە لەکوێدا بووە؟ ئایا گوتاری ئیحسان نوریو ڕاپەڕینەکەی گوتاری نەتەوەیی کوردی بووە؟

بێگومان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دەبێ باس لە مەسەلەیەکی تریش بکەین ئەویش کۆمەڵەی یان حیزبی (خۆیبوون)ە چونکە زۆرێك لەوانەی لەسەر راپەرینی ئاگری داخ قسەیان کردووە پێیان وایە کە ئەم حیزبە لەپشتی ئەو راپەرینەوە بووە. ئەگەر ئەمەش بسەلمێنرێت ئەو راپەرینی ئاگری داخ دەبێتە راپەرینێك کە حیزبو رێکخستن لە ئامادەکردنو رێکخستنو رێو شوێن بۆ دانانیدا دەوری بینیبێت بەشێکی دیار لە نوخبەی کوردی دیارو بەئاگا لەدوای تێکشکاندنی راپەرینەکەی شێخ سەعیدی پیران ناچار بوون کوردستانو تەنانەت پایتەختی دەوڵەتی تورك بەجێبهێڵن.. ژمارەیەك لەم کوردە ئاوارەو دوورخراوانە لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٧دا لە (بحەمدون)ە لە لوبنان کۆبوونەوە بە مەبەستی دامەزراندنی حیزبی خۆیبوون، ئەمانە ئومێدی ئەوەیان هەبوو خۆیان لە هەڵەکانی پێشتر بەتایبەتی دەستەگەریو ناکۆکیەکانی پێشتر بپارێزن کە هەوڵو کۆششی هەمووانی بەفیڕۆ دابوو[٨].

ــ راپەرینی ئاگری داخ لەلایەن دەستەیەك لە رووناکبیرانی کوردەوە پشتگیری دەکرا کە دوورخراوەی پایتەختەکانی سوریاو لوبنان بوونو رێکخراوێکی نوێیان بە ناوی (خۆیبوون)ەوە بۆ سەربەخۆیی کورد دامەزراندبوو[٩].. لە ئابی ١٩٢٧ دوای یەك دوو ساڵ بەرنامەدانان ژمارەیەك لە هەڵسووڕاوە سیاسییەکانی کورد بۆ پێکهێنانی رێکخراوێکی نەتەوەیی لە (بحەمدون)ی لوبنان کۆبوونەوەو لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە هەموو رێکخراوە نەتەوەییەکان هەڵبوەشێننەوە بە مەبەستی دامەزراندنی رێکخراوێکی سەرانسەرییو درێژەدان بە خەبات تا وەدەرنانی دوا سەربازی تورك لە سنوورەکانی کوردستانو دروستکردنی فەرماندەییەکی گشتی کوردو رێکخستنی عەسکەریی هێزەکانو چەکدارکردنیان[١٠].

بێگومان ئەگەر سەرنجی شێوەی پێکهاتنو راوبۆچوونی رێکخراوی خۆیبوون بدەین بەراورد بە راپەرینەکانی پێشتر دەبینین جۆرێك لە بەرنامەی کارکردنی هەبووە کە ئەمەش خاڵێکی گرنگە لە چاو ئەو بارودۆخە دواکەوتووەی ئەو

کاتەی کوردستان‌و لاوازی هەستی نەتەوەیی‌و ئامادەنەبوونی ناسیونالیزمی کوردیدا، راستە ئەو نوخبەیەی کە (خۆیبوون)یان دروستکردووە تاکە ناسیونالیستەکانی ئەو کاتەی کوردبوون، بەلام ئەوەش بۆ خۆی مایەی قسە لەسەر کردنە ئایا لە نەبوونی ناسیونالیزمدا تاك یان نوخبەی بە ژمارە کەمی ناسیونالیست چی پێدەکرێت.

ئەگەر سەرنج لەناوی رێکخراوی (خۆیبوون) بدەین ئەوە هەلبژاردنی ئەو ناوەیە لە روانگەی مەسەلەی ناتەوایەتی کوردییەوە ئەو دەلالەتە هەلدەگرێت کە کورد لەو چرکەساتە مێژووییە بەدواوە پێویستی بەوەیە کە چیتر پەیوەست نەبێت بەئەوانی ترەوە بەلکو دەبێ بگەرێتەوە بۆ نێو بوونی خۆی‌و پەیوەست ببێت بەخۆیەوە لەو لە روانگەیەوە کە پەیوەستبوون بەخۆوە هەنگاوی یەکەمە بۆ هەولدان بۆ خۆناسین‌و خۆجیاکردنەوەو بەدەستهێنانی شوناسی تایبەتی بەجۆرێك کە جیاواز بێت لە شوناسی ئەوانی تر، ناوی (خۆیبوون) لە گەوهەردا هەلگری ماناو دەلالەتی ناسیونالیزمانەیە، هۆکەشی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە نوخبەی خوێندەواری ئاوارەو دوورخراوەی کورد لە زێدو نیشتمان دروستیان کردووە، ئەوە ئاشکرایە کە دووری لە زێدو نیشتمانەوە زۆر جار هەستی نۆستالجیای مرۆڤ دەبزوێنێت‌و بەهێزی دەکات بە جۆرێك کە لە رووکەشدا وەکو ناسیونالیست دەری دەخات بەلام لە گەوهەردا ئەو پەیوەستبوونە بە زێدو نیشتمانەوە پەیوەتسبوونێکی ئەنتۆلۆژیانەیە بەندە بە بوونی مرۆڤەوە لەسەر خاك وەکو زەمینەی لەدایك بوون.

بە هەر حال ئەوەی جێگای بایەخە ئەوەیە کە رێکخراوی خۆیبوون لە بەرنامەی کاریدا سیمای رێکخراوێکی ناسیونالیزمی هەیە کاتێ باسی دروستکردنی یەك رێکخراوی سەرتاسەری بۆ کوردستان دەکات‌و لەوە دەدوێت دوا سەربازی تورك دەبێ لەسەر خاکی کوردان نەمێنێت‌و فەرماندەی گشتی بۆ راپەرین پێشنیار دەکات‌و لەوەش دەدوێت کە پەیوەندی باش‌و دۆستانە لەگەل دەولەتانی دەوروبەردا دروست بکات. لەم خالانەوە دیدو تێروانینی

(خۆیبوون) یان ئاشکراتر بڵێین گوتاری خۆیبوون دەردەکەوێت کە هەرچەندە رەهەندەکانی تێروانینی بۆ سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی کوردستانی دابەش کراو دروستکردنی دەوڵەتی کوردی دیار نییە، هەرچەندە ئەوە ئاشکرا نییە ئایا دەیەوێت تەنیا باکوری کوردستان رزگار بکات و دەسەلاتی سەربەخۆی کوردی لەو بەشەدا دابمەزرێنێت یان مەبەستی هەموو کوردستانی گەورەیە، بەلام هێشتا بەشێوەیەکی سادە بەشێك لە رەگەزەکانی گوتاری کوردی کە مەبەستمانم گوتاری سیاسی نەتەوەیی کوردە ئامادەبوونی هەبووە.. کۆمەڵەی خۆیبوون حیزبێکی سیاسی بوو کە بەرنامەو پەیرەوی ناوخۆی هەبوو، هەر ئەندامێکی ئەم رێکخراوەیە سوێندی برایەتی دەخوارد کە بەڵێن بدات بەدرێژەدان بە خەبات لەپێناوی یەکێتیی کورددا بەگشتی و لەپێناوی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆدا[11] سەرۆکی راپەرینی ئارارات ئیحسان نوری پاشا بوو کە نیشتمانپەروەرێکی دیاری کورد بوو، کۆمەڵەی (خۆیبوون) ناردی بۆ ناوچەی راپەڕین بە سیفەتی نوێنەری سەربازی [12].

لێرەوە بە ئاشکرا پەیوەندی ئیحسان نوری پاشاو خۆیبوون و راپەڕینی ئارارات ئاشکرا دەبێت و ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت کە گوتاری خۆیبوون و گوتاری راپەرینی ئارارات هەمان گوتارە کە بڕیارو ناوبانگی راپەرینەکەو ئیحسان نوری پاشایش هاوشانی یەکترو پێکەوە دەناسرێن و دەبینرێن، بە واتایەکی دی ئیحسان نوری پاشا وەکو سەرکردەی راپەرینەکە کە بەپێی بەرنامەو پەیرەوی خۆیبوون هاتۆتە مەیدانی کار هەوڵیداوە بەپێی ئەو بەرنامەیە سەرکردایەتی راپەرینەکە بکات. هەرچەندە ئالۆزی بارودۆخەکەو دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردی لەو قۆناغەداو نەبوونی ناسیونالیزمی کوردی و بالادەستبوونی عەقڵی خێڵ و ستراتیژی خێڵ و ئالۆزی پەیوەندی نێوان خێڵەکانی کورد و دەوری دەوڵەتی نوێی تورکیش لەلایەکی ترەوە بۆ زیاتر فراوانکردنی رووبەری ناکۆکی کۆمەلایەتی نێو پێکهاتەی کۆمەڵگا کوردی ئەوکاتەو لە هەمان کاتیشدا مەیلی بەزیندوویی مانەوەی بەشێکی دیار لە

نوخبەو سەرخێڵو جەماوەری مسوڵمانی کورد بۆ دەوڵەتی تازە هەڵوەشاوەی عوسمانیو خەونبینین بە زیندووکردنەوەی ئەو دەڵەتەوە.. هەموو ئەمانە کاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر بزوتنەوەکەی ئیحسان نوری پاشا هەبووە. ئەمە سەرباری هاوڕاییو یەکدەنگی دەوڵەتی تورکو فارس لەسەر ئەم راپەڕینەوەو هەموو راپەڕینەکانی تری کورد. کە ئەوکاتەی راپەڕینەکەی ئیحسان نوری پاشا لە ئاستی خۆڕاگرتنو بەرگری کردندا بوو، فارسەکان رێگایان بۆ تورکەکان خۆشکردبووە کە لە سنووری ئەوانەوە زیاتر فشار بخەنە سەر هێزی راپەڕیوو، هەروەك هەندێ بۆچوونی لەو جۆرەش هەیە لە گوایە سوپای سووری سۆڤیێتیش یارمەتی سوپای تورکی دابێت بۆ کۆتایی پێ هێنان بە راپەڕینەکە[١٣].

هەموو ئەم هۆکارانەو لاوازی هێزی کوردیش لەڕووی بەرنامەو عەقڵی سیاسیو عەقڵی سەرکردایەتیەوەو نەبوون یان لاوازی توانای سەربازیو داراییو لەسەرووی هەموشیانەوە نەتوانینی راپەڕینەکە بۆ گواستنەوە لە راپەڕینی شێوە خێڵایەتی خێڵی جەلالییەوە بۆ راپەڕینێکی جەماوەری بەربلاو کە بەلایەنی کەمەوە کوردی باکوری کوردستان بەشداری تێدا بکەن، ئەمەش لە پلەی یەکەمدا نەبوونی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردە لەو قۆناغەدا بە پرۆژە، بەڵکو زیاتر لەسەر شێوەی بنەمای کاردانەوە یان بەرگری ناچارییانە بووە. ئەمەش دەمانگەیەنێت بەو ئەنجامەی کە گوتاری راپەڕینی ئارارات سەرباری جیاوازی لە راپەڕینەکانی پێشتر کە رێکخراوێکی وەکو (خۆیبوون) لە پشتی بووە کە خۆی وەکو رێکخراوێکی نەتەوەیی بەرفراوان ناساندووە کە هەموو رێکخراوەکانی پێشتری هەڵوەشاندوەتەوە خۆی لەجێگای هەموویانو لەجیاتی هەموویان نیشانداوە، بەڵام هێشتا ئەم راپەڕینە نەبۆتە راپەڕینێك کە ناسیونالیزمو پرۆژەی ناسیونالیزمی کوردی لە پشتییەوە ئامادەبوونی هەبوبێت بەو ئەندازەی کە راپەڕینی نوخبەیان سەرکردایەتی ناسیونالیزم بووبێت. بە واتا گوتاری ئەم راپەڕینە رەنگدانەوەی سروشتو سیمای خودی

راپەڕینەکەو کۆمەڵگای کوردی ئەو سەردەمەیە کە کۆمەڵگایەك بووە هێشتا لە دواکەوتووترین باری خێڵایەتیدا ژیاوەو مەسەلەی نەتەوایەتی لە دەرەوەی سنووری عەقڵ‌و بەرنامەی جەماوەریی کارکردن بووە. هۆی کورت تەمەنی‌و بەتەواویش شکست هێنان‌و سەرهەڵنەدانەوەی ئەم راپەڕینەو بەشی هەرە زۆری راپەڕینەکانی تری کورد پەیوەندی بەو باری دواکەوتن‌و ئامادەنەبوونی ناسیونالیزم‌و گوتاری نەتەوەییەوە هەیە. بێگومان شکستی راپەڕینی ئاگری داخیش لە پلەی یەکەمدا پەیوەستە بە هۆکاری ناوخۆی کۆمەڵگای کوردییەوە لەکاتێکدا سەرکردەیەکی ناسیونالیست وەکو هەڵگری گوتاری نەتەوەیی دەردەکەوێت‌و هەوڵدەدات بەپێی تێڕوانینی خۆی نەتەوەکەی بەرەو ئازادی‌و دروستکردنی دەسەڵاتی سەر بەخۆی نەتەوەیی رابەرایەتی بکات، خودی کۆمەڵگا لەڕووی پەرەسەندن‌و هوشیارییەوە ئەو ئامادەبوونەی نییە بۆیە لە زووترین کاتدا ئەم راپەڕینە تێکدەشکێت لەدوای خۆشییەوە جگە لە تراژیدیای شکست‌و بێ ئومێدی شتێکی ئەوتۆ بۆ کورد بەجێناهێڵێت، ئەگەر راپەڕینی ئاگری داخ خاوەنی گوتاری سیاسی نەتەوەیی کورد بوایەو لەسەر ئاستی جەماوەری ئەو گوتارە شوێن‌و پێگەی هەبوایە، ئەوا تەنانەت ئەگەر راپەڕینەکەش دووچاری شکست بهاتبایە، ئەوە گوتاری راپەڕینەکە بە زیندوویی دەمایەوە واتە ئەگەر گوتاری راپەڕینەکە بەفیکرو مەعریفەو جیهانبینی نەتەوەیی کورد بارگاوی بکرایە ئەوا بە ئاسانی لەنێو نەدەچوو. ئەوە ئاشکرایە کە راپەڕینی ئاگری داخ یان ئارارات لەسەر وەختی خۆیدا بڵاوکراوەیەکی دەرکردووە بەناوی (ئاگری) کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی رووداوەکانی ئەو ناوچەیەو ئامانجەکانی راپەڕینەکەشی لە ئەستۆگرتووەو داوای لە خەڵکی کورد کردووە کە یەکگرتووبن لە خەباتدا لەپێناوی سەربەخۆیی‌و رزگاربوون لە چەوساندنەوەی دەستی تورکەکان. بە واتا راپەڕینی ئاگری داخ بڵاوکراوەی هەبووە دەشیا گوتاری ئەم راپەڕینە وەکو

گوتـارێکی جـەماوەری لـەڕێگای ئـەو بڵاوکراوەیـەوە بگەیـشتایە جـەماوەرو بزوتنەوەیەکی جەماوەری لەخۆی کۆبکردایەتەوە.

ڕێکی بخستنایەو بیخستنایەتە جووڵـە، بـەڵام دیـارە خـودی گوتارەکـە لـە بنەڕەتدا گوتـارێکی لاواز بـووە بۆیـە نـەیتوانیووە لـە هـیچ ڕێگایەکـەوە ببێتـە گوتارێکی جەماوەری کاریگـەر ــ بـە واتـا نـە گوتارەکە بەتـەواوی بـە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی نەتەوەیی بارگاوی کراوە نـە جـەماوەریش لـەو قۆناغـەی کوردستاندا ئامادەگی ئەوەی هەبووە ببێتە بزوتنەوەیـەکی چالاکو لـە دەوری گوتارێکی دیاری سەرانسەرگیری هەمەلایەنە کۆببێتەوە.

## سەرچاوەکانی بەشی (٢١)


١ـ کاوە بەیات ــ شۆڕشی ئاگری داغ ــ وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو ــ سلێمانی ـ (٢٠٠٠) ـ ل٢٥.

٢ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ٢٦.

٣ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢٦.

4- David MacDawall – A Modern History of the kurd, London, 2000, p-204.

٥– نادر ئینتیشار ـ ئینتۆنەتەوایەتی کوردی ــ وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی سلێمانی ـ ٢٠٠٥ ـ ل١٨٢.

6- Martin Van Bruinessen – Agha, Shaikh and state, Zedbook, London, 1992, p.283.

7- Ibid, p284.

8- David Macdowall – A Modern History of the kurds, London, 2000, p-203.

٩– نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی ـ ل١٨٤ز

١٠– کاوە بەیات ـ شۆڕشی ئاگری داخ ـ ل٢٤.

١١ـ م.س.لازاریف و آخرون ــ تأریخ کوردستان ــ ترجمة الدکتور عبدي حاجي ـ أربیل ـ الطبعة الأولی ٢٠٠٦ ـ ص٢٢٦.

١٢ـ المصدر السابق ص٢٢٧.

١٣ـ مذکرات الجنرال إحسان نوري پاشا (١٩٢٦ـ١٩٣٠) ترجمة صلاح بروراي ـ بیروت، ١٩٩٠ ص١٠٤.

شێخ عەبدولسەلام چەندین جار ئالاّی دژایەتی عوسمانی هەڵکردو لەدژی والی موسڵ راپەڕی[1] دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ بارودۆخەکان بەتوندی بەرەو خراپی ڕۆیشتن، لەلایەك شێخ عەبدولسەلام بارزانی بەچاوی ترس‌و نەفرەت سەیری رژێمی نوێ‌و خوانەناسی دەکردو لەلایکی تریشەوە دەوڵەتی تازە لەسەر ئەوە سووربوو کە کەسانی وەکو ئەو ناچار بکات باج‌و خەراجی خۆیان بەرێك‌و پێکی بدەن[2] کریس کۆچێرا لەبارەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانییەوە دەڵێت: شێخ عەبدولسەلام ئەو پیاوە بوو کە یەکەم بەرنامەی بۆ بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی نووسی‌و تیایدا لیستێکی تەواو پڕ وردەکاری لە داواکارییەکانی کورد پێشکەش کرد کە پاڵپشتی بەرەسمی بوونی زمانی کوردی لە پێنج قەزا (شار)ی کوردیدا دەکرد، لەگەڵ پاڵپشتی کردنی زمانی کوردی لە خوێندنداو دامەزراندنی کارمەندانی کوردو قازی سەر بە مەزهەبی شافیعی‌و هەڵوەشاندنەوەی باج کە پێچەوانەی شەریعەتەو بەکارهێنانی ئەوەی لە باج کۆدەبێتەوە لە دروستکردن‌و چاك کردنی رێگاویان لە ناوچە کوردییەکان شێخ ئەم بەرنامەیە لەساڵی ١٩٠٨دا دەنێرێت بۆ حکومەت‌و پەرلەمانی عوسمانی[3] لەساڵی ١٩١٤ لە لوتکەی رووداوەکانی بەتلیس دا روویەرێکی گەورەی کوردستانی عێراق کەوتە ژێر دەسەلاّتی کوردە راپەریووەکانەوە کە شێخ عەبدولسەلامی بارزانی سەرکردایەتی ئەو راپەرینەی دەکرد[4]. کاتێ شەڕی یەکەمی جیهانی.. راگەیەندرا شێخ عەبدولسەلام رەفزی کرد کە سەرباز لە لایەنگرانی خۆی بداتە سوپای عوسمانی، هەروەك رەفزی کرد باج بدات[5] شێخ عەبدولسەلام بەشێوەیەکی خێرا وەکو رابەرێکی ئایینی‌و نیشتمانی لە یەك کاتدا دەرکەوت[6].

بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە شێخ عەبدولسەلامی بارزانی لە هەمان ئەو مێژووەدا ژیاوەو تێکەلاّوی رووداوە سیاسییەکان بووە کە ساتەوەختی بەرەو شکست‌و دارمانی دەوڵەتی عوسمانی بوو، هەرچەندە تورکەلاوەکان ئومێدی گۆڕانکاری دەستووریان هەبوو، بەشێك لە منەوەرە کوردەکانی ئەو سەردەمە

ئومێدی ئەوەیان هەبوو کە لەسایەی گۆڕانکاری دەستووری تورکە لاوەکاندا کوردیش سوودمەند ببێت، بەڵام شێخ عەبدولسەلام لەسەرویەری ئەو شۆڕشەدا داواکارییەکانی خۆیی بەرزکردەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بە پێچەوانەی بەشێك لە کەسانی دیاری ئەو سەردەمەی کوردەوە شێخ عەبدولسەلام ئومێدی لەسەر گۆڕانکاری لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەڵنەچنیبوو، هەر ئەوەش وا دەکات لەو کاتەدا کە هەست دەکات دەوڵەت لاوازە ئەم داواکارییەکانی بەرز دەکاتەوە.

دەشێ یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ناکۆکی شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨و تورکە لاوەکاندا ئەوە بێت کە تورکەلاوەکان لایەنگری زیاتری عەلمانیەت بوونو شێخ عەبدولسەلامیش وەکو زۆر کوردو تورکی مسوڵمانی تر ئەوەی بە لادان لە ئیسلام زانیبێتو ئەوەش شان بەشانی هۆکاری نەتەوەییو هەستی نەتەوەییو هۆکاری تەسەوفو پابەندبوونی بە ڕێبازی تەسەوفی نەقشەبەندییەوە بووبێتە هۆی دژایەتی کردنی دەوڵەتو داواکانی خۆیی بۆ جۆرێك لە دەسەڵاتی کوردی بەرز کردبێتەوەو پاشانیش بەدژی والی موسڵ ڕاپەڕی بێت. دیارە ئەوەی کە جێگای بایەخە شێخ عەبدولسەلام خاوەنی جۆرێك لە بەرنامە بووە، وەکو کریس کۆچێرا دەڵێت، بەرنامەکەی لە چەند خاڵێکی گرنگ پێکهاتووەو ئەویش لە پلەی یەکەمدا بەرنامەیەکی نەتەوەیی کوردییەو لە ئاستی دووەمیشدا بەرنامەیەکی ئیسلامییە لەڕوانگەی کوردێکی سوونی شافیعییەوە کە لە هەمان کاتیشدا موریدی یەکێك لە هەرە دیارترین ڕێبازەکانی تەسەوفە لە کوردستاندا کە ئەم ڕێبازەش لە گەوهەردا دژی دەسەڵاتی ناوەندی خەلافەتو لەلایەکی تریشەوە نزیکی هەیە لەنێوان پرەنسیپەکانی ڕێبازی نەقشەبەندیو هەستی نەتەوایەتی کوردیدا[٧] لێرەشەوە دەشێ ئەو هەڵوێستەی مەولانا خالید کە پێدەچێت ویستبێتی لەڕێگای تەسەوفەوە پەیوەندی لەنێوان کوردبوونو ئیسلامبووندا بەجۆرێك ئاراستە بکات جیاوازی لە ئیسلامبوونی پێشتری کورد دروست بکات،

به واتا جۆرێك له دابڕان لەگەڵ رابردووی به ئیسلامبوونی کورددا دروست بکات ئەویش لەو روانگەیەوە کە کورد هەر لە ساتەوەختی پەیوەستبوونییەوە بە ئیسلامەوە بە جۆرێك لەنێو ئیسلامدا تواوەتەوە کە ناسنامەی سروشتی کوردی لەنێو ناسنامەی ئیسلامیدا تواوەتەوە، بەلام مەولاناو تەریقەتەکەی لە ئاستی دەرك پێکراودا بەلام بە ئاسانی نەبینراودا لە هەولی ئەوەدا بوون کە کورد ئیسلام بێت بەلام بە ناسنامەی کوردییەوە واتە لەبری ئەوەی کورد لە ئیسلامدا بتوێتەوە ـ کورد پەیامی ئیسلام بکات بە یارمەتیدەرو هۆکاری مانەوەو پاراستنی خۆی. ئەم رەگەزە دیارەش لە گوتاری شێخ عەبدولسەلامی بارزانیدا بە ئاشکرا دەبینرێت ـ تەنانەت ئەم بۆچوونە لە بەرنامەی سەرجەم ئەو بزووتنەوانەدا دەبینرێت کە شێخەکانی نەقشەبەندی سەرکردایەتیان کردووە ئەوەش کاریگەری پرەنسیپی رێبازی نەقشەبەندی دەردەخات بۆ نموونە هەمان بۆچوون لە بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوللای نەهری‌و دوای شێخ عەبدولسەلامیش لە بزوتنەوەکەی شێخ سەعیدی پیراندا بە ئاشکرا دەبینرێت، تەنانەت سەرباری گۆرانکاری مێژوویی‌و کۆمەلایەتی‌و جیاوازی دەوروبەری سەدەیەك دەتوانین هەمان بۆچوون لە گوتاری مەلا مستەفای بارزانی‌و مەسعود بارزانیشدا ببینین کە روانینە بۆ ئیسلامبوونی کوردو پەیوەستبوون‌و درێژەدان بەو پەیامە ئایینە بە مەرجێك کوردو ناسنامەی کوردی لەنێو ناسنامەی ئیسلامیدا بپارێزرێت خودی ئایینەکەش تەواوکەرو یاریدەدەری بەهێزکردن‌و چەسپاندنی ناسنامەی کوردی بێت.

بە هەر حال گوتاری شێخ عەبدولسەلامی بارزانی گوتارێکی ئاشکرایەو رەهەندەکانی دیارە. هەروەك کرێس کۆچێراش ئاماژەی پێدەدات ئەو یەکەم کەسە کە بەرنامەی بۆ بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی نووسیووەو داواکارییەکانیشی تێدا تۆمارکردووە کە لە پلەی یەکەمدا بەرەسمی ناسینی زمانی کوردی هاتووە، ئەگەر لەسەر ئەم خالە رابووەستین ئەو بۆمان دەردەکەوێت کە زمان لە گوتاری شێخ عەبدولسەلامدا پلەی یەکەمی

وەرگرتووە، ئەوەش ئاشکرایە کە گوتار لە بوونی زماندا پێناسە دەکرێت چونکە گوتار کاتێ ئاسنامەی گوتاری هەیە کە لە ئاستی زارەکیەوە بگوازرێتەوە بۆ ئاستی تۆمارکردن‌و ئەو تۆمارکردنەش لەڕێگای زمانی نووسینەوە دەبێت. کاتێ بەرنامەیەك دادەنرێت‌و دەنووسرێت مانای وایە دەگاتە قۆناغی تۆمارکردن، لەو ئاستەشدا گرنگە کاتێ باسی بەڕەسمی کردنی زمانی کوردی دەکرێت لەو ئاستەشدا سەیری ئەو زمانە بکەین تا بزانین ئایا بارگاوی کراوە بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی یان نا؟

هەر بۆ خۆی داواکردنی بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی هەڵگری فیکرو جیهانبینییەکی جیاوازە لە فیکرو جیهانبینی ئەوانی دی کە لێرەدا مەبەستی شێخ عەبدولسەلام فیکرو جیهانبینی تورکییە، لە پشتی داواکردنی بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردییەوە دەلالەتی گەڕان بەدوای شوناسدا دێتە ئاراوە، شوناس بەو مانایەی کە بوونی کورد وەکو پێکهاتەیەکی ئێتنیکی جیاوازو سەربەخۆ لەوانی تر نیشان بدات.

پێداگرتن لەسەر خوێندن بە زمانی کوردی هەڵگری ئەو دەلالەتەیە کە ئەم زمانە زمانی پێکهاتەیەکی ئێتنیکی سەربەخۆیەو مادەم کەردون لەوانی تری جیا کرلۆتەوە کەواتە مافی سروشتی خۆیەتی بە زمانی دایکی خۆی بخوێنێت‌و فێر ببێت، ئەمەش لەلایەك هەوڵێکە بۆ پەیوەست کردنی منداڵی کورد بە بوونی خۆیەوە، لەڕووی رەگەزو ئاستی بەئاگایی‌و نائاگایشەوە کە ئەوەش بە سروشتی پەیوەستبوونی نەتەوەیی ئەو دەردەخات یان لە بنەڕەتدا لەنێو بوونی زمان‌و داب‌و نەریت‌و عەقڵی کوردانەدا پەروەردەی دەکات‌و ئەنجامیش بەجۆرێك پەروەردە دەبێت کە لە پلەی یەکەمدا لەنێو جوگرافیای بوون، ئاسنامەو فەزای کوردیدا دەبێت‌و لەڕووی ئەستەوە تا ئەندازەیەك سەربەخۆ پەروەردە دەبێت‌و وەکو خۆی بیر دەکاتەوە نەك پەیوەست بێت بەوانی ترەوەو بەرەو ناوەندی ئەو زمانەو داب‌و نەریت‌و کەلتورو عەقڵی بیرکردنەوە، خاوەنی زمانەکە ئاڕاستە بکرێت. ئەمەش واتە خوێندن بە زمانی نەتەو

دەشێ لە بوونی ئەنتۆلۆژی‌و ڕوویەری ئەستدا زەمینە بۆ دروستبوون‌و بەرهەمهێنانی هەستی نەتەوەیی خۆش بکات، لەوێشەوە سەرەتای خۆجیاکردنەوە لەوانی ترو هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی شوناسی تایبەتی سەرهەڵدەدات. لەسەر ئەم بنەمایانە گوتاری شێخ عەبدولسەلامی بارزانی ڕەهەندێکی نەتەوەیی فراوانترو مەودا قوڵتری هەیە لەچاو هەر بزوتنەوەیەکی چەکداریدا کە زیاتر لەسەر بنەمای کاردانەوە بێت‌و هیچ پرۆژەیەکی فیکری یان نەتەوەیی لە پشتەوە نەبێت.

سەرباری ئەوەی شێخ عەبدولسەلام دەیەوێت زمانی کوردی بەڕەسمی بناسرێت‌و لەڕوویەرێکی دیاریکراوی کوردستاندا کاری پێبکرێت. پێی بخوێندرێت‌و کارمەندانی بەڕێوەبردن کورد بن، بەڵام هێشتا دەبێ بزانین لەگەڵ ڕووە گەشەکانی ئەم گوتارەدا، ناتوانین وەکو گوتارێکی نەتەوەیی گشتگیرو هەمەلایەنە سەیری بکەین کە هەڵگری ویست‌و داوا نەتەوەییەکانی کورد بێت بەگشتی، بەڵکو ئەو جوگرافیایەی گوتارەکە دەیەوێت بوونی خۆیی تیا بسەلمێنێت ڕوویەرێکی جوگرافی تەسك‌و دیاریکراوە‌و لەڕووی سیاسیشەوە گوتارەکە ڕەهەندی سیاسیانەی پەیوەست بە داوا سیاسیەکانی نەتەوەی ئاشکرا نەکردووە‌و بەڕوونی لەوە نادوێت کە چ داواکاری‌و بەرنامەیەکی سیاسی‌و ئیداری بۆ کوردستان دەوێت. بەڵام لەنێو خودی بەرنامەکەیدا ئاشکرا دەبێت کە ئەو داوای جیابوونەوەی هیچ بەشێك لە دەوڵەتی تورك ناکات بەڵکو ئەوەی ئەو داوای دەکات جۆرێکە لە گوتاری چاکسازی، کە تەنانەت مافی خوێندنیش بە زمانی دایك دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو گوتارەوە، واتە گوتاری چاکسازی.

لەلایەکی ترەوە بەرنامەکەی شێخ عەبدولسەلام باسی دامەزراندنی کارمەندی کوردی دەکات لە ناوچە کوردییەکاندا، ڕاستە ئەمە ڕوویەکی نەتەوەیی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مەبەست ئەوەیە دەوڵەتی تورکی ئەو کارمەندانە دابمەزرێنێت کەواتە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە لە بنەڕەتدا

بەرنامەی دروستکردنی دەسەلاتی کوردی لەئارادا نەبووە هەتا ئەو دەسەلاتە بە لایەنی کەمەوە لەو ناوچە دیاریکراوەدا کە دەشیا دەسەلاتی بەسەریدا هەبوایە خۆی خاوەنی بریار بوایە چ بریاری سیاسیو چ بریاری بەرێوەبردن. ئەمەش زیاتر گەوهەری بەرنامەکەی شێخ عەبدولسەلام دەردەخات کە مەبەست بەکارهێنانی زمانی کوردیو دامەزراندنی کارمەندی کوردییە لەو ناوچە دیاریکراوەدا کە ئەو پێی وابووە سنووری قەڵەمرەوی ئەوە، ئەو ناوچەیەش بێگومان ناوچەیەکی تەسکە ئەگەر بەراورد بکرێت بە هەموو کوردستان بۆیە تەنانەت ئەگەر وەکو گوتاری نەتەوەییش سەیری گوتاری شێخ عەبدولسەلام بکەین ئەوە دەبێ بڵێین گوتارێکی ناوچەییە کە هەڵگری بەشێك لە رەگەزەکانی گوتاری نەتەوەیی کوردییەو گرنگییەکەشی لەوەدایە کە گوتارێکی نووسراوەو رەوانەی ناوەندی دەسەلاتی دەوڵەتی تورك کراوە.
لێرەوە ئاراستەیەکی تریش لەبیرکردنەوەی شێخ عەبدولسەلامدا دەردەکەوێت ئەویش بریتییە لە بەدەستهێنانی بەشێك لە مافەکانی بەشێك لە کورد لەژێرسایەی دەسەلاتی دەوڵەتی تورکدا، یان بەشێوەیەکی تر شێخ عەبدولسەلام بڕوای بە بوونو شەرعیەتی دەوڵەتی تورك هەیە وەکو خەلافەتی ئیسلامی، بەلام ئەوەش بەرەواو بە مافێکی سروشتی دەزانێت کە کورد لەسایەی دەسەلاتی خەلافەتدا مافی تایبەتی نەتەوایەتی خۆیشی هەیەو دەبێ بەدەستی بهێنێت ئەمەش خاڵێکی گەشە لە بەرنامەو گوتاری ئەودا.
لەلایەکی ترەوە لە بەرنامەکەی شێخ عەبدولسەلامدا باسی ئەوە کراوە کە دەبێ قازی سەر بە مەزهەبی شافیعی لە ناوچە کوردییەکاندا دابمەزرێن لێرەشەوە دەردەکەوێت کە دەوڵەت رەچاوی ئەوەی نەکردووە کە کوردەکان بەگشتی سەر بە مەزهەبی سونەی شافیعین، بە ئارەزووی خۆی قازی لە مەزهەبەکانی تر لە ناوچەکانی ئەماندا دامەزراندووە، ئەمەش بە روانینی شێخ عەبدولسەلام وەکو پیاوێکی ئایینیو رابەرێکی رێبازی تەسەوفی نەقشبەندی کارێکی نەشیاوو نادروستبووە چونکە بە روانینی ئەو دەبێ قازی لە هەمان

مەزهەبی دانیشتوان و هاووڵاتیان بێت چونکە پەیوەندی راستەوخۆی بە مەسەلەی شەرع و مارەبڕین و دادوەریکردن و جێبەجێ کردنی عەدالەتەوە هەیە.

لێرەدا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە شێخ عەبدولسەلام وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو دەڕوانێتە کورد و ئیسلام و هەرگیز ناتوانێت و نایەوێت و بڕوای بەوە نییە کە درز لەنێوان کورد و ئیسلامیدا دروست ببێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێی وایە دەبێ کورد بوون و ئیسلامبوون بە توندی پێکەوە گرێ بدرێن. چونکە ئەگەر کورد بوون مافێکی سروشتی بێت ئەوا خەبات لەپێناوی مافە رەواکانی نەتەوەدا بەپێی بنەماکانی ئیسلامیش رەوایە، هەروەك لە هەمان کاتدا وا سەیر دەکات کە مسوڵمان بوونی کورد پەیوەستبوونێکی رۆحیە، بە واتا ئەو وەها سەیر دەکات کە کورد بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێت دەبێ کوردبوونی خۆی بپارێزێت و کاری بۆ بکات، لە هەمان کاتدا دەبێ پارێزکاری لە ئیسلامیش بکات چونکە ئەو دنیای بۆ مسۆگەر دەکات و لەم دنیاش سەربەرز و سەرفرازی دەکات ئەگەر بزانێت چۆن کاری پێدەکات.

لەڕوویەکی ترەوە شێخ عەبدولسەلام داوای هەڵدەوەشاندنەوەی ئەو باجە دەکات کە دەوڵەتی تورك بەسەر خەڵکیدا سەپاندووە چونکە ئەم پێی وایە فەرزکردنی باج بەو جۆرە پێچەوانەی شەریعەتە. کەواتە لێرەدا شێخ عەبدولسەلام وەکو چاکسازێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی خۆی پێشکەش دەکات لەلایەك دژی ئەو کارانەی دەوڵەت دەوەستێت کە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامن و دەوڵەت بەبێ گوێدانە بنەماکانی شەریعەت لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیدا فەرزی کردوون بەسەر هاووڵاتیانداو ئەوەش بووەتە بارێکی گران لەسەر شانی هاووڵاتیان، ئەم دەیەوێت ناڕاستەوخۆ بڵێت دەوڵەت لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیدا شەریعەتی ئیسلام پشت گوێ دەخات و کاری پێناکات، ئەمەش نزیکە لەو بۆچوونەی کە زۆرێك لەو نوخبەیەی لە سنووری دەوڵەتی تورکدا دەژیان لەسەردەمی دەرکەوتنی بیروبۆچوونی تورکە لاوەکانەوە پێیان وابوو دەوڵەت لە شەریعەتی ئیسلام لایداوە و پەیڕەوی ئەو شەریعەتە ناکات.

لەلایەکی ترەوە شێخ عەبدولسەلام بە پشت بەستن بە بنەمای شەریعەت هەوڵدەدات باس لە چاکسازی کۆمەڵایەتیو مەسەلەی ئاوەدانکردنەوەی ناوچە کوردییەکان بکات. ئەو پێی وایە وەرگرتنی باج لە بنەڕەتدا شتێکی ناشەرعیە بەڵام ئەگەر باجیش وەربگیرێت ئەوا دەبێ بۆ چاککردنی ڕێگاویانەکانی ناوچە کوردییەکان خەرج بکرێت. کەواتە لێرەدا لەلایەکەوە دەردەکەوێت کە ئەو مەبەستی ئەوەیە لەڕێگای باجەوە بەشێك لە داهاتی کورد لەلایەن دەوڵەتی تورکەوە نەبرێت، بەڵکو ئەو داهاتە لەنێوخۆی کوردستانداو لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا خەرج بکرێت.

لەلایەکی ترەوە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لە ڕوانینی شێخ عەبدولسەلامیشدا وەکو زۆرێك لە مسوڵمانانی خاوەن بڕوا بە مەسەلەی گەلو نەتەوە دەشێ شەریعەتو زۆر ڕوانینو بنەمای ئایینی لەپێناوی بەرژەوەندی نەتەوایەتیو دنیاییو دەسەڵاتدا گۆڕانکارییان تێدا بکرێت، بۆ نموونە باج وەرگرتن بە ڕوانینی ئەو ناشەرعیە بەڵام ئەگەر وەریش بگیرێت ئەوا دەبێ لەپێناوی ڕێگاویانو ئاوەدان کردنەوەی کوردستاندا بەکار بهێنرێت، بە واتا بەکارهێنانی ئەو باجە لەپێناوی کوردستاندا مەسەلەی ناشەرعی بوونی وەرگرتنی باجەکە ڕەت دەکاتەوە، ئەمەش ڕوانینی کەسێکە کە بەو ئەندازەی بڕوای بە پیرۆزی ئیسلام هەیە ئەوەندەش بڕوای بە ئاوەدانکردنەوەو بنیادنانەوەو بەرەوپێشەوەچوونو بوون بە خاوەنی مافی هەمەلایەنەی نەتەوەکەی هەیە.

بێگومان دوای دانانی ئەم بەرنامەیەش شێخ عەبدولسەلام لە هەوڵو کۆششدا بوو، بەتایبەتی لەسەروبەندی ڕووداوەکانی بەتلیسدا رابەرایەتی ڕاپەڕینی ڕوویەرێکی دیاری کوردی کردو ناوچەیەکی فراوانیشی گرتەوە ـــ ئەمەش هێزێکی جەماوەری زیاتری بە شێخ عەبدولسەلام بەخشی بەجۆرێك کە کاتێ لە هەمان ساڵدا جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد شێخ عەبدولسەلام پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان ئاڵۆزتربوو بەتایبەتی ڕەفزی ئەوەی کرد کە

سەرباز لەلایەنگرانی خۆی بداتە سوپای تورک، هەروەک بەتەواوی باج دانیشی بە دەوڵەت رەتکردەوە. ئەم دوو خاڵەش لەبەر ئەوەی لە سوودی بەرژەوەندی خەڵکی بوو ـ لایەنگری زیاتری بۆ دروست بوو، سەرباری لایەنگرانی پێشتری لەسەر بنەمای خوێن‌و رێبازی تەسەوف ئەمجارەیان لایەنگری زۆری لە خێڵەکانی تری لە دەرەوەی رێبازی نەقشبەندیش بۆ پەیدا بوو، ئەمەش دەوری بینی لە دەرخستنی شێخ عەبدولسەلام وەکو رابەرێکی ئایینی نەتەوەیی کە خەڵك ئومێدیان پێی هەبێت.

بە هەر حاڵ شێخ عەبدولسەلام بەشێوەیەکی ناجوامێرانە دەستگیرکراو پاشانیش لەساڵی ١٩١٤دا تورکەکان لە موسڵ لەسێدارەیان دا کە ئەوەش مێژوویەکی پڕ سەروەری بۆ خۆی‌و بنەماڵەکەشی دروستکردووە کە لەسەروەختی غیابی ناسیونالیزمی کوردیدا ئەو لەسەر مەسەلەی کورد لەسێدارە بدرێت.

هەرچەندە شێخ عەبدولسەلام لە بەرنامەکەیدا کە پێشتر باسمان کرد تێکەڵاوییەك لە بنەمای نەتەوەیی‌و ئایینی پێکەوە کۆدەکاتەوە. بەڵام بەرنامەی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی ئیسلامی نییە، بەڵکو ئەمیش هەمان شێوەی شێخ عەبدولقادری نەهری بەرنامەی جۆرێك لە دەسەڵاتی سنووورداری لەسایەی دەوڵەتی تورکدا هەبووە کە دەشێ وەکو جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی سەیر بکرێت، کەواتە دەتوانین بڵێین گوتاری شێخ عەبدولسەلام زیاتر گوتارێکی ناوچەیی دەسەڵاتێکی سنووورداره کە بە گوتاری ئۆتۆنۆمی دادەنرێت.

# سەرچاوەكانی بەشی (٢٢)

1- Matin Van Bruinessen – Agha, Shaikh and state, ZedBookes, London, 1992, p.333.

2- David MacDowall – A Modern History of The Kurds, London, 2000, p, 100.

٣– أيوب البارزاني ـ المقاومة الكردية للإحتلال ـ دار النشر حقائق المشرق ـ ٢٠٠٢، ص٣٥.

٤– م. س. لازاريق ـ المسألة الكردية (١٨٩١ ـ١٩١٧)، ترجمة أكبر أحمد، مركز كردستانم للدراسات الإستراتيجية ٢٠٠٠ ص ٣١٢ـ٣١٣.

٥ـ محمود الدرة ـ القضية الكرديةو و القومية العربية في معركة العراق ـ دار الطليعة ـ بيروت ، الطبعة الأولى ١٩٦٣ ص١٢٤ .

٦ـ مسعود البارزاني ـ البارزاني و الحركة التحررية الكردية (١٩٣٠ ـ ١٩٣٢)، كوردستان ١٩٨٦ ص١٧.

٧– عەتا قەرەداخی ـ سلێمانی ـ زەمینەی سەرهەڵدان و ململانێی تەسەوف ـ سلێمانی ٢٠٠٢.

راپەرینی سەید رەزا لەساڵی ۱۹۲۷ـ ۱۹۳۸ لە دەرسیم سەری هەڵدا کە رابەرایەتی ئەم راپەرینە سەید رەزا کردی کە تەمەنی لە سەرووی حەفتا ساڵەوە بوو. پێشتریش لەساڵی ۱۹۲۰ـ۱۹۲۱دا راپەرینێکی تر لەم ناوچەیەدا دژی دەسەڵاتدارانی تورك سەری هەڵدا بەڵام تورکەکان بە ئاگرو ئاسن سەرکوتیان کرد، راپەرینی یەکەمی دەرسیم پشتگیری لە بەندەکانی پەیمانی سیڤەر کردو داوای دامەزراندنی نیشتمان یان دەسەڵاتێکی کوردی سەربەخۆی دەکرد کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم ناوچەیە پێشتر ئەزموونی راپەرینی هەبووە دژی دەسەڵاتی داگیرکەرو بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی کورد..

راپەرینی سەید رەزا لە دەرسیم سنووری نێوان خێڵەکانی بەزاندو سەلماندی لەچاو راپەرینەکەی ساڵی ۱۹۲۱دا زۆر بەهێزترە، سەرباری پشتگیری خێڵەکەی خۆی واتە خێڵی ئەباسوشاگی شێخ رەزا پشتگیری خێڵەکانی یوسف خان و دیمەنانی بەدەست هێناو دوای کۆکردنەوەی هێزێکی گەریلا کە لە پێنج سەد کەس زیاتر بوو، دەستی کرد بە هێرش بردنە سەر رەمزە دیارەکانی دەسەڵاتی تورك[1] لازاریف دەڵێ: حکومەتی تورکیا بریاری دا لە ناوەراستی سییەکاندا دەست بکات بە مل پێکەچکردنی خێڵەکانی دەرسیم کە نیمچە سەربەخۆبوون، دەیویست بەتەواوی ملیان پێ نەوی بکات[2] هەر لەو ساڵەدا لەسەر داوای مستەفا کەمال ئەتاتورك پەرلەمانی تورکیا بریاری دا دەرسیم بکاتە ویلایەت و ناوەکەشی گۆری بۆ تونچەلی. واتە پرۆژەی کەمال ئەتاتورك بۆ دەرسیم بریتی بوو لە بەتورك کردنی ئەو شارەو گۆرینی سیمای کوردبوونی کە ئەویش لە گۆرینی ناوەکەیەوە دەستی پێکرد.. لەساڵی ۱۹۲۵دا دەوڵەت بەبەستی خۆی لە مامەڵەی جدی بەرامبەر بە مەسەلەی دەرسیم ئاشکرا کردو هڵێنی دا بەرنامەیەك جێبەجێ بکات کە بەگوێرەی ئەو بەرنامەیە نەوژەن کردنەوەی دامەزراوی بەرێوەبردن بەهێزی سەربازی ئەنجام بدرێت[3]. دوای ئەوەی کە تورکەکان پرۆژەی بەتورك کردنی ناوچەی دێرسیمیان خستە بواری جێبەجێکردنەوە بۆ جاری دووەم چونکە پێشتریش لەساڵی ۱۹۲۳دا زۆرێك لە

ناوچەو گوندەکانیان چۆڵ کردو دانیشتوانە کوردەکەیان گواستنەوە بۆ شوێنەکانی تری تورکیا. ئەمجارەش بەناوی ئاوێتەکردنی پێکهاتەکانی گەلی تورکیاوە هەوڵیاندا کوردەکان بگوازنەوەو سالانەش دەبێ سێ گوند بۆ تورك لەم ناوچەیەدا دروست بکرێت کە هەر گوندێکی سەدماڵ بێت[4] سەرباری سەختی باری ژیانو نەبوونی ئازادیو بێ مافی کوردەکان، هێشتا دەسەلاتی تورك بەوەش وازی نەدەهێنا، دەیویست ڕێژەی کورد لەم ناوچەیەو هەموو بەشو ویلایەتەکانی تری کوردستاندا لەڕێگای گواستنەوەی کوردەکانو هێنانی تورکەوە کەم بکاتەوە.

لە ئەنجامی ئەم کارە دژ بە کوردانەی دەسەلاتی حکومەتی تورکدا سەید ڕەزای دێرسیم نامەیەکی نارد بۆ جەنەراڵ ئالپ دۆغانی فەرماندەی سەربازی ناوچەکە، تیایدا داوای لە حکومەت کردبوو کە ئەو یاسا نوێیەی سەبارەت بە دێرسیم دایناوە هەڵبوەشێنێتەوەو دان بنێت بە مافەکانی کورددا[5] لێرەوە دەردەکەوێت کە سەید ڕەزا خاوەنی هەستێکی نەتەوایەتی کوردی بووەو نەیتوانیووە لەبەرامبەر ئەو سیاسەتە دژ بە کوردەی ڕژێمەکەی ئەتاتورکدا بێدەنگ بێت، بۆیە لەلایەك داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارەی دەوڵەت دەکات سەبارەت بە گواستنەوەی کوردەکانو هێنانی تورکو تەنانەت گۆڕینی ناوی دێرسیم بۆ تونجەلی. سەرباری ئەم داوایەش سەید ڕەزا داوا لە حکومەتی تورك دەکات کە دان بنێت بە مافەکانی کورددا. بێگومان داواکردنی مافەکانی کورد لە خۆیدا بەشێك لە ڕەگەزو بنەماکانی گوتاری نەتەوەیی کورد هەلگرتووە. هەرچەندە ئاشکرا نییە کە سنوورو ڕەهەندی ئەو مافانەی کە سەید ڕەزا بۆ کوردی داوا دەکات چییەو چۆنە، بەڵام جێگای بایەخە بۆ ئەو کە بەتەمەنی سەرو حەفتاساڵەوە هەستی نەتەوایەتی وای لێ بکات هەم نامە بنووسێتو هەم دواتر سەرکردایەتی ڕاپەڕین بکاتو هەم لە ئەنجامیشدا گیانی خۆی بەخت بکات. هۆکارێکی تری دیاری ڕاپەڕینەکەی سەید ڕەزا ئەوە بوو کە تورکەکان بێ شەرمانە ڕایانگەیاند ولایەتی دێرسیم ولایەتێکی تورکیە لە

بارەیـەوە وەزیـری نـاوخۆی تورکیـا دێرسـیمی بـە.. ناوچـەیەکی خـاوەن دانیشتوانێکی رەسەنی تـورك وەسـف کـرد[٦] لەکاتێکدا کـە وەزیـری نـاوخۆی تورکیا بەم جۆرە وەسفی ولایەتی دێرسـیم دەکـات، کەچـی هاوکـات سـەرباری سیاسەتی راگواستنی کوردەکانو هێنـانی تـورك، هێشتا رێـژەی کـورد ٦٢٪ی دانیشتوانی ناوچەکەی پێکدەهێنا. لە مانگی تەممووزدا.. سەید رەزا نامەیـەکی بۆ ئـەنتۆنی ئایـدنی وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا نووسـیو تیایـدا هۆیـەکانی بەرەنگاربوونەوەی هاونیشتمانیەکانی خستەڕوو لە نامەکەدا هاتبوو: حکومـەت چەندین ساڵە هەوڵ دەدات کە خەڵکی کورد بکات بـەتورك، سـەرکوتیان بکـات بڵاوکراوەی کوردی قەدەغە بکاتو ئازارو ئەشـکەنجەی هـەر کەسـێك بـدات کـە بەکوردی بدوێت، خەڵکی ئەم ناوچە بە پیتو فەرەی کوردستانی راگوێزاوە بـۆ ناوچە ناکشتیارییەکانی ئەنادۆڵو زۆریان لەوێ لەناو چوون زیندانەکانی پـڕ لـە خەڵکی مەدەنی کردووەو رووناکبیرانی گوللەباران کردووە یان هەڵیواسیون یان دووری خستوونەتەوە، کۆتـایی نامەکەی بـەوە هێنـاوە: سـێ ملیـۆن کـورد داوا دەکەن لە ولاتی خۆیاندا بە ئاشتیو ئازادی بژین[٧].

بێگومان ئەم نامەیەی سەید رەزا لەڕووی ناوەرۆکەکـەیو ئـەو ئامانجـەی کـە بـۆی نووسـراوە بایـەخێکی زۆری هەیـە، هـەروەها ئـەوەش نیشان دەدات کـە سەید رەزا کەسایەتییەکی هوشیار بـووە لـەو روانگەیـە کـە زانیوویـەتی چـۆن هەوڵبدات کێشەی کورد بگەیەنێتە لای ولاتانی بڕیار بەدەست. بیسان ئەوە لـە ناوەرۆکی نامەکەدا دەردەکەوێت کە کورد بە ناچاری پەنا بۆ راپەڕینو بەرگری دەباتو ئـەو کـارەش لـەپێناوی مانـەوەدا دەکـات لەکاتێکدا کـە داگیرکـەرانی کوردستـان هیچ سڵ لەوە ناکەنەوە کـە چـۆن بـە ئاشـکراو بـێ شاردنەوە نـەك کورد لە مافەکانی بێبەش بکەن، بەڵکو هەوڵدەدەن پاکتاوی رەگەزیشی بکەنو لەناوی ببەن. جگە لەوەی نامەکەی سەید رەزا رووبەرێکی فراوان لە کێشەو لـە هەمان کاتدا سیاسەتە نادروستەکانی دەوڵـەتی تـورك دەگرێتـەوە کـە کـوردی رووبەڕووی ژیانێکی سەخت کردۆتەوەو تەنانەت لە سەرەتایی ترین مافیش کـە

مافی ئاخاوتنە بە زمانی دایك بێبەشی کردووە، لەکاتێکدا کە سەید رەزا لە بەشێکی دیاری نامەکەیدا سیاسەتە نادروستەکانی تورك دەخاتەڕوو سەبارەت بە کوردو بێبەش کردنی لە مافەکانی دیسان باسی ئەوەش دەکات کە ئەو بەخششانەی کە گەردوون بە کوردستانی بەخشیووە لە زەوی بە پیتو فەڕ، دەوڵەتی تورك ئەو بەخششانە لە کوردەکان دەسەنێتەوەو دووریان دەخاتەوە بۆ ناوچە بیابان ئاساو بێ پیتەکانی ئەنادۆل.

هەروەها لە کۆتایی نامەکەدا سەید رەزا باسی ئەوە دەکات کە سێ ملیۆن کورد داوا دەکەن بە ئاشتیو ئازادی بژین. بێگومان سەید رەزا باسی داوایەکی رەوا دەکات کە کوردیش وەکو هەر نەتەوەیەکی تر مافی خۆیانە کە بە ئاشتیو ئازادی بژین، لێرەشدا نازانرێت ئایا ئەو ئازادییەی کە سەید رەزا باسی لێوە دەکات ئایا ئازادییە لەسایەی رژێمی تورکدا یان مەبەستی جیابوونەوەی کوردو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆیە. لەلایەکی تریشەوە ئەو باسی سێ ملیۆن کورد دەکات.. کە ئەوەش دەری دەخات کە سەید رەزا مەبەستی لەو ژمارەیە تەنیا کوردی باکورە ـ ئەمەش سنوورو رەهەندەکانی گوتاری سەید رەزا تەسکتر دەکاتەوەو لە گوتارێکی گشتگرو هەمەلایەنەی نەتەوەییەوە کە هەموو جوگرافیای کوردستان بگرێتەوە دەبێتە گوتارێکی هەرێمایەتی کە زیاتر بەشێکی کوردستان دەگرێتەوە.

بە هەر حاڵ حکومەتی تورکیا بەشێوەیەکی توند وەڵامی راپەڕینەکەی سەید رەزای دایەوەو پاش ماوەی دوو ساڵ توانی راپەڕینەکە تێکبشکێنێتو سەرکردەکەی دەستگیر بکاتو پاشانیش لەسێدارە بدرێت. هەرچەندە لە راستیدا سەید رەزا خۆی دایە دەستەوە بەڵام بەدەر لە هەر بنەماو نەریتو ئەخلاقێکی سیاسیانە دەسەڵاتدارانی تورك بڕیاری لەسێدارەدانی سەید رەزاو دوو کوڕیو ژمارەیەکی تر لەسەر خێڵەکانی داو لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٧دا بە مەرگ حوکم دران. راپەڕینەکەی سەید رەزا لەدوای لەسێدارەدانی

سەید ڕەزاو هەندێ لە سەرکردە دیارەکانیشی هێشتا هەر بەردەوام بوو هەتا لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٨دا بەتەواوی دامرکێنرایەوە.

ڕاپەڕینەکەی سەید ڕەزا سەرباری داکۆکیکردنی لە مافەکانی کوردو بارگاوی بوونی بە بەشێك لە ڕەگەزەکانی گوتاری نەتەوایەتی کوردی، شێوازێکی نوێشی لە ڕاپەڕین لە مێژووی کورددا هێنایە ئاراوە. لەم بارەیەوە نادر ئینتیسار دەڵێت: بەپێچەوانەی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران و ڕاپەڕینەکەی ئیحسان نوری پاشاوە، ڕاپەڕینی دێرسیم شێوازی تەقلیدی شەڕی نێوان دوو سوپای نەگرتەبەر. لە ڕاپەڕینی دێرسیمدا سوپای تورکیا ڕووبەڕووی هێزێکی بچووك بەڵام بەتوانا دەبووەوە کە پشتی بە تاکتیکی (لێبدەو ڕابکە)ی شەڕی گەریلایانە بەستبوو[٨] ئەمەش نەریتێکی باوی شەڕی پاتیزانیە کە زیاتر لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە لە خەباتی ڕزگاری نەتەوەکاندا پەیڕەو دەکرا. بە هەر حاڵ هەرچەندە ڕاپەڕینەکەی سەید ڕەزا شکستی هێنا بەڵام وەکو ئەڵقەیەکی تری ڕاپەڕینەکانی کورد لەپێناوی مافە نەتەوەییەکاندا سەیر دەکرێت، هەرچەندە ئەوە ئاشکرایە کە ئەم ڕاپەڕینەش زیاتر لەوەی کە بنەمای پرۆژەی نەتەوەیی هەبووبێت، جۆرێك بووە لەکاردانەوە بەرامبەر بە سیاسەتە توندوتیژو دوژمنکارییەکانی دەوڵەتی تورك، بەتایبەتی دەرکردنی یاسای ئاوێتەکردنی کەلتووری ناتورکەکان بە کەلتوری تورکیو ڕاگواستنی دانیشتوانی دێرسیمو گۆڕینی ناوی دێرسیم بۆ تونجەلیو فشارو زەبرو زەنگو قەدەغەکردنی زمانی دایك بۆ ئاخاوتنو ڕێگاگرتن لە بڵاوکراوەی کوردیو.. تاد دا ڕوویدا، بەڵام ئەم ڕاپەڕینە لە گەوهەردا. خاسیەتی بزووتنەوەی نەتەوەیی هەبوو، توخمو ڕەگەزەکانی گوتاری نەتەوەیشی بەرز دەکردەوەو پێی لەسەر دادەگرتنو بایەخی پێدەدان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕووبەری جوگرافی ڕاپەڕینەکە ڕووبەرێکی تەسك بوو، سەرەتا تەنیا خێڵەکەی سەید ڕەزا هێزی سەرەکی ڕاپەڕینەکە بوو بەڵام دواتر چەند خێڵێکی تریش بەشداری ڕاپەڕینەکەیان کرد. هەرچەندە ئەم

ڕاپەڕینە نەیتوانی بە لایەنی کەمەوە هەموو ئەو بەشەی کوردستان بگرێتەوە کە لەژێر سایەی دەوڵەتی داگیرکەری تورکدا بوو. ئەمەش خاسێتی ناوچەیی‌و تەنانەت خێڵایەتیش لەڕووی ڕوویەری کارکردن‌و بەشداری خەڵک‌و جەماوەری بوونەوە بە ڕاپەڕینەکە دەبەخشێت، بۆیە ئەم ڕاپەڕینەش هاوشێوەی هەموو ڕاپەڕینەکانی پێش خۆی هەر لە ڕاپەڕینی بەدرخانیەکانەوە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت نەبۆتە ڕاپەڕینێکی سەرتاپایی کوردستان، بەڵکو ڕاپەڕینی بەشێکی سنورداری وڵاتێکی بەرفراوان‌و نەتەوەیەکی دابەشبوو بووە هەر بەو پێیەش دەتوانین بڵێین لەسەردەمی ڕاپەڕینەکەی سەید ڕەزادا ناسیونالیزمی کوردی دەرنەکەوتووەو تەنانەت نە نوخبەی روناکبیری ناسیونالیست‌و نە تاکە ناسیونالیستی دیاریش لە ڕاپەڕینەکەی سەید ڕەزادا نابینرێت. ئەمەش لە بەرامبەر ئەو پرسیارەدا ڕامانەدەگرێت ئایا دەشێ بزوتنەوەی نەتەوەیی بەبێ بوون‌و ئامادەبوونی ناسیونالیزم‌و تەنانە بەبێ بوونی نوخبەی ناسیونالیستیش بوونی هەبێت؟ لەسەر ئەم بنەمایانە دەتوانین بڵێین گوتاری بزوتنەوەکەی سەید ڕەزا گوتارێکی ناوچەیی خێڵایەتی بارگاوی کراو بووە بە هەندێ ڕەگەزی گوتاری نەتەوەیی کوردی.

# سەرچاوەکانی

# گوتاری را پەڕینەکەی سەید رەزای دێرسیم


١ـ نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی ـ وەرگێڕانی عەتا قەرەداخی ، سلێمانی ـ ٢٠٠٤، ل١٨٦ـ١٨٧.

٢ـ م.س. لازاریف و آخرون ـ تأریخ کوردستان ـ ترجمة الدکتور عبدي حاجي ـ أربیل ـ ٢٠٠٦ ـ ص٢٣١.

3- David MacDowall. A Modern History of the Kurds – London, 2000, p208.

4- Ibid, p210.

٢ـ م.س. لازاریف و لخرون ـ تأریخ کوردستان ـ ص٢٣٢.

6- David MacDowall. A Modern Historry of the Kurds, p.207.

7- Ibid, p208.

٨ـ نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی ـ ل١٨٧.

لەساڵی ١٩٣٢دا ڕاپەڕینی دووەم لە باشووری کوردستان سەری هەڵدا لە ناوچەی بارزان‌و لەژێر سەرکردایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانیدا[١] ناوچەی بارزان لە باکوری عێراق بووە بە چاوگی بزوتنەوەی کوردی لەپێناوی مافە نەتەوەییەکاندا[٢] وا دێتە بەرچاو کە دەوڵەتی عێراقیش وەکو عوسمانییەکان بە هۆکاری ووروژێنەرو دروستکردنی ئاژاوەو جوڵانە ناوخۆییەکان سەیری بارزانیەکانیان کردبێت‌و لەوانەیشە وەکو سیستەمێکی سەربەخۆو جێگای گومان لەقەڵەمی دا بن[٣] حکومەتی عێراق بە هێزێکی زۆرەوە هێرشی کردە سەر بارزان بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٩٣٢دا حکومەت هێرشی کردەوە سەر بارزان بەڵام دیسان تێکشکا. بێگومان لەو سەرویەندەداو لە مانگی حوزەیراندا خێڵەکانی زێباری‌و لۆلان‌و هێزەکانی عێراق بە پاڵپشتی هێزی ئاسمانی بەریتانیا بارزانیان داگیر کرد. بەڵام شێخ ئەحمەد خۆی لەدەستی هێزی کاتی عێراق دەربازکردو خۆی دایە دەستی هێزەکانی تورکیاوە.

مەندوبی سامی بەریتانی بەئاگاداری حکومەتی عێراق نامەیەکی تایبەتی بۆ شێخ ئەحمەدی بارزان نووسی‌و تیایدا ئاگاداری کردەوە کە قسەو باسی ئەوە گەیشتۆتە بەغدا کە ئامادە بۆ ئەوە دەکات خۆتان بۆ لە رِوودا وەستانی دەسەڵاتی حکومەت ئامادەکردووە، لەبەر ئەوە دڵنیاتان دەکەم کە حکومەت هیچ نیازێکی دوژمنایەتی ئێوەی نییە[٤] شێخ ئەحمەد وەڵامی ئەو نامەیەی مەندوبی سامی دەداتەوەو دەڵێ ئەو هیچ شتێکی ناوێ بێجگە لە ئاشتی[٥] عیسمەت ئینینو بە ف. هەمفری دەڵێت: ئومێدەوارم کە حکومەتی عێراقی بەپەلە کار بکات بۆ ئەوەی شێخی بارزان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە چونکە بە ئاشکرا سۆزدارییەکی تەواو لەلایەن خەڵکەوە بەرامبەر بە یاخی بوونی کوردی هەیە لە تورکیا[٦]. بێگومان ئەوە ئاشکرایە شێخ ئەحمەدی بارزانی شوێن‌و پلەیەکی دیاری کۆمەڵایەتی هەبووە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە وەکو جێنشینی شێخ عەبدولسەلام ماوەتەوەو پێگەی ئایینی‌و کۆمەڵایەتی

بنەماڵەکەیان‌و ڕۆڵی دیاری شێخ عەبدولسەلام‌و شەهید بوونیشی بۆ خۆی لەڕووی مەعنەوییەوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر شێخ ئەحمەدو بارزانی‌و ئەوەکانی دواتریشیان هەبووە. هەرچەندە زۆرێك لە نەیارانی بنەماڵەی بارزان ئیدعایەی ئەوەیان بۆ شێخ ئەحمەد کردووە کە گوایە لە ئایین لایداوەو خواردنی گۆشتی بە رازی حەڵاڵ کردووە لەو نێوەندەشدا ئەوە بۆتە یەکێك لە هۆکارەکانی تێکچوونی نێوانیان لەگەڵ شێخ ڕەشیدی لۆلاندا کە ئەمیان خۆی وەکو موریدێکی ڕێبازی نەقشبەندی نیشانداوە، هەرچەندە لە بنەڕەتدا بەرزانییەکان هەر لەسەردەمی مەولانا خالیدی نوێکەرەوەی ڕێبازی نەقشبەندییەوە بوونەتە پەیڕەوکەری ئەم ڕێبازە. ئەو حیکایەتانەی کە دایڤد ماکدۆواڵ لە کتێبی مێژووی نوێی کورددا لەبارەی شێخ ئەحمەدو پەیوەندی بە ڕێبازی نەقشەبەندی‌و تەنانەت دوور خستنەوەشی لە هەستی کوردایەتی ناتوانرێت بسەلمێنرێت، رایەکانی ماکدۆواڵ رای سەر پێی‌و بێ بنەمان بەتایبەتیش کە ماوەیەکی زۆر لەدوای کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد نووسراونەتەوە. بە واتا رایەکانی ماکدۆوال جێگای بڕوا نین سەبارەت بە بنەماڵەی بارزان.

بە هەر حاڵ پێگەی شێخ ئەحمەد لەدوای شێخ عەبدولسەلام‌و شێخ مەحمودی بەرزنجی لە باشووری کوردستاندا لە هەمووان دیارتر بووە، بەتایبەتیش هەتا ساڵی ١٩٣٢ بارزان وەکو تاکە ناوچەیەکی عێراق‌و کوردستان ماوەتەوە کە دەوڵەتی نوێی عێراق نەیتوانیووە دەسەڵاتی بەسەردا بکات، هۆکارەکەشی بەندە بە بوون‌و ئامادەبوونی خودی عەشیرەتی بارزان‌و کەسێتی شێخ ئەحمەدەوە، سەرباری رق‌و کینەی هەندێ لە خێڵ‌و عەشیرەتەکانی دەوروبەری بارزان بەتایبەتی زێباری‌و لۆلانی یان بردۆستییەکان، هێشتا بارزانیەکان ئەگەر وەکو عەشیرەتیش بووبێت ئەوا توانیوویانە پارێزگاری لە دەسەڵاتی سنوورداری ناوچەکەی خۆیان بکەن کە ئەوەش وەکو خاڵێکی لاوازی دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقی سەیر دەکرێت.

هەرچەندە تورکیاو عێراقیش هەوڵی هاریکاری کردنی یەکتریان داوە بۆ ئەوەی جوڵانەوەی لایەنگرەکانی شێخ ئەحمەد سەرکوت بکەن بەتایبەتی لەکاتێکدا کە تورکەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی کە شێخ ئەحمەد لەلایەك هاریکاری کوردەکانی باکور دەکاتو لەلایەکی تریشەوە ناوچەی بارزان بووەتە شوێنی حەوانەوەو داڵدەدانی کوردە نەیارەکانی رژێمی تورك تورکەکان پێشنیاریان بۆ حکومەتی نوری سەعید کرد.. کە شاڵاوێکی هاوبەشی تەمبێ کردن لە هێزەکانی تورکیاو عێراق دژی شێخ ئەحمەدی بارزانی لەسەر زەوی عێراق بەرپا بکرێت[٧].

به هەر حاڵ راپەرینەکەی شێخ ئەحمەد پاش ئەوەی کە بوو بووە مایەی نیگەرانی هەردوو دەوڵەتی عێراقو تورکیاو خێڵە دراوسێکانی بارزانیش، حکومەتی عێراقی پاش چەند هێرشێك بە پاڵپشتی هێزی ئاسمانی بەریتانیا توانی تێکیبشکێنێتو شێخ ئەحمەد ناچاری ئەوە بکات خۆی بداتە دەستی تورکەکانەوە. هەرچەندە دەوڵەتی عێراق پێی وابوو بەخۆبەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەد ئیتر ناوچەکە هێمن دەبێتەوەو کۆتایی بەو پەشێوییە دێت.. بەڵام خۆبەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەد بەتورکەکان کۆتایی یاخی بوونەکان نەبوو، بەڵکوو هەردوو براکەی واتە محەمەد سدیقو مەلا مستەفا لەسەر سنوور لە ناوچە شاخاوییەکانی مزوری باڵا بۆ ماوەی ساڵێکی تر درێژەیان بەشەڕ کردن دا[٨] هەتا سەرئەنجام لە هاوینی ساڵی ١٩٣٢دا بەلێبوردن خۆیان دایە دەستی هێزەکانی عێراقەوە بەمەش هێشتا راپەرینی بارزان کۆتایی پێ نەهات چونکە دوای ئەوەش بەشێك لە هێزەکانی بارزانو ناوچەی بارزان لە دەوری خەلیل خۆشەوی کۆبوونەوە کە خەلیل خۆشەوی یەکێك بوو لە لایەنگرانی شێخ ئەحمەدی بارزانی. بێگومان قسەی ئەوەش هەیە کە پەیوەندی لەنێوان شێخ ئەحمەدی بارزانیو شێخ مەحمودی بەرزنجی دا هەبووە، هەرچەندە لەلایەکی تریشەوە باسی ئەوە دەکرێت کە.. لەساڵی ١٩٢٠دا شێخ ئەحمەد داوای شێخ مەحمود بۆ بەهاوبەشی داواکردنی ئۆتۆنۆمی لەگەڵ سەرجەمی

سەرۆك خێڵەكاندا رەتكرابووەوە[٩] لەلایەكی ترەوە لەگەڵ سمكۆی شكاكدا دەنگۆی ئەوە هەبووە كە پەیوەندییان هەبووبێت، بەڵام كاتێ سمكۆ دەیەوێت سەردانی شێخ ئەحمەد بكات، شێخ ئەحمەد نایەوێت پێشوازی لێ بكات ئەویش لەپای كوشتنی مارشەمعون كە شێخ بەلایەوە كارێكی نادروست بوو.

دیارە مل نەدانی شێخی بارزان بۆ دەسەڵاتدارانی عێراق بەڵگەی بوونی گیانی بەرگری‌و خۆبەدەستەوە نەدانە كە ئەوەش لە دەركەوتنی بنەماڵەی بارزانەوە بەتایبەتی لەسەروەختی شێخ عەبدولسەلامەوە بووەتە بەشێك لە كەلتوری ئەم بنەماڵەیە.

بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنجی راپەرینی شێخ ئەحمەدی بارزان بدەین لەرووی شێوازی سەرهەڵدان‌و كاركردنی خودی شێخ‌و راپەرینەكەوە، نە لەرووی ئەو رووبەری تیایدا سەری هەڵداوە، لەرووی نۆزینەوەی بەرنامەو پەیرەوو پرۆگرام‌و گوتارو دۆكیومێنتەوە بەڵگەیەكی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە كەوەكو راپەرینێكی نەتەوەیی سەیر بكرێت بەو پێیەی كە هەڵگری گوتاری نەتەوەیی كوردی بووبێت یان بەلایەنی كەمەوە هەڵگری هەندێ لە رەگەزەكانی ئەو گوتارە بووبێت. رەنگە تاكە رەگەزێك كە بشێت بە رەگەزی گوتاری نەتەوەیی دابنرێت ئەوە بێت كە ئەو راپەرینە لەلایەن پێكهاتەیەكی كوردی‌و لەسەر جوگرافیای خاكی كوردستان‌و دژ بە دەوڵەتی داگیركەری ئەو جوگرافیایە كراوە، بەڵام راپەرینەكە لە سنووری خێڵی بارزان‌و جوگرافیای بارزاندا ماوەتەوەو خاوەنی بەرنامەو پەیرەوێكی دیار نەبووە. لێرەوە دەگەرێینەوە بۆ سەرنجدانی بارودۆخی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگای كوردی لەكاتی راپەرینەكەی شێخ ئەحمەدی بارزاندا، بێگومان كۆمەڵگای كوردی لەو كاتەدا بە ئاشكرا لە بارێكی دواكەوتوویی خێڵایەتیدا بووە گومانی ئەوەش ناكرێت كە ناسیونالیزمی كوردی دەرنەكەوتووە، هەروەكو پێشتر گوتمان ئەوەی ئامادە بوونی هەبوو تاكی ناسیونالیزمی كوردی بووە، لە راپەرینی شێخ ئەحمەددا زیاتر سیمای شێخانەیەتی باڵادەستبووەو سنووری جەماوەری راپەرینەكەش

سنووری عەشیرەتی بارزان بووە کە نارچەیەکی لادێ نشین بووەو نە هەستی نەتەوایەتی لەبارە سروشتییەکەیدا بۆ قۆناغێکی ژیانی کۆمەڵایەتی لەو جۆرە جێگای باسەو نە نوخبەی خوێندەواری ناسیونالیستیش لە رووبەرێکی داخراوی کۆمەڵایەتی لەو جۆرەدا بە ئاسانی دەردەکەوێت، بۆیە هیچ کەسێتییەکی سەربە نوخبەی رۆشنبیری ناسیونالیستیش لە راپەڕینەکەدا ئامادەبوونی ئاشکرای نەبووە. ئەوەش بەرەو ئەو بۆچوونەمان دەبات کە هاوشێوەی زۆرێك لە راپەڕینەکانی تری کورد، راپەڕینەکەی شێخ ئەحمەدی بارزانیش بە جۆرێك لە کاردانەوە سەیر بکەین، تەنانەت خودی شێخ ئەحمەدیش ئەوە دەسەلمێنێت کاتێ کە باسی ئەوە دەکات دەیەوێت بە ئاشتی بژی[10].

کەواتە ناشێت گوتاری راپەڕینەکەی شێخ ئەحمەدی بارزانی بە گوتاری نەتەوەیی دابنێین لەکاتێکدا ئەو گوتارە ئامادە بوونی نەبێت، بەڵام دیارە ئەم راپەڕینەش وەکو بەشێك لە خەباتی کورد سەیر دەکرێت لەپێناوی مانەوەدا، دیارە دەشێ لەچوارچێوەی گوتاری مانەوەدا جێگای گوتاری ئەم راپەڕینەش بکرێتەوە هەمان شێوەی زۆرێك لە راپەڕینەکانی تری کورد.

# سەرچاوەکانی بەشی (۲۳)


١ـ لوسيان رامبو، الكرد و الحق ـ ترجمة عزيز عبدالأحد نباتي أربيل ـ ١٩٩٨ ـ ص١٠٣.

٢ـ م.س. لازاريف و آخرون ـ تأريخ كوردستان ـ ترجمة الدكتور عبدي حاجي ـ دهوك ـ ٢٠٠٦ ـ ص٢٣٠.

3- David MacDawall – A Modern History of the Kurds, London, 2000, P,..

٤ـ أيوب بارزانى ـ المقاومة الكردية للإحتلال (١٩١٤ ـ ١٩٥٨) دار نشر حقائق المشرق ـ ٢٠٠٢ ـ ص ١٠٣.

٥ـ هەمان سەرچاوە ـ ل١٠٣.

٦ـ هەمان سەرچاوە ـ ل١٠٩.

٧ـ م.س. لازاريف ـ النضال و الإخفاق ـ ترجمة صادق الجلاد ـ السليمانية ـ ٢٠٠٦ ـ ص ٢٤٥.

8- David MacDowall -- A Modern History of the Kurds, p,..

9- Ibid, p..

١١– أيوب بارزانى ـ المقاومة الكردية للإحتلال ص١٠٣.

عەباسخانی سەردار رەشید کوڕی عەلی خانی کوڕی محەمەد سادق خانی کوڕی ئەمانوڵڵاخانی والی ئەردەلانە[1] لەساڵی ١٩٢٦دا هەندێك رووداو لە باشوری ئوستانی کوردستاندا روویاندا[2]. ئەم راپەڕینانە دووربوون لە سنووری جوڵەو قەڵەمڕەوی سمکۆی شکاکەوە. بەڵکو کەسێك لەپشتی ئەم راپەڕینانەوە بوو کە ئەویش سالار ئەلدەولە بوو.. لە هاوینی ساڵی ١٩٢٦دا سەرلەنوێ کەسێتییەکی گەشاوە لەسەر گۆڕەپانی کوردستان دەرکەوتەوە کە پێشتر لە سەروەختی شۆڕشی ١٩٠٥ـ١٩٠٦دا دەستی پێکردبوو ئەویش سالار ئەلدەولە بوو[3] کە کوڕی سێیەمی موزەفەرەدین بوو، لەساڵی ١٩٠٥دا کرایە والی کوردستان، چەندین جار بە یارمەتی‌و پشتگیری خێڵە کوردەکان لەدژی دەوڵەت راپەڕی.. لە شوباتی ١٩١٢دا دوای کۆکردنەوەی هێزەکانی، سالار ئەلدەوله راپەڕینی بەرپاکرد بە مەبەستی بەدەستگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەت‌و داوای لە هەموو کوردەکانی وڵات کرد پشتیوانی بکەن، لەپێشەوەی هەموو خێڵەکان ئەردەلان‌و خێڵەکانی ساوجبلاق هاریکارییان کرد[4]. سالار ئەلدەوله کە لەسەروبەندی جەنگی جیهانیدا لەسەر گۆڕەپانی سیاسی دیار نەما. لەساڵی ١٩٢٦دا جارێکی تر دەرکەتەوە.. سالار ئەلدەوله بە مەبەستی وروژاندن‌و هاندانی خێڵە کوردەکان دەستی دایە هەوڵێکی نوێ‌و پەیوەندی کرد بەسەر خێڵەکانەوە[5] مەبەستی سالار ئەلدەوله بەدەستگرتنی دەسەڵات بوو بۆ خۆی بەلام لەو سەروبەندەدا کە تێکەڵاوی زۆری لەگەڵ کوردەکان لەرێگای ژنخوازییەوە پەیداکردبوو، دەیتوانی کوردەکان لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بەکار بهێنێت.. بەڵام هەر لەوکاتەدا عەباس رەشید ئەردەلان کە خۆی لە بنەڕەتدا لە نەوەی ئەردەلانییەکان بوو، هەستی بەوە دەکرد کە بنەماڵەکەیان بە غەدر دەسەڵاتی (٦٤١) ساڵ فەرمانڕەواییان لەدەست دەرهێنراوەو هەمیشە خەونی بەوەوە دەبینی کە رۆژێ لە رۆژان بتوانێت ئەو سەروەرییە بگێڕێتەوە بۆ بنەماڵەکەیان، عەباس خانی سەردار رەشید پیاوی سەرکەشی ئەو دەمەی ئەم دەڤەرە بوو کە گەلێك جار شۆڕشی لەدژی

حکومەتە ناوچەییەکان هەڵدەگیرسان‌و یاخی بوو[٦] ئەم هەلەیشی قۆستەوە کە هانی خێڵە کوردەکان بدات بۆ پشتگیریکردنی سالار ئەلدەولە. کوردەکان بەشێوەیەکی بەربلاو کۆبوونەوەو بەشداری یەکتریان کرد بۆ پشتگیری سالار ئەلدەولە کە عەباسی خانیش هاوکاری بوو.. کوردەکانی کرماشان لەژێر دروشمی گێڕانەوەی قاجارییەکان بۆ سەر کورسی دەسەڵاتی ئێران راپەرینۆ بەزوویی دەسەلاتیان کرد بەسەر سەردەشت‌و سنەدا[٧]. بەلام بەپێی بۆچوونی لازاریف سالار ئەلدەولە کە پیاوێکی پیری نیمچە خەڵەفاو بوو نەیدەتوانی سەرکردایەتی هێزێکی وەها بکات‌و تازە سەرلەنوێ دەسەلاتی بەسەرچووی قاجارییەکان بگێڕێتەوە. سەردار رەشیدیش کە لەو سەروەختەدا گەڕابووەوە ناوچەی رەوانسەرو بەتەنیا توانای سەرکردایەتی‌و رابەرایەتی بزووتنەوەیەکی کوردی نەبوو لەپێناوی گێڕانەوەی دەسەلاتی لە دەستچووی ئەردەلاندا بوو بووە پاشکۆی سالار ئەلدەولەو لە هەموویشی سەیرتر ئەوەیە کە سالار ئەلدەولە دەیویست بە پاڵپشتی کوردەکان دەسەلاتی لەدەستچووی قاجاری بگێڕێتەوە. بە وتا وەکو مامۆستا عەلائەدین سەجادی دەڵێت: هەردووکیان شەریکی ئەك دەربەوون[٨]. سالار ئەلدەولە تەختی فەرمانڕەوایی ئێرانی لەدەست چوو بوو لە خەونی گەڕانەوەدا بوو بۆ سەر کورسی دەسەلات. سەردار رەشید ئەردەلانیش پاشی نزیکەی سێ چارەکە سەدە لە روخاندنی میرنشینی ئەردەلان ئومێدی ئەوەی هەبوو ئەو دەسەلاتە زیندو بکاتەوە، لەو پێناوەشدا لە سەرەتادا توانی هێزێکی باشی خێڵە کوردەکان کۆ بکاتەوەو تەنانەت هەندێ ناوچەی دیاری وەکو سەردەشت‌و سنە بگرێتە دەست، بەلا، دیارە نە ئەوو نە سالار ئەلدەولە نەیانتوانی لەبەردەم هێرشی هێزەکانی رەز شادا خۆیان رابگرن، بەڵکو دوای تێکشکان ناچار بوون بەرەو عێراق رابکەن. بەشێك لە خێڵەکان بە زوویی خۆیان دایە دەستەوەو تەنانەت داوای لێبوردنشیان کرد. بەشێکی تریشیان ئامادە نەبوون خۆبدەنە دەستەوە

تەنانەت هەندێ لەو سەرخێڵانەی کە تەسلیمی دەوڵەت بوون دواتر هاریکاری دەوڵەتیان کرد بەدژی ئەو خێڵانەی کە خۆیان نەدابووە دەستەوە.

لازاریف دەڵێت: لەژێر سایەی سالار ئەلدەولەدا هەموو لایەنەکانی خێڵە کوردییەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئێران و ناوچە نزیکەکانی عێراق لەوێوەوە کۆبوونەوەو لیژنەیەکی کوردی بۆ کاری هاوبەش لەسەر خاکی ئێران پێکهات[9] کە توانیان هێرشی بەرێڵاو بکەنە سەر هێزەکانی دەوڵەتی ئێران ئەویش لەبەر ئەوەی کە رقیان لە دەوڵەت بوو هەروەها هۆکارێکی تریش باری خراپی ئابووری بوو کە خەڵکەکە ئەوەیان بە لاوازیو کەمتەرخەمی دەوڵەت دەزانی، هەرچەندە باسی ئەوەش دەکرێت کە ئەم ڕاپەڕیوانە ویستو ئارەزووی نەتەوەیشیان هەبوو بێت. هەروەك گوایە یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ڕاپەڕینەکە.. هەوڵدان بوو بێت بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی لەسەر خاکی ئێران بەتەنیا[10] بەڵام کاتێ سەرنجی شێوەو پێکهاتنی ڕاپەڕینەکەو خودی سەردار رەشید ئەردەڵانو پەیوەستبوونی بە سالار ئەلدەولەوە بدرێت ئەوە گومان لەوە دروست دەبێت کە ئەم ڕاپەڕینە لەپێناوی دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیدا بووبێت. لەم بارەیەوە حەسەنی ئەرفەع کە ئەفسەرێکی ئێرانی بەشدار بووە لە شەڕی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەدا دەڵێت: ئەم شەڕانە لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەو شەڕانەی کە لەدژی سمکۆو کوردەکانی ئازربایجاندا ئەنجام درا شایانی بەراورد کردن نەبوو، لەبەر ئەوەی کوردەکانی ئەم مەڵبەندە لەپێناو سەربەخۆییو ئۆتۆنۆمی کورددا نە دەجەنگان بەڵکو ئامانجی ئەوان پاراستنی دەسەڵاتی ناوخۆیی خۆیان بوو(11). بێگومان لەڕووی لێکدانەوەو سەرنجدان بۆ باری کۆمەڵایەتی ئەو کاتەی کوردستانو ئێرانیش بەگشتی ئەوە ئاشکرا دەبێت کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هێشتا پێکهاتەی خێڵایەتی بوو. هێزی باڵادەست هێزی خێڵ بوو. نفوزیش تەنیا نفوزی سەرخێڵ بوو بۆ نموونە ئەوەندەی سەردار رەشید ئەردەڵان وەکو ئەوەی بنەماڵەی ئەردەڵانو ئەوەندەی ناوی مەحمود خانی

کانی سانان‌و مەحمود خانی دزلی‌و جافر سانی لهۆنی‌و سەرخێڵەکانی تر ناویان دەهات، ئەوەندە باسی جەماوەرو خەڵکی کوردستان نەدەکرا. هەریەکە لەمانەش وەکو سەرخێڵ مەیلداری گەڕانەوەی دەسەڵاتی قاجاری بوون چونکە لەسایەی ئەو دەسەڵاتەدا خێڵ‌و عەشیرەتەکان جۆرە سەربەخۆییەکیان لە ناوچەکانی خۆیاندا هەبوو، بەڵام بەرنامەی رەزا شا ملکەچکردن‌و چەککردنی خێڵەکان بوو هەتا دەوڵەت بتوانێت دەسەڵاتی خۆی لە هەموو جێگایەکی وڵاتدا بیسەپێنێت.

راپەڕینی خێڵەکانی کوردستانی ژێر سایەی دەسەڵاتی ئێران زیاتر بۆ پاراستنی ئەو سەربەخۆییە سنووردارەیان بوو، بانگەشەی سالار ئەلدەولەو لەپاڵپشتیدا عەباسی رەشید ئەردەڵان بە ئاراستەی بەدیهاتنی خەونەکانی ئەوان بوو، بۆیە بەشێوەیەکی بەرپلاو بەشدارییان لە راپەڕیندا کرد. ئەگینا هیچ بەڵگەیەکی زیندوو لەئارادا نییە کە سەلمێنەری هەست‌و هوشیاری نەتەوەیی بوویێت لەلای عەباس سەردار رەشید ئەردەڵان‌و لەلای سەرخێڵەکانیش. ئەوەش شتێك نییە وەکو رەخنەو کەموکورتی سەیر بکرێت بەئەندازەی ئەوەی کە قسە کرلنە لە واقیعێك کە بەو جۆرە بووەو هێشتا لەڕووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییەوە ناسیونالیزم دەرنەکەوتووەو ئەگەر تاکی زۆر کەمی ناسیونالیستیش هەبوویێت ئەوە نەك هەردەوریان نەبووە لەو راپەڕینەدا بەڵکودەریش نەکەوتوون.

ئەوەی کە لازاریف باسی لێوە دەکاتە گوایە هەوڵدراوە بۆ دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی، پێم وایە قسەیەکە ناسەلمێنرێت چونکە نە ئەو پێکهاتە خێڵایەتیە لەو ئاستەدا بووە کە هوشیاری دروستکردنی دەوڵەتی هەبێت، نە لەڕووی بنەماکانی سیاسەت‌و کۆمەڵناسییەوە دروستکردنی دەوڵەتی نوێ ئەرکی خێڵە، ئەگەر لە روانگەی دروستکردنی دەوڵەتی خێڵیشەوە سەیر بکەین ئەوا بەلایەنی کەمەوە دەبێت فیدراسیۆنی خێڵایەتی دروست بێت، مەبەست لە فیدراسیۆنی خێڵایەتیش ئەوەیە کە جۆرە یەکگرتن

یەکبوونێك لەنێوان خێڵەکاندا دروست بێت کە ببێتە بنەما بۆ دروستکردنی یەکێتییەکی بەرفراوانترو خاوەنی یەك بڕیارو یەك دەنگو یەك ئابووریو یەك هێزی پاراستن، کە لەوەشدا زەمینە بۆ دروستکردن یان دروستبوونی دەوڵەتی خێڵ دەڕەخسێت، بێگومان نەك لەنێوان خێڵە کوردەکان ڕۆژهەلاتی کوردستاندا ئەو فیدراسیۆنە دروست نەبووە، بەڵکو بەدرێژایی مێژوویی کورد خێڵی کورد نەیتوانیووە ئەو فیداسیۆنە دروست بکات چونکە پەیوەندی خوێنو دەماری خێڵایەتی کوردی ئەوەندە گرژو ئاڵۆز بووە نەیتوانیووە لەنێوان خۆیدا یەکگرتن یان یەکبوون دروست بکەن.

بێگومان لەڕووی پەرەسەندنی ناسیونالیزمیشەوە نەك بۆ ئەو قۆناغە مێژووییە کە هێشتا ناسیونالیزمی نەتەوە بالادەستەکانی دەوروبەری کوردستانیش بەشێوەیەکی ئاشکرا نەبوو بووە بەرنامەی هێزێکی جەماوەری، بەڵکو تاکو ئێستاش ناسیونالیزمی کوردی تەنیا لە قسەو نووسیندا بوونی هەیە ئەگینا لەسەر زەمینەی واقیع بوونی نییە، کەواتە ئەو دەوڵەتە نەتەوەییەی کە لازاریف باسی دەکات لەسەر زەمینەی واقیع نە باسی هەبووەو نە بەرنامەی دروستکردنیشی هەبوو بەڵکو قسەکەی حەسەنی ئەزفەع نزیکترە لە راستییەوە کە راپەڕینی سەردار رەشدو خێڵەکانی تر تەنیا بە مەبەستنی پاراستنی دەسەلاتی ناوچەیی خۆیان بووەو بنەمای نەتەوەیی نەبووە، هەر ئەوەش وا دەکات کە راپەڕینەکە نەتوانێت درێژە بەخۆی بدات یان کە جێگایەتی گرت پارێزگاری لێ بکات، چونکە روانینو ئاسۆی خێڵایەتی تەسکەو بەرهەمهێنی ستراتیژێکە کە پێی دەوترێت ستراتیژی خێڵایەتی کە ئەویش بریتییە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خێڵ. لەکاتێکدا بزوتنەوەی ناسیونالیزمی بزوتنەوەیەکی جەماوەرییە هەموو سنوورو دیوارەکانی نێوان پێکهاتەکانی نەتەوە دەڕووخێنێت. کە بێگومان ئەم بزوتنەوە جەماوەرییە لەو راپەڕینەدا بوونی نەبووە، جگە لەوە نە سەردار رەشیدو نە سەرخێڵەکانیش گوتەیەك، بەیانێك، نووسراوێك، رایەکی ئەوتۆیان لێ بەجێنەماوە کە دوور یان

نزیـك بـاس لـه كـوردو سـەربەخۆیی‌و دەوڵـەتی كـوردی بكـات، لـەڕووی دۆكیۆمێنتیشەوە كە چۆن بزوتنـەوەكانی شێخ عوبەیدوڵڵای نـەهری‌و شێخ سـەعیدو شێخ مـەحمودو سمكۆو بـارزانی بەسـەدان دۆكیـۆمێنتی دەوڵـەتانی پەیوەندیدارو خـودی بزوتنـەوەكان ئـەمڕۆ وەكو شـاهید بـەكار دەهێنرێت بـۆ ئاخـاوتن لەسـەر كردنـی بەرنامـەو سـتراتیژی ئـەو بزوتنەوانـە، ڕاپەڕینەكـەی سەردار رەشید تاكو ئێستاش لەڕووی دۆكیومێنتەوە شتێكی ئەوتۆی لـەبارەوە نییە كە پرۆژەی پەیوەست بەكوردی ئەو دەربخان.

كەواتـە دەتـوانین بـە راشـكاوی بڵـێین راپـەڕینی سـەردار رەشـید ئـەردەڵان راپەڕینێكی خێڵایەتی بەربڵاو بووە لەپێناوی گێڕانەوەی دەسـەڵاتی میرنـشینی ئەردەڵانـدا، ئـەو لـە روانگـەو بۆچـوونی سـەردار رەشـید خۆیـەوە، هـەروەك راپـەڕینێك بـووە بـۆ پاراسـتنی دەسـەڵاتی سـنووورداری خێڵـە كوردەكـان لـە روانین‌و بۆچوونی ئەو خێڵانەوە كە بەشداری راپەڕینەكەیان كردووە. هـەر بـەو پێیە گوتاری ئەم راپەڕینە گوتـاری خێڵایـەتنی دلخـراوی مـەودا تەسـك بـووەو سەرباری ئەوەی لەسەر خاكی كوردستان روویداوە بەڵام خاسێتی نەتەوایـەتی كوردی نەبووە ناشێت‌و وەكو بزوتنەوەیەكی كوردایەتی سەیر بكرێت، هەر بـەو پێیـەش هـەڵگری گوتـاری نەتـەوەیی كـوردی نـەبووە، هەرچـەندە لازاریـفو مامۆستا عەلائەدین سەجادی وەكو بزووتنەوەیەكی نەتەوەیی كـوردی سـەیری دەكەن، بەڵام لەڕووی زانستییەوە بۆچوونەكانیان ناسەلمێنرێت.

## سەرچاوەكانی بەشی (٢٤)

١ـ عەلائەدین سەجادی ـ مێژووی.راپەڕینی كورد ـ ئینتیشاراتی محەمەدی ـ چاپی دووەم ـ ١٩٩٦ ـ ل ٤٨.

٢- حەسەنی ئەرفەع ـ كوردەكان، وەرگێڕانی سەردار محەمەد، سلێمانی ـ ٢٠٠١، ل١٠٠.

٣ـ م.س. لازاريف ـ النظال و الإخفاق ـ المسألة الكردية في سنوات (١٩٢٣ـ١٩٤٥) ـ ترجمة صادق الجلاد ـ سليمانية ٢٠٠٦ ـ ص١٣٨.

٤ـ م.س. لازاريف ـ المسألة الكردية (١٨٩١ ـ ١٩١٧) ترجمة أكبر أحمد. مركز كردستان للدراسات الستراتيجية ص٣٦١.

5- David Macdowall, A Modern History of the Kurds. London, 2000, p:..

٦- حەسەن ئەرفەع ـ كوردەكان، ل١٠٠ـ١٠١.

٧ـ م. س. لازاريف ـ النظال و الإخفاق ـ ص١٣٨.

٨ـ عەلائەدین سەجادی ـ مێژووی راپەڕینی كورد، ل٤٩.

٩ـ م. س. لازاريف ـ النظال و الإخفاق، ص١٣٩.

١٠ـ م. س. لازاريف ـ النظال و الإخفاق، ١٣٩.

١١ـ حەسەن ئەرفەع ـ كوردەكان ـ ل١٠٢.

شێخ مەحمودی بەرزنجی کە لە (١٨٨٢ـ١٩٥٦) ژیاوە. لە بنەماڵەیەکی دیارو پایەداری کوردستانە کە بە ئاشکرا لەسەر وەختی شێخ مارفی نۆدێ وە ئەم بنەماڵەیە دەرکەوتوون کە شێخ مارف لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا زانایەکی ئایینی پایە بەرزی سنووری دەسەڵاتی میرنشینی بابان بووەو رێبەری رێبازی قادر بووە لە ناوچەکەداو دواپلەی زانستی کە پێی گەیشتووە سەرۆکی دەستەی زانایان بووە لە سنووری قەڵەمڕەوی باباندا، هەرچەندە دواتر ئەو پلەیە دەدرێت بە مەولانا خالیدی جافی مکایەڵی نوێکەرەوەی رێبازی نەقشبەندی.

لەدوای شێخ مارف، کاك ئەحمەدی شێخ پیاوێکی دیارو زانا بەناوبانگی ئەم بنەماڵەیە بووە. شێخ مەحمود لەسەر زەمینەی دیارو ئامادەی ئەم بنەماڵە ئایینیە ناسراوەی کوردستان پەروەردە بووەو خۆیشی خاوەنی تواناو لێهاتوویەکی تایبەتی ئەوتۆ بووە کە هەم لەنێو ئەندامانی بنەماڵەکەیو هەم لە سنووری سلێمانیو هەم لەسەر ئاستی کوردستانی ئەو کاتەش بووەتە کەسێتییەکی ناسراوو دیارو بەناوبانگ کە لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستاندا ئامادە بوونی هەبووەو وەکو سەرۆك و'رابەر بەتایبەتی لە خوارووی کوردستاندا ناسراوە. ئەوە ئاشکرایە کە شەهیدکردنی شێخ سەعید لە موسڵ بەشێوەیەکی نامەردانەو زیاتریش بە تاکتیكو بەرنامەی ئیتیحادو تەرەقی دوای ئەوەی کە شێخ سەعیدو بنەماڵەکەی دووچاری دوور خستنەوە لەزێدی خۆیان هاتنو رەوانەی موسڵ کران، کاریگەری زۆری لەسەر شێخ مەحمودی لاو هەبووە، دوای ئەو دوورخستنەوەیە کە دەبوو لەوێ بحەوانایەتەوە بەڵام لەوێش نەیانیەڵا بحەوێنەوە، شێخو ژمارەیەکی دیار لە کەسو کارو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون شەهید کرانو خودی شێخ مەحمودیش بریندار کرا.

بێگومان بە زۆر راگواستن لە سلێمانیو شەهید کردنی باوکیشی لە موسڵ بە تەمەنێکی زۆرەوە، دەوری دیاری هەبووە لەسەر هەستو سۆزی شێخ مەحمودو سەریاری ئازایەتیو چاپوکیو لێهاتوویی خۆی ئەوەش لە ژیانی

دواتــری شــێخ مــەحموددا دەوری لەبەرچــاوی هــەبوو بێگومــان لــەڕووی مەعنەویشەوە شێخ مەحمود پیاوێکی بەهێز بوو چونکە لە دەرەی کەسێتی خۆیشی دوو هۆکاری زۆر بەهێز کاریان لە باری مەعنەوی ئەو کردووە، یەکەمیان پێگەو ئامادەبوونی هەرە دیاری بنەماڵەکەیان، دووەم تراژیدیای شەهید کردنی باوکی کە ئەوەش بۆ شێخ مەحمود بووەتە خاڵێکی بەهێز لەڕووی مەعنەوییەوە. ئەمانەو چەندین هۆکاری تریش دەوری کاریگەرییان بینیووە لە پەیوەستبوونی شێخ مەحموددا بەکوردو کێشەی کوردەوە. ئەمە سەرباری لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانیو دروستبوونی جۆرێك لە بۆشایی لە ناوچەکەداو هەر بەو پێیەش نەیارەکانی بنەماڵەی شێخ لەگەڵ لاوازبوونی تورکەکاندا لاواز دەبوونو بەتایبەتی ئەو لقەی ئیتیحادو تەرەقی کە لە سلێمانی بوو سەرۆکەکەی مەحمود پاشای جاف بووە لەگەڵ ئەو بازرگانو دەوڵەمەندانەدا کە چارەی شێخانیان نەدەویست بەرەو لاوازیو شکست چوونو کەسێتی بەهێزی شێخ مەحموود هەموو ئەوانی شاردەوە، تەنیا مەگەر بیانتوانیایە لەژێرەوە پیلان رێك بخەن. لەو سەروبەندەدا.. شێخ مەحمودی ئازاو چاونەترسو بزێو کەوتە هەوای ئەوەی لە بەشێك لە نیشتمانەکەیدا دەوڵەتێك دابمەزرێنێت کە لەژێر ئاڵای ئەو دەوڵەتەدا هەوڵبدات کوردیش وەکو میللەتانی تر لە سنووری خاکی نیشتمانەکەیدا بە ئاسوودەییو شادمانی بژی[1].

ئێمە بە ئاشکرا نازانین هەستی نەتەوایەتی لای شێخ مەحمود لە کەیەوە دەرکەوتووەو ئاستی ئەو هەستکردنە چەند بووەو چۆن ئەو هەستەو هەستی مسوڵمانی بوونو فاشری بوون پێکەوە لە کەسێتی شێخ مەحموددا کۆبوونەتەوەو پێکەوە گونجاونو کاریان کردووە؟ هەروەك نازانین کام ئاراستە لەو دوانە لەویتریان بەهێزتر بووە؟ ئایا قسەکردن لەسەر کەسێتی شێخ مەحمود وەکو ناسیونالیستێکی مسوڵمان تا چەندێ لەجێگای خۆیدایە؟ ئایا ناسیونالیزمی کوردی لەسەردەمی شێخ مەحموددا دەرکەوتووەو بووەتە

ئایدیاو بەرنامەیەکی جەماوەری؟ ئایا سنووری روانینی شێخ مەحمود تەنیا لە ناوچەی سلێمانیو قەڵەمرەوی باباندا بووە یان هەموو ولایەتی موسڵی گرتۆتەوە؟ یان لە ئاستێکی بەرفراوانتردا ئایا شێخ مەحمود هەموو کوردستانی ژێر سایەی تورکو فارسی وەکو یەك بینیووەو ئومێدی ئەوەی هەبووە یەك دەوڵەتی یەککگرتوو لە هەموو کوردستاندا دروست بکات؟ ئایا یاریکردنی شێخ مەحمود لەنێوان تورکو ئینگلیزەکاندا چۆن لێك دەدرێتەوە لە روانگەی پرسی کوردەوە؟ ئایا شێخ مەحمود خاوەنی گوتاری نەتەوەیی کورد بووە؟ یان لە ئاراستەیەکی تردا گوتاری راپەرینەکانی شێخ مەحمود چ گوتارێك بووە؟ گوتاری نەتەوەیی کوردی بووە یان گوتاری ئیسلامی کە کوردیش لەچوارچێوەی ئەو گوتارەدا بێت؟

بێگومان بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە پێویستمان بە زانینی زۆر لایەنی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئایینیو مێژوویی ئەو سەردەمەی کوردستانو دەوڵەتانی ناوچەکەو دەوڵەتانی بریار بەدەستی دنیاو بەرژەوەندیو ململانێ نێو دەوڵەتیەکان هەیە. ئەوەش بۆ ئەوەیە تا بتوانین بە ئاسۆیەکی روونەوە شوێنی راپەرینەکانی شێخ مەحمود لە گوتاری نەتەوەیی کورددا دیاری بکەین. هەرچەندە پێشتر ئێمە لەبارەی ناسیونالیزم لەسەردەمی شێخ مەحمودا ئاخاوتنمان کردووەو گەیشتووین بە هەندێ دەرئەنجام کە بە گشتی لەوەدا کۆدەبنەوە کە لەسەردەمی شێخ مەحموددا ناسیونالیزمی کوردی وەکو ئایدیۆلۆژیایەکی جەماوەری دەرنەکەوتووە[٣] یان راستتر بڵێین ناسیونالیزمی کوردی دەرنەکەوتووە، کە لە ئاستێکی تردا ناتوانین باس لە بوونی گوتاری نەتەوەیی بکەین لەو روانگەیەوە کە گوتاری نەتەوەیی راستەوخۆ بەندە بە ناسیونالیزمەوە.

ئەوەی ئاشکرایە کە هەتا دەرکەوتنی ئیتیحادو تەرقی بنەماڵەی شێخ مەحمود واتە چ لەسەر وەختی شێخ مارفو چ لەسەردەمی حاجی کاك ئەحمەدداو چ لەسەردەمی شێخ سەعیددا پەیوەندییان لەگەڵ بابی عالی باش

بووەو تورکەکان لەبەر چەند هۆیەك رێزی بنەماڵەکەی ئەمانیان گرتووە، یەکەم لەبەر ئەوەی ئەم بنەماڵەیە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیارو لەبەرچاوو بەهێزیان لەناو کۆمەڵگای کوردیدا بەگشتیو لە ولایەتی موسڵ بەتایبەتیو لە سلێمانیو دەوروبەریشدا بەتایبەتیتر هەبووە، راستە کەسانێك هەبوون دژی نفوزو دەسەڵاتی مەعنەویو رۆحیو کۆمەڵایەتی ئەم بنەماڵەیە بوون، بەڵام تا سەردەمی ئیتیحادو تەرەقی رقی هەندێ کەسو خێڵ لەم بنەماڵەیە نەیتوانییوە رای تورکە عوسمانییەکان لەبەرامبەریاندا بگۆڕێت.

هەرچەندە شێخ مارفی نۆدێ تەنیا وەکو پیاوێکی زاناو رابەری تەریقەتی قادری دەرکەوتووەو پەیوەندی ئەو لەگەڵ تورکەکاندا دیار نییەو، لەوەش ناچێت لەسەروەختی خۆیدا بە باشی لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی بابان ناسرابێ، بەڵام پەیوەندی باشی ئەو لەگەڵ میری بابان ناڕاستەوخۆ ئەوە دەگەیەنێت کە لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو سەردەمەدا ناکۆکی نەبووە. پلەو پایەی زانستیو رابەرایەتی تەریقەتیش یارمەتیدەر بوون بۆ چەسپاندنی کەسێتی خۆی بەجۆرێك کە حیسابی بۆ بکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناڕاستەوخۆ عوسمانیەکان پشتی شێخ مارفیان گرتووە بەتایبەتی کاتێ کە بابانەکان مەولانا خالیدیان دەرکردووە لە سلێمانی رێگا بۆ شێخ مارف چۆڵ بووە، عوسمانیەکان بێدەنگ بوون چونکە وەکو ئەوەی ریچ دەڵێت: عوسمانییەکان لەوە ترساون کە مەولانا مەزهەبێکی تایبەتی لە کوردستان دابمەزرێنێ کە ئەوەش زیانی هەبێت بۆ بەرژەوەندی ئەوان [٣] کەواتە لێرەدا دەشێ وای بۆ بچین هۆی سەرەکی ئاوارەکردنی مەولانا لە سلێمانیو هەڵکەندنی لە زێدی خۆی بەلای عوسمانیەکانەوە ئەو مەترسیە کەم دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا پێناچێت نە بابانییەکانو نە عوسمانییەکان هیچ مەترسییەکیان لە شێخ مارفو سەیدی بەرزنجە هەبووبێت.

دوای شێخ مارف، کاك ئەحمەدی کوڕی کە پیاوێکی زاناو داناو لێهاتووی بواری ئایینو کۆمەڵایەتی بووە، ناویانگی بنەماڵەکەیانی زیاتر بەرز کردەوە

پێگەی کۆمەڵایەتی کاک ئەحمەد زۆر بەهێز بوو، ئەوەش وایکردبوو لە هەموو لایەکەوە ڕێزی لێبگیرێت، بەتایبەتیش لەلایەن زۆرێك لە سەیدو شێخەکانی کوردستانەوەو زیاتریش لەلایەن ئەوانەی کە سەر بە ڕێبازی قادری بوون. ئێستا لەدوای شێخ مارف کاك ئەحمەد لەجێگای ئەودا بوو. بێگومان پەیوەندی کاك ئەحمەد لەگەڵ تورکەکاندا ناکۆکیو ناڕێکی پێوە دیار نەبوو، محەمەد ڕەسوڵ هاوار دەڵێت: کاك ئەحمەدی شێخ وەکو پیاوێکی ئێجگار زاناو خوێندەوارو شارەزا لە ئاییندا وای لە کاربەدەستانی عوسمانلی کردبوو کە حیسابێکی زۆر تایبەتی بۆ ئەو بنەماڵەیە بکەن(٤) تەنانەت سەرەتای ملکداربوونی ئەم بنەماڵەیە لەسەردەمی کاك ئەحمەدی شێخەوە دەست پێدەکات کە عوسمانییەکان بڕیار دەدەن کە زەکاتی چەند گوندێکی بۆ ببڕنەوە. هەروەك کاك ئەحمەد لایەنگری عوسمانییەکانی کردووە لە شەڕی دژی ڕوسەکاندا کە هێزێکی بە سەرۆکایەتی شێخ سەعیدی کوڕەزای بۆ ئەو شەڕی ناردووە ئەمەش بەڵگەی بەهێزی پەیوەندی کاك ئەحمەد بووە بە سوڵتانی عوسمانییەوە دیارە سەرباری بەرژەوەندی هۆکاری سەرەکی پشتگیری کردنی کاك ئەحمەد لە سوڵتانی عوسمانی پەیوەندی بە مەسەلەی ئایینەوە هەیە کە دواتر لە باسی گوتاری شێخ مەحمودو ڕاپەڕینەوە لێی دەدوێین.

لەدوای کاك ئەحمەدی شێخ لەنێو بنەماڵەکەیاندا شێخ سەعیدی کوڕەزای واتە (حەفید) لە هەموویان دیارتر بووەو چ لە ڕووی ئایینییەوە ئەو وەکو جێگرەوەی باپیری سەیرکراوەو تەنانەت عوسمانییەکان لەدوای کاك ئەحمەد ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە شێخ سەعیدە کردووە. تەنانەت شێخ سەعید دەستیگرتووە بەسەر هەموو ئەو موڵكو زەوىو زارانەدا کە عوسمانییەکان بەخشیبوویان بە باپیرىو تەنانەت ئەو موڵکانەی زیاترو فراوانتریش کردووە بەتایبەتی لەسەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیزدا. هەرچەند قسەی ئەوەش هەیە کە شێخ سەعید مامو ئامۆزاو براکانی زەوىو موڵکێکی زۆریان لە دەوڵەتی

عوسمانی کرِیبێت یان ئەو زەوییانەی کە ئەمیریّ بوون واتە مولکی حکومەت بەکرێیان گرتبێتو پاشان بوویێتە مولکی خۆیان، رەنگە دەستیان بەسەر زۆر زەویو زاریشدا گرتبێت بەتایبەتی لە لاواز بوونی دەوڵەتی عوسمانیدا، بە هەر حاڵ پەیوەندی شێخ سەعید لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا بەهێزبووەو تەنانەت شێخ سەعید دووجار چووەتە ئەستەمبوڵو جاری دووەمیان وەکو سەردانو بۆ نیشاندانی وەلاء و دڵسۆزی بووە کە لەویّ سوڵتان عەبدولحەمیدی بینیووەو سوڵتان زۆر رێزی لێگرتووەو تەنانەت شفرەو موخابەراتی نهێنی خۆیی داوە بە شێخ سەعید کە لەکاتی پێویستو تەنگانەو بەپێی ئەو شفرەیە بە تەلگراف سوڵتان ئاگادار بکات[٥]. لێرەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە شێخ سەعید پەیوەندییەکی باشی هەبووە لەگەڵ بابی عالیدا. ئەم سەردانەی شێخ سەعید لەساڵی (١٩٠١ـ١٩٠٢)دا بوو واتە پێش دروستبوونی ئیتحادو تەرەقیە. ئەمەش ئەو راستیە دەردەخا کە گوتاری شێخ سەعید وەکو گوتاری کاك ئەحمەدی شێخو گوتاری شێخ مارفی نۆدیّ ئاراستەیەکی جیاوازی نەبووە لە گوتاری بالادەستی دەوڵەتی عوسمانی کە گوتارێکی ئایینی هەمەلایەنە بووەو لەسەر بنەمای یەکێتییو یەکبوونی گەلانی مسوڵمان بەرهەم هاتووە، بە واتا گوتارێك کە جیاوازی ئیتنیکیو مێژوییو رەنگو.. تێدا ناکرێت.

ئاشکرایە لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٠٨دا تورکیا گۆڕا بۆ مەلیکیەتی دەستووری ئەویش لە ئەنجامی کودەتای تورکە لاوەکانداو دەسەلاتی سوڵتان بەو شێوەیە کۆتایی پێهات، هەرچەندە تورکە لاوەکانیش سەرباری ئەوەی نوخبەی رۆشنبیری ناسیونالیستی تورکو بۆرژوای ساواو تازە دەرکەوتوویوون بەلام لەماوەیەکی کورتدا کەوتنە پیادەکردنی سیاسەتێکی شۆڤێنیانە، وەك ئاشکرا پێشتر نوخبەی کوردی رۆشنبیر لە تورکیا لایەنگری تورکە لاوەکان بوون بەلام کاتیّ بۆیان دەرکەوت کە تورکە لاوەکان بە عەقڵییەتێکی شۆڤێنیستانەی تورکیەوە کار دەکەن لێیان دوور کەوتنەوەو کەوتنە دروستکردنی یانەو کۆمەڵەی کوردی.

هەرچەندە دەنگۆی ئەوەش دەبیسترێت کە شێخ سەعیدی حەفید لایەنگری عەبدولحەمید بووەو نەیویستووە بەشداری تورکە لاوەکان یان ئیتحادو تەرەقی بکاتو تەنانەت ئەوەی بە ناپاکی کردن لە سولتان عەبدولحەمید زانیبوە.

هەر بۆیە کاتێ ئیتیحادو تەرەقی داوا لە شێخ سەعید دەکەن کە یان خۆی یان یەکێك لە کوڕەکانی سەرۆکایەتی لقی دەرەوەیان بکات، ئەو رەتی دەکاتەوەو ئەمەش پارەتیدەر دەبێت بۆ ئەوەی نەیارەکانی بنەماڵەی شێخ ئەو هەلە بقۆزنەوەو لەدژی شێخ سەعیدو شێخانی سلێمانی بەکاری بهێنن، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە لقی ئیتیحادو تەرەقی لە سلێمانی پێکدێتو مەحمود پاشای جاف دەبێتە بەرپرسی.

لێرەدا دەبێ ئەو راستییە بزانین کە لەکاتێکدا شێخ سەعید لایەنگری سولتان عەبدولحەمید بووەو بەو پێیەش گوتاری شێخ سەعید گوتارێکی ئیسلامی گشتگر بووە، گوتاری ئیتیحادو تەرەقی گوتاری ناسیونالیزمی تورکی بووە کە لە راستیشدا ناسیونالیزمێکی عەلمانیەو لەگەڵ ئایین پەیوەندییەکی ئەوتۆی نییە، هەر بەو پێیەش لقی سلێمانی ئیتیحادو تەرەقی یان هەر کەسو ئەندامێکی کورد لە ئیتیحادو تەرەقیدا بووبێت ئەوا بڕوای بە بەرنامەی ئەو کۆمەڵەیە هەبووە کە هەرچەندە لە سەرەتادا باسی ئازادیو دەستووری دەکرد بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا گەوهەرو ماهیەتی دەرکەوت کە رێکخراوی ناسیونالیزمی تورکەو تەنیا بڕوای بە تورکایەتی هەیە، کەواتە بەو پێیە هێشتا لایەنگری کوردێك بۆ بابی عالیو سولتان باشتر بووە لە لایەنگری بۆ ئیتیحادو تەرەقی لە روانگەی ئیسلامیەتی کوردەوە. یان هیچ نەبێت لەو روانگەیەوە کە دەوڵەتی عوسمانی خۆی بە دەوڵەتی هەموو مسوڵمانان نیشانداوە، بەم پێیە هەڵوێستی شێخ سەعید بۆ ئەو قۆناغە لەڕووی مەسەلەی ئایینو تەنانەت مەسەلەی نەتەوایەتیش گونجاوتربووە.

به هەرحاڵ ئەم هەڵوێستەی شێخ سەعید هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی دوور بخرێتەوە بۆ موسڵ و لەوێش بە پیلان و نەخشەیەکی نامەردانە شەهید بکرێت. هەتا کۆتایی ژیانی شێخ سەعیدیش ئەم بنەماڵەیە وەکو رابەری تەریقەتی قادری و بنەماڵەکی بەرێزی ئایینی دەرکەوتوون لە کوردستاندا، ئەوەی لەبارەی پەیوەستبوونیان بە کوردایەتییەوە دیاربێت یەکەم ئەو فەرهەنگە بچووکەیە کە شێخ مارفی نۆدێ بەناوی ئەحمەدییەوە بە عەرەبی و کوردی دایناوە، دووەمیان ئەو سەرگوزشتەیە کە گوایە کاک ئەحمەدی شێخ بە کوردی وانەی گوتووەتەوە کە دەتوانم بڵێم ئەمەش شتێکی ئاساییە و لەرووی گوتاری نەتەوەییەوە رەنگە وەکو یەکێك لە رەگەزەکانی ئەو گوتارە کە ئەویش زمانە سەیر بکرێت ئەگینا بۆ خۆی لەشێوەی گوتاری نەتەوەییدا فۆرمەلە نەبووە.

بێگومان لەدوای ئەم پێشەکیە کە پێشینەی رەچەڵەك و ئامادەبوونی مەعنەوی و پلەو پایەی بنەماڵەو پەیوەستبوونیان بە ئایینی ئیسلام و بە تەریقەتی قادری و بە ناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامییەوە دەردەخات کەسێتی شێخ مەحمود دێت کە ئەم وەکو کەسێتییەکی دیاری کوردی و ئیسلامی دەردەکەوێت. دەبێ ئەوەش بزانین کە لەرووی سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتییەوە ئەو پێشینە مێژووییە پەیوەندییەکی زۆری بە بونیادی کەسێتی شێخ مەحمودەوە هەیە، بەڵام دەبێ بزانین کە شێخ مەحمود ئەوکاتەی باوکی لە موسڵ شەهیدکرا ئەم تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو بەپێی ئەوەی کە لە راپۆرتی قونسولی بەریتانیادا هاتووە، بەڵام دیارە رووداوەکە لە مانگی کانوونی دووەمی ۱۹۰۹دا بووە کە ئەوەش بەپێی ئەو سەرچاوانەی باسی لەدایکبوونی شێخ مەحمودیان کردووە کۆك نییە، بە هەر حاڵ تەمەنی شێخ مەحمود لەو کارەساتەدا لەنێوان بیست و سێ بۆ بیست و حەوت ساڵ بووە، بەڵام دوای کارەساتەکە تا دەرکەوتنەوەی شێخ مەحمود لەدوای گەڕانەوەی بە بریندار لە موسڵەوە بۆ سلێمانی شێخ مەحمود ماوەیەك دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە

ناوچەی مەریوان، بەلام لەسەرویەندی هەلگیرساندنی جەنگی یەکەمدا شێخ مەحمود لەسەر مەیدانی رووداوەکان وەکو پیاوو سەرکردەیەکی دیارو ناسراو دەردەکەوێت. بەتایبەتی دوای ئەوەی بۆ پشتگیری تورکەکان جارێك بەدژی ئینگلیزەکان لە شوعەیبەو جارێکی تریش بەدژی روسەکان لە پێنجوێن سەرکردایەتی راپەرین دەکات. یەکەمیان بۆ بەرگریکردن لە دەسەلاتی عوسمانیو دووەمیشیان گوایە روسەکان بەرنامەی داگیرکردنی سلێمانیان هەبووە. هەتاکو ئەم قۆناغەش شێخ مەحمود وەکو کەسێك کە بڕوای بە بەرگریکردن لە دەسەلاتی سولتانی عوسمانی هەبێت دەردەکەوێت کە ئەو پێی وابووە دەسەلاتیَ عوسمانی بریتییە لە دەسەلاتی ئیسلامی. کەواتە دەتوانین بلێین تاکو ئەوکاتەی کە شێخ مەحمود بەشداری ئەو دوو شەڕە دەکات هێشتا بە ئاشکرا لە ئاستی دیار یان گوتراودا ناشێت بە هەلگری گوتاری کوردی دابنرێت. پێدەچێت هەستی پاراستنی نیشتمان شان بەشانی پاراستنی دەسەلاتی خەلافەتی ئیسلامی پالنەری بەشداریکردنی شێخ مەحمود بوو بێ لەو شەڕەدا کە ئەوەش زیاتر مەیلدارىو پەیوەستبوونی شێخ مەحمودی تاکو ئەو کاتە بە تورکەکانەوە نیشان دەدا. بە مانایەکی تر هەتا کۆتایی سالی (۱۹۱۷) چالاکی شێخ مەحمود وەکو بەشێك لە هەلوێستو شەڕی دژی ئینگلیزو روسەکان دەردەکەوێت کە بەوەش شێخ مەحمود دەبێتە هێزی یاریدەدەرو لایەنگری تورکەکان.

شێخ مەحمود لە مانگی نۆی سالی (۱۹۱۵)دا وەلامی نامەیەکی سەفوەت بەگی نوێنەری روسیای قەیسەری بەمجۆرە دەداتەوە: دوای سلاو برام سەفوەت بەگ، من نیشتمانم لە دڕەندەیی سوپای قەیسەر دەپارێزم هیواشم پێی نییەو پێویستیشم بە دیاری ئەو نییە سوپای قەیسەری خوێنڕێژ کوردی لەناوبرد. تۆ چاکم دەناسیت، من لەو دوژمنە ناترسم کە بیناسم. هەموو هیوام ئەوەیە کوردو کوردستان لەو دوژمنە رزگاری بێت، ئەوەی دەستی یارمەتیمان

بۆ درێژ بکات دۆستمانە، وەڵامی دوژمنەکانیشمان لە لوولەی تفەنگەکانمانەوە دەدەینەوە(٦).

ئەگەر بە وردی سەرنجی ناوەرۆکی ئەم نامەیە بدەین ئەوە دوو خاڵی گرنگمان بۆ دەردەکەوێت، یەکەمیان ئەوەیە کە لەساڵی ١٩١٥دا شێخ مەحمود هیوای ئەوەیە کە کوردو کوردستان لە سوپای خوێنرێژی روس رزگاری ببێت، کەواتە لێرەدا شێخ مەحمود وەکو سەرکردەیەکی کورد دەردەکەوێت کە دروشمی سەرەکی رێگای خەباتی کوردو کوردستانە، کەواتە لێرەدا سیمای کەسێتی ناسیونالیستێك لە بوونی شێخ مەحموددا بەرجەستە دەبێت کە ئەوەش گوتاری نەتەوەییەوە بایەخی تایبەتی خۆیی هەیە خاڵی دووەم ئەوەیە کە شێخ مەحمود بەگومانە لە هەڵوێستی رووسەکانو متمانەی ئەوەیان پێناکات کە ئەوان لایەنگری گەلی کوردی ژێردەستو زۆر لێکراو بن، لەمەشدا ناراستەوخۆ دەشێ وەهای لێکبدەینەوە کە شێخ مەحمود لە روانگەی جیاوازی ئایینەوە پێی وابێت روسەکان نەبنە دۆستی کوردیو هەرچۆن بێت دەشێت لایەنگری تورکەکان لەو روانگەیەوە بۆ کورد بەسوودتر بێت. بەلام بۆمان هەیە ئەو پرسیارە بەرز بکەینەوە ئایا ئەگەر شێخ مەحمود ببووایەتە لایەنگرو هاوکاری روسەکان دەشیا کورد کەڵکی وەریگرتایەو بە ئاراستەی سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەت هەنگاوی بنایەو لەم ئاقارەشدا رووسەکان پشگیری کوردیان بکردایە؟ بێگومان وەلامی ئەم پرسیارەش تەنیا لە سنووری گریمانو ئەگەردایەو دەشێ هەریەکەمان بەپێی روانین لێکدانەوەی خۆمان لەو مەسەلەیە بڕوانین، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بە بۆچوونی من پشت بەستنو لایەنگیری کردنی هەرکام لە دەوڵەتە دیارەکانی ئەو سەروەختە بۆ کورد لە تورکەکان باشتر بوو، چونکە هیچ کام لە دەوڵەتانی دیاری دنیا تەموحی ئەوەیان نەبوو کە کوردستان ببێتە بەشێك لە خاکی ئەوان، بەلام بەگوێرەی تورکەکان کە لەڕووی ئیدارییەوە نزیکەی پێنج سەدە کوردستانیان لەژێر دەستدا بووە، لەگەڵ دەرکەوتنی ناسیونالیزمی تورکیدا تەموحی تورکەکان لە

کوردستاندا ئاشکرابووەو وەکو بەشێك لە خاکی خۆیـان سـەیری کوردسـتانیان کردووەو بە پشت بەستن بە دەسەڵاتی رابردوویان رەوایەتی ئەوەیان بـەخۆیان داوە کـە کوردسـتان بەشـێك بێـت لـە دەوڵەتـە نوێیەکـەی ئـەوانو بـە هـیچ شێوەیەکیش دان نەنێن بە بـوونی کـورددا وەکـو رەگـەزو ئیتنیکێکـی جیـاواز، ئەم ئاڕاستەی ئیشکردنە هـەتاکو ئێستاش لـە عـەقڵی ناسیونالیزمی تورکیـدا ئامادەیـەو بەجـدی کـاری پێـدەکات، بـەڵام بەپێـچەوانەوە هــەموو وڵاتــانی پاشماوەی دەوڵـەتی عوسمـانی کـە کەوتنـە ژێـر سـایەی دەسـەڵاتی ئینگلیزو فەرەنـسییەکانەوە پاشماوەیــەك رزگاریــان بــوو بوونــە خــاوەنی دەوڵــەتی سەربەخۆی خۆیان.

کەواتە لێرەدا دەشێ بڵێین رەنگە بەسوودتر بووایە ئەگەر شێخ مـەحمود لـەو سەرەتایەوە ببوایەتە لایەنگری روسـەکان، بـەڵام باڵادەسـتی پاڵنـەری ئـایینی وای لە شێخ کرد کە لایـەنگری تورکـەکان بکـاتو بـەدژی روسـەکانو تەنانـەت ئینگلیزەکـانیش بجـەنگێت. بـۆ سـەلماندنی لایـەنگیری شـێخ مـەحمود بـۆ تورکەکان شێخ مـەحمود خـۆی لـەبارەی بەشـداریکردنی لەشـەڕی شـوعەیبەدا دەڵێـت: کـە شـەڕی یەکـەمی جیهـانی دەسـتی پێکـرد، منـیش وەکـو یـەکێکی لایەنگری دەوڵەتی عوسمانی ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارانی کـوردم کـۆکردەوەو چـووین بـۆ شـوعەیبە بـۆ بەریەسـتکردنی هێرشـی ئینگلیـز(٧) کەواتـە شـێخ مەحمود هیچ گومانو دوودڵیەکی نەبووە بەرامبەر بە عوسمانیەکان، ئەگەرچـی لــە راستیـشدا راســتەوخۆ یــان ناڕاســتەوخۆ تورکــەکان پەیوەنــدییان بــە شەهیدکردنی باوکییـەوە هـەبووە، بـەڵام لێـرەدا روویـەڕووی ئـەو لێکدانەوەیـە دەبینەوە یان ئەوەتا شێخ مەحمود هیچ رقو کینەو گیانێکی تۆڵەسـەندنەوەی نەبووە یان مەسەلەکە پەیوەندی بە هەستی هاوئایینیو بڕوابوون بەوەوە هەیە کە دەوڵەتی عوسمانی هەڵگری دروشمو ئاڵای ئیسلامە هەرچـەند قـسەو باسـی ئەوە هەیـە کـە شـێخ مـەحمود دوای ئـەوەی لـە ناوچـەی پێنجوێنو مـەریوان هێزەکانی روسیای تێکشکاند، لەسەر رەفتاری نابـەجێی تورکـەکان لـە تـاڵانو

برۆی خەڵکی ناوچەکە لە تورکەکان زویر بووەو ئومێدی پێیان نەماوە، بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئایا تەنیا ئەو زویربوونە بەسە بۆ ئەوەی شێخ مەحمود پشت لە تورکەکان بکاتو بیەوێت هاوکاری ئینگلیزەکان بکات؟ بێگومان ئەگەر ولامان دانا ئەوە تاکە هۆکاری پاڵنەر بوویێت کە هەڵوێستی شێخ مەحمودی گۆڕیبێت، ئەوا دەگەین بەو دەرئەنجامەی کە لە پشتی ئەو هەڵوێستەوە لێکدانەوەو بیر لێکردنەوە نەبووە بەو ئەندازەی کە کاردانەوە دەوری بینیووە لە گۆڕینی هەڵوێستی شێخ مەحموددا. هەرچەندە دوای تێکشکاندنی شێخ مەحمودو هێزەکانی تورك دەگەڕێنەوە بۆ ناسریەی ئێستا، تۆفیق وەهبی باسی ئەوە لەگەڵ شێخ مەحموددا دەکات کە تازە تورکەکان ئومێدی مانەوەیان نەماوەو باشتر وایە شێخ نامە بۆ ئینگلیزەکان بنووسێت بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵیاندا[٨].

بێگومان نازانرێت ئایا ئەو نامەیە کە تۆفیق وەهبی باسی دەکات رەوانە کراوە بۆ ئینگلیزەکان یان نا. بەڵام دواتر بەپێی سەرچاوەکان شێخ مەحمود دوو نامە بۆ ئینگلیزەکان دەنێرێت، نامەی یەکەمیان بەهۆی موحسین ئاغاوە بووە لە کفری نێردراوە بۆ ویڵسنی جێگری حاکمی گشتی ئینگلیز لە بەغدادو نامەی دووەمیشی ناردبوو بۆ ئینگلیزەکان لە کەرکوك کە ئەم نامەیە دوای پاشەکشێی ئینگلیزەکان لە کەرکوكو هاتنەوەی تورکەکان دەست تورکەکان کەوتووە، دواتر تورکەکان لەسەر ئەو نامەیە توانیان شێخ مەحمود لە سلێمانی دەستگیر بکەنو پاشان بەسەر پێی لەبەناو دادگایکردنیدا بڕیاریان دا شێخ مەحمود لەسێدارە بدەن. بەڵام دواتر عەلی ئیحسان پاشا کە تازە بوو بووە سەرلەشکری سوپای عوسمانی لە ویلایەتی موسڵدا بە ئومێدی ئەوەی شێخ مەحمود وەکو پیاوێکی خاوەن پلەو پایەی کۆمەڵایەتیو سیاسی لە ناوچەی سلێمانی بەدژی ئینگلیزەکان بەکار بهێنێت لێی خۆشبوو.

ئەوەی لێرەدا بەلای ئێمەوە گرنگە ناوەرۆکی ئەو دوو نامەیە کە شێخ مەحمود بۆ ئینگلیزەکانی نووسیووە.. هەتا بزانین لەو نامانەدا شێخ تا چ

ئاستیّ له کیّشەی کورد تیّگەیشتووەو ئایا دەتوانین لەسەر بنەمای ناوەڕۆکی نامەکان باس لە گوتاری نەتەوەیی شێخ مەحمود بکەین، شێخ مەحمود لە نامەکەیدا بۆ ویلسن دەڵێت: مەبەستی دەوڵەتە گەورەکان لە جەنگدا، هەروەکو لە بەیاننامەکەی سەرەك کۆماری ئەمەریکاو چەرچڵی شالیاری بەریتانیادا هاتووە، داننانە بە مافی گەلە مافخوراوەکانو سەربەخۆییاندا، ئێمە بەپێی باوەڕمان بەم بەیاننامەیەو بەڵێنەکانی دەوڵەتە گەورەکان هیوامان وایە لە چاوێکی سۆزەوە سەیری مەسەلەکەمان بکرێتو لە ڕزگارکردنی کوردستانو دەرکردنی تورکو بڵاوکردنەوەی بانگی سەربەخۆییدا یارمەتیمان بدەن.[٩]

ئەگەر سەرنجی ناوەڕۆمی ئەم نامەیەی شێخ مەحمود بدەین ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئێستا وەکو کوردێك کە پێشتر لایەنگری عوسمانیەکان بووە، ئەو لایەنگرییەی نەماوەو ئومێدی بەتورکەکان هەرەسی هێناوە، لە ڕووی سۆزیشەوە ئەو نامەی بۆ ویلسن نووسیووە چونکە جۆرێك لە بڕوابوونی بە قسەو پڕوپاگەندەکانی دەوڵەتانی گەورەی پێوە دیارە. بێگومان ئەوەش پەیوەندی بە بونیادی عەقڵی کوردیو کەسێتی کوردییەوە هەیە کە لە ڕاستیدا کەسێتییەکی تێکشکاوە ئەویش دیارە گەلێك هۆکاری مێژوویيو سیاسیو کۆمەڵایەتی کەلتوری هەبووە.

لە ناوەڕۆکی نامەکەدا باس لە ڕزگارکردنی کوردستانو دەرکردنی تورکەکان کراوە لەگەڵ بانگی سەربەخۆییدا، کە ئومێدی ئەوە دەخوازێت کە ئینگلیز بە چاوی سۆزەوە سەیری مەسەلەی کورد بکات بە واتا داواکاری شێخ مەحمود لەنامەکەیدا بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری ئەوانە وەکو دەوڵەتێکی بەهێزو خاوەن دەسەلاّت کە ئێستا هاتۆتە ناوچەکەوە بۆ ئەوەی یارمەتی ڕزگارکردنو سەربەخۆیی کوردستان بدەن بێگومان ئەم نامەیە بارگاوی کراوە بە بەشێك لە ویستو داواکانی کورد کە ئەوانەش بەشێکن لە ڕەگەزەکانی پرۆژەی ناسیونالیزم بەلاّم نازانرێت ئایا ئەو کوردستانەی کە شێخ مەحمود لە نامەکەیدا باسی دەکات هەموو کوردستانی گەورەیە یان تەنیا ولایەتی موسڵە

یان بەشێکە لە ولایەتی موسڵ؟ کە ئەوەش دەبێتە بنەماو پێوانە بۆ قسەکردنی لەسەر گوتاری شێخ مەحمود، بەڵام ئەوەی کە لە هەڵس‌وکەوت‌و دواتریش لەچوارچێوەی دەسەڵاتدارییەکەیدا دەردەکەوێت کە مەبەستی ئەو لە کوردستان زیاتر سلێمانی‌و دەوروبەرییەتی کە زیاتر دەتوانین بڵێین سنووری قەڵەمڕەوی پێشتری میرنشینی بابانە. دیسان گرنگە کە بزانین ئەم نامەیە لەچ بارودۆخێکدا نووسراوە، ئایا بەرهەمی تێڕوانین‌و بڕوابوونێکی واقیعیە بە ئینگلیز یان لە ئەنجامی هەستکردن بە نزیك بوونەوەی تورکەکان لە هەرەس هێنان ئەم ڕوانینە دروستبووە؟

بێگومان ئاشکرایە کە شێخ مەحمود درەنگ گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە لایەنگری تورکەکان سوودێکی ئەوتۆی بۆ ئایندەی خۆیی‌و کوردیش نییە، هەر بۆیە درەنگیش هەڵوێستی خۆیی گۆڕی بەرامبەر بە ئینگلیزەکان‌و تەنانەت ئەو هەڵوێستەی لە بەرامبەر ڕووسەکان هەروەکو خۆی مایەوەو پێی وانەبوو کە ڕووسەکان هیچ دەورێکی پۆزەتیف سەبارەت بە کورد ببینن.

شێخ مەحمود دوای بەریوونی لە موسڵ‌و گەڕانەوەی لەبارێکی شلۆقدا بوو چونکە لەولا بەڵێنی بە عەلی ئیحسان پاشای فەرماندەی ئۆردوی شەشی تورك دابوو کە هێزێك پێکەوە بنێت و لە سلێمانی هاوکاری ئەوان بکات بەدژی ئینگلیزەکان، بەڵام پێشڕەوی کردنەوەی ئینگلیز جارێکی تر دوای پاشەکشێیان لە کەرکوك ئەو بۆچوونەی دروستکرد کە ئینگلیزەکان نەشکاون‌و جارێکی تر دەست دەگرنەوە بەسەر ناوچەکەدا، بەتایبەتیش کاتێ هێزەکانی ئینگلیز هەولێرو موسڵیان گرت، ئیتر گومانی ئەوە نەماکە سەرکەوتن بۆ ئەوانە، لەم بارە شلۆقەدا شێخ مەحمود دەبێ چی بکات ئایا چارەنووسی خۆی بەتورکەکانەوە ببەستێت یان جارێکی تر پشت لەوان بکات‌و وەلائی خۆی بۆ ئینگلیزەکان دەرببڕێت؟ ئایا کام لەو دوو هەڵوێستە لە قازانجی خۆیی‌و کوردیشە؟

لەم بارودۆخەدا شێخ مەحمود لەڕێگای ناردنی نوێنەری خۆیەوە بۆ کفری کە ئینگلیز پێشتر دەسەڵاتیان بەسەر ئەوێدا کردبوو، هەوڵیدا دەنگی خۆی بگەیەنێتە ویڵسن، بەپێی هەندێ بۆچوونو ئەوەشی لەبیرەوەرییەکانی شێخ لەتیفدا هاتووە گوایە ئەو نوێنەرانەی شێخ مەحمود کە بە سەرۆکایەتی فایەقی تاپۆ بووە رێکەوتنێکیان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا کردووەو ئەوەی تێدایە کە هاوپەیمانەکان دوای دەرکردنی تورکەکان دان بە سەربەخۆیی کوردستاندا دەنێن.. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٨دا (پێرسی کوکس)ی مەندوبی سامی بەریتانی لە مەرسیلیا کەوتە گفتوگۆکردن لەبارەی دروستکردنی دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی کوردییەوە لە عێراقدا[١٠] هەروەك خودی لازاریف لە شوێنێکی تردا باسی ئەوە دەکات کە پیرسی کوکس گفتوگۆی لەو بارەیەوە لەگەڵ جەنەراڵ شەریف پاشای خەنداندا کردووە[١١] ئەگەر ئەم قسەیە بەهێند وەربگرین کە دیارە رای پێرسی کوکس کە راوێژکارو مەندوبی یەکەمی بەریتانیا بووە لە عێراق رای حکومەتی بەریتانیایە کەواتە تێدەگەین کە مەبەستو ئامانجی ئینگلیزەکان بەرامبەر بە کوردو بەتایبەتی ولایەتی موسڵ چی بووە. بەتایبەتیش کاتێ کە هەندێ کەسی کورد لەپشتەوەی شێخ مەحمۆد باسی مافی کوردیان لەگەڵ ئینگلیزەکان کردووە وەکو شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا دەڵێ ئینگلیزەکان ئامۆژگاریان کردوون کە لەڕێگای ترەوە هەوڵ بدەن شتێکیان دەستگیر بێت. ئەوەتا دەڵێت: عیزەت مەدفەعی کە زۆر جار نوێنەری باوکم بووەو لایەنگری باوکم بووە، جارەها لێم بیستووە ئەیوت ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتاوە چ لە بەغداو چ لە کەرکوك، کە بەناوی شێخ مەحمودەوە پەیوەندیم پێوە ئەکردنو باسی داوای مافی میللەتی کوردم لەگەڵا ئەکردن، هەموو جارێك شتێکیان دووبارە ئەکردەوە کە پێیان ئەوتم: ئێوە پێویستە پەیوەندی بە شەریف حسێنی حیجازەوە بکەنو لەڕێگای ئەوەوە داخوازییەکانی خۆتان پێشکەش بکەن[١٢] بەڵام وەکو خۆی ولتا عیزەت مەدفەعی دەڵێت: ئەوەی ئینگلیزەکانیان بەشێخ مەحمود

نەگەیاندووە[١٢] واتە راسپاردەی ئینگلیزەکان لەو بارەیەوە نەگەیشتووە بە شێخ مەحمود، لێرەدا بەتەواوی نیەتی ئینگلیزەکان ئاشکرا دەبێت بەرامبەر بە کوردو شێخ مەحمود کە لەلایەك دەشێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی ئینگلیز خۆیان لە ناوچەکەداو تەسەورکردنی ئەوەی کە ناشێت کوردو شێخ مەحمود ئەو بەرژەوەندییە بپارێزن وای لێکردبن زیاتر متمانە بە شەریف حسێنی حیجازو نەوەکانیان بکەن کە دواتریش فەیسەڵیان هێناو کردیان بە مەلیکی عێراق، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی ئینگلیزەکان لە پێکهاتەی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردیو ناکۆکیو ناڕێکی خێڵو عەشیرەتەکان پێکەوە بەجۆرێکی ئەوتۆ کە نە شێخ مەحمودو نە هیچ شێخو ئاغاو بەگو کەسێکی تر نەبوو لە کوردستاندا بەلای زۆرینەی پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردییەوە پەسەند بێتو بۆ ئەوە بشێت سەرکردایەتی بەلایەنی کەمەوە خوارووی کوردستان بکات.

دەشێ کاتێ پێرسی کۆکس گفتوگۆی دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی بۆ خوارووی کوردستان دەکات هێشتا لە نیەتی ئینگلیزەکاندا بوویێت کە لە خوارووی کوردستان دەسەڵاتێك لەژێر چاودێری خۆیاندا بۆ کورد دروست بکەن بەڵام ناکۆکی نێوان خێڵو عەشیرەتەکانو نەبوونی گوتارێکی یەکگرتوو، نەبوونی یەك دەنگی دیارو خاوەن جەماوەر لە کوردستانداو پەیوەندیکردنی سەرخێڵو عەشیرەتەکان بەجیاو هەریەکە بۆ خۆی بە ئینگلیزەوە ئەوەی لای ئینگلیزەکان روونکردۆتەوە کە خوارووی کوردستان وەکو پێکهاتەیەکی پێکەوە نەگونجاوی ناکۆکی پەرشو بڵاوە کە هێشتا بنەماکانی کۆمەڵگای نییە، هەر لێرەشەوە قسەکردن لەسەر بوونی ناسیونالیزمی کوردی لەو قۆناغەدا دەبێتە شتێکی بێ بنەما، تەنانەت تەسەورکردنی نوخبەی ناسیونالیستی خوێنەوارو بەئاگاش بۆ ئەو قۆناغە دەبێتە مایەی گومانکردن، لێرەدا جارێکی تر روو بە ڕووی ئەو بۆچوونە دەبینەوە کە ئایا کورد تا چ

ئاستێك ئامادەبوونی ئەوەی هەبووە لەو قۆناغەدا کە دەوڵەتی لەڕووی سیاسیو ئیدارییەوە بۆ دروست بکەن؟

ئێمە پێشتر باسی ئەو دەروازانەمان کردووە کە دەشیا کورد لێیانە بهاتایەتە نێو مێژووەوە[44]، کە یەکێك لەو دەروازانە پەرەسەندنی سروشتی گەیشتنە بە قۆناغی دروستکردنی دەوڵەت لەڕووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیەوە بێگومان تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت کورد وەکو کۆمەڵگا نەیتوانیووە لەسەر بنەمای پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دەوڵەت دروست بکات یان بەرهەم بهێنێت. هەروەك لەڕووی سیاسیشەوە نە خۆی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی هۆشیاریی سیاسی کە بزانێتو بتوانێت چۆن دەوڵەت دروست دەکات چونکە بە مانایەکی تر ناسیونالیزمی کوردی نەبۆتە ئایدیۆلۆژیایەکی جەماوەری کە هەڵگرو جێبەجێکەری پرۆژەی ناسیونالیزم بێت کە دەوڵەت لە پلەی یەکەمیدا دێت. نە بڕیاری سیاسی نێودەوڵەتیش وەکو زۆرێك لە گەلانی تر دەوڵەتی بۆ دروست کردووە.

هەروەك ئەم باری نائادەبوونەش لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیو نەتوانینی تێگەیشتن لە باروبۆخی سیاسی نێودەوڵەتیو بە هەڵە تێگەیشتنو راڤەکردنی گۆڕانکاریو ململانێو بەرژەوەندییە سیاسیو ئابوریو ستراتیژییە نێودەوڵەتیەکانو لەسەروی هەموو ئەوانەشەوە نەزانینی چۆن کارکردنو چۆن هەڵوێست وەرگرتنو جگە لە نەبوونی بزوتنەوەیەکی جەماوەری بەربڵاوی یەکگرتوو لە کوردستانداو نە کەسێك یان سەرکردەیەکی ئەوتۆ کە زۆرینەی کورد پێی رازی بنو دانی پێدا بنێن لەسەردەمی شێخ مەحموددا هۆکاری سەرەکی بوون بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان لە دروستکردنی دەسەڵاتی کوردی بێ ئومێد بن چونکە زەمانەتی یەکەم بۆ ئەوساو بۆ ئێستاش چۆنێتی کارکردنە لەنێوخۆی کوردستاندا بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنو سەرکردایەتی کردنی سیاسی ئەم کۆمەڵگایەت لەئاستێکی دان پێدانراوی نێودەوڵەتیدا پێبسپێرن. ناکرێت تۆ وەکو سەرۆك خێڵێك کار

بکەیتو بەهیوای ئەوەش بیت کوردستان بە تۆ بسپێرن، بۆیە ناکرێت هەموو گوناهەکان بدرێنە پاڵ ئینگلیزو پێمان وابێت کوردو شێخ مەحمود خۆیان هیچ دەورێکی نێگەتیڤیان نەبووە.

لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا کە وەستانی شەڕ راگەیەنرا ئەوەندە بەسەر ئەو مێژووەدا تێنەپەڕیبوو کە عەلی ئیحسان پاشا شێخ مەحمودی لە موسڵەوە ناردەوە بۆ سلێمانی هەتا وەکو نوێنەری تورك هێز کوبکاتەوە. خۆی بۆ بەرگریو دژایەتی ئینگلیز ئامادە بکاتەوە. بەڵام ئەم شکستەی تورکەکان شێخ مەحمودیشی ناچار کرد کە هەڵوێستی خۆی بگۆڕێت چونکە چیتر تورکەکان ئەو ئامادەبوونەیان نەما کە پشتیان پێببەسترێت. بەڵام لەم سەرویەندەشدا هەرچەندە شێخ مەحمود ناچار بوو بە ئەمری واقیع رازی بێت بەڵام لەوە ناچێت هەرگیز بەچاوی دۆست سەیری ئینگلیزەکانی کردبێت بەڵکو بە پێچەوانەوە وەکو داگیرکەر لێی روانیوون. لەو بارەیەوە لازاریف دەڵێت: لە سەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا هێزەکانی ئینگلیز کوردستانیان داگیر کرد، ئەوەش دوای رێکەوتنی مۆدرۆس کە بەپێچەوانەی ئەم رێکەوتنەوە دەسەڵاتیان بەسەر شاری موسڵو ولایەتی موسڵ کرد. لەو کاتەوە لە مێژووی کوردی عێراقدا قۆناغێکی نوێ لەژێر دروشمی خەبات دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیزیو جێبەجێ کەرە دڵسۆزەکانی نەخشەکەیان دەستی پێکرد[١٥] ئایا شێخ مەحمود لەو قۆناغەدا چ دەورێکی هەبوو؟ ئایا کارەکانی شێخ مەحمود چ لە دروستکردنی ئیدارەو حکومەتو چ لە راپەڕینو چوون بە گژ ئینگلیزەکاندا سەرئەنجامی هەستو هوشیاری نەتەوەیی بووەو خاوەنی گوتاری کوردی بووەو ئەو پاڵنەرە جوڵێنەرو دروستکەری هەڵوێستەکانی بووە یان کاردانەوە؟

بێگومان ئەم پرسیارە بەجێدەهێڵین بۆ ئەوەی لەرێگای قسەکردن لەسەر شێوەی کارکردنو هەڵسو کەوتی شێخ مەحمودو هەڵوێستی ئینگلیزو هەڵوێستی خێڵو عەشیرەتەکانی کوردەوە رێگا بۆ وەڵامدانەوەیان خۆش بکەین. هەرچەندە ئەوە ئاشکرایە کە دوای دەستگرتنی هێزەکانی ئینگلیز

بەسەر موسڵدا ئیتر لەڕووی بەڕێوەبردنەوە دەبوو بەرنامەی بەڕێوەبردنی ولایەتی موسڵ دابنێن، لەو بارودۆخەشدا دەبوو ئینگلیزەکان پشت بە ناوخۆی کوردستانیش ببەستن و لەو سەرو بەندەشدا دەبوا لەدوای ئەو کەسانە بگەڕانایە کە پێگەی کۆمەڵایەتیان هەبوو، دەشیا بتوانن ڕەزامەندی بەشێك لە کۆمەڵ بەدەست بهێنن، هەروەك هەندێك لە خێڵ و عەشیرەتەکانیش پەیوەندییان بە ئینگلیزەکانەوە کردبوو بە ئومێدی ئەوەی کە بەرژەوەندییەکانیان بپارێزێت بۆ نموونە خێڵی هەمەوەندو مستەفا ئاغی باجەلان و شێخ حەمیدو چەندانی تریش. هەروەك ئینگلیزەکانیش دەیانوویست پەیوەندی بە زیاترین کەسانی دیاری ناوچەکەوە بکەن لەو بارەیەوە راپۆرتی کۆمیسیۆنی هێزەکانی بەریتانیا لە بەغدا دەڵێت: ئێمە گەیشتینە ئەو بۆچوونەی کە پەیوەندی بە شێخ حەمیدی تاڵەبانی و پیاوە دیارەکانی ترەوە بکەین ئەوەشمان لە مانگی ئەیلولی ١٩١٧دا کرد[١٦] بێگومان مەبەستی ئینگلیزەکان لەو پەیوەندیکردنانە ئاشکرایەو بە مەبەستی کۆنترۆلکردنی رووبەرێکی فراوان بووە لە واقیعی خوارووی کوردستان و راکێشانیان بەلای خۆیاندا کە لەوەشدا هیچ قسەوباسێك لەبارەی ئەوەی چیان پێدەدرێت و چیان بۆ دەکرێت دیار نییە.

لەسەرویەندی سەرکەوتنی ئینگلیزدا هەوڵی کوردەکان بۆ پەیوەندی کردن بەبەریتانییەکانەوە ئاشکراتر بوو کە دیارە ئەوەش لەلایەك بەهۆی سەرکەوتنی ئەمان و لەلایەکی تریشەوە بەهۆی تێکشکاندنی هێزەکانی تورکەوە بوو کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە کورد بەگشتی و شێخ مەحمودیش وەکو دیارترین کەسێتی خوارووی کوردستان پێشبینیان بۆ رووداوەکان و ئاراستەی بەرەوپێشەوە چوون و سەرکەوتنی ئینگلیز نەبوو و هیچ پرۆژەو بەرنامەیەکی دیاریش لە کوردستاندا نەبووە هەتا بەپێی ئەوە کار بکەن، بەڵکو لەسەر بنەمای کاردانەوە یان ئەنجامی رووداوەکان کاریان کردووە کە ئەمەش نەبوونی پرۆژەی نەتەوەیی و هوشیاری پێویستی نەتەوەیی و تێگەیشتن لەو

بارودۆخە نوێیەو نەزانینی کاری پێویست نیشان دەدات. دوای ئەوەی کە عەلی ئیحسان پاشا ناچار بوو شکست قبول بکاتو هیچ ئومێدی گەڕانەوەی تورك نەما ئەوسا شێخ مەحمود کەوتە ئەوەی کە چی بکاتو چۆن هەنگاو بهاوێت لەو سەرو بەندەدا.. لە سلێمانی کۆبوونەوەی هەموو پیاوماقولانی ناوچەکە کرا بۆ بڕیاردانی سیاسەتی داهاتووی کورد، لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیار درا کە حکومەتێکی کوردی کاتی پێکبهێنن‌و شێخ مەحمود سەرۆکی بێت‌و لە هەمان کاتیشدا بڕیار درابوو کە بینای سیاسەتێك بکەن بۆ دۆستایەتی تەواوی بەریتانیا[١٧] پرسیارەکە لەوەدایە ئایا بۆچی پێش ڕاگەیاندنی شکستی تورکیا پیاوماقولانی ناوچەکەو شێخ مەحمودیش نەیانتوانی کۆبوونەوەیەکی لەو جۆرە ڕێك بخەن‌و حکومەتێك بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە دروست بکەن؟ بێگومان ئاشکرایە کورد تا ئەوساتەی کە بۆشایی دەسەڵات دروست نەبوو بیری لەوە نەکردەوە کە دامەزراوی بەڕێوەبردنی خۆی دروست بکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ پرۆژە یان ڕوانین‌و بۆچوونێك سەبارەت بەوەی کە کورد ببێتە خاوەنی دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی خۆی بوونی نەبووە. ئەمەش بەڵگەی نەبوونی ناسیونالیزم‌و تەنانەت نەبوونی نوخبەی ناسیونالیستیشە چەند نامەیەکی شێخ مەحمودی سەرۆکی ئەو حکومەتە گەیشتنە (دەستی ئینگلیزەکان) کە تیایاندا ئیدیعای نوێنەرایەتی ڕوانینی هەموو کوردی ناوچەکەو تەنانەت ئەو دیوی سنووریش تاکو سنەی کردبوو[١٨].

ناوەرۆکی نامەکانی شێخ مەحمود خاڵی نەبوو لە ڕاستی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگای خۆیەتی بپرسین ئایا خەڵکی کوردستان تا چ ئاستێك لەگەڵ شێخ مەحموددا بوون‌و ئەویش تا چ ئاستێ نوێنەرایەتی خەڵکی دەکرد، لە نەبوونی ناسیونالیزم‌و بە ئاگایی نەتەوەیی‌و غیابی نوخبەی ناسیونالیستیشدا ئەم بۆچوونە تا چەندێ ڕاستە. بە هەر حاڵ بەدوای ڕاگەیاندنی کۆتایی جەنگدا کە دەوڵەتی عوسمانی تیایدا شکستی هێنا. هەر لەو کاتەدا فەرماندرا بە مێجەر نۆئێل بۆ بوونی بە ئەفسەری سیاسی ناوچەی کەرکوك یان سلێمانی‌و

ارووی کوردستان. نۆئێل لە ڕۆژی ١٦ـ ١١ـ١٩١٨ گەیشتە سلێمانیو بۆ ڕۆژی
یی لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی بەردەرکی سەرای سلێمانیدا کە عولەماو
ئەراف‌و ساداتو تاجیرو خەڵکێکی زۆری شاریو دێهاتیو سەر خێڵانو
ندیّ سەرخێڵی کوردی ڕۆژهەڵاتیش بەشداربوون وتارێکی درێژی خوێندەوەو
یدا رایگەیاند کە شێخ مەحمود حوکمداری کوردستانە[١٩] بێگومان ئەوەی
ێگای لەسەر راوەستانە ئەوەیە کە مێجەر نۆئێل لەبەردەمی خەڵکدا
دەگەیەنێت کە شێخ مەحمود حوکمداری کوردستانە. جێگای خۆیەتی
رسین ئایا ئەو کوردستانەی نۆئێل باسی دەکات کویّ دەگرێتەوەو
سنوورەکانی تاکو کوێیەو حوکمداریش بە چ مانایەك دێت، ئایا سەرۆکی
کومەتە، یان سەرۆکی دەوڵەتە یان پارێزگارە، یان کار بەڕێوەبەرە یان
ێنەری بەریتانیایە لە ناوچەکەدا؟ لەپالّ هەموو ئەمانەدا دەنگی شێخ
حمود لەو ڕۆژەدا کە ئەو ئەرکەی پێدەسپێرێن دیار نییە، هەتا لە وتارێکدا
نووری دەسەڵاتی خۆییو سروشتی حوکمدارییەکەی دەست نیشان بکات. بە
ر حالّ مێجەر نۆئێل وەکو حاکمی سیاسی ئینگلیز لە سلێمانی بوو کە
مەش دەیسەلمێنێت بە فیعلی ئەو حوکمدار بووە. هەروەك قسەی ئەوەش
لای مێجەرسۆنو مێجەر دانلیسی حاکمی سەربازی ئینگلیزەوە کراوە کە
رایە ئینگلیز مەبەستی حکومەتێکی تەواو نییە بۆ کوردستان، یان ئینگلیز
رگیز نەیگوتووە کە حکومەت بۆ کوردستان دروست دەکات، بەڵکو مەبەست
وکمدارییە[٢٠] بە هەر حالّ ئەوە دواتر ئاشکرا دەبێت کە هەر بەڕاستی ئینگلیز
نیەتیاندا نەبووە هیچ بۆ کورد دروست بکەن یان تێکەیشتنیان لە کەسێتی
وردو نارێکی نێوان خێڵو عەشیرەتەکانو نەبوونی دەنگێك یان کەسێتییەك
ـە بتوانێت نوێنەرایەتی بەلایەنی کەمەوە کوردی باشوور بکات هۆکاری
اشەکشەی ئینگلیزەکان بوویێت سەبارەت بە دروستکردنی دەوڵەتی کوردی.
وێلسنی حاکمی گشتی کاتیّ مێجەر نۆئێل رادەسپێرێت تا ببێتە ئەفسەری
سیاسی کەرکوكو پشچێت بۆ سلێمانی لەو بارەیەوە دەڵێت: دەبیّ ئەوە بە

ئەركی سەرشانی خۆت بزانیت كە بەیارمەتی سەركردە ناوچەییەكان ئاراه
ئاسایش لەو جێگایانە فەراهەم بكرێت كە دەكەونە ئەولای ناوچ
داگیركراوەكانی سەربازییەوە دەسەڵاتی ئەوەت پێدەدەم كە شێخ مەحـ
وەكو نوێنەری ئێمە لە سلێمانی دابنێیتو بەشێوەیەكی گونجاویش
چەمچەماڵو هەڵەبجەش خەڵك دابنێیت[٢١] ئێستا لەم گوتەی وێڵسندا
ئاشكرا دەردەكەوێت كە بەرنامەی ئەوان ئەوە بوو بۆ هەر ناوچەیەك كەسێ
خاوەن نفوزی كۆمەڵایەتی لەو ناوچەیەدا بكەنە نوێنەری خۆیان كە بەگوێر
سلێمانی لە شێخ مەحمود دیارترو بەدەسەڵاتداریان دەست نەكەوتووە، ﻫ
بۆیە ئەویان داناوە بە حوكمداری ئەم شارە كاتێ وێڵسن، مێجەر نۆئ
رادەسپێرێت كە كەسانی تری گونجاویش بۆ چەمچەماڵ و هەڵەبجەش دابنێ
بەتەواوی مەسەلەكە ئاشكرا دەبێت كە ئەوەی ئەوان دروستی دەكەن ئیدار
كاتی ناوچەییە بۆ بەڕێوەبردنی ئەركەكان بەبێ ئەوەی هیچ بەرنامـ
پرۆژەیەكی ئایندەیان بۆ ئاشكرا بكەن. بەڵام لێرە با بپرسین ئایا شـ
مەحمود تا چ ئاستێ لەم روانینەی ئینگلیزەكان تێگەیشتووە چۆن كا
كردووەو هەستو هۆشیاری نەتەوەیی لە هەڵوێستو كارەكانیدا دەردەكەو
یان تەنیا وەكو پیاوێكی ئایینی خاوەن نفوزی شێخایەتیو تەریقـ
دەردەكەوێتو مامەڵە دەكات؟ ئایا بەڕاستی گوتاری شێخ مەحمود لەسـ
بنەمای كارەكانی گوتاری نەتەوەیی بووە یان گوتاری خێڵایەتی ئایی
ناوچەگەری؟ گریمان لەسەر ئەوە كۆكین كە ئینگلیزەكان لە بەرنامەیان
نەبووە شتێكی ئەوتۆ بۆ كوردەكان بكەن هەروەك ئەوەی مس بێڵ ئاماژەی
دەكات بەتایبەتیش لەكاتێكدا كە ئەم كەسێتیە سكرتێری تایبەتی بووە ا
ئیدارەی گشتی بەریتانیا لە بەغدا كە دەڵێت: ئەو راسپێرییانەی ل
سەركردایەتی ئیدارەی گشتییەوە دەرچووبوون بۆ نوێنێل ئەوەی نەگەیاند ك
پێویستە وا لە خەڵك بگەیەنێت كە ئەو ئیدارەیەی لە سلێمانیدا پێكدێ شتێ
كاتیەو پێویستە نوێنێل ئەو راستیە بۆ شێخ مەحمودو خەڵك روون بكاتەوە[٢٢]

'یا نۆئێل ئەوەی بۆ شێخ مەحمود روونکردۆتەوە کە ئەو دەسەڵاتەی ئەو
یەو ناشێت بەردەوام بێت؟ ئەگەر هەندێ بە وردی سەرنج بدەین و بڕوانیە
ەرین و دژایەتیکردنە ناو بەناوەکانی تری شێخ مەحمود بۆ ئینگلیز ئەو
ووونەمان لادروست دەبێت کە رەنگە نۆئێل راستەوخۆیان ناڕاستەوخۆ
ەی بە شێخ مەحمود راگەیاندبێت بەتایبەتیش ئەوە وای لێکردبێت کە
بەناو دژایەتی ئینگلیز بکات بەو ئومێدەی فشاریان لەسەر دروست بکات
تا هەڵوێستی خۆیان لەو بارەیەوە بگۆڕن، بەڵام ئایا تەنیا فشارێکی شێوە
دانەوەی بێ بەرنامەو بێ پرۆژەی نەتەوەیی و بێ ئامادەبوونی زەمینەی
مەڵایەتی و بێ جەماوەرێتییەکی ئەوتۆ کە زیاتر قورسی و سەنگی شێخ
ەحمود بسەلمێنێت، دەشێ ئینگلیزەکان بگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە
داچوونەوەی هەڵوێستی خۆیان بکەنەوە؟
ێگومان دەبێ ئەو راستییە بزانین کە ئینگلیز لەژێر کاریگەریی دوو هۆکاری
ر دیاردا کاریان کردووە، یەکەیان لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی
ریتانیایەو هەموو هەنگاوێکیشیان لە ئاستی یەکەمدا بۆ زەمینەخۆشکردن و
شتەبەرکردنی ئەو بەرژەوەندییانە بووە. دووەمیان ئینگلیزەکان بە وردی
ەرنجی ئەوەیان داوە کە لەبارترین رێگای شیاو بۆ دەسەڵاتکردن بەسەر
چەکەداو بۆ دەستبەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان چییەو چۆنە، ئایا
یوەندی لەگەڵ کێ ببەستن لەناوچەکەدا؟ ئایا کێ دەتوانێت هەم
رژەوەندییەکانی ئەوان بپارێزێت ئەم بتوانێت لە کورتترین ماوەی شیاودا
سەڵات بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنێت. لەم سەروبەندەدا پێدەچێت کورد
کو نەتەوەیەکی پەرش و بڵاوی بێ دەسەڵاتی فرە بەشی فرە دەنگی فرە
یاری ناکۆک لەگەڵ یەکتردا نەیتوانی بێت ئەو متمانەیە لای ئینگلیزەکان
وست بکات کە لەلایەک دەتوانێت بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز بپارێزێت،
لایەکی تریشەوە بتوانێت لەشێوەی ئیدارەدا خۆی بەڕێوە ببات، بەتایبەتیش
، نە شێخ مەحمودو نە هیچ کەسێکی تریشیان لە کوردستاندا لەو ئاستەدا

نەبینیووە کە بتوانێت کوردستان بەڕێوەببات، هۆکەشی ئاشکرایە چو
کوردبوون بەو مانایەی بەرهەمی ناسیونالیزم بێت نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی
لەمپەڕی مادیو مەعنەوییو دەروونی نێوان خێڵەکان بڕوخێنێتو نەتەوە ی
گەل جێگای خێڵو عەشیرەت بگرێتەوە، مەبەست لەم لێکدانەوەیەش ئەوە
کە لەسەردەمی شێخ مەحموددا گوتاری باڵادەست گوتاری خێڵایەتی ناوچە
مەودا تەسك بووەو ئینگلیزەکانیش لەسەر بنەمای ئامادەبوونی ئەو گوتـ
کاریان کردووە. کاتێ سنووری حوکمدارییەکی شێخ مەحمود ناپەڕێتەوە
دەرەوەی سنووری سلێمانیو دەوروبەری مانای وایە ئەوان لەوە تێگەیشتو
لە باشترین حاڵەتدا نفوزی شێخ مەحمود لە سلێمانیو دەوروبەریدا هێ
ئامادەبوونی هەیە بۆیە بەقەد ئەوەی هەیبووە دەسەڵاتیان پێداوە. ئەگ
بهاتبایە لەسەردەمی شێخ مەحموددا ناسیونالیزمی کوردی ئایدیۆلۆژ
بەرنامەی هێزێکی جەماوەری بوایە کە هەموو ڕوویەری کوردستا
بگرتایەتەوە، ئەوا گوتارێکی گشتگری هەمەلایەنەی بارگاوی کراو بە
نەتەوەییەکان ئامادەبوونی دەبوو کە ئەویش لەسەریەخۆییو دروستکرد
دەوڵەتدا خۆی دەبینیەوە، بێگومان ئەوکاتە ئینگلیزیش ناچار دەبوو لەگ
ئەو گوتارەدا مامەڵە بکات.

بە هەر حاڵ ئەوەی وەکو سەرەتایەك گرنگە ئەوەیە کە مێجەر نۆئێ
بەڕەسمی لەبەردەمی خەڵکدا ڕایگەیاند کە شێخ مەحمود حوکمدا
کوردستانە، هەرچەندە ڕاوبۆچوونی تریش هەیە کە دەڵێت ئینگلیزەکان شـ
مەحمودیان وەکو نوێنەری خۆیان لە سلێمانی داناوەو مەبەست لـ
حوکمدارییەش هەر ئەوە بووە. بەتایبەتیش کاتێك کە دەردەکەوێت دەسەڵا
نۆئێل وەکو ڕاوێژکاری ئەو دەسەڵاتدارییە زۆر لە دەسەڵاتی شێخ مەحمو
حوکمدار زیاترە، بەڵام ئەوەی جێگای تێبینی کردنە ئەوەیە جیاوازییە
ئاشکرا هەبووە لەنێوان ڕوانینی نۆئێلو وێڵسن بۆ شێخ مەحمودو کوردیش
نۆئێل بە نەرمو نیانیو دەشێ بە سۆزیشەوە مامەڵەی لەگەڵ شێخ مەحمو

ئەو هەموو کەموکورتیو نەزانیو نەشارەزاییەدا کربنبێت کە لە حوکمدارییەکەی شێخ مەحموددا بینیویەتی، بەلام ویلسن بەپێچەوانەوە هەولی گەورەکردن زەقکردنەوەی کەموکورتییەکانی داوە. بەڕوانینی من هۆی سەرەکی کەموکورتییەکانیش تەنیا نەشارەزایی نەبووە لە بەڕێوەبردندا، بەلکو نەبوونی ناسیونالیزمی کوردی بووە کە تەنیا ناسیونالیزم خاوەنو هەلگری پرۆژەی نەتەوایەتیە، یان نوخبەی ناسیونالیست یان تاکە سەرکردەی ناسیونالیزم کە ئەمەی دواییان دەشێ زیاتر خاسێتی باوکی رۆحی هەبێت یان کەسێك بێت کە کاریزمای هەبێت. بەلام ئەوەی جێگای گومان نییە کە نە ناسیونالیزمی کورد لەو قۆناغەدا بوونی هەبووە، نە شێخ مەحمودیش ئەو سەرکردە ناسیونالیستەیە بووە کە هەلگری سیفەتەکانی باوکی رۆحی بووبێت، هەرچەندە دەشێ نوخبەی ناسیونالیستو رۆشنبیر یان منەوەر لە ئاستێکی لاوازدا بوونیان هەبوو بێت، بەلام ئەو نوخبەیە لە دەرەوەی بازنەی داخراوی دەسەلاتی شێخ مەحمود بوونو لەوە ناچێت بچوکترین دەوریان لەو دەسەلاتەدا هەبووبێت یان پرسیان پێکرابێت.

# ڕەوشی سلێمانی لەماوەی دەسەڵاتداری یەکەمی شێخ مەحموددا

دەسەڵاتداری یەکەمی شێخ مەحمود لە ڕۆژی ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا دەستی پێکرد کە لەو ڕۆژەدا مێجەر نۆئێل لەبەردەرکی سەرای سلێمانیو لەبەردەم خەڵکێکی زۆردا کە عولەماو ئەشرافو ساداتو تاجرەکانو ڕەئیسەکانی عەشایرو لە هەموو دەستەکانی تری ئەهالی تیابوو بەناوی نوێنەری دەوڵەتی بەریتانیا لە عێراق وتارێکی دوورو درێژی خوێندەوەو هەر لەم وتارەدا بڵاوی کردەوە کە شێخ مەحمود لەلایەن حاکمی عامی عێراقەوە بە حوکمداری کوردستان ناسراوە[٣٢] بێگومان ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمودە. دەمەوێت لێرەدا سەرنجی ئەوە بدەین کە لە وتارەکەی نۆئێلدا هاتووە کە حاکمی گشتی عێراق شێخ مەحمودی داناوە، کەواتە نە شێخ مەحمود خۆی توانیوویەتی ئەو دەسەڵاتدارییە دروست بکات، نە کۆمەڵگای کوردی لە ئەنجامی پەرەسەندنی خۆیدا توانیبێتی ئەو دامەزراوە ناوچەییە سنوور دیاری کراوە بەرهەم بێنێت. کەواتە دەبێ لەڕووی مەوزوعییەوە وەها بڕوانین مادەم شێخ مەحمود لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دانراوە کەواتە دەشتوانن لای ببەن. لێرەوە دەشێ زەمینە بۆ قسەکردن لە پەیوەندی نێوان شێخ مەحمودو خەڵك خۆش بکرێت لەو ڕوانگەیەوە ئەگەر سەرکردەیەك لە ئەنجامی تواناو لێهاتوویی خۆیەوەو لە کۆمەڵگایەکی بە ئاگادا دەرکەوتبێتو گەل پلەو پایەی سەرکردایەتی پێبەخشیبێتو نوێنەری ڕاستەقینەی ئەو گەلە بێت ئەوا نە پێویستی بەوەیە دەرەوە بە بڕیار دەسەڵاتی پێببەخشێتو نە فشاری دەرەوەش دەتوانێت بە تەواوەتی تێکبشکێنێت ئەگەر هەڵگری پرۆژەی نەتەوەیی بێتو بزوتنەوەیەکی جەماوەری لە پشتییەوە بێت. ئێمە لە وتەکەی نۆئێلدا تێدەگەین کە شێخ

مەحمود دانراوە، بۆیە ئاساییە نەتوانێت نوێنەرایەتی هەموو خەڵکی بکات. ئەمە سەرباری ئەوەی کە تێڕوانین و ئاسۆی بینینی و ئاستی تێگەیشتنی لە سیاسەت و شێوازی مامەڵەکردنی و چۆنێتی کارکردنی هەر لە دامەزراندنی دەسەڵاتدارییەکەیەوە، هەتا راپەڕین شەڕکردن و بەگژداچوونی ئینگلیز و خراپی پەیوەندی لەگەڵ زۆرێك لە خێڵەکان و لەگەڵ کەسانی منەوەر و ئەفسەرانی پێشتری نێو سوپای عوسمانی و کۆی خەڵکیشدا جێگای قسە لەسەرکردنە، بێگومان قسەکردن لەسەر ئەم لایەنانە عەقڵی بەڕێوەبردن و سیاسی شێخ مەحمود دیاری دەکات.. دەبێ پێش وەختەش ئەوە بزانین نەك تەنیا بۆ ئەوساو سەردەمی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود بەڵکو بۆ ئێستاش زەمانەتەی سەرکەوتنی دەسەڵاتی کوردی و گواستنەوەی لەباری شلۆقی دەسەڵاتی سنوورداری بەڕێوەبردنەوە بۆ سەربەخۆیی و دەوڵەت تەنیا بەڕێوەبردنی ناوخۆیە بەشێوەیەکی پەسەند و گونجاوی ئەوتۆ کە خەڵك هەست بە ئینتیمای خۆی بۆ ئەو دەسەڵاتە و بۆ وڵاتیش بکات.

سەرەتاو هەر راستەوخۆ لەدوای وتارەکەی مێجەر نۆئێل کە شێخ مەحمود بە حوکمداری سلێمانی دانرا، هەر ئەو رۆژە بۆ ئێوارە خەڵکی سلێمانی و دەوروبەری پیاوماقوڵان و ئەوانەی پەیوەندییان باش بوو لەگەڵ شێخ مەحمود کۆبوونەوەو لایەنگری و دڵسۆزی خۆیان نیشاندا. بێگومان ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هەرچەندە شێخ مەحمود هێزێکی رێکخراو یان جەماوەرێکی هوشیاری بەئاگا لەداواکانی نەتەوەی لەگەڵ نەبوو بەڵام هێشتا بەشی ئەوەی خەڵك لەگەڵدا بوو کە بتوانێت سلێمانی بەڕێوە ببات و بیپارێزێت ئەگەر هونەر و لێزانینی بەڕێوەبردن و کاری سیاسی گونجاو و شارەزایی و سەر دەرچوونی سیاسی بوونی هەبوایە.

ئەگەر سەرنج بدەین جگە لە شێخ مەحمود خۆی وەکو حوکمدار، دەسەڵاتداری تری حوکمدارییەکە لە ئەڵقەی داخراوی بنەماڵەی شێخدا مایەوە تەنیا هەندێ پلەی ئیداری نەبێت کە کەسانی تری بۆ دیاریکرا. بۆ نموونە شێخ

قـادر کرا بـه سوپاسـالارو سـەید عومـەری مـامی شـێخ کرا بـه موتەسـەریفی سلێمانیو حاجی سەید حەسەن کرا بە حاکم کە ئەوکاتە پێی گوتراوە رەئیسی شەرع حاکمی سیاسیش مێجەر نوئێل خـۆی بـوو. ئـەم جـۆرە دابەشـکردنەی پلەکانی سەرەوە لەنێو ئەندامانی بنەماڵەی شێخدا ئەوە نیشان دەدات کـە لـە راستیدا حوکمدارییەکـە زیـاتر لـەوەی سـیمای نەتـەوەیی وەربگرێـت سـیمای خێڵایەتی یان عەشیرەتایەتی وەرگرتووە کە ئەمەش دیسان باڵادەستی عـەقڵی خێـڵو سـتراتیژی خێـڵو بەرژەوەنـدی خێـڵ نیشان دەدات کـە هـەموو شـتێك لەپێناویـە ئـەو پێکهاتەیـەدا دەکـات کـە لەسـەر بنـەمای خـوێنو دەمـار پێکهاتووە[٢٤] ئەم شێوە کارکردنەش دەیسەلمێنێت کە گوتاری باوو باڵادەست گوتاری خێڵ بووە نەك گوتاری نەتەوایەتی.

دیارە ئەوەش ئاشکرایە کـە لـە کۆتـایی جـەنگی یەکەمـدا بـاردۆخی ژیـانی خەڵك زۆر نەهەموار بوو، گرانی بەشێوەیەك یەخەی خەڵکی گرتبوو کە شـتێکی ئەوتۆ نەمابوو بیخۆن، نەخۆشی بڵاوبوو بووەوەو خەڵکی لە برسا دەمردن، لـە بـارودۆخێکی لـەو جۆرەشـدا سـتەمە مـرۆڤ بتوانێـت جگـە لـە هەوڵـدان بـۆ پەیداکردنی نانێك بیر لە هیچی تر بکاتـەوە، بۆیە لەڕووی راستییەوە قسەکردن لە ناسیونالیزمو گوتاری نەتەوەیی لە واقیعێکی لەو جۆرەدا مانایەکی ئـەوتۆی نابێت. بەڵکو خـەڵك هـەموو هـەوڵو ئومێـدێکیان دەبێتـە درێژەدان بـە ژیـانو سـەرکەوتن بەسـەر مەترسـی مردنـدا. لـەم بارودۆخـەدا کـە خـەڵك لەبرسـانا دەمـردن.. بـرنجو گـەنمی عـەماری مـیری کـە لـە تورکـەکان مـابۆوە، هـەر زەخیرەیەك لـە عـەماری دێهاتـەکانی شـێخ مـەحموددا هـەبوو ئـەکرا بـە پـڵاوو چێشتو لـە چێشتخانەی حوکمـدارەوە ئەچـوو ورگـی ئـەم عەشـاماتەوە کـە روویان کردبووە سلێمانی. لەولای تریشەوە مێجەر نوئێل خـەریکی چارەسـازی گرانیو برسێتی بوو[٢٥]. جێگای خۆیەتی بپرسین لـەم کاتـەدا حوکمـداری تـازە دامەزراو خەریکی چی بوو؟ هەرچەندە دەبێ ئەوەش بزانین کە حوکمدارییەکی تازە دامەزراو لە شارێکی نیمچە وێرانی دەستی برسێتیو هەژاری دوای جەنگدا

دەبێ تواناو دەسەڵاتی عەقڵیو دارایىو تەکنیکی لە چ ئاستێکدا بووبێت.
مامۆستا فازیل کەریم دەڵێت: لەبارەی دامەزراوەکانی زەمانی شێخ مەحمودەوە پرسیارم لە ئەحمەد خواجە کرد ئەویش وەڵامی دامەوە کە ناوەڕۆکەکەی ئەمەی خوارەوەیە، ئەو واتە مامۆستا فازیل کەریم لە کتێبەکەیدا ناوی کاربەدەستانو یاریدەدەرانیانو شوێنی کارکردنیانی بڵاوکردۆتەوە. کە ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە شوێنی شێخ قادری سوپاسالار خانوویەکی نووسیێ ژووری بووە، شوێنی شێخ حەمە غەریبی وەزیری ناوخۆ لە فێرگەی فەیسەڵیە بووەو شێخ مەحمود خۆیشی لە هەمان بینادا بووە، کەریمی عەلەکەش کە وەزیری مالیە بووە لە هەمان بینادا بووە، وەزیری مەعریف مستەفا پاشای یاموڵکی لە ماڵەکەی خۆیدا بووە[٣٦].
لێرەوە تێدەگەین کە حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود لەڕووی بەدامەزراویی بوونەوە لە ئاستی دامەزراوەیەکی بالای خێڵدا بووە، بەتایبەتی دیوەخانی هەندێ لە سەرخێڵو ئاغاو بەگو شێخ رەنگە لەڕووی بیناو شوێنو پیاوماقوڵانی خێڵ یان عەشیرەتەوە بۆ پرسو ڕاو بەڕێوەبردنی کاروباری خێڵ یان عەشیرەت هەمان شێوەی دامەزراوەێ ئەم حوکمدارییە بووین. بێگومان ئەم بنەمایەی دامەزراوەی حوکمدارییەکە هەم لەڕووی بیناو پێداویستییەکانی بەڕێوەبردنەوە هەم لەڕووی کەسانی بەڕێوەبەرەوە هەم لەڕووی ڕۆڵو دەوری منەوەرانو ڕۆشنبیرانو تاکە ناسیونالیستو ئەفسەری پێشتری کورد لە دەوڵەتی عوسمانیدا گەوهەرو مافیەتی سلێمانیش وەکو شار دەخاتە بەردەم پرسیارەوە، پرسیار لەوەی ئایا ئەگەر سلێمانی هەلگری بنەماو خاسیێتەکانی شار بووە لەو قۆناغەدا کوانێ ڕۆڵی چینو توێژە کۆمەلایەتیەکان؟ کوانێ بیناو بیناسازی؟ کوانێ کەسێتی ڕۆشنبیرانو منەوەران؟ کوانێ چینی بۆرژوا کە بەرهەمی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی شارە؟ بێگومان وەلامی ئەم پرسیارانە ئەو گران نییەو لە وەلامەکانیشیاندا دەگەین بەو سەرئەنجامەی کە سلێمانی لەو سەروەختەدا خاسێتی گرنگێکی گەورەی هەبووە، تەنانەت بالادەستی

کەسێتی مەعنەوی‌و مادی بنەماڵەی شێخانیش لەگەڵ سروشتی شارو قۆناغی ژیانی شاردا ناکۆکە چونکە لەشاردا هێزی بالادەست هێزی جەماوەرەو کەسێتی دیاریش کەسێتی رووناکبیر، منەوەر، بازرگان، خاوەن سەرمایەی زۆرە...تاد.

بە هەر حاڵ ئەمە شێوەو سروشتی پێکهاتەی شارو حوکمدارییەکی شێخ مەحمود بووە، بەڵام ئایا ئەم دەسەڵاتە چۆن‌و بە چ شێوەیەك رەفتارو هەڵس‌و کەتی کردووە؟ ئایا گوتاری بەڕێوەبردنی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود چ گوتارێك بووە؟ ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: لە گۆشەیەکی کوردستانی جنوبیدا بە معاوەنەتی ئینگلیزەکان ئیدارەی مەحەلی دامەزرا کە باش ئیدارە نەکراو تێکچوو[27] محەمەد رەسول هاوار دەڵێت: راستە شێخ مەحمود پیاوێکی تازە پیاکەوتوو بووە لەڕووی سیاسەت‌و پەیوەندی کردن بە دەوڵەتانەوەو لە زۆر هەڵوێستیدا سەرگەرم‌و سەرچڵ بووە[28] رەفیق حیلمی دەڵێت: شێخ مەحمود بۆ دارشتنی بناغەیەکی باش‌و بەهێز بۆ ئەم حکومەتە تازە تەقەلایەکی تەواو بەکەڵکی نەئەدا، هیچ نەبێ بۆ پاراستنی جێ‌و ناوچەی نەفسی خۆشی کردەوەیەکی ئەوتۆی دیار نەبوو. نەتەشکیلاتێکی ئیداری رێکوپێك نەدانانی نیزامێك‌و رێگەیەکی تایبەتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەت[29] حوکمدار خۆی بە خەڵات‌و بەرات چەند رەئیسێکی عەشایری لەخۆی نزیك خستبۆوەو بە برینەوەی مەواجب بۆ چەند کەسێکی تری بە نفوزو ناودار، هەندێ دۆست‌و لایەنگیری پەیدا کرد بوو[30] ئینگلیزەکان کە لە تەبیاتی شێخ مەحمود باش شارەزابوون‌و بۆیان دەرکەوت کە زۆر بەتەنگ دوارۆژەوە نییەو هەر بۆ ئەو رۆژە ئەژی کە تیایەتی[31].

دیارە ئەوە ئاشکرایە کە ئینگلیز شێخ مەحمودی کرد بە حوکمداری سلێمانی، دەشێ شێخ مەحمود وەها سەیری ئەو دەسەڵاتەی کردبێت کە خۆی هۆکاری سەرەکی بوویێت بۆ دامەزراندنی، هەروەك لەبەرامبەریشدا ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان وەکو نوێنەری خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی

سلێمانیو دەوروبەری سەیرکردبێت، ئەمین زەکی بەگ باسی ئەوە ناکات کە چۆن ئەو دەسەڵاتدارییە دروستبووە یان دروستکراوە یان شێخ مەحمود نوێنەری ئینگلیز بووە بۆ بەڕێوەبردنی سلێمانی یان خۆی خاوەنی دەسەڵات بووەو نوێنەری ئەوان نەبووە، چونکە وا پێدەچێت کە ئەم مێژوونووسە لەسەر بنەمای ئەنجامەکان سەیری ئەو دەسەڵاتدارییەی کردبێتو ئەوەی بەلای ئەمەوە جێگای بایەخە ئەوەیە کە ئەم دەسەڵاتدارییە باش بەڕێوە نەبراوە، واتە هۆی روخاندنی دەگێڕێتەوە بۆ باش بەڕێوەنەبردن، بەڵام زۆریش شۆڕ نابێتەوە بۆ لێدوان لە وردەکارییەکانی ئەو خراپ بەڕێوەبردنە. بێگومان ئەمین زەکی بەگ وەکو پیاوێکی منەوەر کە پێشترو ئەوکاتەو دواتریش رووداوەکانی بەچاوی خۆی بینیووە، باش لەوە تێگەیشتووە کە ئەو جۆرە مامەڵەکردنە بۆ دامەزراوەی حکومیو دەسەڵاتێك نابێت کە ئومێدی ئەوەی بۆ بخوازرێت هەنگاوی گرنگ هەڵبنێتو بەرەو ئایندەی سەربەخۆییو دەوڵەتی سەربەخۆو یەکگرتوو بروات.

کاتێکیش رەفیق حیلمی دۆستی نزیکی شێخ مەحمودو بەئاگاش لە کاری ئینگلیزەکان لەبەر ئەوەی وەرگێڕی مێجە نوئێلو مس بێل بووە ئامازە بۆ لاوازییەکانی ئیدارەی شێخ مەحمودو بۆ لاوازی خەڵکیش دەکات لەرووی بەڕێوەبردنو کارکردنی جیدی بۆ ئێستاو رابردوو، نزیك کردنەوەی ئاغاو بەگو شێخو عەشایەرو ماستاوچی لەلایەن شێخ مەحمودەوە، دەیەوێت پێمان بڵێت راستە ئێمە لەبەردەم دوو گرفتی گەورەداین کە یەکێکیان باری خراپی ناوخۆو چۆنێتی هەڵبژاردنی حکومەتو کاربەدەستانیەتی لەلایەن شێخ مەحمودەوە، باری دووەمیش خراپ تێگەیشتنە لە روانینی ئینگلیزەکان بۆ کوردو لە هەمان کاتدا بۆ بەرژەوەندی ئینگلیزیش، بەڵام گرفتی سەرەکی نەتوانینی دروستکردنی ئیدارەیەکی باشو رێکوپێکی ئەوتۆیە کە ئەو بۆچوونە لای ئینگلیز دروست بکات کە کورد توانای خۆ بەڕێوەبردنی هەیە. بەتایبەتی ئەو سەرئەنجامەی کە رەفیق حیلمی پێی گەیشتووە لەراستی لێکۆڵینەوەی گرێ سەرەکییەکە

نزیکمان دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە کە کاتێ ئینگلیزەکان باش لە سروشتو کەسێتی شێخ مەحمود تێگەیشتوون بۆیان دەرکەوتووە کە زۆر بەتەنگ دوارۆژەوە نییە.

مەبەستی ئەو لەدوا رۆژ ئاشکرایە واتە شێخ خاوەنی روانینو ئاسۆیەکی روون نەبووە بۆ ئایندەو تەنیا ئێستای بینیوەو ئاستی تێگەیشتنیشی لە ئێستا بێگومان لاوازو سادە بووە چونکە ئەو هیچ متمانەیەکی بە منەوەرانو رۆشنبیرانی سەردەمەکەی خۆی نەبووەو بە شایەنی ئەوەی نەزانیوون کە پرسو رایان پێ بکات، لە هەمان کاتدا ئەوانەی لە نزیکی بوون نە لە رووی تێگەیشتنەوە نە لەرووی جورئەتو تواناوە لەو ئاستەدا نەبوون کە ئاسۆی بینینی شێخ مەحمود روونتر بکەنەوەو رێگای راستی نیشان بدەن، بەڵکو دەشێ لەپێناوی بەرژەوەندیەی کاتی خۆیاندا شێخ مەحمودیان بە هەڵەدا بردبێت محەمەد رەسوڵ هاواریش کاتێ باسی ئەوە دەکات کە شێخ مەحمود پیاوێکی تازە پیاکەوتوو بووە لەرووی سیاسەتو پەیوەندیکردنەوە تا ئەو ئەندازەی کە دەڵێت لە زۆر هەڵوێستدا سەرگەرمۆ سەرچڵ بوو. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەوەندەی شێخ لەژێر کاریگەری فاکتەری هەڵچوونو کاردانەوەو ئازایەتی خۆیدا جوڵاوەو هەڵوێستی وەرگرتووە ئەوەندە بە لۆجیکی سیاسی عەقڵی سیاسیو لێکدانەوەی هەمەلایەنەی هەموو مەسەلەکانو کارکردن لەسەر بنەمای لێکدانەوەی قوڵو سەرئەنجامی ئەو لێکدانەوانە کاری نەکردووە. بەگوێرەی ئینگلیزەکان ئەو ماوەیەی کە مێجەر نۆئێل لە سلێمانی حاکمی سیاسی بووە ئەوە قۆناغی تاقیکردنەوەی کەسێتیو تواناو روانینی لێهاتووی شێخ مەحمود بووە تا بزانن ئایا بۆ ئەوە دەشێت کە ئەرکی بەرێوەبردنی وڵاتی پێبسپێرن. بەروانینی من هێمنیو دان بەخۆگرتنی نۆئێل بەرامبەر بەو لاوازیو شێوازی بەرێوەبردنەی شێخ مەحمودو خەریک بوونی بەکاری سادەو بێ قەوارەوە بەراورد بە کێشەیەکی گەورەو هەستیاری وەکو حوکمدارێتیو مەسەلەی نەتەوەوە، تەنیا بۆ ئەوە بووە کە بە وردی لە

هەموو رووبەکەوە شێخ مەحمودو واقیعی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردیش بۆ ئەو مەبەستە هەڵبسەنگێنێت، بۆچوونی دروستیش ئەوەیە کە شێخ مەحمود لەو تاقیکردنەوەی ئینگلیزدا دەرنەچووە، هەر بۆیە دوای تەواوبوونی ئەرکەکەی، نۆئێل بەرەو لایەکی ترو بەرپرسیارێتییەکی تر دەچێت‌و مس بێڵ دێتە جێگای ئەو کە لە وەسفکردنەکانی رەفیق حیلمیدا دەردەکەوێت کە کەسێتی بێڵ جیاواز بووە لە نۆئێل، بەلام بەلای منەوە مەسەلەی جیاوازی لە کەسێتی نۆئێل‌و بێڵدا پەیوەندی بە جیاوازی ئەرکەکانیانەوە هەبووەو دەبێ ئەو راستییە بزانین کە دەوڵەتی بەریتانی دەوڵەتێکی دامەزراوەیی بووە لەو کاتەداو تاکە کەس ئەو دەورەی نەبووە لە بڕیارداندا بەڵکو بەپێچەوانەوە بڕیار سەرچاوەیەکی یەکگرتوو کۆ دەنگی هەبووەو جیاوازی کەسێتەکان پەیوەندی بە کات‌و شوێنەوە هەبووە، کەوا لێرەدا دەگەین بەو سەرئەنجامەی هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان پشت لە شێخ مەحمود بکەن خودی شێخ مەحمودو شێوازی کارکردنی‌و دەوروبەرەکەی بووە. ئینگلیزەکان هەلێکیان رەخساند، بەلام شێخ مەحمود نەیتوانی سوودی لێ وەرگرێت بە قازانجی خۆی‌و کورد.

# رۆڵی ڕاپەڕین لە زیاتر شێواندنی بارودۆخەکەدا

شێخ مەحمود بۆ گەڕانەوەی ئەو دەسەڵاتەی کە خەریکبوو بزر دەبوو لە ڕۆژی ۲۲ی مایسی ۱۹۱۹دا ڕاپەڕینێکی ڕێکخست کە بۆ سەرکەوتنی پشتی بەست بە پاڵپشتی کوردەکانی ئێران کە لە سنووری ئێرانەوە بگەنە لای بەتایبەتی عەشیرەتەکانی هەورامان‌و مەریوان[٣٢] شێخ مەحمود کە زانی ئینگلیز لە هەموو لایەکەوە دەیەوێت خەڵکی لێ دوور بخاتەوەو دەسەڵاتەکەی تەواو لاواز بکات کەوتە خولیای ئەوە کە لەڕێگای ڕاپەڕین‌و چەکەوە هەوڵی ئەوە بدات کە ئینگلیزەکان ناچار بکات دەستبەرداری ئەو جۆرە رەفتارکردنە بن لەگەڵیدا، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە مێجەرسۆن بوو بە حاکمی سیاسی سلێمانی، ئیتر شێخ باش تێگەیشت کە مەبەست‌و نیەتی ئینگلیز چییە. بۆیە کەوتە بیرکردنەوەی لێدانی ئینگلیز لە سلێمانی، دیارە گومانی هەبوو لەوەی کە بەو هێزەی کە لە سلێمانیدا هەیبوو و بتوانێت لەڕووی ئینگلیزەکاندا بووەستێت بۆیە.. بە دزییەوە ڕایسپارد کە مەحمود خانی دزڵی بە بیانووی زیارەتی کاك ئەحمەدەوە بێتە سلێمانی‌و بیگرێت. مەحمود خان بە سێ سەد کەسێکی چەکدارەوەو لە ۲۱ی مایس دا هاتە سلێمانی‌و گرتی.. مێجەر سۆن پێش گەیشتنی مەحمود خان بۆ ناو شار (گرینهاوس)ی کرد بە وەکیل‌و خۆی بە سەیارە گەیاندە کەرکوك[٣٣].

بە هەر حاڵ دوای هاتنی هێزەکانی مەحمود خانی دزڵی شار کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەواوەتی شێخ مەحمودو لایەنگرەکانی. بەڵام ئایا ئەوە دوا چارەسەر بوو، ئیتر شێخ دەیتوانی بە ئاسانی‌و بە ئاشتی لەشاردا دابنیشێت‌و حوکمداری بکات یان دەبوو خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی ئینگلیز ئامادە بکات کە ئەوەش مەسەلەیەك بووە عەقڵ نەیبڕیوە کورد بە هێزێکی لاوازی

ناوخۆو بە پاڵپشتی هێزێکی عەشایەری دەرەوەی شار بتوانێت لە بەرامبەر هێزێکی سەربازی دیسپلین کراوی خاوەن چەکو تەقەمەنیدا رابووەستێت. بێگومان ئەنجامیش هەر بەو جۆرە بووە کە شێخ مەحمودو هێزەکانی نەیانتوانی بەرگرییەکی ئەوتۆ بکەن کە حوکمداری بپارێزن، بەڵکو لە ئەنجامی ئەو راپەڕینەدا ئەو دەسەڵاتە سنووردارەش لەدەست چوو. ئێستا پرسیار ئەوەیە ئایا ئەگەر شێخ مەحمود راپەڕینی نەکردایە دەسەڵاتەکەی چی بەسەر دەهات؟ ئەی ئەگەر شێخ مەحمود بەدڵی ئینگلیزەکان هەڵبسورایە ئایا چارەنووسی دەسەڵاتدارییەکەیی‌و کوردیش چۆن دەبوو؟

بێگومان ئەوە ئەگەرە کە ئێمە دایدەنێین بەڵام بۆچوونی بابەتی ئەوەیە کە ناشێت تۆ ئینگلیز خۆی رابگەیەنێت کە تۆ نوێنەری ئەویت لە سلێمانی‌و حاکمی سیاسیشی بۆ دانابێت‌و هەموو کاروبارەکان بەدەستی ئەوەوە بێت‌و تۆش لە بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانەدا بەشداری ئەو بیت، چی دەگەیەنێت کە هەم خۆت رابپەڕیت‌و هەم هێزی دەرەوەش بانگهێشت بکەیت بۆ یارمەتی دانت بەدژی ئەوی ئینگلیز گریمان ئەوەشت کرد بەڵام دەبێ لە سادەترین لێکدانەوەدا لەوە تێبگەیت کە تۆ دەڕوخێیت‌و ئەو دەسەڵاتە سنووردارەی کە پێت دراوە لێت دەسەندرێتەوە یان لەدەستت دەچێت. بەداخەوە ئەوەی جێگای سەرنجە شێخ مەحمود بیری لەوە نەکردۆتەوە کە هەر کارێکی چەکداری دژی ئینگلیز دەشێ ببێتە هۆی لە دەستچوونی ئەوەی کە دەستی کەوتووە.

دیارە بەپێچەوانەی ئەم هەڵویستەشەوە شێخ مەحمود ئەگەر بە نەرم‌و نیانی رەفتاری لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکردایەو لەسەر ئاستی نێوخۆ نموونەیەکی تری دەسەڵات‌و بەڕێوەبردنی پێشکەش بکردایەو لەبری ململانێ‌و ناکۆکیش لەگەڵ خێڵ‌و عەشیرەتەکانی تری کوردستاندا هەوڵی پێکەوە کارکردن‌و پێکەوە ژیان‌و هاریکاری کردنی بدایەو دەسەڵاتی حوکمدارییەکەی تەنیا لە سنووری ئەندامانی بنەماڵەی شێخان‌و دۆستەکانیان لە سلێمانی نەمایەتەوەو ئەو

دەسـەڵاتەی کـە دروسـتکرا رووبـەرێکی فـراوانتری لـە کۆمـەڵگای کـوردی بگرتایەتەوە رەنگە ئەگەری ڕوخاندنی کەمتر بووایە. بێگومـان لێرەوە بۆمـان دەردەکـەوێت. سـەرباری باڵادەسـتبوونی گوتـاری خێـڵ لەسـەردەمی شـێخ مـەحموددا، گوتـاری دەسەڵاتدارییەکەشـی زیـاتر گوتـاری خێڵایـەتی یـان ناوچەگەری بـووە، ئەمـەش زیـاتر ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە ناسیونالیزم لـەو مێژووەدا بـوونی نـەبووەو تەنانـەت ناسیونالیـستیش وەکـو نوخبـە هـەم لـە دەسـەڵاتدارییەکەی شـێخ مـەحموددا لـە ئاسـتی نـەبوودا بـووە، هـەم لەسـەر زەمینەی سیاسیو مێژوویی ئەو قۆناغەش ئامادەبوونی نـەبووە، هـەر لێرەوە دەشێ بگوترێت سەرباری ئامـادەبوونی نـاوی کوردو کوردستان لەسـەردەمی حوکمداری یەکەمی شێخ مەحموددا گوتاری کوردی لە ئاستی نـەبوودا بـووە چ وەکو گوتارێکی گشتی لەسـەر ئاسـتی کۆمـەڵگا چ لەسـەر ئاسـتی تاکەکەسـی حوکمدار واتە خودی شێخ مەحمود چونکە ئەوە ئاشکرایە شێخ مەحمود هـەتا کۆتایی هـاتنی جـەنگیش هـیچ هەڵوێستێکی ئـەوتۆی لێ نابینرێـت کـە هەسـت بکرێت مۆتیڤی نەتـەوایەتی لە پشتیەوەیە. هەروەك دەشزانین کاتێکیش کە بوو یان کرا بە حوکمداری بەشێك لە کوردستان ئەم نە پرۆژەیـەکی دیـاری هـەبوو، نە ئاسۆیەکی روونیشی هەبوو هەم بۆ دۆزی کورد، هەم بەرامبەر بە ئینگلیز.

مەبەستمان لەم قسانەی سەرەوە ئەوەیە کە گوتاری کوردی شـتێك نییـە لـە ناکاودا دروست ببێت یان بەرهەمی کاردانەوە بێت، بـەگوێرەی راپـەڕینی شـێخ مەحمود لەدوای نزیکی شەش مانگ لـە حوکمـداری دەردەدەکـەوێت کـە شـێخ مەحمود خاوەنی گوتارێکی دیار نەبووە نە لەکاتی حوکمدارییەکەیدا نە لەکاتی راپەڕینەکەیـدا، بـەڵکو لـە یەکەمیانـدا ئینگلیزەکـان دایـان نـاوە بـۆ ئـەوەی سیمایەکی ناوخۆیی یان کوردایەتی بدەن بە دەسەڵاتی خۆیان لـە ناوچـەکەدا، لە دووەمیشدا واتە لە راپەڕیندا شێخ مـەحمود لـەبری بـوونی گوتـارێکی دیـار، کاردانـەوە دەیکەڕێنێتـەوە ئاسـتی هەڵوێست وەرگرتن ئێمـە پێشتر گوتمـان گوتـار ئـەو پێکهاتـە زمانییـە کـە بارگـاوی کرابێـت بـە فیکـرو مەعریفـەو

جیهـانبینی، ئەگـەر ئـەم رەگەزانـە بـوونی هـەبێت ئـەوا بێگومـان جێگـا بـۆ کاردانەوەو هەڵچوونی ژێر کاریگەری پاڵنـەرو هۆکـاری سۆزو عاتیفـەو هەسـتی سادە نامێنێتەوە. بۆیە لێرەوە دەتوانین ئامـاژە بـۆ ئـەوە بکـەین کـە گوتـاری شێخ مـەحمود ئەوەنـدەی گوتـاری کاردانەوەیـەو ئەوەنـدەی مـۆتیڤی سـۆزو عاتیفەو هەڵچوون دەیجوڵێنێت ئەوەندەی گوتاری تاکە کەسە، ئەوەندە نەبۆتە گوتارێکی جەماوەری کە روانین‌و فیکرو بەرژەوەنـدی هاوبەش بنـەمای بێـت. هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ غیابی ناسیونالیزم‌و ناسیونالیست. ئەمە جگە لە پەروەردەی داخراوو ئاسۆ کورتی کۆمەڵگای کوردی کە هەم شـێخ مـەحمود پـەروەردەی ئـەو کـەلتورە داخـراوە بـووە، هـەم ئـەو کۆمەڵگایـەش کـە شـێخ مەحمودی تیا ژیاوە لە بارودۆخێکدا بووە کە نە ئامادەگی هەبووە بۆ راپەڕین‌و شۆڕش، نـە خێـڵ‌و عەشـیرەتەکانی کـوردیش لـەو ئاستەدا بـوون کـە بنـەمای یەکگرتن‌و یەکبوونیان هـەبێت کـە ناشـێت بـەبێ یـەکگرتن‌و یـەکبوون راپـەڕین بکرێت خۆ ئەگەر ئەوەش روویدا ئەوە ناشێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت.

ئەم قسانەش ئەوەی لێ بەرهەم دێت کە ناشـێت تەسـەوری ئـەوە بکـەین لـە واقیعێکی دواکەوتووی وەکو کۆمـەڵگای کـوردی ئـەو سـەردەمەدا چاوەڕوانی ئەوە بکەین بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی پێشکەوتوو دروست ببێت، رەنگـە تاکـە کەسـی سـەرکردە دەربکـەوێت دەوری دیـار ببینێـت لـە کۆمـەڵگای خۆیـداو تـوانیبێتی هـەموو توانـاو رۆحـی کۆمـەڵگا لـە کەسـێتی خۆیـدا کۆبکاتـەوەو رابەرایەتی کۆمەڵگا بکات کە ئەوەش دەبێتە بـاوکی رۆحـی، بـەڵام دیـارە ئـەم حاڵەتە بۆ شێخ مەحمود فەراهەم نەبووە نە لەپێش ئەوەی ببێتە حوکمدارو نە لـەکاتی حوکمـداری یەکـەمی‌و نـە لـەکاتی راپـەڕین‌و نـە لـە کـاتی حوکمـداری دواتردا، بە واتا شێخ مەحمود وەکو سەرکردەیەك نەیتوانیووە رۆحی کۆمـەڵگا لە خۆیدا کۆبکاتەوەو هەموو کۆمەڵگای کـوردی بـەرەو ئـازادی‌و سـەربەخۆیی‌و دروستکردنی دەوڵەتی کـوردی رابەرایـەتی بکـات. بـە واتایـەکی تـر ناتوانرێـت تەسەوری ئەوە بکرێت کە شێخ مەحمود کاریزمای هەبووبێت.

بە هەر حاڵ شێخ مەحمود لە ئەزموونی یەکەمی حوکمدارییەکەیدا کە نزیکەی شەش مانگی خایاند نەیتوانی نموونەی ئیدارەیەکی لەبار پێشکەش بکات بۆ ئەوەی سەرنجی ئینگلیزەکان بۆ لای خۆی رابکێشێت و ئەو بۆچوونەیان لەلا دروست بکات کە دەتوانێت کوردستان بەڕێوە ببات. هۆکەشی ئەوەیە شێخ مەحمود هەر بەچاوی بەڕێوەبردنی عەشیرەت و خێڵەوە سەیری بەڕێوەبردنی حوکمدارێتی کردووەو دەشێ وای ببینین کە وەزیر هەر هەمان شوێن و پلەو پایەی پیاوماقوڵانی عەشیرەتیان هەبووە. لایەنی دووەمی لاوازی ئەم ئەزموونەی حوکمداری شێخ مەحمود نەتوانینی رێکخستنی خێڵ و عەشیرەتەکانی تری کوردستان بووە بۆ ئەوەی بە سەرۆکی خۆیانی قبوڵ بکەن و بێنە سنووری دەسەڵاتی ئەوەوە ئەم دوو خاڵەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە سەرباری دەرکەوتنی هەستی نەتەوایەتی لای شێخ مەحمود بەتایبەتی لەسەر وەختی کۆتایی هاتنی شەڕەوە بەڵام نەبۆتە هەڵگری گوتاری نەتەوەیی کوردی.

ویڵسن دەڵێت: بەتەواوی نەدەتوانرا بزانرێت بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەناو کوردەکاندا هەتا چ رادەیەك ئەتوانێ داوای سەربەخۆیی کوردی پێ بکرێ و نەدەتوانرا بزانرێ ئایا ئەو بزوتنەوەیە بریتییە لە خولیاو ئارەزووخواستنی یەکێك لە سەرۆك عەشیرەت و زەعیمەکانی کورد یان نا؟[٤]

هەرچەندە باسی ئەوەش دەکرێت کە ئەو هەستە لە سلێمانیدا دیارە بەهێز بووە. بەڵام لەڕووی خوێندنەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی و مێژوویی ئەو کاتەوە ناگەینە ئەو بۆچوونەی کە راستی ئەم قسەیە بسەلمێنین، بەتایبەتی لەکاتێکدا باسی بوونی ئەو هەستە نەتەوایەتیە دەکرێت لە سلێمانیدا کەچی هەر خودی ویڵسن دەڵێت: جگە لە شێخ مەحمودو لایەنگرەکانی، ئەوەشمان ئەزانی کە هێزێکی تر هەبوو لەناو سلێمانیدا کە بریتی بوون لە پارەدارو موڵکدارو بازرگان کە بەلای ئەوانەوە دەسەڵات بەدەست بەریتانیاوە بوایە باشتر بوو وەك ئەوەی لای شێخ مەحمود بێ[٣٥].

له ئاستی یەکەمدا بۆمان دەردەکەوێت کە تەنانەت لەنێو سلێمانی خۆیشیدا خەڵك دابەشبوون لەنێوان لایەنگرانی شێخ مەحمودو نەیارانی نەیارەکانی ئەهلی بازاڕو خاوەن موڵكو پارەو بازرگان بوون کە بە ئاشکرا لەم قسەیەدا دەردەکەوێت هێزی ئابوری لای ئەمانە بووە. دەبێ بپرسین بۆچی ئەهلی بازاڕو پارە لایەنگری دەسەڵاتی شێخ مەحمود نەبوون لەکاتێکدا بەپێی لێکدانەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی هەستی نەتەوەییو دەرکەوتنی ناسیونالیزم لەنێو شارەوەو لای ئەهلی کاروبازاڕو نوخبەی خوێندەوار دروست دەبێت، کاتێکیش باسی بازرگانو ئەهلی پارە دەکرێت واتە باسی بازاڕ دەکرێت، بەو پێیە دەبوو ئەهلی بازاڕ زووتر هەستی نەتەوایەتیان لەلا دروست ببوایە لەچاو ئەو پێکهاتەیەی تردا کە لایەنگری حوکمداری شێخ مەحمود بوونو لە راستیشدا ئینتیمایان بۆ شێخ مەحمود ئینتیمای عەشرەتایەتیو خێڵایەتیو تەریقەت بووە کە ناشێت لە رووبەری جوگرافیای ئەم پێکهاتەیەدا بەدوای هەستی نەتەوایەتیدا بگەڕێین.

له قسەکانی وێڵسندا دەردەکەوێت کە مەسەلەی سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەت لای کوردەکان بەتایبەتی لەسەر ئاستی گشتی جەماوەر ئاشکرا نەبووە، دەشێ ئەو هەستە لای تاکەکەس سەری هەڵدابێت، بەڵام کاتێ دەتوانرێت باس لە بزوتنەوەی نەتەوەیی بکرێت کە ناسیونالیزم بوبێتە پرۆژەو ئایدیۆلۆژیای بزوتنەوەیەکی جەماوەری، ئەمەش لە روانینی وێڵسنو ئینگلیزەکانەوە بوونی نەبووە، دەشێ شێخ مەحمود هەستێکی وەهای هەبووبێت بەڵام لە پلەی یەکەمدا تەنیا هەستی تاکەکەس بۆ گەیشتن بە ئاستێك کە دەبێ بزوتنەوەی جەماوەری لە پشتییەوە بێت بەس نییە، لە هەمان کاتدا چۆنێتی کارکردنی ئەو تاکە کەسەش لەو بوارەدا دەوری گرنگی دەبێت.

سەرئەنجامی قسەکردن لەسەر حوکمداری یەکەمی شێخ مەحمود دەگەینە ئەو بۆچوونەی کە بڵێین لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەو قۆناغەدا لەبری گوتاری

نەتەوەیی گوتاری خێڵایەتی ناوچەیی بارگای کراو بە رەگەزەکانی ئایین باڵا دەست بووە، نوخبەی ناسیونالیست ئامادەبوونی نەبووە، ناسیونالیزم بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێك لەوانەی لەسەر بزووتنەوەکانی کورد قسەیان کردووەو باس لە بوونو قۆناغەکانی ناسیونالیزم دەکەن، ناسیونالیزم دەرنەکەوتووە، شێخ مەحمود سەرکردەیەکی پشت بەستوو بە بنەمای عەشیرەتایەتیو تەریقەت بووەو هەستێکی سادەی نەتەوایەتیشی لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕ لەلا دروست بووە، بەڵام ئەو هەستە لەو ئاستەدا نەبووە گوتاری نەتەوەیی کوردی بەرهەم بهێنێت.

# بەشی بیست و شەش

## سروشتی گوتاری شێخ مەحمود
## لە ڕوخاندنی حوکمداری یەکەمەوە

له رۆژی ۱۹۱۹/٦/۱۸دا دوای شکستی هێزەکانی شێخ مەحمود له دەربەندی بازیان‌و بەدیل گرتنی شێخ بە برینداری‌و پاشان دادگایی کردنی‌و سزادانی بە خنکاندن‌و پاشان گۆڕینی سزاکەی بە زیندانی بۆ ماوەی (۱۰) ساڵ‌و ڕەوانەکردنی بۆ هیندستان، هیچ بنەماو پاشماوەیەکی حوکمدارییەکەی نەمایەوەو ئینگلیزەکان ڕاستەوخۆ دەسەڵاتیان بەسەر سلێمانیدا کردەوە، دەبوو هەوڵبدەن ئاسایش‌و جۆرێك لە ئاوەدانکردنەوە جێبەجێ بکەن، بەلایەنی کەمەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە حوکمداری ئەمان لە حوکمداری شێخ مەحمود باشترە بۆ ناوخۆی ئەو بەشەی کوردستان کە پێشتر شێخ حوکمداری بووە.

لەدوای ڕوخاندنی دەسەڵاتدارییەکەی شێخ مەحمود لە مانگی حوزەیرانی (۱۹۱۹)دا کە ئینگلیز هاتەوە سلێمانی ئایا چۆن شێوازی بەڕێوەبردنی خۆیی ڕێکخستەوە؟ ئایا خەڵکی کوردستان هەڵوێستیان چۆن بوو؟ ئایا لەدوای دادگایی کردن‌و ڕەوانەکردنی شێخ مەحمود بۆ هیندستان چی بەسەر پاشماوەی حوکمدارییەکەی‌و لایەنگرانیدا هات واتە گوتاری سەردەمی حوکمداری شێخ مەحمود چی بەسەرهات؟ ئایا ڕۆڵی تورکەکان لەو قۆناغەدا چی بوو؟

بێگومان پەیوەندی شێخ مەحمود هەرچەندە لەگەڵ مس بێل دا زۆر باش نەبوو، بەڵام نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی کە شێخ مەحمود بەتەواوی بگاتە ئەو بۆچوونەی کە ئینگلیز پشتیان تێکردووە. بەڵام کاتێ لەناوەڕاستی مانگی مارتی (۱۹۱۹)دا مێجەرسۆن کرا بە حاکمی سیاسی سلێمانی ئیتر پشتگوێ خستنی شێخ مەحمود لەلایەن ئینگلیزەوە بە ئاشکرا دەرکەوت. هەر لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنیدا مێجەرسۆن کە بە فرۆکە گەیشتە سلێمانی شێخ مەحمود لەگەڵ خەڵکێکی زۆر چوویبوونە پێشوازی کردنی.. مێجەرسۆن بە فرۆکە گەیشت‌و کە دابەزی یەکە یەکە لەگەڵ خەڵکدا تەوقەی کرد‌و دەستی گوشین بەڵام بە هیچ جۆرێك ڕووی نەکردە شێخ مەحمود[٣٦] ئەمەش سەرەتایەك بوو

که زەنگێکی ترسناکی بۆ شێخ مەحمود لێداو دەشێ وەهایشی لێکبدەینەوە که یەکێك لە هۆکارەکانی راپەڕینی شێخ مەحمود کە دوای سێ مانگ لەم هەڵوێستەی مێجەرسۆن بەرامبەری روویدا ئەم هەڵوێستەی مێجەرسۆن بوو بێت که لەوەشدا زیاتر بالآ دەستبوونی گوتاری سۆزو عاتیفە دەردەکەوێت کە دیارە کارکردن بە هۆکارو پاڵنەری سۆزو عاتیفەش لەبواری سیاسەتدا ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە.

به هەرحاڵ دوای روخاندنی حوکمداری یەکەمی شێخ مەحمود، مێجەرسۆن وەکو حاکمی سیاسی سلێمانی بەردەوامبوو لە کارەکانیداو بە ئارەزووی خۆی شاری بەڕێوە دەبردو تا ئەندازەیەك خەریکی خەرجکرنی پارەو لێدانی هەندێ رێگاو بانو پرد بوو، لە هەمان کاتدا مێجەرسۆن چاپخانەیەکی هێنایە سلێمانیو یەکەم ژمارەی رۆژنامەی پێشکەوتنی پێ لە چاپدا. لێرەوە دەردەکەوێت کە راستە سۆن پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحمودا خراپ بوو، یەکێك لە هۆکارەکانی راپەڕینی شێخ مەحمود رەفتاری خراپو توندوتیژی مێجەرسۆن بوو.. بەڵام سۆن باوەڕی بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی کورد هەبوو، بۆیە کوردی کرد بە بەشداری بەڕێوەبردنی ناوخۆو فێری بنەماکانی حوکمی دەکردن[٢٧] سۆن دژی ئەوە بوو کە کورد بە کەمایەتییەکی عێراقی دابنرێ، کۆتایی ئەو ساڵە بە راشکاوی رای خۆی بەرامبەر بە سەپاندنی حوکمێکی عەرەبی بەسەر سلێمانیدا دەربڕی کە دەبێ کاتیو رێ خۆشکەر بێت بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی[٢٨].

به هەر حاڵ ئەم قسانە لەبارەی مێجەرسۆنەوە بۆ ئەوە نییە کە وەکو دۆستی کورد نیشان بدرێت، بەڵکو دەمانەوێت لە روانگەی ئەم دوو هەڵوێستە جیاوازەیەوە سەیری تێڕوانینی ئەو بکەین بۆ شێخ مەحمود، کە دەشێ وەهای لێکبدەینەوە کە مێجەرسۆن شێخ مەحمودی بە شایانی ئەوە نەزانی بێت کە حوکمداری بەشێك لە کوردستان بێتو راستییەکەشی ئەوەیە کە سۆن وەکو سەرۆك عەشیرەتێك سەیری شێخ مەحمودی کردوە نەك وەکو سەرکردە یان

رابەری کورد، هەر بۆیە دوژمنایەتی شێخ مەحمود دەکات دەیەوێت هیچ دەسەلاتێکی لەدەستدا نەهێلێتو لەلایەکی تریشەوە مێجەرسۆن باسی سەربەخۆیی‌و لایەنگری دروستکردنی دەوڵەتی کوردی دەکات.

بەهەرحاڵ ئەوەی گرنگە هەڵوێستی ئینگلیزەکان نییە بەلای ئێمەوە، بەڵکو ئەوەی جێگای بایەخی ئەم نووسینەیە خودی کوردو شێوازی کارکردنی‌و ئاستی هوشیاری‌و ئاستی تێگەیشتنی‌و ئاستی هەستی ناسیونالیستان‌و مەسەلەی ناسیونالیزمی کوردییە کە بەو پێیەش دەشێ ئاخاوتن لەسەر گوتاری کوردی بکرێت. بەلای ئێمەوە ئەوەی جێگای بایەخە لە کارەکانی مێجەرسۆندا رێگا لێدان‌و پرد دروستکردن‌و دانانی چاپخانەو رۆژنامە دەرکردنە کە ئەمانە بنەمای سادەن بۆ بنیادنانی شارو پیشەسازی کە لە شاریشەوە یان لە زەمینەی شاردا هەستی نەتەوایەتی‌و هەر بەو پێیەش ناسیونالیزم دەردەکەوێت یان بە مانایەکی تر تەنیا لەژێر کاریگەری پەرسەندنی پیشەسازیدا کە تەکنۆلۆژیاو عەقڵی بەڕێوەبردنی تەکنۆلۆژیا دێتە ئاراوە توانای تاکە کەس‌و عەقڵی تاکە کەس‌و عەقڵی تەکنۆکرات دەبێتە بنەمای کارکردن‌و بەرهەمهێنان دەشێ تەنیا لەو سەرزوبەندەدا پەیوەندییەکانی خێڵایەتی عەقڵ‌و ستراتیژی خێڵایەتی هەڵبوەشێنەوە. ئەوەی لەسەردەمی شێخ مەحمودا خاسێتی دیاری کۆمەڵگای کوردی بووە، هیچ پەیوەندییەکی نەبووە بە کۆمەڵگایەکەوە کە سادەترین خاسێتی کۆمەڵگای سەردەم یان هاوچەرخ یان پیشەسازی هەبێت، کەواتە ناشێت چاوەڕوانی بوونی ناسیونالیزم بکرێت، هەر ئەوەشە کە زیاتر لە هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی خاسێتی خێڵایەتی ناوچەگەری بە بزوتنەوەی شێخ مەحمود بەخشیووە. تەنانەت لە ماوەی دوورخستنەوەی شێخ مەحمود خۆیشیدا بۆ هیندستان واقیعی کۆمەڵگای کوردی هیچ گۆڕانکارییەکی دیاری بەسەردا نەهاتووە. بۆشمان دەردەکەوێت کە بزوتنەوەکەی شێخ مەحمود بەرهەمی بارودۆخی دوای شەڕ بووەو ئەوەندەی خودی شێخ مەحمود خۆی دروستکەرو جولێنەرو

هێزی تەقینەوەی بوو، ئەوەندە بزوتنەوەیەکی جەماوەری نەبووە، چونکە ئەگەر بزوتنەوەیەکی جەماوەری بوایە بە بریندار‌بوون یان دەستگیرکردنی شێخ مەحمود کۆتایی نەئەهات، راستە لەم لاو ئەولا باسی هەندێ جوڵە دەکرێت بەڵام ئەوە لەو ئاستەدا نەبووە کە بتوانێت بیسەلمێنێت کە راپەرینەکەی شێخ مەحمود هەرەسی نەهێناوە. جێگای خۆیەتی گرتنی شێخ مەحمودو راپەرینەکەی بەراورد بکەین بە گرتنی عەبدوڵلا ئوچ ئالانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان و بزووتنەوەکەی، لەبەر ئەوەی بزوتنەوەکەی ئوچ ئالان یان پارتی کرێکاران بووەتە بزووتنەوەیەکی جەماوەری دەستگیر کردنی سەرۆکی ئەو پارتەو بزوتنەوەکەی نەبوو بەهۆی ئەوەی کە بزوتنەوەکەی سەنگەری خەباتو بەرخوردان چۆڵ بکات.

بێگومان لە غیابی شێخ مەحمودا ئینگلیزەکان بیریان بەلای ئەوەدا چوو کە کەسێکی تری شیاو لە کوردستان بدۆزنەوەو ئەرکی حوکمداریو دەسەڵاتی کوردی پێبسپێرن. هەرچەندە لە خواروی کوردستانو لەناوچەی سلێمانی کەسانی دیاری وەکو سەرخێڵەکانی هەمەوەندو جافو شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم هەبوون، بەڵام ئینگلیزەکان زیاتر چاویان لەسەر سەید تەهای نەهری بوو. رەفیق حیلمی دەڵێت: ئینگلیزەکان لەگەڵ سەید تەهای شەمدینان کەوتنە گفتوگۆ، سەید تەها ئەمجارە هەندێ داوای هەبوو ئەمەی لە بەغداد بەرەسمی پێشکەش بە کاربەدەستانی ئینگلیز کرد[39]. هەروەك محەمەد رسوڵ هاواریش دەڵێت: ئەو دەورانە سەید تەهای نەهری یەکێکی تر بوو لەو سەرکردە کوردانە کە خرایە بەر قسەو هەڵسەنگاندن بۆدانانی بە حوکمداری ناوچەی سلێمانیو رەواندز[40].

لێرەدا لەرووی راستیەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەو قسەیە لەجێگای خۆیدا نییە کە گوایە ئینگلیز لە بنەڕەتدا نەیانوویستووە دەوڵەت یان دەسەڵات بۆ کورد دروست بکەن، ئەگەر ئەو قسەیە راست بوایە یەکەم جار شێخ مەحمودیان نەدەکرد بە حوکمداری سلێمانی، دوای ئەویش کە لە

تاقیکردنەوەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو نەیتوانی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بگونجێت‌و دەسەڵاتەکەی روخا، بۆچی ئینگلیزەکان بیریان بۆ لای سەید تەهای نەهری چوو بۆ ئەوەی بیکەن بە حوکمداری بەشێك لە کوردستان. هەندێك وای بۆ دەچن کە ئینگلیز خۆی توانای ئەوەی نەبووە کە کوردستان بەڕێوە ببات بۆیە هەوڵیداوە لە ڕێگای کەسانی دیاری خاوەن نفوزەوە ئەم کارە بکات، لە ئاستی یەکەمدا ئەوە قسەیەکی بێ بنەمایە کە ئینگلیز نەیتوانیبێت کوردستان بەڕێوە ببات یان کۆنترۆڵی بکات چونکە تواناو هێزی سەربازی‌و مادی‌و مەعنەوی‌و عەقڵی ئینگلیز لەو سەردەمەدا زۆر لەوە زیاتر بووە کە نەتوانێت دەسەڵات بەسەر پێکهاتەیەکی خێڵایەتی لاوازی دواکەوتووی هەژاری دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا بکات. کەواتە لێرە دەگەین بەو سەرئەنجامەی کە کورد خۆی لەو ئاستەدا نەبووە کە بتوانێت ئەرکی بەرپرسیارێتی‌و بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی خۆی بگرێتە ئەستۆ بەجۆرێك کە متمانە لای ئینگلیزەکان دروست بکات. بە مانایەکی تر کورد خۆی نەیتوانیووە لەڕووی بەڕێوەبردن‌و عەقڵی سیاسی‌و خۆگونجاندنەوە ئەوە بە ئینگلیزەکان بڵێت کە ئەم توانای ئەوەی هەیە وڵاتی خۆی لە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و گونجاودا بەڕێوە ببات.

بێگومان لەدوای روخاندنی حوکمداری یەکەمی شێخ مەحمودەوە تاکو گەڕانەوەی لە هیندستان‌و گەیشتنەوەی بە سلێمانی لە ڕۆژی ٣٠ ئەیلولی ١٩٢٢، شتێکی ئەوتۆ لەبارەی شێخ مەحمودەوە یان گوتاری شێخ مەحمودەوە باس ناکرێت چونکە لەسەر مەیدانی ڕووداوەکان نەبووە‌و تەنیا لە یادەوەری بەشێك لە خەڵکدا ئامادەبوونی هەبووە. هەرچەندە هۆی گێڕانەوەی شێخ مەحمود لەلایەن زۆرێك لەوانەی لەو باسە دوواون دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی ئینگلیز‌و نەتوانینی دروستکردنی سەقامگیری لە خواروی کوردستاندا. بەڵام بە بۆچوونی من هۆی سەرەکی ئەوە بووە کە ئینگلیزەکان دوای بێ ئومێد بوون لە سەید تەهای نەهری بۆ ئەوەی بکرێتە حوکمداری خوارووی کوردستان‌و دوای باڵادەستبوونی ئۆزدەمیر لە ڕەواندوز‌و دەوروبەری‌و

پەیوەندیکردنی بەشێك لە کوردەکان پێیەوە، بیریان لەوە کردۆتەوە کە هەلێکی تر بدەن بە شێخ مەحمود تا بزانن ئەمجارەیان چی دەکاتو چۆن کار دەکات، ئایا دەشێ لە تاقیکردنەوەی ئەمجارەدا دەربچێت؟ بێگومان دەرچوونیش لەو تاقیکردنەوەیەدا لەسەر دوو خاڵ بەندبوو یەکەمیان تێگەیشتنی شێخ مەحمود لە گەمەرو بەرنامەی سیاسی بەریتانیا لە ناوچەکەداو بەگشتیو رەفتارکردن بە جۆرێك کە دژو ناکۆك نەبێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیادا. دووەمیان چۆنێتی پێکهێنانی دامەزراوەکانی ئەو دەسەڵاتەی دروستی دەکاتو چۆنێتی بەڕێوەبردنیان واتە دروستکردنی دامەزراوەی بەڕێوەبەرێتی لەسەر بنەمای لێهاتوویی‌و بە باشی بەڕێوەبردن نەك لەسەر بنەمای خزمایەتیو پەیوەندی کە ئەمەش خاسێتی کۆمەڵگای خێڵە واتە ئێستا شێخ مەحمود لەبەردەمی ئەو تاقیکردنەوەیەدایە کە ئەمجارەش وەکو جاری یەکەم حکومەتێك دروست دەکات کە لە شێوەی ئەنجومەنی پیاوماقولانی خێڵو عەشیرەتدا دەبێت یان نموونەیەکی ئەوتۆ پێشکەش دەکات کە لە روانگەی ئینگلیزەکانەوە نموونەیەکی پەسەند بێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان واتە پرسیارەکە ئەمەیە ئایا لە جاری دووەمدا شێخ مەحمود پشتی بە هەمان جۆر نموونەکانی پێشترو هاوشێوەی ئەوان بەستەوە بۆ دروستکردنی حوکمدارییەکە یان حکومەتەکەی لە نوخبەی منەوەرو ئەفسەرانی پێشتری نێو سوپای دەوڵەتی عوسمانی بەست؟ وەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارە رووناکی دەخاتە سەر گەوهەری گوتاری شێخ مەحمود لەم بارودۆخەی دوای گەڕانەوەیدا.

شێخ مەحمود دوای ئەوەی لە کفری پێشوازی کرا بە قۆناغ بەرەو سلێمانی بەڕێکەوت کە لەو ڕێگایەشدا وەك ئەدمۆنز دەڵێت بینینی جەماوەری پێشوازیکەرو هەوای کوردستان مەیلی سەرکردایەتی شێخ مەحمودی زیاتر گەشانەوە. ئیدمۆنز دەڵێت هەر بەزوویی چەند ناڕەزاییو سکاڵای کە لە شێخەکانی تاڵەبانیو هی تریشەوە پێگەیشت کە باسی ئەوەیان تیا کرابوو

شێخ مەحمود لەڕێگا ناچاری ئیمزاکردنی دۆکیومێنتێکی کردوون بۆ داواکردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بە سەرۆکایەتی خۆی.

بێگومان ئەم کارەی شێخ مەحمود لەڕێگای گەڕانەوەدا دەری دەخات کە شێخ لەسەر ویستی خۆی سوور بووە کە سەریەخۆی کوردستان بووە، بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرنجە ئەوەیە کە تاڵەبانیو ئەوانەی تریش کە ناویان لای ئەدمۆنز هاتووە دیارە بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود رازی نەبوون بۆیە سکاڵایەك گەیشتۆتە لای ئیدمۆنز. ئەمەش لەلایەك دیسان لاوازی هەستی نەتەوایەتی دەردەخات لەلایەکی ترەوە شێوازی کارکردنی شێخ مەحمود نیشان دەدات چونکە دەشیا لەبری ناچارکردن لەڕێگای رێکەوتنەوە هەوڵی ئەو ئیمزایەی پێبدانایە، یان هەر لە بنەڕەتدا دەکەوینە سەر ئەو لێکدانەوەیە دەبێ گەل خۆی بە خواستی خۆی دوای سەرکردە بکەوێتو بوونو ئازادی خۆی لە بوونی سەرۆکدا ببینێتەوە نەك سەرۆك ناچاریان بکات کە دوای بکەون، رەنگە ئەمەش لە قۆناغی دووەمی حوکمداری شێخ مەحموددا یەکێك لەو هۆکارانە بووبێت کە لاوازی کەسێتی شێخ مەحمودی بۆ سەرۆکایەتی دەوڵەتی کوردی نەك حوکمداری دروست کردبێت، بە مانایەکی تر یەکێك لە کێشەکانی شێخ مەحمود ئەوە بووە کە سەرباری پلەو پایەی بنەماڵەکەیو خۆی بەڵام نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بەلایەنی کەمەوە خەڵکی خوارووی کوردستان بێ جیاوازی بنەمای خێڵایەتیو عەشیرەتایەتی وەکو سەرۆکی خۆیان قبوڵی بکەن، ئەوەش پەیوەندی بە دوو لایەنەوە هەیە یەکەمیان باڵادەستبوونی عەقڵو ستراتیژی خێڵایەتی لە کوردستان کە هەر خێڵو عەشیرەتە خۆی لە هەموو ئەوانی تر پێ لەپێشتر بووەو دەسەڵاتدارێتی خۆیی لە سنووری جوگرافیای خێڵدا لەپێش دەسەڵات دەوڵەتی کوردییەوە داناوە، بە واتایەکی تر عەقڵی خێڵایەتی کوردی ئەو عەقڵە بووە کە دەسەڵاتێکی سنووورداری خێڵایەتی کە خۆی واتە سەرخێڵ یان شێخی عەشیرەت بەڕێوەی ببات بەلاوە باشتر بووە لە دەوڵەتێکی کوردی کە یەکێکی تر بەڕێوەی ببات.

بە مانایەکی تر عەقڵی باوی خێڵایەتی کوردی لەو سەردەمەدا ئەوە بووە کە دەخوازێت خۆی دەسەڵاتێکی هەبێت هەرچەندە سنوور تەسکیش بێت گرنگ نییە بەواتا لەو بۆچوونەی ئیبن خەلدونەوە کاریکردووە کە دەڵێت "دەسەڵاتم دەوێ تەنانەت ئەگەر لەسەر بەردێکیش بێت"[42] کۆسپی یەکەم شێخ مەحمود ئەم بنیادو عەقڵەی خێڵو عەشیرەتی کوردی بووە. کۆسپی دووەم پەیوەندی بە کەسێتی شێخ مەحمود خۆیەوە هەیە کە ئەویش نیسان کوڕی ئەم واقیعە کۆمەڵایەتییەیەو سەرباری ئەوەی کە ویستی دەوڵەتی کوردی هەیە بەڵام زیاتر وەکو شێخێکی عەشیرەت دەردەکەوێتو لە مامەڵەو رەفتارو سیاسەتکردنو بەڕێوەبردندا کەسێتی سەرۆک عەشیرەتی زاڵەو کەسێتی سەرکردایەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی یان حوکمدارێتی لاوازە کە ئەمەش وایکردووە بەگشتی خەڵکی خوارووی کوردستان جگە لە لایەنگرە نزیکەکانی وەها سەیری بکەن کە ئەو دەسەڵاتی حوکمدارییو تەنانەت خەبات بەدژی ئینگلیزیش لە پێناو فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی شێخایەتیو عەشیرەتایەتی خۆیدا دەکات.

شێخ مەحمود دوای گەیشتنەوەی بە سلێمانیو حەوانەوەیو پێشوازی کردنی خەڵکی، لە رۆژی ٩ی تشرینی یەکەمدا شێوە بەیانێکی دەرکرد کە لە رۆژنامەی بانگی کوردستاندا بڵاوکراوەتەوە تیایدا دەڵێت: لە ئیمڕوە دەستم کردووە بە تەدبیری پەروانەی حکومەتو موحافەزەی مەوجودییەتو ئیستقلالیەتی کوردستان. ئومێدو ئارەزوو ئەکەم هەمووتان بەیەک غایەو مەسلەکو بێ فاصیلە سەعی بۆ دەوامی ئەم رۆژەو کۆشش بۆ تەعالیی ئەم میللەتە ئەکەن[44].

بێگومان لەو راگەیاندنەدا شێخ مەحمود وەکو کەسێکی پەیوەست بە نەتەوەکەیە دەردەکەوێت کە لە قسەکانیدا ئەوەش رادەگەیەنێت کە دەبێ هەمووان بۆ ئەو مەبەستە کار بکەن چونکە ئەوە ئەرکی هەموویانە. بەڵام بەدوای ئەمەدا کە پێکهاتەی حوکمدارییەکەی رادەگەیەنێت هەر هەمان ئەو

کەسانە دەبینین کە پێشترو لە حوکمداری یەکەمدا هەبوون و ئەوەشی جێگای سەرنجە نوخبەی خوێندەوارو بەئاگا دوورن یان لە دەرەوەی حوکمدارییەکەیدان. ئەمەش سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت کە لەنێو پێکهاتەی دەسەڵاتدارییەکەی شێخ مەحموددا نوخبەی خوێندەوار جێگایەکی ئەوتۆی نەبووە، ئەمەش دیسان پەیوەندی بە عەقڵ ستراتیژی خێڵایەتی کوردییەوە هەیە کە ناشێت خوێندەواری سەر رووت جێگای هەبێت لە مەجلیسی شێخ و ئاغاو بەگو پیاوماقوڵاندا. هەر لێرەشەوە دەردەکەوێت کە سەرباری نەبوونی ناسیونالیزمی کوردی، ناسیونالیستی تاك یان دەستەو گروپ وەکو نوخبە لە حوکمداری شێخ مەحموددا جێگایان نەبووە ئەمەش یەکێکە لەو کێشانەی تا ئەندازەیەکی لەبەرچاو بزووتنەوەکانی کورد بەدەستیەوە ناڵاندویانەو ناکامیش عەقڵی راوێژکاری یان سەردەرچوو غائیب بووە.

دیارە ئاشکرایە کاروباری بەڕێوەبردن دلمەزراو، نوئێل وەکو بەرپرسی پەیوەندی لەنێوان دەسەڵاتی شێخ مەحمودو حاکمی گشتی عێراقدا لە سلێمانی بوو. لێرەوە دەردەکەوێت کە ئینگلیزەکان بۆیە مێجەر نوئێلیان ناردەوە سلێمانی بۆ ئەوەی کێشە بۆ شێخ مەحمود دروست نەبێت چونکە دەزانین لەسەردەمی حوکمداری یەکەمدا مێجەر نوئێل بەینی زۆر باشبوو لەگەڵ شێخ مەحموددا، ئەگەر ئینگلیز مەبەستیان بوایە کێشە بۆ شێخ مەحمود دروست بکەن ئەوا مێجەرسۆن یان مس بێڵ یان دەناردەوە سلێمانی، بەڵام دەبێ ئەمجارە شێخ چۆن سەیری مێجەر نوئێل و ئینگلیزی کردبێت؟ دیارە ئەوەی جێگای پرسیارە ئەوەیە کە لەو بارە ئاڵۆزو ناسەقامگیرەدا.. شێخ مەحمود سێ هەفتە دوای گەڕانەوە بۆ شکار چووە قەزای شارباژێڕو لە ۲۲ی تشرینی یەکەمدا گەڕایەوە[٤٤].

پرسیارەکە ئەوەیە ئایا لەو بارودۆخەدا کە هێشتا شێخ مەحمود میوانی بەخێرهێنانەوەی تەواو نەبوبوو کەچی ئەو دەچێت بۆ راووشکار؟ ئایا ئەمە

جۆرێك لە ڕۆیشتن بەدوای حەزو ئارەزووەکاندا ناگەیەنێت لەکاتێکدا کە خەڵکی چاوەڕوانی ئەوەن شێخ دەستکەوتی گەورەیان بۆ بەدەست بهێنێت. لە هەمان کاتدا کە هێشتا دیار نەبوو ئینگلیزەکان مەبەستو نیەتیان چییە بەرامبەر بە کورد بەگشتی شێخ مەحمود بەتایبەتی، هەروەك هێزی تورکەکانیش لە ڕەواندزو دەوروبەری بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر لە هەوڵی فراوانکردنی ڕووبەری دەسەڵاتی خۆیاندا بوونو دەیانویست لەوە تێبگەن ئایا شێخ مەحمود پاڵی داوە بە ئینگلیزەوە یان دەیەوێت سەربەخۆ بێت یان مەیلی بەلای ئەواندا واتە تورکەکاندا هەیە. دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ دوو هۆکار بکەین کە دەوریان هەبووە لە مەیلی شێخ مەحمود بەلای تورکەکاندا. یەکەمیان بێهیوابوونی شێخ مەحمود لە ئینگلیزو سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەری، دووەم پەیوەستبوونی ئایینی شێخ مەحمود بە هەمان ئایینی تورکەکانەوە کە ئایینی ئیسلامە. واتە لای شێخ مەحمود تورك برای دینیو ئینگلیزیش ئەوی غەیرە دینە. ئەمە جگە لەوەی کە بەشێك لەوانەی دەوری شێخ مەحمودیان دابوو لایەنگرو مەیلداری تورك بوون واتە ئەوانەی کە بەجل خوارەکان ناودەبران. جێگای خۆیەتی لەم بارە ئاڵۆزو ناجێگیرەدا ئاماژە بۆ گوتاری شێخ مەحمود بکەین یان لەوە بپرسین ئایا دیدو بۆچوونی شێخ مەحمود لەنێو ئەم هاوکێشە ئاڵۆزەدا چی بووەو چۆن بووە؟ ئایا دەشێ کەسانێکی خوێندەوارو منەوەر لەو قۆناغەدا هەبووبن کە شێخ مەحمود ڕاوێژی پێکردبن یان گوێی لێگرتبن؟ ئایا کوشتنی جەمال عیرفان لە ماوەیەکی کورتی دوای گەڕانەوەی شێخ مەحموددا چ ئاسەوارێکی نێگەتیڤی لەسەر شێوازی ئیدارەو خودی شێخ مەحمودو منەوەرو نیشتمانپەروەرانی تر بەجێهێشت بەتایبەتی کە ئەم ڕووداوە لەکاتێکدا ڕوویدا کە خەڵك ئومێدیان بە ئاسۆیەکی نوێ هەبوو هەر لەم کاتەشدا بە قسەی ڕەفیق حیلمی: ترسێکی گەورە کەوتە دڵی لاوەکانو کوردپەروەرەکانو کەسیان بەتەمای گیانی خۆیان نەمان. مستەفا پاشاش لەم دەورەدا لەبەرچاو کەوتبوو. خۆم ئاگام لێ بوو چەند جارێك ئەهاتە دایرە: شێخ مەحمود ڕێگەی

ئەئەدا بێتە ژوورەوە، سەرەڕای ئەمەش خرایە ژێر چاودێری ڕەسمییەوە لە ماڵی خۆیدا چەند پۆلیسێکی بەسەرەوە دانراو ڕێگای هاتوچۆی لێ قەدەغەکرا[45] شێخ مەحمود هەستی دەکرد ئینگلیزەکان هیچ جوڵەیەك ناکەن بۆ دروستکردنی دەسەڵاتی کوردی هەرچەندە لە بەغدا هەندێ بەڵێنی وەرگرتبوو. لەم کاتەدا هێزەکەی ئۆزدەمیریش لە ڕەواندوزو دەوروبەریدا بوو، ئۆزدەمیر بەشێك لە پیاوانی دیارو سەرخێڵەکانو لایەنگرانی تورکی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. ئێستا شێخ مەحمود لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی سەختدا بوو، ئایا بداتە پاڵ ئۆزدەمیرو بچێتە سەنگەری تورکەکانەوە یان لایەنگریو کارکردنی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکان پتەوو بەهێز بکات یان وەکو بزوتنەوەیەکی جەماوەری بەهێز لەناوخۆدا خۆی پتەوو بەهێز بکاتو لەسەر بنەمای بەرژەوەندی کورد کار بکات کە ئەمەش بەندە بە ئاستی ئامادەبوونی ناسیونالیزمی کوردیو ئامادەبوونیو ڕۆڵی لە بڕیاری سیاسی شێخ مەحمودا کە دیارە ئەمەش حاڵەتێك بوو بە هیچ جۆرێك لەو بارودۆخەدا چاوەڕوان نەدەکرا چونکە ناسیونالیزمی کوردی ئامادەبوونی نەبوو، نوخبەی منەوەرو خوێندەواریش کە دەشیا هەستی ناسیونالیشتانەیان جۆرە ئاسۆیەکی لەلای دروستکردبن، لە دیوانی شێخ مەحمودا بوونیان نەبوو. تەنانەت لە ترسو دڵەڕاوکێدا دەژیان بەتایبەتی لەدوای کوشتنی جەمال عیرفانو چاودێری خستنە سەر مستەفا پاشای یاموڵکی جۆرێك لە بێ ئومێدی لەلای خەڵك دروست بوو.

لەم سەروبەندەدا تورکەکان لە ڕەواندوزەوە نفوزێکی تەواویان پەیدا کردبوو. لایەنگرێکی زۆریان لەنێو خێڵو عەشیرەتەکانی کورددا هەبوو، ڕەفیق حیلمی دەڵێت: ناوشاری سلێمانی پڕبوو بوو لە تورك خوا، دائیرەی حوکمدار بە پەنجەی تایەر ئەفەندی واتا بە ئەمرو ئیشارەتی ڕەواندوز ئەچوو بەڕێوە[46] ئەحمەد تەقی کە یەکێك بووە لەو سێ کەسەی کە ئۆزدەمیر بە نهێنی ناردوونی بۆ لای شێخ مەحمود: کە شێخ مەحمود ئومێدی لە ئینگلیزەکان بڕا،

ناچاری پاڵی بە شێخ مەحمودەوە نا کە لەکاتی گفتوگۆکردنیدا لەگەڵ وەفدەکەی ئۆزدەمیر کە خۆم یەکێکیان بووم بە هەموو جۆرە ئیدارەیەك رازی بێت بۆ کوردستان، هەروەها عەرزی شێخم کرد کە رێکەوتن لەگەڵ تورکدا بۆ سەربەخۆیی کوردستان شتێکی زەحمەتەو ئەگەر شتی واش بکرێ پێویستە حکومەتی مەرکەزی موافەقەی لەسەربکاو ئۆزدەمیر هیچی بەدەست نییە لەو رووەوە[٤٧] دوای ئەوەی کە شێخ مەحمود گەڕایەوە سلێمانی.. ئۆزدەمیر یەك لەدوای یەك زابتەکانی خۆی دەناردەلای‌و بەنامەی جوان‌و دڵخۆشکەرەوە لە بزواندنی هیوای خۆی‌و قەومی کورد ساتێك ماوەی نەدا دوای ئەوەی کە دۆستایەتی لەگەڵ شێخ مەحموددا پەیداکرد، بۆی دەرکەوت کە شێخ مەحمود کەمی تورکەکان بەزۆری ئینگلیزەکان ناگۆڕێتەوە[٤٨].

لێرەوە دەردەکەوێت کە شێخ مەحمود وەکو سەرکردەیەکی ناسیونالیزم هەڵوێستی نەنواندووە چونکە سەرکردەی ناسیونالیست پێش هەموو کەس دەبێ پشت بە جەماوەری میللەتەکەی خۆی ببەستێت، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە لەماوەی حوکمداری دووەمی شێخ مەحموددا جەماوەرو تەنانەت خێڵ‌و عەشیرەتەکان‌و سەرۆك‌و شێخەکانیشیان لە ئاستی نەبوودا بوون‌و هەموو کارو بیرکردنەوەی شێخ مەحمود لەسەر ئەوە بووە ئایا ئەگەر پشت لە ئینگلیز بکات دەبێ تورکەکان چی پێببەخشن. مەبەستمان لەم قسەیە ئەوەیە کە هێزی یەکەم کە جەماوەرو دەشی هەر ئەویش هێزی سەرکەوتن‌و بەدەست هێنانی ماف بێت غائیبە، کەواتە دەشێ بپرسین یان ئەوەتا لە بنەڕەتدا هەستی نەتەوایەتی کوردی بوونی نەبووە لەو کاتەدا یان ئەگەر ئەو هەستە بوونی هەبووبێت ئەوە مانای وایە کە جەماوەر شێخ مەحمودی بە رابەری خۆی نەزانیووە بۆیە لەدوایەوە نەوەستاوە، یان ئەوەتا هۆکاری تر لەئارادا بووەو دیوارێکی ئەستووری لەنێوان شێخ مەحمودو خەڵکدا دروست کردووە.

هەروەك لە دەوروبەری شێخ مەحمود خۆیشیدا جۆرێك لە دابەش بوون هەبووە، شێخ زیاتر مەیلی بەلای تورکەکاندا دەشکایەوەو شێخ قادرو

حەپسەخان و مستەفا پاشای یامولکیش مەیلیان بەلای ئینگلیزەکاندا دەشکایەوەو تەنانەت حەپسەخان دەوری هەبووە لە پروپاگەندەکردندا دژی شێخ مەحمودو هەولیدا خەلك لە شێخ مەحمود بتەکێنەوە[٤٩] ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لایەنگری خەلکی بۆ شێخ مەحمود لە هەر ئاستێك بوویێت نەگەیشتۆتە پەیوەستبوونێکی رۆحی ئەوتۆ کە جیابوونەوەو دورکەوتنەوە لێی وەکو سەرۆك کارێکی مەحال بوویێت. دیسان لێرەوە پرسی ناسیونالیزمی کوردی سەرهەلدەدات ئەگەر شێخ مەحمود داواکاری دروستکردنی سەربەخۆیی و دەولەتی کوردی بووەو ناسیونالیزمی کوردیش ئامادەبوونی هەبووە وەکو پرۆژەیەکی جەماوەری بۆچی هێزی جەماوەری کوردی لەژێر سەرکردایەتی شێخ مەحموددا کۆنەبوتەوە؟ بێگومان وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە بەراستی دەیسەلمێنێت نە ناسیونالیزمی کوردی لەو قۆناغەدا ئامادەبوونی هەبووە نە شێخ مەحمودیش مۆدێلی رابەرێکی ناسیونالیست بووە، هەر ئەوەش وایکرد کۆمەلگای کوردی لەسەر بنەمای وابەستەیی خێل و عەشیرەت بریار بدات، ئەگەر شێخ یان سەرخێل لەگەل شێخ مەحمود کۆك بوویێت ئەو جەماوەری خێل یان عەشیرەتەکەی بە فەرمانی سەرۆك خێل یان شێخەکەیان جولاون.

ئەم بارودۆخەی کۆمەلگای کوردی وایکردووە کە شێخ مەحمود لەبری جەماوەری خەلك پێویستی بە پەیوەندی بەتین بوویێت لەگەل سەرخێل و شێخی عەشیرەت کە ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك بەدینەهاتووە ئەویش بەشێوەیەکی گشتی ناکۆکی مەعنەوی نێوان سەرجەم شێخ و سەیدەکانی کوردستان لەگەل ئەو خێلانەی کورددا کە خاوەنی دەرەختی بنەمالە نەبوون. خۆ ئەگەر بۆ کاتێکی دیاریکراویش هەندێ لەو سەرخێلانە پەیوەندییان لەگەل شێخ مەحمود باش بوویێت ئەوە لەپێناوی هەندێ بەرژەوەندی تایبەتیدا بووە. لەلایەکی تریشەوە لەنێو پێکهاتەی شێخ و سەیدەکانی کوردستانیشدا پەیوەندییەکی توندوتۆلیان نەبووە، چونکە تاکو ئێستاش هەریەکەیان بەپێی

ئەو دەرەختی بنەماڵەی هەیانەو خۆیان دەگەیەننەوە بە پێغەمبەرو کەس‌وکاری سەیدی بەرزنجە خۆی لەپێش ئەوانی ترەوە سەیر دەکاتو خۆبەپیرۆزتر دەزانێتو ئەوەش نەك بۆ ئەوسا بەڵکو تاکو ئێستاش مایەی پەشێویی‌و ناکۆکیە لە پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردیدا، بێگومان راستە پلەو پایەی نزیکەی سەدەیەك‌و چەند دەیەیەکی بنەماڵەی شێخ مەحمود دەورێکی گەورەی هەبووە بۆ دروستکردنی کەسێتی شێخ مەحمود، بەڵام لە هەمان کاتدا نزیکی ئەم بنەماڵە هەمیشە لە دەسەڵاتەوە وایکردووە زۆرێك لە خێڵ‌و عەشیرەتەکان حەز بە بوونی دەسەڵات‌و پلەو پایەیان نەکەن‌و پشتیان نەگرن، مەبەست لە نزیکی بنەماڵەی شێخانی بەرزنجە لە دەسەڵاتەوە ئاشکرایە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی میرنشینی بابانداو بەتایبەتی شێخ مارفی نۆدێ لە دەسەڵاتی میرنشینەوە نزیك بووە، پەیوەندی کاك ئەحمەدی شێخ‌و شێخ سەعیدو دواتریش شێخ مەحمود تاکو حوکمداری یەکەمی لەگەڵ بابی عالی باش‌و بەتین بووە رابەرایەتی کردنی رێبازی قادریش لەلایەن ئەم بنەماڵەیەوە هۆکارێکی تر بووە بۆ ئەوەی بەشێکی خێڵ‌و عەشیرەتەکانی کوردستان مل نەدەن بۆ هاریکاری‌و کارکردن لەگەڵ شێخ مەحموددا. بەتایبەتی هەموو ئەوانەی کە سەر بە رێبازی نەقشەبەندی بوون چ شێخ‌و سەیدەکان‌و چی ئەوانی تریش. بە ئاسانی لەبەردەم ئەم بنەماڵەیەدا نەچەماونەتەوە. هەروەك ئاشکرایە کاتێ جافەکان بەگشتی‌و بەگزادەکانی جاف بەتایبەتی ملیان بۆ شێخ مەحمود نەداو بگرە شێخ مەحمود نەیتوانی دەسەڵاتی خۆی بگەیەنێتە سنووری جوگرافیای خێڵی جاف، بەشێکی پەیوەندی بەو یادەوەرییە تاڵەوە هەیە کە دەوری شێخ مارف لەسەر ئاوارەکردنی مەولانا خالیدی جافی مکایەڵی هەیبووە.

ئەنجام ئەگەر لەم ئاراستانەوە سەیری کەسێتی شێخ مەحمودو واقیعی کۆمەڵگای کوردی بکەیت ئەوسا بۆت دەردەکەوێت کە بۆچی ئینگلیزەکان لەدوای هێنانەوەی شێخ مەحمود لە هیندستان نەدەچوونە ژێر باری ئەوەی کە لە سەرۆکی مەجلیسی میللی سلێمانی زیاتر بە شێخ مەحمود رەوا ببینین

چـونکە ئاشـکرایە بینیوویانــە کــە شـێخ مــەحمود ناتوانێـت بـەپێی ئـەو ئامادەبوونەی کە هەیەتی نوێنەرایـەتی بەلایـەنی کەمـەوە خـواروی کوردسـتان بکات.

لە ڕۆژی ٢١/١٢/١٩٢٢دا بەریتانیاو حکومەتی عێراق بە مەبەستی ڕازیکردنـی کوردەکان بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە کـە تیایـدا هـاتبوو: حکومـەتی خـاوەن شکۆی بەریتانیاو حکومەتی عێراق دان بە مافی ئەو کوردانەدا دەنێن کە لـەناو چوارچێوەی سنوورەکانی عێراقدا دەژین بـۆ پێکهێنـانی حکومـەتێکی کـوردی ئاواتەخوازن کە لایەنە جیاوازەکانی کـورد بـەزووترین کـاتی شـیاو بگەنـە ڕێـك کەوتنێك لەسـەر شـێوەی ئـەو حکومەتـەی کـە ئومێـدی دروسـتکردنی دەکـەن هەروەها دەستنیشانی ئەو سنوورە بکـەن کـە دەخـوازن ئـەو حکومەتـەی تیـا دروست بکرێتو نوێنەری دەسـەڵات پێـدراو بنێرنـە بەغـدا بـۆ ئـەوەی گفتوگۆ دەربارەی پەیوەندییە ئابووریو سیاسییەکان لەگەڵ حکومەتی خـاوەن شـکۆی بەریتانیاو عێراقدا بکەن(٥٠).

ناوەرۆکی ڕێکەوتنەکەو ئاراستەکردنی داواکارییەکان بۆ کورد چەند شتێکمان بـۆ ئاشـکرا دەکـات. یەکـەم بـەریتانیاو عێـراق ئـەو بەیانـەیان دەکـردووە، بەڕاستیان بوو بێت یان بۆ فریوودان باسی دروسـتکردنی حکومـەتێکی کـوردی دەکەن. بـەبێ ئـەوەی کـورد لـەو ڕێکەوتنـەداو لەسـەر دەرکردنـی ئـەو بەیانـە ئامادەبوونی هەبووبێتو توانیبێتی لـە گفتوگـۆدا داواکـانی کـورد لـەو بەیانـەدا فراوانتر بکات یان هـەوڵی ئـەوە بـدات کـە حکومـەتی بـەریتانیاو عێـراق بخاتـە بەردەم پەیوەستبوونی جێبەجێ کردنی ئەو بەیانەوە.

دووەم لە بەیانەکـەدا داواکراوە کـە کوردەکـان سـەرباری جیـاوازی نێوانیـان پێویستە ڕێك بکەونو نوێنەرایەتیەکی دەسەڵات پێدراو بنێرنـە بەغـدا. کەواتـە ئینگلیزەکـانو عێراقیـەکانیش بـاش لـەوە تێگەیـشتوون کـە کوردەکـان لـەنێو یەکدا کۆك نینو هەریەکە خـۆی بـە کوێخـا دەزانێـت. تەنانـەت ئـەوان لـەوەش تێگەیـشتوون کـە شـێخ مـەحمود ناتوانێـت نوێنەرایـەتی هـەموو خـوارووی

کوردستان بکات، هەر بۆیە کاتێك شێخ مەحمود نوێنەری خۆی دەنێرێتە بەغدا.. بە سەرۆکایەتی سەید ئەحمەدی بەرزنجی بۆ بینینی مەندوبی سامی، مەندوبی سامی دەستی دەستی پێکردن و ڕێگەی نەدا بیان بینێت و لە ئەنجامدا بە وەفدەکە دەڵێت ئەو بەیانە بۆ هەموو کورد دەرچووە نەك بۆ شێخ مەحمود کە ئێوە تەنها نوێنەری ئەون[٥١].

کەواتە لێرەدا واتە لە بەیانەکەو لە قسەکانی مەندوبی سامیشدا بۆ نوێنەری شێخ مەحمود دەردەکەوێت کە ئینگلیزەکان بە ئاشکرا گەیشتوونەتە ئەو بۆچوونەی کە شێخ مەحمود نوێنەری یان سەرکردایەتی هەموو کوردی باشووری پێناکرێت، دیارە کوردیش لەو کاتەدا لەو ئاستەدا نەبووە کە بتوانێت لەسەر ئاستی خوارووی کوردستان نوێنەرایەتی خۆی هەڵبژێرێت و بنێرێتە بەغدا هەتا بیانووی مەندوبی سامی و حکومەتی عێراقیش ببڕێت بە هەرحاڵ ئەوەی لەبارەی ئەو بەیاننامەو نوێنەری شێخ مەحمودەوە بۆ بەغدا بەلای ئەم باسەوە گرنگە نە خودی بەیاننامەکەو نە ناردنی نوێنەرە لەلایەن شێخ مەحمودەوە، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە چیمان لەبارەی کۆمەڵگای کوردی ئەوکاتەو هۆکارەکانی نەتوانینی دروستکردنی نوێنەرایەتییەك بۆچووتە بە بەغداو گوتاری کوردییەوە پێدەڵێت.

لەسەرجەمی ئەو بەڵگەو نووسراوو یادداشت و گێڕانەوانەدا کە پەیوەستن بەسەردەمی شێخ مەحمودەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵگای کوردی پێکهاتەیەکی خێڵایەتی پەرت و بڵاوی لەگەڵ یەك ناکۆکی گۆشەگیر بووە کە سادەترین بنەمای دروستکردنی فیدراسیۆنی خێڵایەتیش لە ئارادا نەبووە کە کۆمەڵگای عێراقی کۆن لەسەردەمی بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی بابلیدا توانیوویەتی ئەو فیدراسیۆنە خێڵایەتیە دروست بکات کە ئەنجامی ئەوە دروستبوونی دەوڵەتۆچکەی شار بووەو لەوێشەوە دەوڵەتی گەورەی بابلی دروستبووە.

ئەم پێکهاتە ناجۆرەی کورد نەك بۆ سەردەمی شێخ مەحمود بۆ ئێستاش کە حیزب بووەتە جێگرەوەی خێڵ نەیتوانیووە لە شێوەی پێکهاتەیەکی یەکگرتوودا خۆی رێك بخات و خاوەنی یەك دەنگو یەك نوێنەرایەتی بێت، ئەمەش لەوساوە بۆ ئێستا پەیوەندی بە نەبوونی ناسیونالیزمی کوردییەوە هەیە، واتە هەرچۆن بە چەمکی تەقلیدییانە کورد وەکو نەتەوە نەیتوانیووە دەوڵەت دروست بکات، بە چەمکی نوێش دەوڵەت نەیتوانیووە نەتەوە دروست بکات ئەویش لەبەر غیاب یان نەبوونی ناسیونالیزم. تەنیا کاتێك کورد لە شێوەی فرە دامەزراوەیی خێڵو عەشیرەتو فرە ناوچەیی کە ناوچەی دەسەڵاتی خێڵو عەشیرەتە دەپەڕێتەوە کە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو پیشەسازیو تەکنۆلۆژیا ئەو دامەزراوە تەقلیدییە داخراوە هەڵبوەشێنێتەوەو بنەماکانی کۆمەڵگای شار پێکبهێنێت لەو روانگەیەوە کە دابەش بوونی کۆمەڵ لەبری دابەشبوون بەپێی بنەمای خوێنو دەمارگیری دابەشبوون بێت لەسەر ئاستی چینو توێژی کۆمەڵایەتی کە لە بارێکی ئاوەهادا ناسیونالیزم وەکو بەرنامەو ئایدیۆلۆژیایەکی کۆمەڵایەتی جەماوەری دەردەکەوێتو هەموو کۆمەڵ لە پێکهاتەیەکی یەکگرتوودا کۆدەکاتەوە، ئەگەر لەسەردەمی شێخ مەحمود ئەو یەکبوونە لەژێر کاریگەری دروستبوونی کۆمەڵگای پیشەسازی شاردا دروست ببوایە ئەوا ئاسان بوو بۆ کورد کە نوێنەری خۆی لەسەر ئاستی نەتەوە هەبێت ئەوساش چاوەڕوانی ئەوە نەدەکرا کە بڕیاری کۆمەڵگای کوردی لای تاکە کەس بێت، بەڵکو کۆمەڵ خۆی خاوەنی دەنگ دەبوو بەدەر لە بنەمای مادیو مەعنەوی خێڵو عەشیرەت سەرکردە لەنێو کۆمەڵەوە هەڵدەبژێرا یان دەردەکەوت. بەڵام لەسەروەختی شێخ مەحموددا نە کۆمەڵگای کوردی خاسێتی دیاری کۆمەڵگای هەبووە نە ناسیونالیزم دیار بووە، نە شاری پیشەسازی لە کوردستان هەبووە هەتا بنەماکانی کۆمەڵگای هاوچەرخی لەگەڵدا لەدایك ببێت، نە لەسەر ئەو بنەما وێرانەیە ئەگەری هەڵکەوتنی سەرکردەی ناسیونالیست هەیە. بۆیە ئاخاوتن لەسەر گوتاری نەتەوەیی

لەسەردەمی شێخ مەحموددا بەرەو ئەوە رامان دەکێشێت کە باسی شتێك دەکەین لە بۆشایدا بەبێ ئەوەی هیچ پایەیەکی مادیانەی هەبێت، بە واتا بوونی گوتاری کوردی لەکاتی نەبوونی ناسیونالیزمو ناسیونالیستدا جگە لە خەیاڵ هیچی تر نییە، ئەمەش حاڵەتێکە لە مێژووی کورددا نەك تا کاتی شێخ مەحمود بەڵکو بۆ دواتریش هەر بەردەوام بووە. ئەمەش بەرەو ئەو لێکدانەوەیە دەمانبات کە چ راپەرینی شێخ مەحمودو چ راپەرینەکانی تری کورد بریتی بوون لە کاردانەوە بۆ سیاسەتی توندو نامرۆڤانەی سەرجەم داگیرکەرانی کوردستان بەرامبەر بە گەلی کورد.

بە هەر حاڵ حوکمداری دووەمی شێخ مەحمود لەڕووی گوتارو بەرنامەو کاری بەڕێوەبردنی ناوخۆو پەیوەندی شێخ لەگەڵ نوخبەی خوێندەوارو تاکە ناسیونالیستەکانو نزیکردنەوەی کەسانی خۆپەرستو بەرژەوەندی پەرستو شێخانو چەند کەسێکی تری دیاریکراوەوە گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە لەچاو قۆناغی حوکمداری یەکەمیدا. قۆناغی دووەمی حوکمدارییەکەی ئەگەرچی ئینگلیزو حکومەتی عێراقیش وەکو سەرۆکی مەجلیسی میللی سلێمانی سەیریان کردووە، دوای دەرکردنی بەیانە هاوبەشەکەی حکومەتی بەریتانیاو حکومەتی عێراقی سەبارەت بە دروستکردنی حکومەتێکی کوردیو رازینەبوونی مەندوبی سامی بە نوێنەری شێخ مەحمود لەبری هەموو کوردو دەرکەوتنی پەیوەندی یان مەیلداری شێخ مەحمود بۆ تورکەکان بەتایبەتی دوای ئاڵوگۆڕکردنی نامە لەنێوان شێخو ئۆزدەمیرو یاری کردنی شێخ مەحمود کە لەژێرەوە لەگەڵ تورکەکان خەریکی پەیوەندی بوو، بەڕووکەشیش پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەبوو، بە قسەی ئەدمۆنسیش دەست کەوتنو ئاشکرا بوونی ناوەرۆکی نامەی نێوان شێخو ئۆزدەمیر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، هۆکاربوون بۆ زیاتر بێئومێد بوونی ئینگلیز. هەروەك لەوکاتەی کە سمکۆ هاتە سلێمانیو لە هەمان کاتدا پەیوەندی نێوان شێخ مەحمودو تورکەکان بەرەو چڕبوونەوەی زیاتر دەچوو.. ئینگلیزەکان ئاگاداری

ئەو جموجووڵەی تورکەکان بوون لە سلێمانیداو تەنافی سیاسەت ڕوو لە پچڕان بوو.. لە هەمان کاتدا لەو مونتەمەرەی (ماڵی شێخ مەحمودا) بڕیار لەسەر نووسینی مەزبەتەی باسکراو درابوو وە بە ئیمزای[٣٦] کەس لەسەرەك عەشیرەتە ناودارەکانو گەورەکانی کورد پێشکەش بە شێخ مەحمود کرابوو[٥٣]. بێگومان ئەو مەزبەتەیە بریتی بوو لە پشتگیری سەرخێڵو هەندێ لە پیاوانی دیاری ئەو سەردەمەی سلێمانی بۆ شێخ مەحمود. بێگومان ئەو مەزبەتە بە مەبەستی ئەوە کرابوو بنێردرێت بۆ تورکەکان. ڕەفیق حیلمی دەڵێت: سێ ڕۆژ دوای ئەم موزاکەراتەو لە ڕۆژی ٢١ی شوباتی ١٩٢٣دا منو فەتاح ئەفەندی یوزباشی فەتاحی ئەمینی عەتارو ئەحمەد تەقی بەیانی لەپێش هەتاوکەوتنا لەوێوە ڕووەو ڕەواندوز کەوتینە ڕێ[٥٢] ڕاستە ڕەفیق حیلمی باسی ئەوە دەکات کە دەشیا شێخ مەحمود وەکو ڕاگرتنی هاوسەنگی پەیوەندی لەگەڵ هەردوولا هەبێتو هەوڵیش بدات کە ئەو پەیوەندییە وەکو فشار بەرامبەر بە لایەنەکەی تر بەکار بهێنێت، بەڵام ئایا عەقڵی سیاسی کوردی لەو کاتەدا لەو ئاستەدا بوو کە بتوانێت کارێکی لەو جۆرە بکات.

ئێمە لەبەردەم ئەو پرسیارەداین ئایا کاتێ مەندوبی سامی داوا لە شێخ مەحمود دەکات بۆچی ئامادە نابێت بچێتە بەغدا.. مەندوبی سامی لە کۆتایی مانگی شوباتی ١٩٢٣دا داوەت نامەیەکی ئاڕاستەی شێخ مەحمود کردووە بۆ ئەوەی بگاتە بەغداو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ مەندوبی سامی تا پێکەوە لەو مەسەلانە بدوێن کە پەیوەندییان بە سلێمانییەوە هەیە، لەو داوەتنامەیەدا مەندوبی سامی بەڵێنی داوەتێ کە زۆر بەڕێزەوە کاری لەگەڵدا بکات، هەر لەو داوەتنامەیەدا ئینزاری شێخ مەحمودی کردووە کە ئەگەر پابەندی داواکەی نەبێ ئەوا هەنگاوی پێویست بەرامبەری وەردەگرێ[٥٤] ئایا شێخ مەحمود خۆی لەسەرووی ئەوەوە بینیووە کە بچێتە بەغدا یان ئایا هەستی بە مەترسی کردووە کە ڕازی نەبووە لە بەغدا مەندوبی سامی ببینێت؟ یان لە پشتەوە تورکەکانو بەتایبەتی ئۆزدەمیر لەوەدا دەورێکی هەبووە، بە هەر حاڵ

نەچوونی شێخ بۆ بەغدا زیاتر باروتۆخەکەی ئاڵۆزکردووەو بەڵگەی داوەتە دەستی ئینگلیز کە بڵێت شێخ مەحمود خۆی نایەوێت چارەسەری کێشەکان بکرێت، هەر لەو سەروبەندەدا: ئەو سەرکردە کوردانەی کە نەیاری شێخ مەحمود بوون لەناویاندا شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەمو بابەکر ئاغا ئاگاداری دەسەڵاتی بەریتانیایان کرد کە وا شێخ مەحمود بەتەمای نەخشەیەکە لەگەڵ هاوکارەکانی وەکو مەحمود خانی دزڵیو عەباسی مەحمود ئاغا لەناوچەی پشدەر کە هەموو سوێندیان بە قورئان خواردووە کە هێرش بەرنە سەر هەولێرو کەرکوک دوای کشانەوەی تورکەکان بۆ سنوورەکانی تورکیا[٢٥].

لێرەشەوە دەردەکەوێت کە کۆمەڵگای کوردی هیچ خاسیەتێکی کۆمەڵگایەکی یەککرتووی نەبووەو هەمووان بە عەقڵی ناوچەگەریو بەرژەوەندی تایبەتی کاریان کردووە. تەنانەت ئەوانەشی سەر بە هەمان خێڵو عەشیرەت بوون واتە هەمان خوێنو دەماریان هەبووە، لەزۆرکاتدا دژی یەك بوون وەکو ئەو هەڵوێستەی کە شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم بەرامبەر بە شێخ مەحمود نواندوویەتی کە هەردووکیان لە هەمان درەختی بنەماڵەن.

سێ یان چوار رۆژ دوای رۆیشتنی وەفدی شێخ مەحمود بۆ لای ئورزدەمیر، ئینگلیزەکان بەیاننامەی هەڕەشە ئامێزیان لە ئاسمانەوە بە فڕۆکە فڕێدایە خوارەوە کە فەرمانی مەندوبی سامی تێدا بوو بۆ شێخ مەحمودو ئەندامانی ئەنجومەنی سلێمانی کە دەیگوت: پێویستە لەسەر شێخ مەحمود ئەفەندیو ئەندامانی لیوا لەڕێی کەرکوکەوە بەرەو بەغدا بچن بەبێ دواکەوتنو هەر بیانوویەك لەوێ ئامادەبنو راپۆرتێك بدەنە خاوەن سەعادەتیان (مەندوبی سامی) سەبارەت بە ئیدارەی لیواکەیان(٥٦) بێگومان هەر لەو بەیانەدا ماوەی پێنج رۆژ دیاری کراوە بۆ گەیشتنی شێخو ئەندامانی ئەنجومەنەکەی چەند نامەیەکیش نێردرا بۆ کەسایەتیە دیارەکان یان بەڕێوەبەری ناوچەو قایمقامەکان لە سەنگاوو پشدەرو لەنێو خێڵی جافو هەمەوەندو بەڵباس کە

تیایـــدا ئاگـــاداركرابوون لـــەوەی كـــە حكومەتەكـــەی شـــێخ مـــەحمود هەڵوەشاوەتەوە(٥٧).

بێگومان لە ئەنجامی هەڵوێستی دژو ناكۆكی نێوان شێخ مەحمودو ئینگلیز ئەمجارەش شێخ مەحمود ناچار بوو شار بەجێ بهێڵێتو روو بكاتە ناوچەی سووررداشو ئەشكەوتی جاسەنە، بەمەش كۆتـایی بە دووەم حوكمـداری شێخ مەحمود هـات لـە سلێمانی كە لـە ١٩٢٢/١٠/٩ دەستی پێكردو هـەتا شـەوی ١٩٢٣/٣/٤ بـەردەوامبوو، كـە لـە هاتنەوەیـدا ئینگلیزەكـان وەكـو سـەرۆكی مەجلیسی میللی سلێمانی ناردیانەوەو پاش ماوەیەك وەكو حوكمدارو دواتریش خۆی وەكو مەلیكی كوردستان راگەیاند، بەبێ ئەوەی حكومـەت یـان دەوڵـەتی سەربەخۆ یان لەژێر سایەی ئینتیدابدا بوونی هەبێت.

قسەی ناكۆكیش هەیە كە لەسەر رێكـەوتنی شـێخ مـەحمود لەگـەڵ مەنـدوبی سامیو مەلیك فەیسەڵدا دەكرێتو بەپێی قسەی لایەنگرانی ئینگلیزو حكومەتی عێراقی بێت شێخ مەحمود لەبەردەمی ئەواندا وای نیشانداوە كـە سـەربەخۆیی كوردسـتانو دەوڵـەتی كـوردی كـارێكی زەحمەتـە. ئـەدمۆنز دەڵـێ: هـەوای ئەشئەبەخطی كێوەكانی سلێمانی شێخ مەحمودی سەریەست كرد، لەبەر ئەوە هەر گفتێك كە دابووی‌و هەر پەیمانێك لەگەڵ گەورەكانی حكومـەتی بـەریتانیادا كردبووی لەبیری چووەوەو زۆری پێ نەچوو خۆی ناونا مەلیكی كوردستان(٥٨).

بە هەر حـاڵ دیارە هەرچۆن ئێمـە پێمـان خۆشـە هـەموو هەڵـەكان بخەینـە ئەستۆی ئینگلیزەكانو ئەستۆپاكی بۆ شێخ مـەحمود بكـەین، ئینگلیزەكـانیش هەوڵدەدەن هەموو هەڵەو ئەو هۆكارانەی كە ئـەیان هێشت كورد لەسـەردەمی شێخ مەحمودا ببێتە خاوەنی سەربەخۆیی‌و دەوڵەتی خـۆی بخەنـە ئەسـتۆیی شێخ مەحمودو خێڵو عەشیرەتەكانی كـورد كـە ئامادەباشـی ئـەوەیان نـەبوو متمانەی ئینگلیزیان پێببەخشرێتو ئینگلیز دروستكردنی دەوڵـەتی كـوردی بـە لایەنی كەمەوە لە خوارووی كوردستاندا رابگەیەنێت.

لێرەوە ئەگەر سەرنجی گوتاری سیاسیو ئیداری شێخ مەحمود بدەین لە حوکمداریتی دووەمیدا ئەوە دەگەین بەم ئەنجامانە.

یەکەم لەڕووی بنەماو شێوەی دەربڕینەوە جیاوازی لەنێوان گوتاری سیاسی قۆناغی حوکمداری یەکەمو قۆناغی حوکمداری دووەمدا نییە. لە هەردوو قۆناغەکەدا شێخ مەحمود ویستو ئارەزووی دروستکردنی دەسەلاتێکی کوردی هەیە، ئومێدی ئەوەشی هەیە کە خوارووی کوردستان هەمووی بکەوێتە چوارچێوەی ئەو دەسەلاتەوە، ئەگەر ئەوەش نەشیا ئەوا زیاترین رووبەری خوارووی کوردستان بگرێتەوە، ئەگەر ئەمەشیان نەشیا ئەوا دەیەوێت لە سلێمانیدا دەسەلاتدارییەك دروست بکات کە بێگومان لەو ئاقارەشدا کاری کردووە. ئەمەش ئەگەر هاوشێوە بکەین بەو بۆچوونەی فارابی لەسەروەختی خۆیدا لەبارەی دەسەلاتی دەولەتی ئیسلامییەوە خستویەتیە روو ئەوا لە شێوەیەکی بچووك کراوەدا حوکمداری لە سنووری شارێکدا بریتییە لە هاوشێوەی دەسەلاتی تەواو کە ئەو بە شاری تەواو[٥٩] ناوی بردووە، بەو پێیە دەسەلاتداری تەواو لە هەموو خوارووی کوردستاندا دەبێتە دەسەلاتداری شاری تەواوتر، هەروەك دەسەلاتداری لە سلێمانیو چەند شارو شارۆچکەیەکی تری خوارووی کوردستان دەبێتە دەسەلاتی (شاری تەواو).

دیارە گوتاری نەتەوایەتی گشتگر گوتاری شاری هەرە تەواوە، گوتاری شاری تەواوتر گوتارێکی نیمچە تەواوی نەتەوەییە کە خاسیەتی هەمە لایەنیو گشتگری تێدا نییە، هەروەك گوتاری شاری تەواو گوتارێکی ناوچەیی داخراوی شێواز خێلایەتیە، هەرچەندە دەشێ بارگاویش بکرێت بە هەندێ توخمو رەگەزی نەتەوەیی، تەنیا لەکاتێکدا گوتاری شاری هەرە تەواو بەرهەم دێت لەسەر ئاستی نەتەوایەتی کە ناسیونالیزم لە ئاستێکی پەرەسەندودا بێتو دەولەتی نەتەوەیی دروست بووبێت، گوتاری شاری تەواوتریش دەبێ دەولەتی نەتەوە لەسەر بەشێکی فراوانی جوگرافیای نەتەوە دروستکرابێت، گوتاری شاری تەواو گوتارێکی ناوچەیی هەرێمایەتی داخراوی رووبەری تەسکە کە

دەسەلاتێك لە روویەرێکی دیاریکراودا بنیادا دەنرێتو ئەو گوتارەش زەمانەتی بەردەوامبوونی نییە چونکە ئەو دەسەلاتەی کە دەشێ وەکو ئەوەی شێخ مەحمود بە دەسەلاتی حومکداری یان کاتی ناو ببرێتو زیاتر بەرهەمی ئەمری واقیعە، لەبری ئەوەی بەرهەمی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی بێت، هەمان شێوەی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمودو قازی محەمەدو تەنانەت دەسەلاتی ئێستای حکومەتی هەرێمی کوردستان. هەموو ئەمانە دەسەلاتی شاری تەواون واتە دەسەلاتی لەرزۆك. لێرەوە دەتوانین بلێین دەسەلاتدارییەکەی شێخ مەحمودو بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود خاوەنی هەمان گوتاری شاری تەواو بووە کە گوتارێکی ناوچەیی سنورداخروی سروشت خێلایەتی بارگاوی کراو بووە بە هەندێ لە رەگەزەکانی گوتاری شاری تەواوتر، بەلام لە بواری پراکتیکدا نەیتوانیووە گوتاری شاری تەواوتر بکاتە گوتاری خۆی.

دووەم گوتاری ئیداری لە هەردوو خولی حوکمداری شێخ مەحمووددا هەمان گوتارە کە ئەویش گوتاری خێلایەتی هەرێمایەتی ناوچەگەرییەو بنەمای سەرەکی پەیوەندی بە هاوخوێنیو هاودەمارییەوە هەیە وەکو ئەوەی ئیبن خەلدون بۆ دەولەتی عەرەبی ئیسلامی دیاری دەکات. رەئیسی روئەسا شێخ قادر برای شێخ مەحمودە، رئیسی داخلیە شێخ محەمەد غەریبی زاوایەتی کاریەدەستانی تری سەرەوەش لە دۆستو کەسە نزیکەکانی شێخ مەحمودن یان ئەوانەت کە لە راستیدا لە پیاو ماقولانی شارنو رەنگە بە ئاسانیش کەسێکی سەریە نوخبەی خوێنەوار لە بەرپرسە یەکەمەکاندا نەدۆزرێتەوە. مستەفا پاشا یامولکی کە لە خولی دووەمی حوکمدارییەکەدا رەئیسی مەعاریف بووە وەکو پیاوێکی خوێندەوار، بەپێی گێرانەوەکانی رەفیق حیلمی شێخ زۆر بەینی باش نەبووە لەگەلیدا. هەروەك حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ مەحمود لە خولی یەکەمدا قازی بووەو حاجی سەید عومەری مامیشی کراوە بە موتەسەریفی سلێمانیو سەید ئەحمەدی بەرزنجی لە خولی دووەمدا رەئیسی ئەمنیەتی عومومییە بووە. لێرەدا دەردەکەوێت کە کەسو کاری شێخ

مەحمود بەشی شێریان لە دەسەڵاتدارییەکەیدا بەرکەوتووە. لەم بارەیەوە رەفیق حیلمی دەڵێت: بەشی زۆریەی خزمو کەس‌وکاری حوکمدارو دەستەو دائیرەی شێخان هەریەکە بەجۆرێکو بەپێی حاڵ کارێك یان واجبێکیان بۆ رێکخرابوو دامەزرابوو[٦٠].

لێرەدا دەردەکەوێت کە هەمان شێوەی زۆرێك لە دامەزراوە ئیدارییەکانی تری کوردستان‌و هەندێ لە وڵاتانی رۆژهەڵات، دامەزراوەی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود لەو کەسانە پێکهاتوون کە زۆر لێیەوە نزیك بوون ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بنەمای تواناو لێهاتوویی لەو دانانەدا دەوری نەبینیووە بەقەد ئەوەی خزمایەتی‌و پەیوەندی خوێن دەوری بینیووە. ئەوەش ئاشکرایە کە خزمایەتی‌و خوێن پایەو بنەمای پێکهێنەری دامەزراوی خێڵ‌و عەشیرەتن، بۆیە دەتوانین بڵێین گوتاری ئیداری حوکمدارییەکەی شێخ گوتاری ئیدارەی خێڵ بووە.

سێیەم گوتاری نوخبە کە مەبەستمان نوخبەی خوێندەوارو نوخبەی ناسیونالیستە نە لە بریاری سیاسیدا نە لە رێکخستنی ئیداریدا ئەو دەورەی نەبووە بە واتا سەریاری لاوازی ئەو نوخبەیەش لەسەردەمی شێخ مەحموددا بەڵام هێشتا دەورێکی ئەوتۆیان نەبووە یان رێگای ئەوەیان نەدراوە کە ئەو دەورەیان هەبێت، بۆ نموونە هیچ کام لە رەفیق حیلمی‌و شێخ نوری شێخ سالح‌و پیرەمێردو زێوەرو جەمال عیرفان پێش کوشتنی‌و عارف سائیب پێش کوشتنی دەورێکی ئەوتۆیان پێنەدراوە کە جێگای باس بێت.

چوارەم گوتاری عاتیفەو گوتاری ئایینی‌و گوتاری تەریقەتیش هەریەکە بە ئەندازەیەك دەوریان هەبوو لە لاوازکردنی گوتاری نەتەوەیی‌و گوتاری ئیداری‌و گوتاری نوخبەی خوێندەوارو ناسیونالیستدا. پێشتر ئاماژەمان بە قسەیەکی ئەدمۆنزکرد لەبارەی رۆڵی چیاکانی سلێمانی لەسەر نەشئە بەخشین بە شێخ مەحمودو پشت کردن لەو رێکەوتنانەی لەگەڵ بەرپرسانی بەریتانیاو حکومەتی فەیسەڵدا کردبووی، هەروەك ئاشکراشە پەلەکردن‌و کاردانەوەی بەپەلەو

بڕیاری بەپەلەش کە زیاتر لە عاتیفەو هەڵچوونەوە سەرچاوە دەگرن لە کەسێتی شێخ مەحموددا وەکو سەرجەمی کەسێتی کوردی ئاشکرابووە..
ڕاستە لە زەمانی شێخ مەحموددا چ بەهۆی هەڵەو سەرچڵیو نەبوونی ئاقیکردنەوەیەکی سیاسیەوە بوویێت وەکو هەندێ کەس ڕەخنەیان لێگرتووە یاخود بەهۆی گێرەشێوێنیو ناکامیو نەشارەزایی دەستەو دایەرەکەیەوە بوویێت لەمانە گلەییو ڕەخنە لە هەمووی بووەو هەیە[٦١]. بێگومان ئەو هەڵچوون سەرچڵیو پەلەکرنە ئەگەرچی بنەمایەکی کەلتوریو ئەنتۆلۆژی هەیە لە کەسێتی کوردیدا بەڵام زیانێکی گەورە دابەخشێت لەکاری سیاسیداو هەمیشە دەبێت هۆی ئەوەی کە عاتیفەی سیاسی جێگای عەقڵی سیاسی بگرێتەوەو کاردانەوە لەبری نەخشەو بەرنامەو پرۆژە کاری پێبکرێت یان کار بکات کە ئەمەش نەك تەنیا لەلای شێخ مەحمود بەڵکو لای سەرجەم سەرکردەی ڕاپەڕینو بزوتنەوەکانی کورد خاسیێتێکی دیارەو زیانی گەورەشی بە خودی ئەو سەرکردەو ڕابەرانەو بزوتنەوەی کوردیش گەیاندووە. کە دەشێ ئەم حاڵەتە وەها وەسف بکەین کە باڵادەستبوونی گوتاری عاتیفەیە بەسەر گوتاری عەقڵو گوتاری سیاسیدا.
کاریگەری ئایینیش لەسەر کەسێتی شێخ مەحمود کەم نەبووە، ئەمەش نەك مەبەست ئەوە بێت کە خودی ئایین دەوری نێگەتیفی بینیبێت، نەخێر بەڵکو مەبەست پەیوەستبوونی شێخ مەحمودە بە هەمان ئایینی عوسمانیەکانەوە واتە ئەگەر لە ئاستی گوتراویشدا ئەوە نەبینرێت ئەوا لە ئاستی نەگوتراوو بە جوانی دەبینرێت کە شێخ مەحمود وەها سەیری تورکەکانی کردووە کە برای دینیو تەنانەت دوای کارەساتی شەهیدکردنی باوکی بەشێوەیەکی ناڕەوا لە موسڵ، هێشتا ئەم نەگەیشتە ئەوەی کە وەکو بکوژی باوکی سەیری تورکەکان بکات، لێرەدا جێگای خۆیەتی سەیری هەڵوێستی شێخ مەحمود لەسەر کوشتنی باوکیو سمایل ئاغای شکاك لەسەر کوشتنی براکەی بکەینو لەوێشەوە بپرسین ئایا هۆکارەکانی بێدەنگ بوونی شێخ مەحمود چی بووە؟

بە هەر حاڵ کاریگەری گوتاری ئایینی لەسەر شێخ مەحمودو زۆرێك لە دەوروبەرەکەی ئەوە بووە کە زیاتر مەیلداری تورکی لا دروست کردون لەبری مەیداری ئینگلیز، تورکیش بەو چاوە سەیری شێخ مەحمودیان کردووە کە وەکو مسوڵمانێك ئەرکی سەرشانی خۆیەتی جیهاد بکات دژی هێزی غەیرەدینی ئینگلیز بەبێ ئەوەی تورکەکان ئامازەیان بۆ ئەوە کردبێت کە راستە شێخ مەحمودو نەتەوەکەی مسوڵمانن، بەڵام مافی خۆیانە سەرباری مسوڵمان بوونیان داوای مافی نەتەوەیی خۆیان بکەن.

لەدوای روخانـدنی دەسـەڵاتی حوکمـداری دووەمـی شـێخ مـەحموددا لـە ١٩٢٣/٣/٤ چوونە دەرەوەی شێخو هێزو لایەنگرەکانی بۆ ناوچەی سورداشو ئەشکەوتی جاسەنەو پاشانیش چوونە گوندی پیرانی سەرسنوور، بۆشاییەکی ئیداری لە سلێمانیدا دروست بوو، ئینگلیزەکانیش هەرچەندە دوای هاتنەوەیان بۆسلێمانی ئیدارەیـەکیان بـۆ لیواکـە دروسـت کـردو بەشـێکی زۆری قـەزاو ناحیەکانیشیان لە سلێمانی کردەوەو خستیانە سەر کەرکوکو هەولێر. لەگەڵ ئەوەشـدا بەشـێکی دیـار لەوانـەی لەگـەڵ شـێخ مـەحموددا بـوون لەگـەڵی نەڕۆیشتنو تەنانەت هەندێ لە ئەفسەرە کوردەکانی وەکو عیزەتـی تۆپـچیو ئەمین رەوانـدزیو رەشـید شـەوقیو چـەندانی تـر لەوکاتـەدا "ویـستیان شـێخ مەحمود لە تورك بتەکێننەوە، کارەکەیان سەری نەگرتو تورکخواکانی دەوری شێخ، بۆیان تێ چاندن[٦٢].

دواتر سـەرۆك وەزیـری عێـراق لـە ١٩٢٣/٥/٢٩دا هاتـە سـلێمانی بەمەبەسـتی رێکخستنـەوەی کاروبـاری لیواکـەو بـۆ ئـەوەی بیخەنـە سـەر عێـراق، هـەر لـەو دەمەدا ئیدمۆنز پێشنیاری کرد کە ئەنجومەنێکی ئیداری بـۆ شـار پێکبهێنـرێ، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەمجارەیان شـێخ قـادر لـە سـلێمانی مایـەوەو لەگـەڵ شـێخ مـەحموددا نەڕۆیشتو دوای هـاتنی سـەرۆك وەزیـری عێـراقو مەنـدوبی سامی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی تری شارو ناوچەکەدا لەگەڵ مەندوبی سـامی کۆبـوووەوە. ئەمـەش دەشـێ تیشکێ بخاتـە سـەر هەڵوێـستی شـێخ قـادر کـە لەنێوان هەردوو لایەنی تورکو ئینگلیزدا ئـەو کـارکردنی لەگـەڵ ئینگلیزدا پـێ پەسەندتر بووبێت بەتایبەتیش پەیوەندی شێخ قادر لەگەڵ مستەفا پاشـای یـا مولکیـدا رەنگـە سەرچـاوەکەی نزیکـی بۆچـوونی هـەردووکیان بووبێـت بـۆ لایەنگری کردنی ئینگلیز نەك تورکەکان.

بە هەر حاڵ پاش ماوەیـەك لـەوەی کـە ئینگلیز هاتنـەوە سـلێمانی لـە رۆژی ١٩٢٣/٦/١٧ جارێکی تر سلێمانیان چۆڵ کردەوە ـ پاش نزیکـەی سـێ هەفتـە لە رۆیشتنی هێزەکانی ئینگلیز هێزی شێخ بەبێ هیچ بەرەنگارییەك هاتەوە نـاو

سلێمانیو پاشماوەیەکی کەم سێیەم حوکمداری خۆی پێکهێنا کە نیسان بەناوی مەجلیسی میللیەوە ناونرا. ئەمجارەیان لەبری شێخ قادری برای شێخ محەمەد غەریبی زاوای نایبی حکومەتو رەئیسی مەجلیسی میللی بوو، مستەفا پاشاو کەریمی عەلەکەو.. تاد لە پێکهاتەی ئەو مەجلیسەدا نەبوون، بێگومان سنووری دەسەڵاتی ئەمجارەی شێخ مەحمود لەوساو لە پێشتر تەسکتر بوو، چونکە بەریتانیەکان بەشێك لە قەزاو ناحیەکانی پێشتری سلێمانیان خستە سەر شارەکانی هەولێرو کەرکوك. دیارە ئەوە ئاشکرایە کە لەدوای چۆڵکردنی سلێمانی لەلایەن شێخ مەحمودەوەو رۆیشتنی بۆ سورداشو پاشا جاسەنە، نێوانی لەگەڵ شێخ قادری برایدا خراپ بوو، بەجۆرێك کە دواتر شێخ قادر خۆی پاڵاوت بۆ ئەندامی یەکەم ئەنجومەنی تەئسیسی عێراق، ئەمەش بارێکی نائاساییو خراپ بووە بۆ شێخ مەحمود، هەمان حاڵەت لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولو سەرکردایەتی بارزانی نەمردا دووبارە دەبێتە کە بەشێك لە کورەکانی دەبنە لایەنگری دوژمن.

قۆناغی سێیەمی حوکمداری شێخ بە قسەی محەمەد رەسوڵ هاوار لە ١٩٩٢/٨/١١ دەست پێدەکات هەتا مانگی تەمموزی ١٩٢٤، کە ئیتر سلێمانی بەجێ هێشتو ئیتر نە بە حوکمداری نە بە مەلیکێتی نەگەڕایەوە بۆ ناو شاری سلێمانی[٦٣] کەواتە لێرەدا ئەوە ئاشکرا دەبێت کە حوکمداری شێخ ناوبەناو لە مانگی یانزەی ساڵی (١٩١٨)ەوە تاوەکو تەمموزی ١٩٢٤ بەردەوام بوو. بەڵام ئایا لە قۆناغی سێیەمی حوکمداری شێخ مەحمودا گوتاری ئەو یان راپەرینەکەی هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەر هاتووە یان هەر وەکو خۆی ماوەتەوە؟ ئایاگوتاری شێخ مەحمود بووەتە گوتارێکی نەتەوەیی یان گوتارێکی سیاسی یان هەر لە شێوەی گوتاری خێڵایەتی ناوچەگەریدا ماوەتەوە؟

بێگومان نە لەڕووکەشو نە لە گەوهەردا هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر گوتاری شێخ مەحمود نەهاتووە، کە گوتارێکی خێڵایەتی بارگاوی کراوە بە هەندێ

رەگەزی نەتەوایەتی، بەلام دیارە نەبۆتە گوتاریکی نەتەوەیی خاوەن شوناس، تەنانەت ئەگەر سەرنجی ئەو رووبەرە جوگرافییە بدەین کە لە حوکمداری سێیەمی شێخ مەحمود دەسەلاتی بەسەریدا هەبووە ناوچەیەکی تەسکتر بووە یان جوگرافیایەکی بچوکتر بووە لەچاو جوگرافیای سەردەمی حوکمداری یەکەم و دووەمیدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەبری ئەوەی بنەماکانی گوتاری نەتەوەیی لەسەردەمی حوکمدارییەکەی شێخ مەحموددا بەرەو پەرەسەندن و بەهێزبوون و گەیشتنە ئاستی بەدەستهێنانی شوناس بچێت کەچی بەپێچەوانەوە بەرەو لاواز بوون دەچێت لە چەند ئاراستەیەکەوە. لەلایەکەوە زۆرێک لە لایەنگرەکانی لێی جیا دەبنەوە، دەوری نوخبەی خوێندەوار هەرچەندە لە قۆناغی یەکەم و دووەمیشدا زۆر لاواز بوو، لە قۆناغی سێیەمدا دەگاتە ئاستی نەبوون، زۆرێک لەو ئەفسەرانەی سوپای عوسمانی کە پێشتر لەگەڵ شێخ مەحموددا بوون، لە قۆناغی سێیەمدا یان دەستگیر کران یان پشتیان لە شێخ مەحمود کردو دوورکەوتنەوە. لەرووی دەسەلاتدارییەوە ئەگەر لە قۆناغی یەکەم و دووەمدا خاسیەتێکی لاوازی حکومەتی هەبوویێت ئەوا لە قۆناغی سێیەمدا بەتەواوەتی هاوشێوەی دامەزراوەی خێڵ بوو لە چەند کەسێکی کەم پێکهاتبوو، تەنانەت حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلی زادە سێ پۆستی هەبووە کە ئەوانیش پۆستی بازرگانی و مەعاریف و نافیعە بووە. هەروەک لیژنەی پیاو ماقولانی شار وەکو بەشێک لە پێکهاتەی حکومەت سەیرکراوە.

ئەگەر سەرنجی سروشتی پێکهاتەی حوکمداری شێخ مەحمود بدەین لە هەرسێ قۆناغەکەیدا ئەوا بەتەواوی بۆمان دەردەکەوێت کە سەرپاری بەڵێنی ئینگلیز و سەرپاری هەوڵی شێخ مەحمود خۆیشی حوکمدارییەکەی نەک خاسیەت و بنەمای دەوڵەتی نەبووە وەکو زۆرێک لەوانەی لەسەریان نووسیووە و بە دەوڵەتیان داناوە بەلکو خاسیەتی دەوڵەتێکی سادەشی نەبووە، بەلام دیارە ئێمە لەرووی سۆزداری و کارکردنمانەوە بەهۆکاری سۆز و عاتیفە نەک

حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود بەڵکو گەلێك شتی تر لە ژیانی سیاسیو ئیداریو کەلتوری خۆماندا لە قەوارەی خۆی گەورەتر دەکەین.

لەڕووی بنەماکانی گوتارەوە دەبێ ئەو راستیە دووبارە بکەینەوە کە پاڵنەری بزوێنەری شێخ مەحمودو راپەڕینەکەی دەرکەوتنو پێگەیشتنی ناسیونالیزمی کوردی نەبووە چونکە هیچ گومانمان لەوە نییە کە لەو قۆناغەدا ناسیونالیزمی کوردی دەرنەکەوتووە. شێخ مەحمود خۆیشی ناسیونالیستێك بووە لەڕێگای سۆزو عاتیفەوە نەك لەڕێگای فیکرو جیهانبینییەوە کە ئەو سۆزەش لەگەڵ ئینتیمای شێخایەتیو عەشیرەتایەتیو تەریقەتو ئیسلامێتی تێکەڵاوبووە، بۆیە لە هەر گۆشەیەکەوە سەیری گوتاری شێخ مەحمود بکەین دەتوانین بەپێی روانینی خۆمان ناوی بنێین، هەر ئەوەش وایکردووە کە ئەوانەی بە سۆزی نەتەوایەتی لەسەر بنەمای عاتیفەو بێ بەهێندگرتنی واقیعی کۆمەڵایەتیو شێوازو بنیادی کۆمەڵگای کوردی لەبارەی راپەڕینەکانی شێخ مەحمود دواون وەکو رابەرێکی نەتەوایەتی لەسەر ئاستی جوگرافیای کوردستان سەیری بکەن. هەروەك ئەوانەشی کە ویستوویانە لە روانگەی ئاینو تەریقەتی قادرییەوە سەیری بکەن، وەکو تێکۆشەرێکی موجتەهیدی رێگای ئیسلامو تەریقەت سەیریان کردووەو وایان لە راپەڕینەکانی روانیووە کە غەزایە دژی کوفر. دیسان ئەوانەی لە روانگەی خێڵایەتیو عەشیرەتایەتیەوە سەیری شێخ مەحمودیان کردووە وەکو شێخێکی عەشیرەت سەیریان کردووەو نەیانتوانیووە لە دەرەوەی جوگرافیای عەشیرەتی بەرزنجی یان شێخانی سلێمانیو بەرژەوەندییەکانیانو خەریك بوون بەدەست بەسەراگرتنی موڵكو زەویو زار بەولاوە سەیری شێخ مەحمود بکەن. بەڵکو بەپێچەوانەوەی هەموو ئەمانەوە نە شێخ مەحمود خۆی کەسێکە تەنیا لە یەکێك لەو روانگانەوە سەیری بکرێت نە گوتارەکەشی تەنیا یەك ئاراستەی هەیە لەو ئاراستانە بەڵکو شێخ مەحمود خۆی کەسایەتییەکی ئیسلامی خاوەن تەریقەتی کوردی عەشایەرە یان شێخە کە دەیەوێت هەموو ئەو بنەمایانە هەموویان پێکەوە

مومارەسە بکات، دیارە گوتارەکەشی بارگاوی کراوە بە سەرجەم رەگەزەکانی ئەو بوارە جیاوازانە واتە رەگەزی نەتەوایەتی خێڵایەتیو شێخایەتیو ئیسلامیو تەریقەت، هەر ئەم تێکەڵاوییەش وایکردووە کە ئاستی شێخ مەحمود زۆر روون نەبێتو هەمیشە لەبارێکی شلۆقی دەروونیو کۆمەڵایەتیو سیاسیدا بێتو ئەوەش وای لێ بکات نەبێتە خاوەنی پرۆژەو هەمیشە لە بڕیاری بە پەلەو هەڵوێستی ناجێگیرو کاردانەوەدا بێت. کە ئەوەش سروشتو خاسیەتی گوتاری ئەوو راپەرینەکەشی بە هەمان شێوە بەرجەستە کردووە کە گوتارێکە خاوەنی شوناسێکی دیارو جێگیر نیەو کارکردنیش لەگەڵ گوتارێکی لەو جۆرەدا کێشەو گرفتی دیاری خۆی هەیە.

بێگومان دوای هەرەس هێنانی دوا حوکمداری شێخ مەحمود بۆ دواجار لەساڵی ١٩٢٤دا ئیتر شێخ مەحمود بە فیعلی ئیدارەی سلێمانی نەگرتۆتەوە دەستو تەنیا ئەوەندە ئامادەبوونی هەبووە کە ناوبەناو لە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراودا راپەرینی بەرپاکردووە بە تایبەتی لەدوای رۆژی رەشی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ کە دوا راپەرینی بریتی بوو لە شەڕی ئاوباریك لە نزیك کفری کە لەو شەڕەدا تێکشکاو جارێکی تر هێزەکەی پاشەکشەی کردو بڵاوەی لێکرد ئەوەش دوا جار بوو کە شێخ مەحمود سەرکردایەتی راپەرینو شەڕی تێدا بکات کە رێکەوتی سەرەتای مانگی نیسانی ساڵی ١٩٣١ بوو. ئیتر لەوە بەدواوە تاکو کۆچکردنی شێخ مەحمود چالاکییەکی سیاسی ئەوتۆی نەبوو هەتا باس لە گوتاری ئەوەو دوای بکرێت، بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لە راپەرینو شەڕی ئاوباریکیشدا شێخ مەحمود هەر هەڵگری هەمان گوتاری پێشتری بووەو هەمان جۆر سیاسەتو هەڵسوکەوتی کردووە لە راپەریندا و بە هێزی خێڵەکانو لە رووبەرێکی تەسکو لەسەر بنەمای برواپێبوون بە فشار دروستکردن لەسەر دوژمن شەڕی کردووە نەك لەسەر بنەمای بوونی پرۆژەیەکی نەتەوایەتی مەودا فراوان.

# گەڕان بەدوای ڕەگەزەکانی گوتاری شێخ مەحموددا لەو شیعرانەی کە وتویەتی

بێگومان سەرجەم ئەو ئاخاوتنانەی کە پێش ئێستا لەسەر گوتاری شێخ مەحمود کردمان لەسەر سێ بنەما بەرجەستە بوون، یەکەمیان ڕاوبۆچوونی کەسانی نزیکی شێخ مەحمود لە مێژوونووس و یاداشت نووسەکان. دووەمیان ڕاوبۆچوون و دۆکیومێنتەکانی کاربەدەستانی ئینگلیز لە ناوچەکەدا، سێیەمیان هەڵوێستەکانی شێخ مەحمود و ئەو بارودۆخە مێژوویی و کۆمەڵایەتی سیاسییەی کە ئەوی تێدا ژیاوە. بەڵام لەو بوارانەدا وتارێکی دیاری شێخ مەحمود کە وەکو قسەی خۆی سەیر بکرێت لەبەردەستدا نییە جگە لەو ڕاگەیاندنانەی کە لەکاتی حوکمداریدا یان ڕاپەڕیندا بڵاوی کردونەتەوە کە دەشێ ئەوەش کاریگەری و جێپەنجەی ئەو ڕۆژنامانەی پێوە دیاربێت کە تیایاندا ئەو ڕاگەیاندنانە بڵاوکراونەتەوە. بەڵام بایەخدارترین دەقی زمانی لەبەردەست بوو بۆ ئاخاوتنی گوتاری شێخ مەحمود ئەو دەقە شیعریانەن کە لەکات و شوێنی جیاوازدا نووسیونی، دیارە لێرەدا ئێمە مەبەستمان ئەوە نییە لەڕووی بەرهەمهێنانی شیعریەتەوە باسی گوتاری شیعری شێخ مەحمود بکەین نەخێر بەڵکو دەمانەوێت لەڕێگای ئەو شیعرانەوە جیهانبینی سیاسی و نەتەوەیی ئەم سەرکردەیە دیاری بکەین. دیارە شیعرەکانی زیاتر دەربڕینی" ڕووی ڕاستەقینەی کەسێتی ئەون و تێڕوانینی ئەویان تیا دەبینرێت شێخ مەحمود دەڵێت:

**ئامەوێ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومرەهی**
**ئایکەمە سەرخۆم بەدەستی موددەعی تاجی شەهی**
**قەد بە ئەمری دوژمنانم ئامەوێ فەرمانڕەهی**

یان دەڵێت:

**پارێز ئەکەم بە هیمەتی حەیدەر حقوقی کورد**

**یا رۆحی خۆم و ئالی پەیغەمبەر فیدا ئەکەم**

**گەر مانیعی حەققی میللەتی کورد بن عەرەب**

**بێشك نوێژەکانم بە کوردی قەزا ئەکەم.**

**شاهبازێ بووم لە مەیدانی شکاری دوژمنا**

**جەهلی میللەت بوو بە زیللەت هات بەسەر شانی منا**(٦٤)

ئەگەر سەرنجی ئەم چەند نێرە شیعرەی شێخ مەحمود بدەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە شێخ مەحمود لە ئاستێکی دیاریکراودا پەیوەستبووە بە کوردەوە بەڵام ئەوەی جێگای پرسیارەو تاکو ئێستاش جگە لە بۆچوونی ئەملاو لا نازانرێت ئایا شێخ مەحمود مەبەستی لە کورد یان لە میللەت یان نەتەوە هەموو کورد بووە لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە یان یان تەنیا کوردی ولایەتی موسڵی مەبەست بووە یان کوردی سلێمانیو دەوروبەری، واتە ئەو رووبەرە جوگرافیەی کە لەسەردەمی حوکمدارییەکەیدا لەژێر سایەی دەسەڵاتو قەڵەم رەوی ئەودا بووە؟ ئەمەش مەوداو رەهەندی گوتاری ئەو دیاری دەکات کە ئایا گوتارێکی نەتەوەیی بووە یان گوتارێک بووە کە لەسەر بنەماو زەمینەی ئەمری واقیعی دابەشبوونی کوردستان بنیاتنراوە یان گوتارێکی سنوور تەسکی ناوچەیی بووە کە تەنیا پەیوەست بووە بەو رووبەرە جوگرافیەوە کە خۆی لە چەند قۆناغێکی دەسەڵاتدارییەکەیدا دەسەڵاتی بەسەریدا هەبووە؟

شێخ مەحمود لە کۆپلەی یەکەمی ئەم شیعرانەدا لەوە دەدوێت کە چی تر بە ژیانی ژێردەستەییو کۆیلەی رازی نابێت. بەواتە دەیەوێت کۆتو پێوەندی دیلێتیو ژێردەستی بپسێنێتو ئازادی دەستەبەر بکات، لەگەڵ ئەوەشدا پێ لەسەر ئەوەدا دەگرێت کە ئەو ئازادییەکی دەوێت کە بە خەباتو کۆششی خۆی بەدەستی بهێنێتو دەیەوێت ئەوە رەت بکاتەوە کە بە فەرمان یان بە

خواستو ویستی دوژمنانی رابەرایەتی یان تاجی شاهەنشاهی قبول بکات، بە مانایەکی تر دەیەوێت بڵێت من ئەو دەسەڵاتو سەرۆکایەتییەم ناوێت کە دوژمنانم رەزامەندیان لەسەر بێتو ئەوان پێم ببەخشن.

لێرەدا ئەگەر بابەتیانە سەرنجی ئەم روانینەی شێخ مەحمود بدەین ئەوا دوو بۆچوونمان لەلا ئاشکرا دەبێت، یەکەمیان ئەوەیە کە شێخ مەحمود هەست بەجۆرێك لە کەسێتی خۆی دەکاتو بڕوای بەوەیە کە دەبێ دەسەڵاتو تاج بە هەوڵو تێکۆشانی خۆی بەدەست بهێنێت کە ئەمەش لە ڕوویەکەوە جۆرێك لە پشت بەستن بەخۆو بە هەوڵو کۆششی خۆیی دەردەخات کە ئەمەش لە روانکەی ئامادەبوونەوە هەوڵێکە بۆ ئەوەی بکەری رووداو دروستکەر بەرهەم بێت کە بتوانێت گۆڕانکاری بەرهەم بهێنێتو لەو ئاقارەشدا ببێتە خاوەنی شوناس، بەڵام لێرەدا دەبێ بپرسین ئایا پاڵنەری ئەم جۆرە هەڵوێستە لە بنەڕەتدا ئامادەبوونو تواناو لێهاتوویی بابەتییەو شێخ مەحمود لەوە تێگەیشتووە کە دەتوانێت بۆ خودی خۆی سەربەخۆییو دەسەڵات بەدەست بهێنێتو لە بنەڕەتدا خاوەنی پرۆژەیەکە کە بتوانێت لەسەر بنەمای ئەو پرۆژەیەو کاری جەماوەرییو عەقڵی سیاسی خۆی ئەوەی دەیەوێت بەدەستی بهێنێت یان ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا پرۆژەو بەرنامەو عەقڵی سیاسی غائیبنو پاڵنەری سەرەکی بۆ ئەو قسەو هەڵوێستانە سۆزو عاتیفەو هەڵچوونی رۆمانسیانەیە؟

دووەم دەشێ وای لێکبدەینەوە کە ئەو جیهانبینییە لە پشتی ئەم شیعرەوە وەستاوە جیهانبینییەکی مەودا کورتەو زیاتر لەوەی لە روانگەی بەرژەوەندییەوە سەیری سیاسەت بکات، لە روانگەی ئەخلاقەوە سەیری دەکات. کە لە هەموو سەردەمێکدا روانین بۆ سیاسەت لە روانگەی ئەخلاقەوەو کێشانەی سیاسەت بە پێوانە ئەخلاق کارێکی هەڵەیە، لێرەوە تێدەگەین کە شێخ مەحمود روانینی بۆ مەسەلەی بەدەست هێنانی دەسەڵاتو بۆ سەربەخۆییو دروستکردنی دەوڵەتی کوردی روانینێکی خێڵایەتی یان

شێخایەتی بووەو ئەو لەبەر باری سیاسی و مامەڵەی دیپلۆماسیانەو پشت بەستن بە چەمکی ئامانج پاساوی ئامرازەکان دەکات کە لە سیاسەتدا کاری پێدەکرێت پشتی بە چەمکی ئەخلاق و عیزەتی نەفس و خۆڕاگری بەستووە کە ئەمانەش لە خاسیەتەکانی عەقڵی خێڵ و کەلتوری خێڵ و ڕوانینی خێڵە بۆیە لێرەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە گوتاری شێخ مەحمود لە شیعرەکانیشیدا گوتارێکی خێڵایەتی دلخراوە کە بە هەندێ ڕەگەزی نەتەوەیی بارگاوی کراوە.

ئێمە دەزانین کە لە مێژوودا دەوڵەت لە دوو ئاڕاستەدا دروستبووە یان لە ئەنجامی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا لە خێزانەوە بۆ کۆمەڵگای مەدەنی و پاشان لەوێشەوە دەوڵەت بەرهەم هاتووە کە دەوڵەتیش لەو میانەدا توانیوویەتی نەتەوە دروست بکات یان لە ئەنجامی گۆڕانکارییە سیاسیەکاندا بڕیاری سیاسی دەوڵەتی بۆ هەندێ لە نەتەوەکان دروستکردووە. هەر چۆن لەدوای جەنگی جیهانی بە بڕیاری سیاسی لە پاشماوەی دەوڵەتی هەڵوەشاوەی عوسمانی چەندین دەوڵەت دروستکرا. یان وەکو چۆن لەدوای جەنگی جیهانی دووەم و تەنانەت دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤێت بڕیاری سیاسی دەوڵەتانی بڕیار بەدەست چەندین دەوڵەتی دروستکرد، هەر بۆیە دەشیا لەسەردەمی شێخ مەحمودیشدا سەرباری دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردی و سەرباری نەبوونی کەسێك کە لە کوردستاندا کۆدەنگی هەموو کوردی لەسەر بێت بۆ سەرکردایەتی هێشتا بواری ئەوە هەبێت کە کورد دەوڵەتی بۆ دروست بکرێت بەڵام بە مەرجێ لە کوردستاندا گوتارێك هەبوایە لەگەڵ گوتاری ئەو کاتەی ئینگلیز بگونجایە یان ببوایەتە جێگای متمانەی ئینگلیز. کاتێ شێخ مەحمود باسی ئەوە دەکات کە ئەو دەسەلات و تاجەی ناوێت کە دوژمن پێی ببەخشێت، مانای وایە هێشتا گوتاری شێخ مەحمود لەو ئاستەدا نەبووە کە لایەنی هەرە کەم ئینگلیزەکان بە جێگای ئەوەی بزانن کە دەوڵەتی بۆ دروست بکەن، شێخ مەحمود خۆی دەڵێت من ئەو دەسەلات و تاجەم ناوێت کە ئەوان بمدەنێ کەواتە کاتێ ئێمە هەمو گوناهی دروست نەکردنی دەوڵەتی کوردی ئەخەینە ئەستۆی ئەوان مانای وایە دەمانەوێت پاکانە بۆ خۆمان بکەین کە

ئێمە خاوەنی کەموکورتیی‌و هەڵەنین‌و لە بنەڕەتدا ئێمە لە چارەمان نووسراوە کە قوربانی بین، بەڵام لەڕووی راستیەوە ئەم کۆپلە شیعرەی شێخ مەحمود پێمان دەڵێت شێخ لە بنەڕەتدا بڕیاری داوە بە هیچ شتێك رازی نەبێت کە ئەوان پێی ببەخشن، هۆکەشی دیارە دەگەڕێتەوە بۆ ئاسۆی مەودا کورتی بینین‌و تێنەگەیشتن لە چەمکی سیاسەت‌و کارکردن بەپێی بەرژەوەندی نەتەوایەتی بە ولاتایەکی دی لەم شیعرەوە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە شێخ مەحمود وەها سەیری دنیای کردووە یان دەبێ بەتوانای خۆی ئازادی‌و سەربەخۆیی بسەپێنێت یان ئەو ئازادی‌و سەربەخۆییەی ناوێت کە دەبێ بە ملدان‌و رێکەوتن‌و سەودا گەری‌و خۆنزیك کردنەوە لە دوژمنان وەکو خۆی ناوی بردوون دەستی دەکەوێت.

لە کۆپلەی دووەمی ئەو شیعرەدا کە شێخ نووسیوویەتی ئاستی ئیمانداری‌و پەیوەستبوونی بە ئایینی ئیسلامەوە دەردەکەوێت‌و لە خەبات‌و تێکۆشانیشدا شێخ مەحمود پشت‌و پەنای خودایە کە ئومێد دەکات لەو خەباتەدا بۆ کورد سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. لەو خەباتەدا شێخ مەحمود باسی ئەوە دەکات کە گیانی خۆی‌و ئالی پێغەمبەر دەکات بەقوربانی. لێرەدا ئاماژەی ئەوە هەیە کە شێخ مەحمود لەبری ئەوەی بڵێت گیانی خۆیی‌و رۆڵەکانی کورد بەفیدا دەکات، دەڵێت گیانی ئالی پێغەمبەر بەفیدا دەکات کە ئەمەش بە دوو ئاڕاستە لێکدەدرێتەوە. یەکەمیان مەبەست لە ئالی پێغەمبەر مسوڵمانانە. دووەمیان مەبەست لە ئالی پێغەمبەرهەموو سەیدەکانی کوردستانە واتە هەموو ئەوانەی کە لەڕێگای درەختی بنەماڵەوە دەچنەوە سەر پێغەمبەرو کەس‌وکاری. ئەمەش تا ئەندازەیەکی ئاشکرا ئاڕاستەی نەتەوایەتی بوونی گوتاری شێخ مەحمود لاواز دەکات‌و زیاتر سیمایەکی ئایینی پێدەبەخشێت هەروەك لە هەمان کاتدا لەجیاتی قسەکردن لە هێزێکی جەماوەری بەرفراوان کە هەموو کورد بگرێتەوە، جەخت دەکرێتە سەر ئینتیماو پەیوەستبوونی

عەشیرەتایەتیو خێڵایەتی واتە پەیوەندی خوێنو دەمار کە ئەمەش خاسێی کۆمەڵگای خێڵایەتیە.

لە هەمان کاتدا کە بەو شێوەیە پەیوەستبوونی خۆی بە ئیسلامو پێغەمبەرەوە دەدەخاتو ناڕاستەوخۆش باسی ئەوە دەکات کە عەرەب لەبەر ئەوەی زمانەکەیان زمانی ئایینی ئیسلامەو ئێمەش وەکو کورد دەبێ بە زمانی ئەوان نوێژو ئەرکە ئایینییەکان جێبەجێ بکەین کە دیارە ئەوەش دەبێ یەکێتیو یەکبوون لەنێوان هەمان مسوڵمانان دروست بکات، واتە ئەم ئایینە هەموو بڕواردارەکان دەکات بەبرای دینی، بەڵام شێخ مەحمود وای نیشان دەدات ئەگەر برا عەرەبە مسوڵمانەکان دژی ئەوە بن کوردە مسوڵمانەکان ببن بە خاوەنی مافی نەتەوەیی خۆیان، ئەوا شێخ مەحمود پشت لەو زمانە دەکاتو لەوە بەدواوە نەك هەر ئەو زمانە رەت دەکاتەوە کە قورئانی پێهاتووەتە خوارەوە، بەڵکو بڕیار دەدات لەوە بەدواوە نوێژ بە کوردی بکات، دیارە ئەوەش لایەنێکی بەهێزی گوتاری کوردییە چونکە لە خۆیدا گوتار بریتییە لە دەقی نووسراو واتە زمان لە ئاستی تۆمارکردندا. بەڵام لێرەدا پرسیارێکی تر سەرهەڵدەدات ئەویش ئەوەیە ئایا شێخ مەحمود بەبیرکردنەوەی خۆییو وەکو پڕۆژەیەکی نەتەوەیی دەیەوێت نوێژ بکات بەکوردی یان لە بەرامبەر هەڵوێستی عەرەبە مسوڵمانەکاندا کە رەفزی مافەکانی کورد دەکەن ئەمیش وەکو کاردانەوە بەرامبەر بەو هەڵوێستە توندەی ئەوان دەیەوێت پەیوەندی خۆی بە عەرەبەوە کۆتایی پێبهێنێتو لەوە بەدواوە نوێژیش بە کوردی بکات.

بەڵام سەرباری ئەم قسانەی پێشەوە کە شێخ مەحمود راستەوخۆ وەکو کوردێك یان ناڕاستەوخۆ وەکو مسوڵمانێکی کورد بە هەڵگری گوتاری کوردی دەردەکەوێت لەدوا دوو دێڕە شیعری ئەودا کە لەپێشەوە نووسیمانەوە دوو رای بەرامبەر بەیەکی شێخ مەحمودمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەوەش دەشێ وەکو هۆیەکی سەرەکی شکستی راپەڕینەکانی ئەو دابنرێن. یەکەمیان شێخ مەحمود لەو شیعرەدا دەیەوێت قورسایيو لێهاتوویی خۆی دەربخاتو هەر

خۆیشی باسی ئەو قورسایی‌و لێهاتووییە دەکات کە چۆن لە بەرامبەر دوژمندا ئازاو لێهاتوو بووەو لە مەیدانی لێدانی دوژمندا خۆی وەکو شاباز وەسف دەکات، لە هەمان کاتدا هۆی شکاندن‌و سەرنەکەوتنی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ نەزانینی میللەت بە واتا میللەت دەکاتە بەرپرسی یەکەم لە شکست هێنانی.
دیارە هیچ گومان لەوە ناکرێت کە ئەم قسەیە راستییەکی زۆری تێدایە بەتایبەتی لەکاتێکدا کە شێخ مەحمود راپەڕینی کردووەو داوای سەربەخۆیی‌و دەوڵەتی کوردی کردووە، کورد وەکو نەتەوە ئامادەبوونێکی ئەوتۆی نەبووە ئەویش بەهۆی باری دواکەوتوویی‌و نەزانی‌و نەخوێندەواری‌و نەبوونی هەست‌و هوشیاری نەتەوەییەوە کە دەشێ بە نەبوونی ناسیۆنالیزم ناوی ببەین.
بە واتایەکی دی لەسەردەمی راپەڕینەکانی شێخ مەحموددا کورد وەکو کۆمەڵگا لە پێکهاتەیەکی خێڵایەتی ناکۆك لەگەڵ یەکتری‌و پەیوەندی لاوازدا بووە. هەر خێڵ‌و عەشیرەتە لەسەر رووبەرێکی دیاریکراوی جوگرافی، هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیی داوەو لەو پێناوەشدا تەنیا بە شەڕو هێزی خێڵ خۆیی پاراستووە هەستی نەتەوایەتیش بەو جۆرە پەرەی نەسەندووە کە سنووری نێوان خێڵەکان بڕوخێنێت‌و وەکو یەکەی یەککرتوو کۆببنەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە لەبارێکی پچڕ پچڕی لاوازدا بوون، ئەمە جگە لەوەش کە خێڵ‌و عەشیرەتەکانی کورد تا ئەندازەیەکی فراوان کەسێتی شێخ مەحمودیان بە سەرۆکی خۆیان قبوڵ نەکردووە چونکە وەکو شێخێکی عەشیرەت لێیان روانیووەو پێیان وابووە شێخ مەحمود دەیەوێت لەرێگای راپەڕین‌و دروستکردنی دەسەڵاتەوە دەست بەسەر هەموو ناوچەکەدا بگرێت‌و هەمووی بخاتە خزمەتی خۆیەوەو لەپێناوی بەرژەوەندی خۆی‌و بنەماڵەکەیدا ئەوە بکات، دیارە هەوڵی شێخ مەحمودیش بۆ دەست بەسەردا گرتنی زەوی‌و زارو ئاوو جۆگەو هەندێ شوێنی زۆر دەوری هەبووە لەسەر خێڵ‌و عەشیرەتەکانی کوردستان بۆ ئەوەی بە ئاسانی مل بۆ شێخ مەحمود نەدەن، لە هەمان کاتدا نەزانی‌و دواکەوتوویی‌و نەبوونی هەستی نەتەوایەتیش دەوری خۆیی هەبووە.
شێخ مەحمود کاتێ تۆباڵی شکستەکانی دەخاتە ئەستۆی میللەت‌و ئەوەش

دەگێڕێتەوە بۆ نەزانی میللەت دەبەرێت پێمان بڵێت هۆی شکستی ئەو ئەوە بووە کە میللەتی لەگەڵدا نەبووە، ئەمەش تا ئەندازەیەك راستە چونکە راپەڕینەکانی شێخ مەحمود لە هیچ قۆناغێکیدا نەیتوانیووە رووبەرێکی فراوان بگرێتەوەو لە ناوچەگەریی و هەرێمچێتی بپەڕێتەوە. ئەمەش دیسان شوناسی راپەڕینەکە لە راپەڕینێکی نەتەوەییەوە دەکاتە راپەڕینێکی ناوچەگەری بەو پێیەش گوتاری ئەم راپەڕینە گوتارێکی ناوچەیی مەودا تەسکی خێڵایەتی دەبێت کە بارگاوی کراوە بە هەندێ رەگەزی نەتەوایەتی.

بە هەر حاڵ لەم چەند دێڕە شیعرەی شێخ مەحمودا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە شێخ مەحمود وەکو کوردێکی مسوڵمان متمانەیەکی تەواوی بە خۆیی و بە ئازایەتی و لێهاتوویی خۆی هەبووەو گیانی سازش و سەوداگەری تێدا نەبووەو تەنانەت ئەگەر زانیبێتی ئەو سازش و سەوداگەرییە رەنگە ببنە هۆکاری بەدەست هێنانی تاج و سەربەخۆیش بۆ کورد. لە هەمان کاتدا هەموو گوناهی شکست و سەرنەکەوتنی دەخاتە ئەستۆی میللەت و لەلایەکی تریشەوە ئەستۆی دوژمن. ئەمەش هەمان ئەو عەقڵێتەی کوردە کە هەمیشە دەیەوێت هەڵەو کەموکورتییەکان لەخۆی دوور بخاتەوەو هەمووی بخاتە ئەستۆی ئەوانی تر ئیتر گرنگ نییە ئەوانی تر کێن، ئەوانی دوژمن و داگیرکەرن یان ئەوانی میللەتن. بەگوێرەی شێخ مەحمود. لێرەدا دەگەینە ئەو سەرئەنجامەی کە سەرباری شکست هێشتا شێخ مەحمود ئامادە نییە هیچ رەخنە لەخۆی بگرێت یان تەنانەت خۆی بەجێگای رەخنە بزانێت، ئەمەش ئەو دەلالەتە هەڵدەگرێت کە عەقڵی کوردی عەقڵێکە هەرگیز توانای ئەوەی نەبووە رەخنە دروست بکات یان بگاتە ئەو ئاستەی توانای خوێندنەوەی خۆیی هەبێت و رەخنە لەخۆی بگرێت، هەر ئەوەش وای کردووە کە کورد نەتەوانێت هیچ پەندو وانەیەك لە شکستەکانی رابردووی خۆی وەربگرێت یان رابردووی خۆی بخاتە بەردەم رەخنەوەو هەڵیسەنگێنێت بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە لە حاڵەتی بەپیرۆز سەیرکردنی ئەو رابردووەدا بووە.

# سەرچاوەکانی گوتاری شێخ مەحمود


١- محەمەد رەسوڵ هاوار - شێخ مەحمودی قارەمانو دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان - بەرگی یەکەم - لەندەن - ١٩٩٠ ل٧٥.

٢- عەتا قەرەداخی - خەونی سەربەخۆیی لە واقیعێکی ناجێگیردا سلێمانی - ٢٠٠٤ - ل٢٩.

٤- محەمەد رەسوڵ هاوار - شێخ مەحمودی قارەمان - بەرگی یەکەم ل١٢٦.

٥- هەمان سەرچاوە - ل١٤٠.

٦- یادنامەی شێخ مەحمودی حەفید - سلێمانی - ٢٠٠٧ ل٣٦.

٧- گۆڤاری کاروان - گفتوگویەك لەگەڵ شێخ مەحموددا لە (حزیون) وەرگیراوە، کاروان ژمارە (٢٦)ی ساڵی ١٩٨٤.

٨- محەمەد رەسوڵ هاوار - شێخ مەحمودی قارەمان - بەرگی یەکەم ل ٣٤٦-٣٤٧.

٩- کەماڵ نوری - یادەشتەکانی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود ساڵی ١٩٩٥ - ل٣٦.

١٠- م. س. لازاریف و آخرون - تأریخ کوردستان - ترجمة: الدکتور عبدي حاجي - دهوك - ٢٠٠٦ - ص١٨٤.

١١- م. س. لازاریف - المسألة الکردیة (١٨٩٠-١٩١٧) ترجمة: أکبر أحمد - مرکز کوردستان للدراسات الستراتیجیة - ٢٠٠١ ، ص٥٠٨.

١٢- محەمەد رەسوڵ هاوار - شێخ مەحمودی قارەمان - بەرگی یەکەم - ل٣٦٧.

١٣- هەمان سەرچاوە. ل٣٦٨.

١٤ـ عەتا قەرەداغی ــ چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا ــ هەولێر ــ ٢٠٠٥ ـ ل٩١.

١٥ـ م.س. لازاريف ــ المسألة الكردية ــ ص٥٠٨.

16- Office of civil Commissionery, Mes, Ex. Force pricis of Affairs in Southern Kurdistan During the Great war – Baghdad, 1919, p.5.

17- Ibid. P.5.

18- Ibid, p.6.

١٩ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت ــ سلێمانی ــ چاپی سێیەم ٢٠٠٣، ل٤٦.

٢٠ـ عەلائەدین سەجادی ــ مێژووی راپەڕینی کورد ــ ئینتنیشاراتی محەمەدی ١٩٩٦، ل٥٦.

21- A.T.Wilson, Mesopotamia(1917-1920), London, 1930,p.128.

٢٢ـ المس بيل ــ فصول من تأريخ العراق القريب ــ ترجمة جعفر خياط ــ بيروت (وەرگیراوە لە هاوار ــ بەرگی یەکەم ل٣٨٥).

٢٣ـ رەفیق حیلمی ـ یاداشت ـ چاپی سێیەم ــ سلێمانی ٢٠٠٣، ل٤٦.

٢٤ـ الدكتور محمد عابد الجابري ــ العصبية و الدولة ــ بغداد .ص ١٩٨.

٢٥ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت ــ چاپی سێیەم ــ ل٤٨.

٢٦ــ فازیل کەریم ـ شاری سلێمانی ململانێی گروپە کۆمەڵایەتیەکان (١٨٢ــ٩٢٠، سلێمانی ٢٠٠٦ ل١١٦ــ١١٧).

٢٧ـ هەمان سەرچاوە ــ ل١٩١.

٢٨ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان بەرگی دووەم ــ ل٣٨٨.

٢٩ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت ــ چاپی سێیەم، ل٦١.

٣٠ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت، چاپی سێیەم، ل٦٢.

٣١ـ رەفیق حیلمی ـ یاداشت، چاپی سێیەم، ل٦٢.

٣٢ـ وەلید حەمدی ــ کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا ــ وەرگێڕانی محەمەد نوری توفیق ــ سلێمانی ١٩٩٩، ل٥٩.

٣٣ـ رەفیق حیلمی ـ یاداشت، بەرگی سێیەم، ل١٨٠ـ٨١.

٣٤ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ بەرگی دووەم ــ ل٤٦٨.

٣٥ـ هەمان سەرچاوە ــ ل٤٦٩.

٣٦ـ هەمان سەرچاوە ل٤٦٤.

٣٧ـ جريس فتح الله ـ يقظة الكرد ص٢٢٨.

٣٩ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت ــ چاپی سێیەم ـ ل١٦٢.

٤٠ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ سمكۆو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد ــ سوید ١٩٩٦، ل٢٣٧ـ٢٣٨.

٤١ـ سيي. جي. ادموندز ــ كورد و ترك و عرب ـ سياسة و رحلات و بحوث عن الشمال الشرقي من العراق (١٩١٩ــ١٩٢٥) ــ ترجمة: جرجيس فتح الله ــ دار آراس ١٩٩٩، ص٢٧٢ .

٤٢ـ عبدالرحمن بن خلدون ــ مقدمة إبن خلدون ــ دار الجيل. ص١٦٧.

٤٣ـ بانگی کوردستان ــ ژمارە (١٠)ی ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢، ل١.

٤٤ـ بانگی کوردستان، ژمارە (١١)، ل٦.

٤٥ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت، چاپی سێیەم، ل٢٤٨.

٤٦ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت ـ چاپی سێیەم ــ ل٢٣٧.

٤٧ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ بەرگی دووەم ل٤٠٠.

٤٨ـ هەمان سەرچاوە ــ ل٤٠٧.

٤٩ـ هەمان سەرچاوە ــ ل٤٤٧.

50- Special Report: progress of Iraq During The period (1920-1931).

"هاوار دەقە ئینگلیزییەکەی لە بەرگی دووەمی شێخ مەحمودی قارەکانی بڵاوکردۆتەوە" ص٤٦٩.

٥١ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ـ بەرگی دووەم، ل٤٧١.

٥٢ـ هەمان سەرچاوە ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ ل٤١٠ـ٤١١.

٥٣ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت، چاپی سێیەم ــ ل٢٥٩.

٥٤ــ وەلید حەمدی ــ کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا ــ ل١٢٧.

٥٥ـ هەمان سەرچاوە ــ ل١٢٧.

٥٦ـ هەمان سەرچاوە ـ ل١٢٨.

٥٧ـ هەمان سەرچاوە ــ ل١٢٨.

٥٨ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ بەرگی دووەم ل٢٩٢.

٥٩ـ

٦٠ـ رەفیق حیلمی ــ یاداشت ــ چاپی سێیەم ــ ل٤٧.

٦١ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ بەرگی یەکەم ل١٩٦.

٦٢ــ سدیق ساڵح ـ حکومەتی کوردستان (١٩١٨ـ١٩٢٤) سلێمانی ٢٠٠٧ ـ ل١٤٦ـ١٤٧.

٦٣ـ محەمەد رەسوڵ هاوار ــ شێخ مەحمودی قارەمان ــ بەرگی دووەم ل٥٥٧.

٦٤ـ عومەر مارف بەرزنجی، نوریەخشی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢٧، ٢٨.

# سەرەتا:

لە رۆژی ٢٢ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا قازی محەمەد دامەزراندنی، کۆماری میللی کوردستانی راگەیاند، سوپای ئێران لە رۆژی ١٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا چووە ناو مهابادەوەو کۆماری مهابات کە هێشتا ساڵێکی تەواو نەکردبوو روخێنرا، سنووری دەسەلاتی ئەم کۆمارە زۆر تەسک بوو تەنیا ناوچەکانی مهابادو بۆکانو نەغەدەو شنۆی دەگرتەوە. بێگومان پێش ئەوەی باسی گوتاری کۆماری مهاباد بکەین دەبێ لەبارەی کۆمەڵەو پاشانیش پارتی دیموکراتی کوردستانو بەرنامەکانیانو گوتاریانەوە بدوێین بۆ ئەوەی رێگا خۆش بکەین بۆ ئاخاوتن لەسەر گوتاری کۆماری مهاباد.

دکتۆر عەبدورەحمانی قاسملۆ دەڵێت: لەماوەی ساڵەکانی شەڕدا هێزی هاوپەیمانان نەچوو بۆ بەشی شیمالی کوردستانی ئێران کە مەرکەزەکەی شاری مەهابادە. بۆیە ساڵی ١٩٤٤ پاش ئەوەی پاشماوەی هێزی پۆلیسی ئێران لە مەهاباد وەدەرنرا، خەڵك بۆ خۆی حوکمی ئەو مەڵبەندەی گرتە دەست. لەو کاتەدا رێکخراوێکی ناسیونالیستی بەناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد تێکۆشانی خۆی دەست پێکردبوو[1] عەلادین سەجادی دەڵێت: هەندێ لە گەنجەکانی ئەو وڵاتە کە تا بیست کەسێك ئەبوون لە سابڵاخ بەناوی "کۆمەڵەی ژ.ك."ەوە دەستیان دابوو بە ئیشەوەو گۆڤارێکیشان بەو ناوەوە دەرئەکرد. گۆڤارەکە ئەبرا لە تەورێز لەچاپ ئەدراو لە وڵاتی موکریان بڵاو ئەکرایەوە. ئامانجی کۆمەڵەی (ژ.ك.) ئەوە بوو کە ژیانی کوردستانی گەورەبێ[2]. کۆمەڵەی "ژ.ك." بەرە بەرە پەرەی سەندو دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی نهێنییەکانی دڵی خۆیانو پروپاگەندەکردن بۆ رزگارکردنی کوردستانی گەورە[3].

حەسەنی ئەرفەع دەڵێت: لە سێپتەمبەری ١٩٤٢، ژمارەیەك لە رۆشنبیری خەڵکی مهاباد رێکخراوی (کۆمەڵە)یان دامەزراند، ئەم رێکخراوە بەشێوەیەکی پوخت تایبەت بوو بەو مەڵبەندەو، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ حیزب‌و رێکخراوە کوردییەکانی تیکەی وەك (خۆیبوون)و (هیوا)دا نەبوو، بەرنامەو ئامانج لە دامەزراندنی ئەم رێکخراوە بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردنشینی ئێران‌و پاشان دامەزراندنی کوردستانی گەورە بوو[4] لە ئابی ١٩٤٢دا نوێنەرانی جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستانی ئێران‌و عێراق لەشاری مەهاباد کۆبوونەوە. لەم کۆبوونەوەیەدا پانزە نوێنەری هەردوولا بەشدار بوون. پێکەوەنانی رێکخراوێکی سیاسی بەناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردەوە یەکێ بوو لە بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە[5]. هەر لەبارەی دامەزراندنی کۆمەڵەوە نووسەری بە رەگەز ئێرانی نادر ئینتیسار دەڵێت: لە رۆژی ١٦ی ئەیلولی ١٩٤٢دا هەندێ لە کوردەکانی مهاباد کۆبوونەوەیەکیان کرد بە مەبەستی پێکهێنانی لیژنەیەك بەناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد، بۆ نەخشە دانان‌و کارکردن بۆ پشتگیریکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس لەلایەن کوردەوە[6].

بێگومان لەم وتانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵە لەبارودۆخێکدا دروستبووە کە تا ئەندازەیەك ناوچەی موکریان‌و بەتایبەتیش مهاباد ناوچەیەکی نیمچە چۆڵ بوو لەرووی دەسەڵاتی سیاسی‌و دەوڵەتیەوە، چونکە کاتێ هێزەکانی هاوپەیمانان‌و بەتایبەتیش هێزەکانی سۆڤێت هاتنە ئێران حکومەتی رەزا شا روخاو هێزی هاوپەیمانەکان نەچوونە بەشی باکوری کوردستانی بە ئێرانەوە لکێنراو بەتایبەتیش کە مهاباد شاری دیاری ئەو ناوچەیە بوو کە هێزی هاوپەیمانەکانی تێنەچوو، هەر بۆیە هەم بۆشایی ئیداری‌و هەموو دووری دەسەڵاتی دەوڵەتی پێشووی شاو نەمانی ئەو دەسەڵاتە جۆرە ئازادییەکی لێکەوتەوە کە ئەوەش زەمینە خۆشکەر بوو بۆ سەرهەڵدانی بیروباوەڕی نوێ، هەروەك دەوری سۆڤێتییەکان‌و حیزبی تودەش لەو سەرو

بەندەدا ئاشکرا بوو. واتە بانگەوازی سۆڤیێت بۆ پشتگیری کردنی گەلانی ژێردەستەو ماف خوراو لەو سەروبەندەدا هۆکارێکی تر بوو بۆ ئەوەی نەك هەر کورد بەڵکو زۆرێك لە نەتەوە ژێردەستەکانی جیهان بکەنە جوڵەو خۆکۆکردنەوە لەپێناوی ئازادیدا.

هەروەك لەلایەکی تریشەوە دروستبوونی حیزبی هیوا لە کوردستانی لکێنراو بە عێراقەوە دەوری راستەوخۆو ناڕاستەوخۆی هەبووە لەسەر دروستبوونی کۆمەڵە "میر حاج کە نوێنەری حیزبی هیوا بوو بە پشت بەستن بە ئەزموونی حیزبی هیوا توانی ئامۆژگاری‌و رێنومایی عەمەلی لەبارەی دامەزراندن‌و بەردەوام بوونی گروپێکی ناسیونالیستی کوردییەوە پێشکەش بکات کە دەبێ چۆن دابمەزرێ چۆن بەڕێوە بچێت.. دوای گوێ گرتن لە رێنوماییەکانی میر حاج، پیاوانی مهاباد بڕیاریان دا کە خۆیان لە دەستەیەکدا رێك بخەن کە ئەویش ناونرا کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد[٧] کەواتە لەم قسەیەوە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە پەیوەندی لەنێوان حیزبی هیواو کۆمەڵەدا هەر لەپێش راگەیاندنی کۆمەڵەدا هەبووە. هەندێ وای بۆ دەچن کە حیزبی هیوا لە سەرەتاوە مەبەستی ئەوە بوویێت کە لقێکی حیزبەکە لە رۆژهەڵات دروست بکات، دیارە ئەوەش لەسەر بنەمای بڕوابوون بە بوونی یەك کوردستانەوە هاتووە، واتە سەرباری دابەشبوونی، کورد یەك نەتەوەیەو کوردستانیش یەك وڵاتە بەو پێیەش دەشێ یەك حیزبی نەتەوەیی لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا دروست ببێت‌و خەبات بکات لەپێناوی رزگارکردنی هەموو کوردستان‌و دروستکردنی یەك دەوڵەتی نەتەوەییدا لەسەر هەموو جوگرافیای وڵاتەکە کە پێشتر بڕیاری سیاسی‌و بەرژەوەندی دەوڵەتانی بڕیار بەدەست دابەشیان کردووە بەسەر دەوڵەتانی هاوسنووریداو بەوەش لەبری ناوەندێکی نەتەوەیی کە کوردی لە دەور کۆببێتەوە، کوردیان خستۆتە ژێر فەرمانی چوار ناوەندی نامۆوە بە کورد کە هەر چوار ناوەندەکە لەڕێگای هێزو کوشتن‌و بڕین‌و سەرکوتکردنەوە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەم نەتەوەدا دەسەپێنن. دەشێ لە هەر

چرکەساتێکدا کە ناسیونالیزمی کوردی بەشێوەیەکی سروشتیو پێگەیشتوو دەربکەوێت پڕۆژەی دروستکردنی یەك ناوەندو روخاندنی سنوورە دەستکردەکانو پێکهێنانی یەك بزوتنەوەی جەماوەری لەسەر ئاستی هەموو کوردستان لە کارو ئەرکەکانی ئەو بێت ولە ناسیونالیزمی کوردی، ئەو دەمەش رێکخەری ئەو پڕۆژە نەتەوەییە بێگومان بوونی حیزبێکی ناسیونالیستی دەبێت لەسەر ئاستی هەموو کوردستان کە ئەویش دیارە حیزبی کۆمەڵگای شارو دروستکراوی نوخبەی ناسیونالیستی شار دەبێت نەك حیزبی خێڵو عەشیرەتو دەستەو گروپی ناوچەیی داخراو، پەیوەست بەو سنوورانەوە کە داگیرکەرانی کوردستان دروستیان کردوون پرسیارەکە ئەوەیە ئایا کۆمەڵە هەر لە دروستبوونیەوە وەکو رێکخراوێکی ناوچەیی تەنیا بۆ رزگارکردنی مهابادو هەندێ شوێنی دەوروپشتی دروستبوو یان ئامانجی رزگارکردنی کوردستانی لکێنراو بوو بە ئێرانەوە یان بەرنامەو پڕۆژەی کوردستانی گەورەی هەبوو؟ چونکە بەرنامەو پڕۆژەو شێوەی کارکردن دەبنە بنەما بۆ دەست نیشانکردنی گوتاری ئەم رێکخراوە.

لەو وتانەی لەسەرەوە لەبارەی دروستبوونی کۆمەڵەوە وەرمانگرتن ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە دروستبوونی کۆمەڵەدا دوو خاڵ گرنگی زۆریان هەیە لە روانگەی گوتاری ئەم رێکخراوەوە کە یەکەمیان ناوهێنانێتی وەکو رێکخراوێکی ناسیونالیستیو دووەمیان بەرنامەی کارکردنێتی لە پلەی یەکەمەوە لەپێناوی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانم لکێندراو بە ئێرانەوە، لە پلەی دووەمیشدا خەباتکردن لەپێناوی کوردستانی گەورەدا.

دیارە ئەوە ئاشکرایە کە لەکاتی دروستبوونی کۆمەڵەدا جۆرێك لە هەستی نەتەوەیی کوردی سەری هەڵداوە، ئەگەرچی هێشتا بارودۆخی کۆمەلایەتیو ئابوری کوردی لەو ئاستەدا نەبووە کە دەرکەوتنی ئەو هەستە نەتەوەییە وەکو بەرهەمی سروشتی پەرەسەندنی ئەم کۆمەڵگایە سەیر بکرێت. بەڵام دیارە کاریگەری دەرەوە بەگشتیو قسەکردن لە مەسەلەی مافی بریاردانی

چارەنووسیش کە لەلایەن سۆڤێتو حیزبە شیوعیەکانەوە کە ئەوکاتە لەو وڵاتانەشدا دروستبوو بوون کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکرابوو دەوری دیاری هەبوو لەسەر نوخبەی خوێندەوارو هوشیاری کورد بۆ ئەوەی هەوڵی دروستکردنی رێکخراوی خۆیان بدەن بۆ پێداگرتنو خەبات کردن لەپێناوی ئەو مافەدا کە دەبێ هەموو نەتەوەیەك بێ هیچ کۆسپو بەربەستێك بەدەستی بهێنێت، بە هەر حاڵ کۆمەڵە هەر لە دروستبوونیەوە لە خۆیدا وەکو رێکخراوێکی نەتەوەیی دەردەکەوێت کە هەڵگری ئاستێك لە داواکارییەکانی کوردە ئەگەرچی مەوداو رەهەندی ئەو داواکارییانەش لە روانگەی ناسیونالیزمەوە جێگای قسە لەسەرکردنە.

بێگومان لەو وتانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵە بەرنامەی یەکەمینی ئۆتۆنۆمییە واتە لەپێناوی ئۆتۆنۆمیدا خەبات دەکات ئەگەرچی بەرنامەی ئەوپەڕینی سەربەخۆیی کوردستانی گەورەیە . دیارە ئەوە ئاشکرایە کاتێ حیزبی شیوعی لە عێراقو ئێران دروستبوو باسی دیموکراتی بۆ وڵاتو ئۆتۆنۆمی بۆ نەتەوەیی دووەمیان دەکرد، لێرەوە دەردەکەوێت کە بەرنامەی کۆمەڵە لەژێر کاریگەریو دەوری بەرنامەی حیزبە شیوعیەکاندا دروستبووە. ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر پەیوەندی کۆمەڵە بە واقیعی ئەو کۆمەڵگایەوە کە تیایدا سەری هەڵداوە بە واتا ئایا کۆمەڵە بەرهەمی بە سروشتی لەدایکبووی واقیعی ئەو کۆمەڵگایە کە بەشێکە لە کۆمەڵگای کوردی. ئایا ئەگەر کۆمەڵە لەژێر کاریگەری تودەو کەلتوری ستالینیدا دروست نەبوویێت بۆچیو لە کوێوە چەمکی ئۆتۆنۆمی بووەتە خاڵی بنەڕەتی لە بەرنامەکەیدا !.

لەلایەکی ترەوە دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لەڕووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییەوە هەستی نەتەوایەتیو بەو پێیەش ناسیونالیزم دەبێ لەشاردا دەربکەوێتو سەرهەڵبدات، ئەمەش سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت ئەگەر کۆمەڵە رێکخراوێکی ناسیونالیستی بێت دەبێ بەرهەمی عەقڵی شارو

دروستبوونی چینی بۆرژوا بێت، بەلام وەك ئاشكرایە مهاباد لەو كاتەدا شارۆچكەیەكی بچووك بووەو لەڕووی پیشەسازیو بازرگانییەوەو بەو پێیەش لەڕووی دەركەوتنی بۆرژواوە لەدوای شارەكانی سنەو كرماشانو سلێمانیو كەركوكو ئامادەو هەولێر دێت. بۆچی دەبێ كۆمەڵە وەكو ڕێكخراوێكی ناسیونالیست لەوێ دروست ببێت ئەگەر بە كاریگەری دەرەوە دروست نەبووبێت.

بەرنامەی كۆمەڵە لە سەرەتادا سادەو نزیك لە قسەی ئاسایی خەڵك بوو، بەلام پێدەچێت دواتر بەتایبەتیش لەساڵی (١٩٤٥)دا گۆڕانكاری تێدا كرابێت، لەم بارەیەوە نەوشیروان مستەفا دەڵێت ئەو گۆڕانكارییانە لەو یاداشتەدا دەردەكەوێت كە داویانەتە نوێنەری حكومەتی ئێرانو وەزیری راوێژكاری دەوڵەت كە هاتبووە مهاباد كە تیایدا هاتبوو دان بنرێت بە زمانی كوردیداو ئەم زمانە بكرێتە زمانی رەسمی خوێندنو بەڕێوەبردنو باجو دەرامەتی كوردستان لە پرۆژە خزمەتگوزارییەكانی ناوچەكانی خۆیاندا خەرجبكرێت، كارمەندی دەزگاكانی كوردستان كوردبن[8] بێگومان ئەم خاڵانە لەڕووی بنەماكانی گوتاری كوردییەوە گرنگنو كار لەسەركردنیان نزیك بوونەوەیە لە كاركردن بۆ بنیادنانی بەرنامەیەكی ئایندەیی كە سیمای نەتەوایەتی هەیە، بەلام كاتێ ئەم خاڵانە دەبینین لەڕووی یادەوەرییەوە راستەوخۆ دەگەڕێینەوە بۆ ساڵی (١٩٠٨و ١٩٠٩)و هەمان ئەو یاداشتەمان دێتەوە یاد كە شێخ عەبدولسەلامی بارزانی داویەتی بە توركەكان بۆ بەدەستهێنانی جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی بۆ پێنج شاری كوردی.

هەروەك ئاشكرایە دەبێ حیزب بنەماو پایەی دروستبوونی هەبێتو بزانرێت لەسەرچی بنیاد دەنرێتو بەو پێیەش ئاسۆو رەهەندی كاردنو گوتارو ئاراستەی ئیشكردنیشی دەردەكەوێت. "كۆمەڵەی ژ ـ ك لەسەر چوار كۆڵەكەی ئیسلامەتی، كوردایەتی، مەدەنیەت، سوڵحو ئاشتیخوازی دانراوەو هەموو

قانوون و نیزامەکانی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام تەتبیق ئەکریو ئینجا ئەخرێتە کار [٩].

ئەگەر سەرنجی کۆڵەکانی یان پایەکانی کۆمەڵە بدەین زیاتر لەوەی کە وەکو ڕێکخراوێکی نەتەوەیی کوردی دەریکەوێت، وەکو ڕێکخراوێك ئیسلامی کوردی خۆی پێشکەش دەکات کە داوای بەشێك لە مافەکانی نەتەوەش دەکات و ئەوەندەی لە باسی ئەو پایانەدا کە لەسەری ڕاوەستاوە باسی ئایینی ئیسلام دەکرێت ئەوەندە مەسەلەی نەتەوایەتی ئامادەبوونی نییە، ئایا لە بنەڕەتدا دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بەو جۆرە پەیوەستبوون بە ئیسلامەوە کە بەو جۆرە بڕوانن ڕێکخراوەکەیان یان ئەوەیە کە پەیوەستبوونێکی بەو جۆرە بە ئیسلامەوە لە ئەنجامی تێگەیشتن لەو ڕاستیەدا بووە کە کۆمەڵگای کورد کۆمەڵگایەتی مسوڵمانەو ئایینی ئیسلام پەیامی ڕۆحی ئەم کۆمەڵگایەو ڕوویەری کۆنەستی کۆمەلایەتی کۆمەڵگای کوردی داگیرکردووەو ناشێت هیچ کارێکی جەماوەری بکرێت ئەگەر هێزی کۆنترۆڵکەری ئەو کۆنەستە نەجوڵێت. بە هەر حاڵ ئێمە بەڵگەی دیارمان لەبەردەستدا نییە هەتا بزانن ئامانج لەو جۆرە پەیوەستبوونە بە ئیسلامو بنەماکانی شەرێعەتی ئیسلامەوە لە بەرنامەی کۆمەڵەدا چی بووە. بەڵام دیارە ئەوە ئاشکرایە لە کەلتوری ئیسلامیدا جیاوازی ئیتنیكو ڕەنگو زمان بایەخێکی ئەوتۆیان نییە چونکە پەیوەستبوونو نزیکی لە خوداو پەیامەکەیو پێغەمبەرەکەیەوە شوێنی هەرکەسە دیاری دەکات بۆیە قسەکردن نەك لەو قۆناغەدا بەتەنیا بەڵکو لە ئێستاشدا لەبارەی پرۆژەی نەتەوایەتیو ئایینی کوردییەوە کارێك بووە لە دەرەوەی تێڕوانینو دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەند کە خۆی بە جێگرەوەی خەلافەتی ئیسلامی زانیووە ئەوەش کارێکی بێ بەرهەم بووە چونکە کورد لەبەر ئەوەی سەر بە سونەری شافیعییەو ئەم مەزهەبەش مەزهەبی دەسەڵاتو خەلافەت بووە بۆیە هیچ ناکۆکیو نەیارییەك لەلایەن کوردەوە بۆ ئەو ناوەندە نەبووە. خۆ ئەگەر لە ئێرانیشدا پشت بەستن بە بنەماکانی ئایین لە

دروستکردنی ڕێکخراوێکی کوردیدا لەبەر ئەوە بوو بێت کە ئاینی دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەند ڕاستە ئیسلامە بەڵام پەیڕەوکەری مەزهەبی شیعەیە، ئەوا بەو پێیە کێشەکە دەبێت کێشەی دوو مەزهەبی ئیسلام. مەزهەبێکی پەیوەستو کۆك لەگەڵ ناوەندی دەسەڵاتی خەلافەتدا کە مەبەست مەزهەبی سونەی شافیعییە کە کوردەکان پەیڕەوکەری ئەومەزهەبەن، هەروەها مەزهەبێکی ناکۆکو ناتەباو نەگونجاو لەگەڵ ناوەندی دەسەڵاتی خەلافەت کە ئەویش مەزهەبی شیعەیەو هەڵگرەکانی کە فارسن لە ئەنجامی تواناو لێهاتوویییان بۆ بەکارهێنانی ئەو مەزهەبەو بنەما دژەکانی بەرامبەر بە ناوەندی دەسەڵاتی خەلافەت توانیانە ناوەندێکی نوێ دەسەڵاتی ئاینی دنیایی دروست بکەنو لەبەرامبەر دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامیدا ئەمیش ئامادەبوونی هەبێت کە ئەویش دەوڵەتی فارسی شیعە مەزهەبە هەر لێرەشەوە لە ئاستێکی نەگوتراودا دانانی ئیسلام بە یەکێك لە پایەکانی دروستکردنی کۆمەڵە، لەبەر ئەوەی کوردەکان سونی شافعین کەواتە بنەماکانی ئەم مەزهەبە دەکەنە پایەی دروستکردنی ڕێکخراوەکەیان کە لەگەڵ مەزهەبی دەسەڵاتی ناوەندیدا کۆكو تەبانییەو ئەوەش وا دەکات زیاتر کێشەی مەزهەبیش بخاتە ڕوو. ئەمە جگە لەوەی کە لەسەر ئاستی ناوخۆی کۆمەڵە خۆیشی گوتارێکی ئاینی نەتەوەیی خێڵایەتی بەرهەم دێنێت، کە هاوشێوەی گوتاری شێخ مەحمودە، دەشێ پێی بگوترێت گوتارێکی خێڵایەتی ناوچەگەری ئاینی بارگاوی کراو بە هەندێ لە ڕەگەزو توخمەکانی کوردایەتی. ئەوەی مایەی سەرنجدانەو جێگای لەسەر ڕاوەستانە ئەوەیە کە "ئەندام دەبووایە سوێند بخوات بە قورئان کە خیانەت لە نەتەوەی کورد نەکاتو لەپێناوی سەربەخۆیی کورددا تێدەکۆشێو هیچ نهێنییەکی کۆمەڵە نەدرکێنێت"[10] لێرەوە دیسان دەردەکەوێت کە تاکە بنەمای باوەڕپێکراو ئاینی ئیسلام بووەو قورئان بۆ سوێندخواردنو دروستکردنی متمانە هۆکارو پێوانە بووە. کەواتە لێرەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە هەستی نەتەوایەتیو پەیوەستبوون بە کوردەوە هێشتا لەو ئاستەدا نەبووە کە

متمانەی بوونە ئەندام لە کۆمەڵدا دروست بکات، بە واتایەکی تر بۆ مەسەلەی کوردایەتی یان نەتەوایەتی‌و کارکردن لەپێناویدا نەکەوتۆتە پێش ئینتماو پەیوەستبوون بە ئیسلامەوە. بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونەی کە دایڤد ئالمسۆن لەساڵی ١٩٦٤دا دەیڵێت: ئەگەر لە کوردێك بپرسیت تۆ چیت دەڵێ من کورد ئەگەر لێی بپرسیت کوردیت یان مسوڵمانیت، دەڵێ کوردێکی مسوڵمانم.

ئێمە مەبەستمان لەم قسانە ئەوە نییە کە بڵێین نابێت یان ناشێت کورد پشت بە ئیسلام ببەستێت لە پرۆژەی زیندوکردنەوەی کەسێتی خۆیی‌و پرۆژەی ڕێنسانسی خۆیدا بەڵکو بەپێچەوانەوەو لە ڕاستیشدا یەکێك لە پایەکانی ڕێنسانسی کوردی‌و بەو پێیەش گوتاری کوردی ئایینی ئیسلامە. بەڵام لەو شێوازە دەربڕینەی کۆمەڵەدا ئیسلام وەکو یەکێك لە ڕەگەزەکانی بەرنامە گوتاری ئەو ڕێکخراوە باس نەکراوە، بەڵکو وەکو سەرەکیترین ڕەگەز دانراوە کە مەسەلەی نەتەوایەتی کورد دەکەوێتە دوای ئەوەوە، ئەمەش وا دەکات بڵێین گوتاری کۆمەڵە گوتارێکی ئایینی بارگاوی کراوە بە هەندێ لە ڕەگەزەکانی نەتەوایەتی.

لەکاتێکدا کە کۆمەڵە لە ڕوویەکەوە وەکو بنیانەری پرۆژەیەکی ئایینی لە ڕووی بەرنامەکەیەوە دەردەکەوێت، لە هەمان کاتدا لە لایەکی ترەوە زۆرێك لە خەڵك بە ڕێکخراوێکی مارکسی یان لایەنگرو دروستکراوی سۆڤیێتی دەیدەنە قەڵەم، ئەمەش بێگومان لە شێوەی کارو هەڵسوڕانی ئەندامانی کۆمەڵەدا هەستی پێدەکرێت‌و ئەو بایەخدانەش بە ئیسلام وەکو جۆرە فێڵێك بۆ فریودانی جەماوەر بەکار دێت. لەلایەکی تریشەوە باروداۆخی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی‌و پێکهاتەی خێڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەو مامەڵەکردنیشی لەگەڵ ئەو واقیعەداو شوێنی دیاری ناو ڕێکخراوەکە کە کەسانی سەرۆخێڵ‌و عەشیرەت‌و بنەما دیارو ناودارەکان پڕیان کردبووەوە، زیاتر سیمای خێڵایەتی بوونی ئەم ڕێکخراوەی دەردەخست، دەشێ پێکداچوونی ئەم ڕەگەزو ئاڕاستە

لەگەڵ یەك ناكۆكانەی نێو بەرنامەو گوتاری كۆمەڵە، هۆكاری بوونی جۆرێك لە تەموومژو ناناشكرایی بێت لە بەرنامەو گوتاری ئەم رێكخراوەدا.

بە مانایەكی تر دەمانەوێت بڵێین هۆكاری نەبوونی گوتارێكی دیاری خاوەن شوناس لەلای كۆمەڵە بەندە بەو واقیعە كۆمەڵایەتیو سیاسیو كەلتورییەوە كە ئەم رێكخراوەی تیادا دروستبووە كە واقیعێكی دواكەوتووی خێڵایەتی داخراوی نایینیەو لە هەمان كاتیشدا بەرهەمی دروستبوونی بۆشاییەكی سیاسیو ئیدارییە، ئەمە جگە لەوەی كە وەكو پێشتر گوتمان هۆكاری دەرەكیش لەوەدا رۆڵی دیاریان هەبووە بەتایبەتی كاریگەری كەلتوری ستالینیو حیزبی تودەی ئێرانیو لە هەمان كاتیشدا دەوری دیاری حیزبی هیوا كە پێشتر لە باشوری كوردستان دروستبووبوو، ئەم حیزبەش لەرێگای ناردنی (میرحاج)ەوە رۆڵێكی دیاری هەبووە لە دروستبوونی كۆمەڵەو شێوازی رێكخستنی كۆمەڵەدا، بەو پێیەش دەبێ لە بەرنامەو گوتاری ئەم رێكخراوەیەدا رۆڵی حیزبی هیواو (میرحاج)یش ئاشكرا بووبێت. هەموو ئەمانەش ئەوەمان بۆ دەردەخەن كە كۆمەڵە بەرهەمی پەرەسەندنی ناسیونالیزمی كوردی نەبووە بەو ئەندازەی كە نوخبەیەكی ناسیونالیستی هوشیار دایانمەزراندووەو بەرنامەو گوتاری ئەم رێكخراوەیان لە رەگەزی جۆراوجۆر باركردوە بە واتایەكی دی گوتاری كۆمەڵە بارگاوی كراوە بە رەگەزی جۆراو جۆر بەپێی واقیعی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگای كوردیو بەپێی كاریگەری هێزو ئاراستە جۆراوجۆرەكانی دەورووبەری كوردستان. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات كە هەر چۆن كۆمەڵە هۆكاری ناوخۆییو دەرەكی پێكەوە دەوریان لە دروستكردنیدا بینیووە، بە هەمان شێوە گوتارەكانی دەرەوەی واقیعی كۆمەڵگای كوردی دەوریان لەسەر گوتاری كۆمەڵە هەبووە.

بێگومان لەسەروەختی دروستبوونی كۆمەڵەدا لە ئازربایجانی رۆژئاوا بە كاریگەریو رینومایی سوپاسی سووری حیزبی شیوعی سۆڤێتی، حیزبی كۆمۆنیستی ئازربایجان پێكهاتبوو، نزیكی مهاباد ئەو رووبەرە تەسكەی كە

کۆمەڵەی تیا دروستبوو، بووە هۆی ئەوەی کە نوخبەی خوێندەواری مهاباد لەژێر کاریگەری یان چاولێکەریدا کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردیان دروست کردو کاریگەری ئەو حیزبەو گوتارەکەشیان لەسەر رێکخراوی کۆمەڵەو گوتاری کۆمەڵەش ئاشکرابووە، بەتایبەتی مەسەلەی ئۆتۆنۆمیو دروستکردنی دەسەلاتێکی لەو جۆرە لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئێراندا، لە بەرنامەو ستراتیژی حیزبی شیوعی سۆڤێتیو تودەو کۆمۆنیستی ئازربایجانەوە هاتۆتە نێو بەرنامەی کۆمەڵەوە. واتە گوتاری کۆمەڵە وێنەیەکی تری گوتاری حیزبی کۆمۆنیستی ئازربایجانەو حیزبی شیوعی سۆڤێتیو تودە بووە.

دیارە کۆمەڵە لە ماوەیەکی کورتدا پەرەی سەندو ژمارەیەکی باش لە نوخبەی مهابادو شنۆو بۆکانو ناوچە نزیکەکانی تر چوونە ریزی ئەم رێکخراوەوە، بەلام ئەم رێکخراوە نەیتوانی لە شارێکی دیاری وەکو سنە یان تەنانەت سەقزدا رێکخستنی خۆی دروست بکات، ئەمەش زیاتر خاسێتی ناوچەیی بەخشیووەتە کۆمەڵە، کە وەکو رێکخراوێکی ناوچەگەری داخراوی ئاسۆ تەسکی دەرەوەی ناسیونالیزم خۆی پێشکەش کردووە.

دیارە ئەوە ئاشکرایە لە قازی محەمەد لە قۆناغێکی دواتردا پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەوە، زیاتر لەوەی کە قازی خۆی چوویێتە پێشەوە بوو بێتە ئەندام، سەرانی کۆمەڵە هەستیان بەوە کردووە کە رازیکردنی پیاوێکی دیارو خاوەن پلەو پایەی کۆمەلایەتیو ئایینیو مێژوویی وەکو قازی محەمەد بۆ هاتنە ریزی کۆمەڵەوە بایەخێکی زۆری دەبێت بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامانی سەرەوەی، کۆمەڵە زیاتر پێیان وابوو کە قازی محەمەد پیاوێکی ئایینی خۆپارێزو کۆنەپارێزەو دەشێ هاتنی ئەو بۆ ناو کۆمەڵە ببێتە هۆی کوشتنی ئاراستەی دیموکراتیانەو کراوەی کۆمەڵە. بە واتا ئەندامانی کۆمەڵە دەترسان لەوەی کە رێکخراوەکەیان باوکی بۆ دروست ببێت، بەڵکو ئەوان زیاتر بڕوایان بەجۆرێك لە ئاراستەی ئاسۆیی پەیوەندی لەنێو پێکهاتەی رێکخراوەکەیاندا هەبوو، بە واتا زیاتر لەوەی کە ئاراستەی فەرمان هەرەمی بێت لە سەرەوە بۆ

خوارەوە، ئاراستە ئاسۆیی فەرمانو پەیوەندی هەبوو، دەترسان لەوەی کە قازی محەمەد لەسەر بنەمای بۆچوونو پلەو پایەی کۆمەلایەتی خۆی راستەوخۆ بچێتە لوتکەی دەسەلاتی رێکخراوەکەوەو بەوەش هەرەمی دەسەلاتو فەرمان دروست ببێتو بنەماکانی دیموکراسی لەنێو رێکخراوەکەدا لاواز ببێتو بەرەو نەمان بچێت، کاربەدەستانی سۆڤێت سەرنجیان دابوو کە بەبێ رابەرێکی روحانی، رێکخراوی کۆمەڵە توانای زامن کردنی پشتگیری سەرۆك هۆزەکانی نابێ، بۆ ئەم مەبەستە ئەندامانی کۆمەڵەیان راسپاردبوو کە قازی محەمەد بۆ نێو رێکخراوەکەیان بانگهێشت بکەن[11].

لێرەدا دوو خالی گرنگمان بۆ دەردەکەوێت کە یەکەمیان ئەوەیە لە کۆمەلگایەکی خێلایەتی دواکەوتووی وەکو کۆمەلگای کوردیدا دەبێ پشت بە شێخو ئاغاو بەگ ببەسترێت زیاتر لە رێکخراوی سیاسیو جەماوەری چونکە ئەو کەسێتە کۆمەلایەتیانە پلەو پایەی دیاری خۆیان هەیەو دەتوانن جەماوەر کۆبکەنەوە، دووەم کۆمەڵە بەبێ رەزامەندی خۆیان ناچاربوون راسپاردەکەی سۆڤێت بۆ داواکردن لە قازی تا بێتە ریزی کۆمەڵەوە پەسەند بکەن. ئەمەش رۆڵو نفوزی سۆڤێت لەسەر کۆمەڵە ئاشکرا دەکات بەو پێیەش بەرنامەو گوتاری کۆمەڵە کاریگەری بەرنامەو گوتاری سۆڤێتییەکانی پێوە دیار دەبێت. سۆڤێتییەکان لەگەل ئەوەشدا کە دەزانن قازی محەمەد پیاوێکی ئایینیە بەلام لەوە تێدەگەن کە لە واقعی کوردستاندا حیزبو رێکخراوو نوخبەی خوێندەوار یان ناسیونالیست ناتوانن رابەرایەتی بزوتنەوەیەکی جەماوەری بکەن بەو ئەندازەی کە دەشێ پیاوێکی ئایینی دیاری وەکو قازی محەمەد متمانەی ئەوەی هەبێت کە هەم جەماوەرو هەم سەرۆك عەشیرەتەکان هاوکاری بکەن. ئەمەش راستەوخۆ پێمان دەلێت کە لەو قۆناغەدا هەروەك ناسیونالیزمی کوردی لە ئاستی نەبووندا بووە بە هەمان شێوە کۆبوونەوەش لە دەوری رێکخراوێکی وەکو کۆمەڵە کە خۆی وەکو رێکخراوێکی نەتەوەیی خستۆتە روو، لە ئاستێکی لاوازدا بووە، هەر بەو پێیەش گوتاری ئەم رێکخراوە بەشێوەیەکی

بابەتی بارگاوی نەکراوە بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی نەتەوەییانەی ئەوتۆ کە شوناسی گوتاری نەتەوەیی یان ناسیونالیزمی پێببەخشێت.

دکتۆر عەزیزی شەمزینی کە زیاتر لەڕێگای سۆزو عاتیفەوە قسە دەکات باسی ئەوە دەکات کە قازی محەمەد چەند جارێك داوای کردووە لە کۆمەڵەدا وەریگیرێت بەلام داواکەی رەتکراوەتەوە، هەتا سەر ئەنجام "کۆمیتەی ناوەندی لەخۆیەوەو بەبێ پرس کردن بە سکرتێری کۆمەڵە قازی بە ئەندام وەرگرت[14] لە راستیدا ئەم قسەیە لەو روانگەیەوە کە قازی محەمەد هێندە پەرۆش بوویێت ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەدا رێگای تێناچێت، چونکە قازی لەڕووی پێگەی کۆمەلایەتیو مێژوویی بنەماڵەکەیو خوێندەوارییو زمانزانیو ئابوریشەوە هێندە دیارو بەدەسەلات بووە، پێناچێت هەروا بە ئاسانی چەمابێتەوە بۆ ئەوەی لە کۆمەڵەدا بکرێتە ئەندام، بەڵکو راستیەکەی ئەوەیە کە کۆمەڵە پێویستی بە قازی بووەو سۆڤێتیش لەوەدا کە قازی بچێتە لوتکەی کۆمەڵەو بزوتنەوەی کوردی لەو ساتەدا، دەوری هەبووە. ئەمە جگە لە توانای کەسێتی قازی خۆی بەلام قسەکان دکتۆر عەزیزی شەمزینی زیاتر لەو روانگەیەوەیە کە دەیەوێت پێگەیشتنو لە بارییونی کۆمەڵگای کوردی ئەو قۆناغە بەجۆرێك نیشان بدات کە تیایدا بزووتنەوەی ناسیونالیستی کوردی لە ئاستێکی پەرەسەندودا بووە، دیارە هیچ لێکدانەوەیەکی بابەتیو عەقڵانی لەسەر کۆمەڵگای کوردی نەك ئەو کاتە بەڵکو ئێستاش راستی ئەو بۆچوونانە ناسەلمێنێتو بەجۆرێك لە خەیاڵی تاکێکی ناسیونالیستی دادەنێت دکتۆر عەبدورەحمانی قاسملو دەڵێت: لە ١٦ی ئوتی ١٩٤٥دا لەشاری مەهاباد هەر لەسەر بناغەی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد حیزبی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، ئەو حیزبە زۆر بە خێرایی بوو بە حیزبی هەموو گەلو پشتیوانی بەشێکی زۆر لە جووتیارانو زەحمەتکێشانی شارو وردە بۆرژوازییو خاوەن ملکە نێودجییەکانو عەشیرەتە نیشتمانپەروەردەکانی بۆ لای خۆی راکێشا[14] ئارچی روزفلت دەڵێت: قازی محەمەد کەمێك دوای هاتنەوەی (لە سۆڤێت)

پیاوماقوولێو گەورەکانی کوردی کۆکردەوەو دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ڕاگەیاندو داوای لە بەشداران کرد ببنە ئەندامی[١٥]. کەواتە لێرەدا دەردەکەوێت کە ئەگەرچی قازی محەمەد لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورددا هیچ دەورێکی نەبووبێت، ئەوا پاشماوەیەکی کورت لە هاتنە ناو ئەم ڕێکخراوەیەوە، قازی محەمەد بووەتە کەسێتی یەکەمو دواتریش هەر خۆی لەبری ئەم ڕێکخراوە دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕادەگەیەنێت.

"قازی محەمەد دوای گەڕانەوەی لە سەفەری باکو، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ئەندامانی بەناوبانگی کۆمەڵەی ژ ـ ك پێکهێنا، لەو کۆبوونەوەیەدا مەسەلەی دوایی هێنان بە تێکۆشانی کۆمەڵەی هێنایە گۆڕێو پێشنیاری کرد لەجێگای ئەو ڕێکخراوە، لەسەر ئەساسی ڕێزلێنان لەئازادییە دیموکراتییەکانو دابین کردنی مافی چارەنووس بۆ گەلی کورد بناغەی حیزبێك بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان دابڕێژن[١٦].

دیسان ڕۆڵی قازی محەمەد لە دروستکردنی پارتی دیموکراتی کوردستاندا دەردەکەوێت، ئەوەشی جێگای سەرنجە قسەکردنی قازی محەمەد لەسەر ئازادییە دیموکراسیەکانو دابین کردنی مافی چارەنووسو بڕیاردان لەسەر ئەو مافە کە دیارە بایەخێکی گرنگی هەیە کە لەو مێژووە دواکەوتوو خێڵایەتیەی کوردستاندا مەسەلەی ئازادییە دیموکراتیەکان بووبێتە خاڵی سەرەکی لەبیرکردنەوەی قازی محەمەددا، کە پێشتر دکتۆر عەزیزی شەمزینی بە کۆنەپارێزو داخراو وەسفی کردووە بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات ئایا ئەو تێڕوانینە بەرهەمی بیرکردنەوەو لێکدانەوەی قازی محەمەد خۆی بووە یان ڕۆڵی سۆڤیێتو مەیلداری قازی بەلای سۆڤیێتدا ئەم ڕوانینەی لای دروستکردووە. بێگومان بە ڕوانینی من ڕۆڵی سۆڤیێتیو کەلتوری ستالینیو نزیکی لە ئازربایجانی ڕۆژئاواوە لەو هۆکارانەن کە ئەو تێڕوانینەیان لای قازی دروستکردووە ئەمەش دەبێتە بەڵگەیەك بۆ ئاشکراکردنی دەوری دەرەوەو لاوازی زەمینەی ناوخۆو هێزی فیکریو سیاسیو ڕۆشنبیری کورد لەناوەوە.

هەر بەو پێیەش گوتاری حیزبی دیموکرات لەڕووی رووکەشەوە گۆڕانی بەسەردا دێت بەڵام ئەو گۆڕانکارییە گەوهەرو ماهیەتی گوتارەکە ناگرێتەوە، هۆکەشی ئەوەیە کە ئەو گوتارە زیاتر وەکو گوتارێکی خواستراو لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵگای کوردی دەردەکەوێت نەك بەرهەمی پەرەسەندنو گەشەکردنی ناسیونالیزمی کوردی بێت بە واتایەکی دی دەتوانین بڵێین گوتاری کۆمەڵەو لەدوای ئەویش گوتاری حیزبی دیموکراتی کوردستان نەبوونەتە گوتاری ناسیونالیزمی کوردی خاوەن شوناس بەڵکو گوتارێکی ناوچەگەری بارگاوی کراوە بوون بە رەگەزەکانی نەتەوایەتیو تەنانەت ستالینیزمو لە هەمان کاتیشدا رەگەزی ئاینیش لەم گوتارەدا ئامادەبوونی هەبووە، هەر ئەمەش دەیسەلمێنێت کە ئەم گوتارە بەرهەمی پرۆژەیەکی نەتەوایەتی نەبووە چونکە ئەگەر بەرهەمی پرۆژەی نەتەوایەتی بوایە ئەوا گوتارێکی نەتەوەیی جەماوەری بارگاوی کراوە دەبوو بە تۆخمو رەگەزە نەتەوەییەکانو فیکری نەتەوەییو مەعریفەی نەتەوەییو جیهانبینی نەتەوەیی خاسیەتی دیاری گوتارەکە دەبوو، بەرنامەی لایەنی کەمیشی سەربەخۆیی کوردستانو یەکگرتنەوەییو دروستکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی دەبوو لەسەر هەموو جوگرافیای کوردستانو لەم حاڵەتەدا کوردبوونو پەیوەستبوون بە کوردو بە نیشتمانو بە کوردایەتییەوە دەکەوێتە پێش هەموو جۆرە ئینتیمایەکی ترەوە، چ ئینتیمای خێڵایەتی، چ ئینتیمای حیزبایەتی، چ ئینتیمای ناوچەگەری چ ئینتیمای ئاینیو مەزهەبی، بێگومان کاتێ ناسیونالیزم ببێتە ئایدیۆلۆژی جەماوەری هەموو ئەم ئینتیمایانە پاسیڤ دەکاتو ئینتیمای نەتەوەییو نیشتمانی جێگایان دەگرێتەوە. "حیزبی دیموکرات کە لەسەر بناغەی کۆمەڵەی ژیانەوە دامەزراو دەتوانین ئەوەش بڵێین کە لەڕووی گوتاری کوردییەوە جۆرێك لە پاشەکشێ کردو دەست بەرداری هەندێ لە دروشمو داواکانی کۆمەڵە بوو، ئەمەش دیارە هۆکاری راستەقینەی هەیەو پابەندە بە دەوری سۆڤێتو کەلتوری ستالینییەوە بۆ چەمکی دیموکراتی بۆ دەوڵەتی نەتەوەی سەردەست

و خودموختاری بۆ گەلانی بن دەست کە ئەوەش بووە جێگرەوەی مافی بڕیاردانی چارەنووس کە لە تێزی لینین دا زۆر بایەخی پێدراوە. لە بەندی یەکی دروشمەکانی حیزبی دیموکراتی هاتووە: نەتەوەی کورد لەنێوخۆی ئێراندا بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری مەحەللی خۆی سەربەخۆو ئازادبێ لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا خودموختاری خۆی وەدەست بێنێ[١٧].

لێرەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە یەکەم لە بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بەرنامەی سەربەخۆیی کوردستان بوونی نەبووە، نە کوردستانی گەورەو نە کوردستانی لکێندراو بە ئێرانەوە، واتە نە بەرنامەی نەتەوەیی گشتیو نە بەرنامەی نەتەوەیی هەرێمایەتی ئامادەبوونی نەبووە چونکە سەربەخۆیی کراوە بە خودموختاری لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە مەسەلەی خودموختاری لەسەردەمی شێخ عەبدولقادری شەمزینیەوە بەشێوەیەکی ئاشکراو راگەیەندراو هاتە نێو عەقڵی سیاسی کوردییەوەو جێگای مافی بڕیاردانی چارەنووسو دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەی گرتەوە، دەشێ وای لێکبدەینەوە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو بۆچوونە لای شێخ عەبدولقادرو دواتریش شێخ مەحمود هۆکاژی هاوئاییینیو بوویێت بەڵام لە بەرنامەی حیزبی دیموکراتدا کەلتوری ستالینی ئەو بۆچوونەی لە هەموو کوردستاندا چەسپاندووە کە هەتاکو ئێستاش رووبەرێکی فراوانی لە کونەستی جەماوەری خەڵکی کوردستان داگیرکردووە.

لێرەوە مەسەلەی ئاخاوتن لەسەر گوتاری خود موختاری لە سنووری دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەندا دێتە ئاراوە کە ئەوەش هەمان گوتاری شاری تەواوە بە چەمکی فارابی کە ئەوەش دیارە نە کەسێتی سیاسی ئەو شارەو نە کەسێتی ئابوریو کەلتوریو بڕیاردانی لە ئاستێکدا دەبێت کە هیچ شوناسێکی لە روانگەی ناسیونالیزمو گوتاری نەتەوەییەوە پێببەخشرێت. لێرەوە دەردەکەوێت کە بەرنامەی حیزبی دیموکرات زیاتر خەبات ئاراستە دەکات لەپێناوی دیموکراتیو بە دیموکراتی کردنی دەوڵەتدا چونکە پێی وایە هەتا

دەوڵەتێکی دیموکراتی لە ئێراندا دروست نەبێت نە کوردو نە هیچ هاوڵاتیەکی تریش نابنە خاوەنی سادەترین ماف، ئەم تێڕوانینەش هاوشێوەیە لەگەڵ بەستنەوەی مەسەلەی نەتەوایەتی بە شۆڕشی دیموکراتیەوە کە دەبێ چینی بۆرژوای نیشتمانیو پیشەسازی ئەنجامی بدەن، ئەمەش بێ هیچ پەردەیەك کاریگەری زۆر ئاشکرای ستالینیزمو چەمکی مارکسیەت لەسەر بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەردەخات. ئەمەش دیسان دەمانگێڕێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر دوانەی "ناوەوە/ دەرەوە" کە لە چەمکی سیاسەتدا بە دوانەی "خودی/ بابەتی" ناو دەبرێت، لەوەشدا دەردەکەوێت کە لە لاوازیو نائامادەبوونی ناوەوە یان رووبەری (خود)دا، دەرەوە بووەتە ئەو هێزە مەعنەویو فیکریو ئایدیۆلۆژییەی کە هەموو رووبەری ناوەوەی کۆنترۆڵ کردووە، لێرەشەوە بە ئاسانی گوتارێك لە دەرەوە دێتو دەبێتە جێگیرەوەی گوتاری ناوەوە.

بەرنامەی حیزبی دیموکرات یان بەیاننامەی دامەزراندنی هەشت خاڵی لە خۆی دەگرت، وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ خاڵی یەکەمی کرد، ئەوەی تیابوو کە خودموختاری جێگای سەربەخۆییو دەوڵەتی نەتەوەیی گرتبووەوە لە خاڵی دووەمدا هاتووە: دەبێ زمانی کوردی لە خوێندندا بەکاربهێنرێتو دەبێ زمانی رەسمی بێت لە کاروباری بەڕێوەبردندا[(١٨)]. کاتێ سەرنجی ناوەڕۆکی ئەم خاڵە بدەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە پرۆژەی کوردبوون لە کوردستاندا کە خاڵی بنەڕەتیو سەرەکییە ئامادەبوونی تەواوی نییە، چونکە ئەگەر پرۆژەیەکی لەو جۆرە بوونی هەبووایە، ئەوا باسی ئەوە نەدەکرا کە زمانی کوردی لە خوێندندا بەکار بهێنرێت یان بکرێتە زمانی رەسمی بەڕێوەبردن، دیارە ئەم خاڵەش کە لەپێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە یاداشتەکەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانیدا بۆ دەسەڵاتدارانی تورك جێگیر کراوە، لە بەرنامەی حیزبو رێکخراوەکانی دواتری کوردستاندا دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە کوردستان وەکو بەشێك لە

دەوڵەتی ناوەند سەیر دەکرێتو لەو دەوڵەتەشدا کە ئەو بەشەی کوردستانی پێوە لکێنراوەو زمانی یەکەم زمانی فارسییە، کاتێ باسی ئەوە دەکرێت کە زمانی کوردی لەو بەشەی کوردستاندا بکرێت بە زمانی خوێندنو زمانی رەسمی ئەو دەلالەتە بەرهەم دێت کە داوای حیزبی دیموکرات لەبری دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ، ئۆتۆنۆمیە، لەو سیستەمەشدا زمانی کوردی وەکو زمانێکی ناوچەی سەیر دەکرێت بۆیە داوا دەکرێت کە بەکار بهێنرێتو بکرێتە رەسمی، بەڵام لە پرۆژەی سەربەخۆییدا باسی زمانو کەلتورو رۆشنبیری نەتەوەیی ناکرێت لەو روانگەوە بکرێتە رەسمی، بەڵکو سەربەخۆیی شوناس دەبەخشێت بە هەموو رەگەزو توخمو بنەماو پایەکانی کورد وەکو نەتەوە کە مەبەست لەم قسەیەش ئەوەیە کە هەموو بوارە جۆراوجۆرەکان لەو پرۆژەدا دەبنە رەسمی، بە مانایەکی تر ئەگەر بەراوردی خاڵە گرنگەکانی بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان بکەین بە بەرنامەی هەر حیزب یان رێکخراوە یان بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی ئەوا بۆمان دەردەکەوێت بەرنامەی ئەم حیزبە لە خوار بەرنامەی ناسیونالیزمەوەیە چونکە ناسیونالیزم هەڵگری پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییە دیارە لەچوارچێوەی "دەوڵەتی نەتەوەییشدا رێنیسانسی کەلتوری نەتەوەیی دەبێتە پرۆژەیەکی گشتگرو هەمە لایەنو سەرجەم توخمەکانی ئەو کەلتورە دەبنە خاوەنی شوناسی خۆیان[19] کە مەبەست لەبەدەست هێنانی شوناسیش بەگوێرەی هەرکام لەو توخمانە ئەوەیە کە خۆی بکاتە ناستی کارپێکردنو جێگا بە توخمو رەگەزە کەلتورییەکانی ئەوانی داگیرکەران چۆڵ بکات کە زمانیش یەکێکە لە رەگەزەکانی کەلتور.

"شیکردنەوەی وردی مانیفێستی (بەیانی) سەرەکی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەری دەخات کە ئەم حیزبە بێ هیچ ئامرازێک رێکخراوێکی کۆمۆنیستی ئاراستەکراوە. پەیڕەوی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەمان پرۆگرامەکانی زۆر لە حیزبە سیاسییە ئێرانییەکانی ئەو سەردەمەیە کە

ڕووە گەوهەرییەکانی لیبراڵیزمە[٢٠] ئەم قسانەش زیاتر لە ئاراستەی دروستکردنی کوردستانێکی جیاوازو سەربەخۆ، یەکێتیی نیشتمانێك نیشان دەدات کە ئێرانەو گوتارێك بەرهەم دێنێت کە گوتاری ئێرانیە، دیارە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە کە گوتاری حیزبی دیموکراتی کوردستان گوتارێکی پان ئێرانییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە جگە لە هەندێ تایبەتمەندی پەیوەست بە کوردەوە وەکو مەسەلەی زمانی کوردیو خودموختاری خاڵەکانی تری بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەموو ئێران دەگرێتەوەو بەرنامەیەکە بۆ بە دیموکراتی کردنی ئێران کەواتە دەشێ بڵێین بەهەمان ئەو توخمانە بارگاوی کراوە کە گوتاری هەر حیزبو ڕێکخراوێکی تری لیبراڵی ئێرانی پێ بارگاوی کرابێت. ئێستاش پاش زیاتر لە شەست ساڵ بەسەر دامەزراندنی ئەم حیزبەدا هەمان گوتار هەروەکو خۆی ماوەتەوەو مەسەلەی دیموکراتی بۆ ئێرانو خود موختاری بۆ کوردستان دروشمی سەرەکییە. ئەمەش ئەو پرسیارە دروست دەکات ئایا لەماوەی شەست ساڵی ڕابردوودا ئەوەندە پەرەسەندن لە کوردستاندا ڕووی نەداوە، هەتا کاریگەری لەسەر بەرنامەو گوتاری حیزبی دیموکرات هەبێت، ئایا لەساڵێ چلەکانی سەدەی نۆزدەوە تاکو ئێستا ناسیونالیزمی کورد ئەوەندە گەشەی نەکردووە کە گۆڕانکاری لە عەقڵی سیاسیو جیهانبینی ئێمەدا دروست بکات؟ ئایا بەرنامەی حیزب هێندە پیرۆزەو شایەنی هیچ دەستکارییەك نییە؟ یان هەموو ئەم خاڵانە دەیسەلمێنن کە لە عەقڵی کۆمەڵگای کوردیدا کە کۆمەڵگایەکی داخراوی سەرەتاییە، حیزبیش هاوشێوەی دامەزراوی ئایینییە ناشێت هیچ گۆڕانکارییەك لە بەرنامەو پەیڕەوو پرۆگرامیدا بکرێتو لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو گۆڕانکاری سیاسیو ئابووریو کەلتوریدا ئەمیش گۆڕانکاری بەسەردابێت. بێگومان یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی نێو عەقڵو کەلتوری کوردی ئەوەیە کە جێگۆڕکێ بە ئامرازو ئامانج دەکات. لە هەر بەشێکی ئەم جیهانەدا سەیر بکەیت دەبینیت دامەزراوەی حیزب ئامرازە بۆ گەیشتن بە ئامانجو مەبەستێکی دیاریکراو،

کەچی لێرە حیزب کە ئامرازی ئەو گەیشتنەیە خۆی دەبێتە ئامانجو لەو ئاقارەشدا دەبێتە جێگرەوەی کۆمەڵو هەموو شتێ لە سنووی بوونی دامەزراوەکەی خۆیداو لەپێناوی ئەو دامەزراوەیەو بەرژەوەندییە گشتیو تایبەتییەکانیدا دەبینێتو جێبەجێ دەکاتو لەوەشدا وەکو دامەزراوەیەکی نامۆو غەریب بە کۆمەڵگا دەردەکەوێت. هەر ئەوەش وا دەکات کە حیزبی کوردی هەمیشە لە قاڵبێکی جێگیردا بمێنێتەوەو توانای گۆڕانکاری لەنێو دامەزراوەکەیدا نەبێتو شێوەی دامەزراوەیەکی ئایینی خێڵایەتی وەربگرێت کە بەجۆرێك لە پیرۆزییەوە سەیری خۆی بکاتو نەشتوانێت لەگەڵ قۆناغەکەدا بژی.

دامەزراندنی کۆماری مهاباد بەشێوەیەکی رەسمی لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا راگەیەندرا، لە کۆبوونەوەیەکدا کە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانو ژمارەیەك لە سەرۆك خێڵو مەلا مستەفای بارزانیو لەگەڵ سێ ئەفسەری سوپای سووری سۆڤێتیدا، ئامادەی بوون لەم کۆبوونەوەیەدا قازی محەمەد بە سەرۆکی کۆمارە نوێیەکە هەڵبژێردراو کابینەی نوێ پێکهێنرا کە ئەو کابینەیەش بەشێوەیەکی سەرەتایی لە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە مهاباد پێکهات[٢١]. لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ قازی محەمەد دامەزراندنی کۆماری راگەیاند کە ناوچەیەکی بچووك بوو ئەویش شارەکانی مهابادو بۆکانو نەغەدە شنۆی دەگرتەوە[٢٢].

بێگومان دەبێ لە چەند لایەنێکەوە سەرنجی دامەزراندنی کۆماری مهاباد بدەینو لەوێشڕا بەدوای گوتاری کۆماردا بگەڕێین تا بزانین ئایا کۆماری مهاباد گوتارێکی جیاوازی هەبووە لە گوتاری حیزبی دیموکرات یان هەر هەمان گوتاری حیزب؟ گوتاری کۆماریش بووە؟

سەرەتا جێگای گرنگی پێدانە کە لەکاتێکدا لە ئێرانو عێراقو زۆر وڵاتانی دەورروبەری کوردستان رژێمی فەرمانڕەوایەتی رژێکی پاشایەتی بووە، بەڵام قازی محەمەدو حیزبی دیموکراتی کوردستان کۆمار لە کوردستان دروست

دەکەن واتە لەڕووی ناوەوە ڕژێمێکی هاوچەرخ دروست دەکەن. هەرچەندە جێگای خۆیەتی کە باسی ئەوەش بکەین دروستکردنی ڕژێمی کۆماری چ لە ئازربایجان‌و چ لە مهاباد دەوری ئاشکرای سۆڤێتی تێدا بووە. بەتایبەتی کاتێ ناوی ئەو حیزبەی لە کوردستان دروست بوو وشەی دیموکراتی لەگەڵدا بوو هەر بەو پێیە ناشێت حیزبێك خۆی بە دیموکرات ناو ببات‌و ڕژێمی فەرمانڕەوایی پاشایەتی بنیاد بنێت، هەر لێرەشەوە دەتوانین بڵێین گوتاری کۆمار کاریگەری گوتاری کەمپی ڕۆژهەڵاتی یان باشتر بڵێین ستالنیزمی پێوە دیار بووە، بەڵام ئێمە لەبەردەم پرسیارێکی تردایین ئەویش ئەوەیە لەکاتێکدا لە خاڵی یەکەمی بەرنامەی حیزبی دیموکراتدا خودموختاری بۆ کوردستان لەچوارچێوەی ئێراندا هاتوە کەواتە ناوی کۆمارو سەرۆك کۆمار لەڕووی یاساییەوە تا چ رادەیەك گونجاوە؟ لەلایەکی ترەوە دەشێ بپرسین ئایا لەڕووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی‌و دەرکەوتنی ناسیونالیزمی کوردییەوە کۆمەڵگای کوردی لە ئاستی بەرهەمهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیدا بووە لەو کاتەدا؟ ئایا خودی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە پشتی دروستکردنی کۆماری مهابادەوە بووە حیزبێکی ناسیونالیست بووە بەجۆرێك کە هەڵگری پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بوو بێت؟ بێگومان ئێمە ناتوانین لە کۆمەڵگایەکی خێڵایەتی دواکەوتووی داخراوی داگیرکراوی کشتوکاڵی‌و ئاژەڵداریدا تەسەوری بوونی ناسیونالیزمێك بکەین کە پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی هەبێت، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش ناتوانین تەسەوری بوونی گوتارێکی ئەوتۆ بکەین کە بارگاوی کرابێت بە فیکرو مەعریفەو جیهانبینی نەتەوەیی، بەڵکو بەپێچەوانەوە گوتاری بالادەستو ئامادەی کۆماری مهاباد گوتارێکی ناوچەیی بارگاوی کراوە بە رەگەزەکانی پان ئێرانیزم و نەتەوایەتی کوردی پێکەوە، دیارە هۆکاری ئەو پێکەوە کۆکردنەوەیەش بریتی بووە لە کاریگەری گوتاری ستالینیزم. ئەگەر گوتاری نەتەوەیی کوردی خاوەن شوناس خۆی لەسەربەخۆیی‌و دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی یەکگرتووی کوردیدا ببینێتەوە لەسەر هەموو

جوگرافیای کوردستان، ئەوا دروستکردنی دەوڵەت لە ڕووبەرێکی زۆر تەسکی نیشتمانداو بڕوا بوون بەوەش کە ئەو دەوڵەتە لەبەرزترین لوتکەی پەرەسەندنیدا دەشێ تەنیا جوگرافیای ئەو بەشەی کوردستان بگرێتەوە کە لکێندراوە بە ئێرانەوە، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم دەوڵەتە هەڵگری گوتارێکی ناوچەیی ڕەهەند تەسکە کە سنووری دەسەڵاتو قەڵەمڕەوی تەنانەت لە دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵان تەسکتر بووە، ئەمەش سەرنجمان بەلای ئەو بۆچوونەدا ڕادەکێشێت کە نەك هەر کۆماری مهاباد بەڵکو حوکمدارییەکەی شێخ مەحمودیش تەنیا لەڕووی ناونانەوە جیاوازبوون ئەگینا لەڕووی ڕووبەری جوگرافیو دەسەڵاتی ئیداریو پێکهاتەی دامەزراوەکانیشەوە هاوشێوەی دەسەڵاتی میرنشینەکان بوون، لەکاتێکدا دەسەڵاتو دامەزراوی میرنشینیش شێوەیەکی تا ئەندازەیەك پەرەسەندوی دامەزراوەو دەسەڵاتی خێڵ بوون، سەرکەوتنی قازی محەمەد لە کۆمەڵەداو پاشانیش دروستکردنی حیزبی دیموکراتو دوای ئەوەش بوونی بەسەرکۆماری کۆمارەنوێیەکە. سەرباری تواناو لێهاتوویی قازی محەمەد خۆی دەبێ بزانین ناوو ناوبانگی بنەماڵەکەیو ئامادەبوونیان لە مهاباددا دەوری دیاری هەبووە لەوەدا کە قازی ببێتە کەسی یەکەم کە گەڕانەوە بۆ هۆکاری ڕەگو ریشەو پایەی خێزانو بنەماڵەو ئاینو تەریقەت لەخۆیدا وابەستەبوون بە کەلتورو عەقڵو بنەمای خێڵایەتی نیشان دەدات کە ئەمەش نەك بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی بیست بەڵکو لە ئێستایشدا شتێکی ئامادەو ڕەت نەکراوەیە کە ئەوەندەی فاکتەری خوێنو دەمار هۆکاری کۆمەڵایەتی بوونن لە کۆمەڵگای کوردیدا، ئەوەندە پێداویستی ژیانی ڕۆژانە یان پەرەسەندنی ناسیونالیزمو دروستکردنی ئینتیمای هاوبەش لەنێوان هەموو ئەندامانی نەتەوەدا کە ئینتیمایە بۆ نەتەوەو نیشتمان بوونی نییە. دیارە چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت لە واقیعێکی لەم جۆرەدا گوتاری نەتەوەیی خاوەن شوناس بەرهەم بێت.

دوای دروستبوونی کۆماری مەهابادو سوێندخواردنی قـازی محەمـەدو دانـانی وەزیرەکانو بەدەستگرتنی کاروباری بەڕێوەبردن، دیـارە هەنـدێ کـاری گرنگ ئەنجامـدراوە بەتایبـەتی ئـەوەی لـەڕووی ڕەگـەزەکانی گوتـاری کوردییـەوە بایەخدارە گەڕانەوە بوو بۆ خوێندن بە زمانی کوردی. دکتـۆر عەبـدولڕەحمانی قاسملۆ دەڵێت: زمانی کوردی بۆ یەکەمجار بوو بە زمانێکی ڕەسمیو منـداڵانی کـورد بـە زمـانی زگمـاکی خۆیـان قوتابخانـەیان بـۆ کرایـەوەو کتێـبو گۆڤـارو ڕۆژنامەی کوردی بە چەشنێکی بێ وێنە بڵاوکرانەوە[٣٢] دیـارە ئێمـە تەسـەوری ئەوە ناکەین لەماوەی کەمتر لەساڵێکدا بواری خوێندنو بڵاوکردنـەوەی کـوردی بەو جۆرە پەرەی سەندبێت بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە گەڕانەوە بـۆ زمـانی دایكو هەوڵـدانی بڵاوکردنـەوە بـەو زمانـە خـاڵێکی گرنگـە لـە پـرۆژەی گەڕانـەوە بـۆ نێـو کـەلتوری نەتەوایـەتیو هەوڵـدان بـۆ زیندوکردنـەوەی ئـەو کەلتورەو ڕێگا خۆش کردن بۆ ڕێنسانسی کەلتوری کە گومانی تێدا نییـە بـەبێ ڕێنسانسی کەلتوری ناشێت لە هیچ بوارێکی تری ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا پـرۆژەی گۆڕانکـاری گـرنگ دابنرێـت، هـەروەك ناشـێت لـە غیـابی پـرۆژەی ڕێنیسانـسی کەلتوریدا باسی گەڕانەوە بۆ نێو جەستـەی فـەرامۆش کراوی نەتـەوە بکرێـت. دیارە ئەوەش شـتێکی بەڵگـە نەویسـتە کـە شکستی سـەرجەم بزوتنـەوەکانی کورد لە مێژووی دوای هەرەسی میرنشینەکانەوە تاکو ئێستا لە پلـەی یەکەمـدا بەندە بە غیابی پـرۆژەی ڕێنسانـسی کەلتورییـەوە چـونکە هەسـتو هوشـیاری نەتەوەییو فۆرمەلە بوونی عەقڵی سیاسی لە پرۆژەی ڕێنیسانسی کەلتورییەوە بەرجەستە دەبن دیارە شکستی بزوتنەوەکانی ئێمە لەژێر هۆکاری دیار نەبوون یان لاوازی هەستو هوشیاری نەتەوەییو عەقڵی سیاسی نەتەوەییدا بـووە کـە هــەموو ئەمانــەش بەنــدن بــە پــرۆژەی ناســیونالیزمەوە. هەڵبــەت ناتوانرێــت چــاوەڕوانی بــوونی ناســیونالیزمی کــوردی بکرێــت لــە دەرەوەی پــرۆژەی ڕێنیسانسی کوردی.

زمانی کوردی هەروەك پایەی سەرەکی گوتاری کوردییە لە هەمان کاتدا یەکێکە لە پایە سەرەکییەکانی کەلتوری کوردی، هەر بەو پێیە کاتێ راستەوخۆ لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکی تەمەنی کۆماری مهابادا بەرنامەی خوێندن بە کوردیو بە رەسمی کردنی زمانی کوردی دەکەوێتە بواری کارکردنەوە، مانای وایە زەمینە سازی لە ئارادایەو دەکرێت بۆ گەڕانەوەو پەیوەستکردنەوەی منداڵی کورد بە زمانی زکماکی خۆیەوە کە ئەوەش لەسەر پانتایی کۆنەست جۆرە ئینتیمایەکی بەهێز بۆ ئەو زمانە دروست دەکات کە ئەویش دەبێتە ئینتیما بۆ رەگەزو نەتەوەو نیشتمان چونکە کاتێ منداڵ بە زمانی دایکی دەخوێنێت لە بوونی ئەنتۆلۆژی خۆی پەرت ناکرێتو بە ئاشکرا هەست بەو بوونە دەکات ئەوەش دەبێتە سەرەتایەکی باش بۆ بنیادنانی کەسێتییەکی خاوەن شوناس کە ئەمەش خاڵی یەکەمە کە لێیەوە زەمینە بۆ بنیادنانەوەی کەسێتی لە مێژینە تێکشکاوی کوردی خۆش دەکرێت، هیچ گومانیشی تێدا نییە هەتا کەسێتی کوردی بنیاد نەنرێتەوەو ئەو کەسێتە لە حاڵەتی هەست بە کەمی کردن رزگاری نەبێت ناشێت بتوانێت هیچ گۆڕانکارییەك دروست بکات بە ئاراستەی بەدەست هێنانی شوناسو ئامادەبوون وەکو بکەرێکی رووداو دروستکەر لەسەر زەمینەی واقیع، تەنیا کاتێك ئەو کەسێتیەش دەبێتە بکەری سەر واقیعی خۆی کە بتوانێت رووداو دروست بکات، حیزبی دیموکراتی کوردستانو قازی محەمەد هەوڵی دروستکردنی رووداویان دا، رووداوێك کە دابڕان لەگەڵ رابردوودا دروست بکات، بەڵام سەرباری بوونی ئەو بکەرە لەبەر ئەوەی زەمینەی کۆمەلایەتیو سیاسیو کەلتوری ئامادەبوونی نەبوو، سەرئەنجام بکەرەکە تێکشکا، هۆی سەرەکیش دەگەڕێتەوە بۆ غیابی پرۆژەی رێنسانسی کەلتوریو نەبوونی ناسیونالیزمی کوردی، کە زیندوکردنەوەی زمانی کوردی یەکێکە لە رەگەزەکانی ئەو کەلتوورەی کە باسی دەکەین، بۆیە لەم رووەوە پرۆژەی خوێندن بە کوردیو بەرەسمی کردنی زمانی کوردی بایەخێکی گرنگی هەیەو وەکو یەکێك لەو

رەگەزانەش سەیر دەکرێت کە شوناسی گوتاری نەتەوەییان لەسەر بنیاد دەنرێت.

بە هەر حاڵ دەسەڵاتداریتی کۆماری مهاباد ماوەیەکی زۆری نەخایاند، ئەویش ئاشکرایە لەبەر ئەوەی کە چ کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردو چ حیزبی دیموکراتی کوردستانو چ کۆماری مهابادیش بە پلەی یەکەم لە ئەنجامی ئەو بۆشاییە سیاسیو ئیدارییەدا دروستبوون کە ناوچەی مهابادو دەوروبەری گرتەوە لە ئەنجامی جەنگی جیهانی دووەمدا، هەرچۆن دروستبوونی هەمان بۆشایی هۆکار بوو بۆ دروستبوونی حوکمدارییەکی شێخ مەحمود لە سلێمانیو دەوروبەریدا لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیو دروستبوونی هەمان بۆشایی ئیداریش هۆکار بوو بۆ دروستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەدوای شکستی عێراق لە جەنگی دووەمی کەنداودا. مەبەستمان لەم قسەیەش ئەوەیە کە دروستکردنی دامەزراوەی بەڕێوەبردن لە هەرسێ قۆناغەکەدا لە کوردستان لە ئەنجامی بە بکەربوونی کەسێتی کوردی خۆیدا نەبووە بەو ئەندازەی کە بەرهەمی ئەمری واقیع بوون. ئەمەش لەلایەك نەبوونی ناسیونالیزمی کوردیو لاوازی نوخبەی ناسیونالیستی کوردی دەردەخات کە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی بزوتنەوەیەکی جەماوەری خاوەن پرۆژە بێتو لەڕێگای هێزی جەماوەریو هێزی مەعنەوی پرۆژەکەیەوە دامەزراوەی خۆی دروست بکات کە ئەویش دەبێ دامەزراوی دەوڵەت بێت ئەگەر بڕوامان وابێت کە بزوتنەوەکانی کورد بزوتنەوەی ناسیونالیستی بوون. بەڵام دیارە بڕیار لەسەر شوناسی بزوتنەوەیەك لەسەر بنەمای گوتە نادرێت، بەڵکو بەرنامەی پیادەکراوو پرۆژەی جێبەجێ کراو ئەو بنەمایانەن کە دەکرێن بە پێوانە بۆ قسەکردن لەسەر شوناس کە لەم روانگەیەوە ناتوانین شوناسی بزوتنەوەی ناسیونالیستی بە بزوتنەوەکانی کورد ببەخشین، چونکە لەڕووی راستیەوە ئەم بزوتنەوانە خۆیان خاوەنی ئەو شوناسە نین هەر بەو پێیەش هەڵگری گوتاری نەتەوەیی نین بەڵکو هەڵگری گوتارێکی ناوچەیی داخراوی بارگاوی کراون بە رەگەزەکانی

خێڵایەتیو ئایینیو مارکسیزمو نەتەوایەتیش، دیارە ئەم کۆکردنەوانەش لەسەر بنەمای بڕوابوون بە پێکەوە ژیانی دژەکان نەهاتۆتە دی، بەڵکو لە ئەنجامی نەتوانینی هەریەکە لەو ئاستانە بۆ بەدەست هێنانی شوناسی تەواوەتی خۆی دروستبووە، واتە ئەم گوتارە کە هیچ شوناسێکی سەربەخۆی نییە بەرهەمی لاوازی بکەری کوردییە کە بکەرێکی ناکاراو لاوازو بێ پرۆژەو بێ بەرنامەیە.

بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە سۆڤێت تا ئەندازەیەکی ئاشکرا هەرچۆن لە پشتی دامەزراندنی کۆماری ئازربایجانەوە بوو بە هەمان شێوە لە پشتی دامەزراندنی کۆماری مهابادیشەوە بوو، تەنانەت سەرباری ناکۆکی کوردو ئازەرییەکان لەسەر کۆمەڵێك مەسەلەی پەیوەست بە بەرژەوەندی جیاوازیانو کێشە تێکەڵاوی لە جوگرافیاو بەرژەوەندیدا، بەڵام لە رووکەشدا بە کاریگەری سۆڤێت وەکو دۆستو هاوکاری یەکتر خۆیان دەردەخست هەرچەندە مەسەلەی پشتگیری کردنی سۆڤێت لە کۆماری مهاباد گرنگو پڕ بایەخ بوو، بەڵام لە دوو رووەوە زیانی گەورەی جەماوەری لەم کۆمارەدا بوو، یەکەمیان بەگشتی خێڵو عەشیرەتەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان کۆماری مهابادیان بە دروستکراوی سۆڤێتی دەزانیو دەترسان ئەم کۆمارە یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵ بەکاریگەری سۆڤێت جێبەجێ بکاتو ئەوەش ببێتە هۆی دابەشکردنی زەویو زارەکانیانو بەوەش زیانی گەورەیان لێ بکەوێت، بۆیە بە گومانەوە سەیری کۆماریان دەکردو نەدەبوونە پاڵپشتو یاریدەدەری، هەروەك کوردەکان بەگشتی کە مسوڵمان بوون بە گومانەوە سەیری دەسەڵاتی کۆماریان دەکرد کە پێیان وابوو دروستکراوی سۆڤێتیو دژی ئایینی ئیسلامە. ئەم دوو هۆکارەو هۆکاری ئابووریش کە مهابادو ناوچەکانی دەورووبەری لە تارانو شارە گەورەکانی ئێران دابڕی بوو وایکردبوو کە بەرهەمی کشتوکاڵی کوردستان بەتایبەتی توتن نەگاتە تارانو شارەکانی تری ئێرانو بەوەش جوتیارو خاوەن موڵکەکان زیانێکی مادی گەورەیان لێدەکەوت.

بە هەر حاڵ سۆڤێتیش وەکو سەرجەم وڵاتانی تری دنیا لەپێناوی سیاسەت‌و بەرژەوەندی خۆیدا کار دەکات دەبوو‌ا بەرژەوەندی خۆی لەپێش هەموو شتێکەوە دابنایە بۆیە سەرگەرمی گەمەیەکی لێزانانە بوو، لەم لا یارمەتی دامەزراندنی دوو کۆماری دابوو لە کوردستان‌و ئازربایجان، لەولاش هەوڵیدەدا پەیوەندی خۆی لەگەڵ حکومەتی ئەحمەد قەوامی سەرۆك وەزیری ئەوکاتەدا بەهێز بکات‌و دەشێ وای بۆ بچین کە لە بنەڕەتدا یارمەتی سۆڤێت بۆ دروستکردنی هەردوو کۆماری مهاباد‌و ئازربایجان بەمەبەستی فشار دروستکردن بووبێت لەسەر ئێران بۆ ئەوەی بەرژەوەندی‌و ئیمتیازاتی زۆری لێ دەست بکەوێت. راستیەکەشی هەروا دەرچوو کاتێ پەیوەندی لەگەڵ تاران باش بوو پشتی لە هەردوو کۆمارە دەستکردەکەی خۆی کرد، هەرچەندە حکومەتی ئەحمە قەوامی لە سەرەتادا لەگەڵ حکومەتی ئازربایجان رێکەوتنێکی کردو لەو رێکەوتنەدا دانی بە بوونی ئەو حکومەتەدا نا لەچوارچێوەی ئێراندا، بەڵام ئامادە نەبوو دان بە کۆماری مهاباددا بنێت چونکە مهابادی وەکو بەشێك لە ئازربایجان سەیر دەکرد. بە هەر حاڵ لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی سوپای سووردا حکومەتی ئێرانی لە بەڵێنەکانی بەرامبەر بە حکومەتی ئازربایجان پاشگەز بووەوە. هەڵوێستی پاشەکشەی سۆڤێت لە رێکەوتنی نیسانی ١٩٤٦ رێگای بۆ حکومەتی ئێران خۆشکرد کە بکەوێتە جوڵە چونکە لەو رێکەوتنەدا: سۆڤێت بەڵێنی کشانەوەی هێزەکانی خۆیی لە ئێران دا، هەروەها بەڵێنی ئەوەشی دا کە مامەڵەی کێشەو گۆڕانکارییە خێراکەی ئازربایجان وەکو مەسەلەیەکی تەواو ناوخۆی ئێران بکات. رێکەوتن نامەکە لەلایەکی ترەوە داوای دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی هاوبەشی ئێران‌و سۆڤێتی دەکرد[٢٤].

بە هەرحاڵ لەدوای پاشەکشێ کردنی هێزەکانی سوپای سوور رێگا لەبەردەم حکومەتی قەوام سەڵتەنەدا کرایەوە بۆ ئەوەی هەوڵی سەپاندنەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەند بدات بەسەر هەموو ناوچەکانی ئێراندا بەتایبەتی ئەو دوو

ناوچەیەی کە هەردوو کۆماری ئازربایجانو مهابادی تیا دامەزرابوو. کوردو ئازەر هەوڵی زۆریان دا لەگەڵ حکومەتی ناوەنددا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بە ئاشتی بەڵام حکومەتی ناوەند سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو ناوچانە بخاتە ژێر دەستی خۆی. سەرەتا حکومەت ئەوەی راگەیاند کە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران دەکرێت لە ئێرانداو قەوام سەڵتەنە کەوتە دواندن لەبارەی هەڵبژاردنەوەو لەو بارەوە "بڵاوکراوەیەکی رەسمیی دەربارەی مسۆگەرکردنی ئازادی هەڵبژاردن دەرکرد، لەو بڵاوکراوەیەدا روونی کردەوە کە سوپاو پۆلیس بۆ هەموو مەڵبەندەکانی هەڵبژاردن بە کوردستانو ئازربایجانیشەوە دەنێرێ"(٢٥)
دیارە حکومەتی ناوەند ئامادەی هیچ رێکەوتنێکی ئەوتۆ نەبوو لەگەڵ هەردوو کۆمارەکەدا، تەنیا ئەو رێکەوتنە نەبێت کە پێشتر لەگەڵ نوێنەری کۆماری ئازربایجاندا کردبووی، بەڵام ئەویشی پشت گوێ خست. بەڵکو حکومەتی ناوەند خەریکی خۆئامادەکردن بوو بۆ هێرش کردنە سەر هەردوو کۆمارەکە، پێش هێرشی راستەوخۆ، هێزەکانی ئێران بەبێ تەقە شاری زنجانیان کۆنترۆڵ کردو ئەوەش هاندەر بوو بۆ پێشڕەوی کردن "سوپای سێی ئێران لەشاری زنجانو سوپای چوار لەشاری سنە بەشێوەیەکی ئاشکرا بەهێزکران"(٢٦) ئەمەش خۆئامادەکردن بوو بۆ هێرش کردن، دیارە هەریەکە لەو دوو کۆمارەش هێزی خۆیان هەبوو، بەڵام هێزێکی رێکنەخراو لەڕووی تاکتیکو هونەری شەڕەوە، بەڵکو زیاتر هێزی خێڵو عەشیرەتەکان بوون، بەتایبەتی هێزەکەی کۆماری مهاباد، رەنگە درۆ نەبێت ئەگەر بگوترێت ئەو هێزەی کە کۆمار پشتی پێبەستوو زیاتر هێزی خێڵەکان بوو، لەبەر ئەوەی سەرخێڵەکانی کوردستانیش وەکو پێشتر باسمان کرد بڕوایان بە حیزبی دیموکرات نەبوو، بە دروستکراوی سۆڤێتو بە مەترسیان دەزانی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیان، بۆیە نەدەشیا هەر وا بە ئاسانی بەرگری لە کۆمار بکەن، رەنگە هێزی هەرە دڵسۆزی کۆمار ئەو هێزەی بارزانی بووبێت کە دواتریش ئامادە نەبوو خۆی بداتە دەستەوە "شاهەنشا وەکو شاو وەکو سەرۆکی گشتی سوپا فەرمانو رێنوماییدا بە

هێزەکانی ئێران بۆ لەناوبردنی هەردوو کوماری ئۆتۆنۆمی ئازەربایجان‌و کوردستان[٢٧] هەر لەو سەروبەندەداو بەتەواوی "لە مانگی دیسەمبەردا وەفدێکی حکومەتی کوردی سەردانی رەزایەی کرد بۆ گفتوگۆکردنی ئەو بارودۆخە لەگەڵ هاشیموفی باڵوێزی سۆڤێتیدا لەوێ، وەفدەکە لەوێ دڵنیاکران کە مەبەستی حکومەتی ئێران لەناردنی هێز بۆ ئازربایجان‌و کوردستان بۆ رێکخستنی کاروباری هەڵبژاردنە کە حکومەتی ئێرانی نیازی ئەوەی هەیەو چالاکی سەربازی ئێرانی لەچوارچێوەی ئەو مەبەستەدا ئەنجام دەدرێت[٢٨].

بە هەر حاڵ لە ماوەیەکی کورتدا هێزەکانی دەوڵەتی ئێرانی توانیان کوماری ئازربایجان لەنێو ببەن‌و پیشەوەری‌و زۆریەی وەزیرو کاربەدەستانی دیاری حکومەتەکەی بەرەو سۆڤێت رایانکرد. دیارە دوای روخاندنی کوماری ئازربایجان سەرەی هێرشکردن بوو بۆ سەر کوماری مهاباد. بورهان یاسین دەڵێت: لەگەڵ کەوتنی تەورێزدا ژمارەیەکی دیار لە ئەندامانی حیزبی دیموکراتو کاربەدەستانی ئیدارەی کوردی لەناویاندا هەرسێ قازی (واتە قازی محەمەدو سەدری قازی‌و سەیفی قازی) و حاجی بابە شێخ خۆیان دایە دەستەوە بۆ سوپای ئێرانی، لەکاتێکدا خەڵکانی تر خۆیان ئامادەکرد تا مهاباد بەجێبهێڵن، هێزەکانی حکومەتی مەرکەزی لە رۆژی (١٧)ی دیسەمبەرد هاتنە ناو شاری مهابادەوە[٢٩]، واتە چوار رۆژ دوای چوونە ناو تەورێزەوە توانیان کوماری مهابادیش لەناو ببەن. لێرەدا دەشێ بپرسین ئایا ئاستی بەرگری هەریەکە لەم دوو کوماره چەندێ بوو، لە چ ئاستێکدا بوو؟ ئایا توانای هێزەکانی حکومەتی ناوەند بەجۆرێك بوو کە هێزی هەردوو کومارەکە نەتوانن بەرگری بکەن؟

بێگومان ئەوەی ئاشکرایە هیچ کام لەم دوو کومارە نەیانتوانی بەرگرییەکی ئەوتۆ بکەن، هۆی ئەمەش ئاشکرایە کە لە پلەی یەکەمدا دەگەڕێتەوە بۆ پشت بەستنی هەریەکە لەم دوو کومارە بە یەکێتی سۆڤێت‌و سوپای سوور، دووەم هێزی ئەم دوو کومارەو بەتایبەتیش هێزەکانی کوماری مهاباد بریتی بوو لە

هێزی خێڵەکان کە ئەوەش جێگای متمانەو پشت پێبەستن نەبوو، بەتایبەتی حکومەتی تاران بە ئاسانی دەیتوانی سەرخێڵەکان لە قازی محەمەد دوور بخاتەوە چونکە لە بنەڕەتدا سەرخێڵەکان خۆیشیان بڕوایان بە حیزبی دیموکرات‌و کۆماری مهابادیش نەبوو، تەنانەت لەڕووی ئابوورییەوە بۆ ئەوان جێگای زەرەرو زیان بوو چونکە نەیاندەتوانی بەرهەمی توتن‌و شتی تریشیان بنێرنە تاران‌و شارە گەورەکانی ئێران بە پارەی باش بیفرۆشن، لەسەروی هەموو ئەمانەیشەوە لاوازی یان نەبوونی ناسیونالیزمی کوردی بوو لەو کاتەدا کە بتوانێت هەستێکی هاوبەش‌و ئینتمایەکی بەهێز لەنێوان تاکەکانی کورددا بۆ ئەو دەسەڵاتە دروست بکات ئەوەش وایان لێ بکات کە ئامادەی خەبات‌و قوربانیدان بن لەپێناوی پاراستنی کۆماردا، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەڕووی جەماوەرداریيەوە کە ئەوەش ئاستی گەشەکردن‌و پەرەسەندنی هەستی نەتەوایەتی دیاری دەکات کۆماری مهاباد نەبوو بە دامەزراوەیەکی جەماوەردار نەك لەسەر ئاستی هەموو کوردستان بەڵکو لەسەر ئاستی کوردستانی ئێرانیش، بێ جەماوەر مانەوەی کۆمار وەکو دامەزراوەیەکی تا ئەندازەیەك نامۆ بە خەڵکی بەشەکانی یان شوێنەکانی تری کوردستان بێجگە لەو ناوچە تەسکەی لە سنووری قەڵەمڕەوی کۆماردا بوو، هۆکارێکی ئاشکرای لاوازی گیانی بەرگری کردن بوو لە کۆمار.

خاڵێکی تر کە زۆر مایەی قسە لەسەر کردنە نەگەیشتنە ئەنجامی سەرانی کۆمارو حیزبی دیموکرات بوو بۆ بەرگری کردن‌و بەپێچەوانەوە هەڵبژاردنی ڕێگای دووەم کە خۆ بەدەستەوە دان بوو هەڵوێستێکە لاوازی‌و سادەیی‌و بێ بەرنامەیی عەقڵی سیاسی کوردی لەو قۆناغەدا نیشان دەدات. ئایا دەشێ بزوتنەوەیەك خۆی بە بزوتنەوەی نەتەوایەتی بزانێت بەڵام توانای هیچ بەرگری کردنێکی نەبێت‌و سەرباری ئەوەش لە ئاستی کەسی یەکەمدا بێ وەرگرتنی هیچ زەمانەتێك خۆی بداتە دەستی سوپاسالاری سوپای هێرش کەرەوە بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتەکەی ئەو. ئێستا هەندێ وتەو بیانووی قازی محەمەد باس

دەکرێت سەبارەت بەخۆبەدەستەوەدان کە گوایە قازی نەیویستووە خۆی رزگار بکات‌و خەڵکی مهاباد بۆ ژێردەستەیی‌و ئازاردانی سوپای ئێرانی بەجێبهێڵێت. بە هەر حاڵ لەڕووی راستیەوە خۆبەدەستەوەدانی قازی بێ بەرگری کردن هیچ بیانوویەکی بۆ ناهێنرێتەوە تەنیا لاوازی عەقڵی سیاسی نەبێت، هەرچەندە پێدەچێت قازی ئومێدی ئەوەی هەبووبێت کە پەیوەندی باش‌و بەتینی خۆی‌و براکانی لەگەڵ قەوام سەڵتەنەدا ببێتە هۆی پاراستن‌و رزگاربوونیان لە هەر سزاو ئازاداردانێك، بەڵام دیارە ئەوەش جۆرێك لە خراپ تێگەیشتن‌و خراپ لێکدانەوەی تێدایە کە تۆ چاوەڕوانی ئەوە بیت سەرۆکی حکومەتی داگیرکەرو وێرانکەری وڵاتەکەت تۆ بپارێزێت لەکاتێکدا کە تۆ بۆ رزگارکردنی وڵات‌و نەتەوەکەت بەدژی ئەو خەباتت کردێت. بە هەر حاڵ ئەو هەڵوێستەی قازی مایەی سەرنج لێدانە لە دوو رووەوە، یەکەمیان بریاردان بۆ خۆبەدەستەوەدان تەنانەت هەوڵدان بۆ ئەوەی کە رێگا خۆش بکات هیچ کەس بەرەنگاری هێزەکانی ئێران نەبێتەوە لە هاتنە نێو مهابادا. کۆلۆنێل جەی. دی. پایبۆس کە پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی بەریتانیا بووە لە تاران: ئەو رەفتارەی قازی محەمەد بە ناپاکی دەداتە قەڵەم(٢٠) بەهەر حاڵ دەشێ ئەوە پەیوەندی بە خراپ تێگەیشتن‌و لاوازی ئاستی لێکدانەوەو نەبوونی عەقڵی سیاسی‌و لاوازی گیانی بەرگرییەوە هەبێت، بەڵام سەرئەنجام قازی خۆیشی دەبێتە قوربانی دەستی ئەو خراپ تێگەیشتن‌و لێکدانەوەیە.

دووەم لاوازی ئاستی گیانی بەرگری سەرانی تری حکومەتەکەی قازی‌و حیزبی دیموکرات‌و خەڵکیش لەو هەڵوێستەدا دەردەکەوێت‌و ئەوەش ئاشکرا دەبێت کە لە واقیعی کۆمەڵایەتی ئەو کاتەی مهاباد‌و دەوروبەریدا هیچ ئامادەبیەکی ئەوتۆ بۆ راپەڕین‌و بەرگری کردن لەو دەسەڵاتە کوردییە لە ئارادا نەبووەو جەماوەر بەگشتی لەڕووی هەست‌و هۆشیاری نەتەوەییەوە لەو ئاستەدا نەبوو کە لەوە تێبگات کارێکی نادروست‌و ناجۆرە دەسەڵاتی داگیرکەر کۆمارەکەیان بە بەرچاوی ئەمانەوە بڕوخێنێت کەچی کەس بەدەنگ نەیەت

کەس ئامادەی بەرگری کردن نەبێت. بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین بەرگری نەکردنی خودی قازی محەمەدو چوون بە پێشوازی جەنەراڵ هیومایۆن‌و سوپای ئێرانەوە کارێکە ناشێت لە فەرهەنگی خەبات‌و بەرگریدا جێگای بۆ بکرێتەوە تەنیا لەژێر ناوی لاوازی ئاستی تێگەیشتن‌و نەبوونی عەقڵی سیاسیدا نەبێت.

دیارە لەماوەی نزیکەی ساڵێکی دەسەڵاتی کۆماری مهاباددا، کۆمار هێزێکی چەکداری پێکهێنابوو، هێزەکەی بارزانیش بەشێکی دیاری ئەو هێزەی کۆمار بوو کە دواتریش ئامادە نەبوو خۆی بدات بەدەستەوە، سەرباری ئەوەش قازی محەمەد بە رووکەش هێزی خێڵەکانی دەوروبەری مهبادو هەندێ لە ناوچەکانی تری باکوری رۆژهەڵاتی کوردستانی لەگەڵدا بوون بەڵام دیارە ئەوە هیچ دەورێکی نەبینیووە لە پاراستنی یان بەرگری کردن لە کۆماردا "ئەرتەشی ئێران کە سەردەشت‌و بانەو سەقزی بەدەستەوە بوو، سەرەتا چەککردنی هۆزە کوردەکانی دامەزراند، تەنانەت پێش ئەوەش کە قازی محەمەد خۆی بەدەستەوە بدات، بەردەوامبوونی دەسەڵاتدارییەکەی بەسەر هۆزە کوردەکانی باکوری رۆژهەڵاتدا جێگای گومان بوو، زۆربەی سەرۆک هۆزەکانی مامەش‌و مەنگوڕو دێبوکری بڕیاریان دابوو روو بکەنە حکومەتی ئێران [٣١]. ئەوەی ئاشکرایە لەسەر وەختی دەسەڵاتی کۆماری مهاباددا هەرچۆن ناسیونالیزمی کوردی لە ئاستێکی لاواز یان ناپیاردا بوو هەر بەو پێیەش نوخبەی ناسیونالیستیش نەبوو بووە هێزێکی ئەوتۆ کە لەسەر مەیدانی سیاسی‌و گۆڕانکارییەکان دەورێکی ئەوتۆی هەبێت، بەتایبەتی لەو بەشەی کوردستانی لکێندراو بە ئێرانەوە نوخبەی ناسیونالیستی کوردی لە ئاستێکی لاوازتردا بوو لە چاو ئەو بەشەی تری کوردستاندا کە پێشتر لەژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانیدا بوو، ئەویش بەهۆی کاریگەری ئەستەمبوڵ‌و شارە گەورەکانی تری تورکیاو ئەوروپاوە کە راستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو لەرووی پەرەسەندن‌و سەرهەڵدانی چینی بۆرژواو شۆڕشەکانی

پیشەسازیو سەرهەڵدانی تەکنۆلۆژیاوە کە ئەوەش دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەییو دەرکەوتنی ناسیونالیزمی لەگەڵ خۆیدا هێنا. بێگومان بوونی نوخبەی کوردی لە دامەزراوەکانی دەوڵەتی عوسمانیو لە ئەستەمبوڵو شارە دیارەکانی تردا دەوری دیاری هەبوو لەسەر دەرکەوتنی نوخبەیەکی دیاری خوێندەواری ناسیونالیستی کوردی کە دوای جەنگی یەکەم زۆربەیان گەڕانەوە کوردستانو دەوری دیاریان لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتو لە بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکاندا هەبوو، کە بەگوێرەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەو کاریگەرییە کەمتر بووە، ئەمەش دەوری هەبووە لە نەبوونی نوخبەیەکی ناسیونالیستی دیاردا لە ڕۆژهەڵات بە گشتیو لە مهابادو دەوروبەریدا بەتایبەتی. ئەمەش بە یەکێك لە لاوازییە سەرەکیەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانو کۆماری مهابادو خودی قازی محەمەدیش دادەنرێتو نەتوانینی ئامادەکردنی جەماوەرو هێزی چەکداریش بۆ بەرگری کردن پەیوەندی بەو بارودۆخە بابەتییەی مهابادو ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هەیە. هەرچەندە پێشتر لەو هەرێمەدا شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریو سمکۆی شکاکیش ڕاپەڕینیان بەرپاکردووە، بەڵام سروشتی ڕاپەڕینەکانی ئەوانو هێزی جوڵێنەریانو گوتارەکەشیان جیاوازبووە لە بەرنامەی کۆمەڵەی ژیانەوەو حیزبی دیموکراتو کۆماری مهابادیش، کە دەشێ هەردوو ڕاپەڕینی پێشتر زیاتر لە سنووری ڕاپەڕینی ئایینیو خێڵایەتی بە ئاستەم بارگاوی کراو بە مەسەلەی نەتەوایەتی لێکبدرێنەوەو لە هەمان کاتیشدا هیچ کام لەو دوو ڕاپەڕینەی پێشتر نەبوونەتە خاوەنی دەسەڵاتی ئیداری وەکو کۆماری مهاباد.

هەڵبەت زۆرێك لەوانەی باسی کەسێتی قازی محەمەدیان کردووە، لەوە دواون کە قازی محەمەد لە خێزانێکی ئایینی دەوڵەمەندی خۆپارێز بووەو هاتنیشی بۆ ناو کۆمەڵەی ژیانەوە لەلایەن ئەندامانی سەرەکی کۆمەڵەوە پێشوازییەکی وەهای لێ نەکراوەو هەمیشەش مەترسی ئەوە لەئارادا بوو کە قازی پێگەو هێزی مادیو مەعنەوی خۆی بخاتە کار بۆ دەسەڵاتکردنی تەواوەتی بەسەر

ئـەو رێکخـراوەدا. لێـرەوە ئەگـەر ئـەو بۆچـوونانە ببەسـتینەوە بـە خۆبەدەستەوەدانی قازی محەمەدەوە ئەوا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە قـازیش سەرباری ئەوەی ژیانی خۆیی بەخشییوە بـەڵام هـەڵگری گوتـارێکی نەتـەوەیی شۆڕشگێڕانەی ئەوتۆ نەبوو کە بیخاتە سەنگەی بەرگرییەوە.

لەلایەکی ترەوە دەتوانین وەهای لێکبدەینەوە کە سـەرباری لاوازی هەسـتو هوشیاری نەتەوەییو لاوازی نوخبەی ناسیونالیستی کوردیو باڵادەستبوونی عەقڵو ستراتیژی خێڵایەتی لـە کۆمـەڵگای کوردیـدا بەگشتیو لـە رۆژهـەڵاتی کوردستان بەتایبەتیو لە مهابادو قەڵەمڕەوی کۆماری مهابادیشدا بەتایبـەتتر، حیزبـی دیمـوکراتو کۆمـاری مهابـادو خـودی قـازیش نـەیانتوانیووە جـۆرە یەکێتییو یەکبوونێکی خێڵایەتی لەنێوان خێڵە کوردەکانـدا دروسـت بکـەن کـە ئـەوەش وەکـو جـۆرە فیدراسیۆنێکی خێڵایـەتی دەربکـەوێتو ببێتـە هێزێکـی یەکگرتوو بۆ بەرگریکردن لە دەسەڵاتی کۆمار. کەواتە لێرەوە دەتـوانین بڵـێین لـە سـنووری کۆمـاری مهابـاددا نـە ناسـیونالیزم لـەو ئاسـتەدا بـوو کـە ببێتـە بزوتنەوەیەکی جەماوەریو کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵ یەك بخـاتو بـەوەش جەماوەر لە دەوری ئەو دەسەڵاتە کۆبکاتەوەو بەو پێیەش بەرگری جـەماوەری بۆ پاراستنی کۆمار دروستبووایە. نە فیدراسیۆنی نێوان خێڵو عەشیرەتەکانی کورد بەو جۆرە دروست بووە هەتا هێزی پارچە پارچەی خێڵەکان یەك بگرێتو توانای بەرگری کردنی لەو دامەزراوە ئیدراییە سیاسیە هەبێت.

سـەرنجدانی ئـەو دوو حاڵەتـە واتـە نـەبوونی ناسـیونالیزمو لاوازی نوخبـەی ناسیونالیستو نـەبوونی یـەکێتیو فیدراسیۆنی خێڵایـەتی کـوردی لـەماوەی جـەنگی دووەمـی جیهـانیو دروسـت کردنـی کۆمـاری مهابـاددا، بـە ئاشـکرا کۆمەڵگای کوردی دەخاتە بەردەم پرسیارێکی گرنگـەوە، ئـەویش ئەوەیـە ئایا کۆمەڵگای کوردی کە نەبوویتە کۆمەڵگایەکی هاوچـەرخی ئـەوتۆ کـە بـۆرژوای نەتـەوەیی، یـان بـۆرژوایی پیـشەسازی تیـادا دەرکـەوتبێتو بنـەماکانی پیشەسازیو تەکنولۆژیاو عـەقڵی شـارو پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانی شـاری

تێدا دروست نەبوبێتو بەو پێیەش هەستی نەتەوایەتیو ناسیونالیزمیش لە ئاستی نەبووندابن، لەلایەکی تریشەوە لەڕووی پێکهاتنەوە ئەم کۆمەڵگایە، پێکهاتەیەکی خێڵایەتیو بونیادێکی خێڵایەتی هەبێتو کەچی نەیتوانیبێت فیدراسیۆنی خێڵایەتی دروست بکاتو لە هەمان کاتیشدا کە قۆناغی خێڵایەتی لە ڕوویەکی تردا بریتییە لە قۆناغی فیودیالی کەچی ئەم کۆمەڵگایە نەیتوانیبێت ئابوری یان سیستەمی ئابوریو پەیوەندی بەرهەم هێنانی فیودیالیش وەکو سیستەمو پەیوەندییەکانی ئابوریو بەرهەم هێنانی خاوەن شوناس دروست بکات، کەواتە دەبێ چ جۆرە کۆمەڵگایەك بێت؟ یان بە قسەیەکی تر ئایا بەپێی پێودانگە سیۆسیۆلۆژییەکان چ جۆرە کۆمەڵگایەکە؟ یان لە ڕاستیدا دەشێ پێی بگوترێت کۆمەڵگا؟

بە هەر حاڵ لەسەر بنەمای ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتیو سیاسیو عەقڵیو مەعنەویو سایکۆلۆژییەیە کە قازی محەمەد لەبری بەرگری کەچی خۆی دەدات بەدەستەوەو داگیرکەرانی وڵاتەکەشی لەسەر بنەمای هۆشیاریو بە ئاگابیان لە ناسنامەی نیشتمانی خۆیانو بە مەبەستی پاراستنی ئاسیشی نەتەوەیی خۆیان هیچ دوو دڵ نابن لەوەی کە فەرمانی لەسێدارەدانی بدەن، بێگومان خۆبەدەستەوەدانی قازیو سەرانی کۆمارەکەی خاڵێکی نێگەتیڤە لە مێژووی ڕاپەڕینەکانی کورددا و بەگوێرەی ئێمەی کوردیش یادەوەرییەکی تفتو ئازاربەخشەو دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو حەقیقەتە تاڵەی کە ئێمەی کورد کەسێتییەکی تێکشکاومان هەیەو لەبەردەم ئەوانی تردا کەمجار توانای خۆراگرتمان هەیە، چونکە هەستکردن بە تێکشکانو بە بچووکیو بە ناتەکتیڤی لە بوونی ئێمەدا هەمیشە ئامادەیە کاتێ ڕووبەڕووی ئەوانی دی دەبینەوە.

بە هەر حاڵ گوتاری قازی محەمەدو کۆمارەکەی ڕاستەوخۆ بەرهەمی ئەم واقیعە مێژوویيو سیاسیو کەلتوریو ئەنتۆلۆژییەی ئێمەیە سەرباری دەوری کەلتورو عەقڵی سۆڤێتیش، بە واتا گوتارێکی خێڵایەتی پەرتبووی دواکەوتووی داخراوی بارگاوی کراو بە ڕەگەزەکانی نەتەوایەتیو ئایینیوکەلتوری مارکسی

ـ لینینی کە لە پشتی ئەم گوتارە ناجۆرەشەوە بکەرێکی کارکەرو رووداو دروستکەر بوونی نییە، چونکە ئەگەر بکەر بوونی هەبووایە بێگومان ئەو بکەرە هەروا بە ئاسانی خۆی نەدەدایە دەستەوەو هەوڵیدەدا کار بکاتو رووداو دروست بکاتو بەو پێیەش گۆڕانکاری لە بەرژەوەندی خۆی دەستەبەر بکات بەجۆرێك بتوانێت بوونی خۆی بسەلمێنێت بوونێك لەسەر بنەمای ئامادەبوون لەبواری بەرهەم هێنانی شارستانێتیدا، کە دیارە بێ بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی کە بتوانێت نەتەوە دروست بکات لە کوردستاندا نە زەمینەی ئەو خۆسەلماندنە دێتە ئاراوە، نە کورد دەگاتە ئەو ئاستەی ببێتە خاوەنی شوناسی نەتەوەیی خۆی، نە دەشتوانێت ببێتە خاوەنی گوتارێکی نەتەوەیی هاوچەرخ. دیارە بەراورد بەم بۆچوونانە گوتاری قازی محەمەدو کۆماری مهاباد لە ئاستێکی زۆر لاوازدا بووە کە ناشێت شوناسی گوتاری نەتەوەیی پێببەخشرێت سەرباری بەرێزەوە سەیرکردنی هەوڵی قازی محەمەدو خوێن بەخشینی.

# سەرچاوەکانی گوتاری کۆماری مهاباد


١- دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو ــ کوردستانو کورد ــ هەولێر ــ چاپی دووەم سالی ٢٠٠٦، ل٨٨.

٢ــ عەلائەدین سەجادی ــ مێژووی ڕاپەڕینی کورد ــ چاپی دووەم، ئینتیشاراتی محەمەدی ـ ١٩٩٦ ـ ل١٨١.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٨٢.

٤- حەسەن ئەرفەع ـ کوردەکان ـ وەرگێڕانی سەردار محەمەد ــ سلێمانی ٢٠٠١ـ ل١١٢.

٥- دکتۆر عەزیز شەمزینی ــ جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانیی کوردستان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد ـ چاپی چوارەم، سلێمانی ٢٠٠٦ ـ ل٢١٧.

٦- نادر ئینتیسار ـ ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی ــ وەرگێڕانی عەتا قەرەداخی سلێمانی ـ ٢٠٠٤، ل٤٤ـ٤٥.

7- John Bulloch and Harvy Morris – No friends But the Mountains – Penguine Books – 1993 – p.p 98-99.

٨– نەوشیروان مستەفا ئەمین ــ حکومەتی کوردستان: کورد لە گەمەی سۆڤیێتیدا ـ سلێمانی ١٩٩٣، ل٦٢ـ٦٣.

٩- حسێنی مەدەنی ــ کوردستانو ستراتیژی دەوڵەتان ــ بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠١، ل٢٠٠.

١٠- مەحمودی مەلا عیزەت ـ کۆماری میللی مهاباد ـ سلێمانی ١٩٩٨ ل٦٦.

10- David Adimson – The Kurdish War. P.11

١٢- حەسەن ئەرفەع ـ کوردەکان ـ ل١١٨.

١٣- دکتۆر عەزیز شەمزینی ـ جولانەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان - ل٢٣.

١٤ـ دكتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ ـ كوردستان و كورد ـ ل٨٨.

١٥ـ ئارچی رۆزفلت ـ كۆماری مهاباد ـ وەرگێڕانی ئەبوبەكر خۆشناو ـ سلێمانی ـ ١٩٩٨ ـ ل١٨.

١٦ـ حوسێنی مەدەنی ـ كوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان ـ بەرگی دووەم ـ هەولێر ـ ساڵی ٢٠٠٠ ـ ل٢٣٨.

١٧ـ ویلیام ئیگلتن ـ كۆماری كورد لەساڵی ١٩٤٦دا ـ وەرگێراو لە حوسێنی مەدەنی ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣٨.

18- Borhandedin A. Yassen : Vision or Reality: The Kurds in the policy of Great power (194-1947) - Lund University press - 1995-p.152.

١٩ـ عەتا قەرەداغی ـ كاریگەری كەلتوری ئەوان لەسەر كورد ـ سلێمانی ـ ٢٠٠١ ـ ل٢٤٧.

20-Borhanedin A- Yassen : Vision or Reality – p-153.

٢١ـ نادر ئینتیسار ـ ئێتنۆنەتەوایەتی كوردی ـ وەرگێڕانی: عەتا قەرەداخی ل٢.

22- David MacDowall – A Modern History of the Kurds, London, 2000-p.241.

٢٢ـ دكتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ ـ كوردستان و كورد ـ ل٨٩.

٢٤ـ نادر ئینتیسار ـ ئێتنۆنەتەوایەتی كوردی ـ ل٥٥.

٢٥ـ دكتۆر عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی كوردستان: ل٣٠٩.

٢٦ـ حەسەن ئەرفەع ـ كوردەكان ـ ل١٤٤.

27- Borhanedin A. Yassen: Vision or Reality p.186.

28- Ibid. p.p. 186-187.

29- Ibid. p.p. 187.

30- Ibid. p.p. 187-188.

٣١ـ ئەنوەر سوڵتانی ـ رۆژهەڵاتی كوردستان لە بەڵگەنامەكانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٥ل٢٦٦.

زۆرێك لەو زاراوەو چەمكو تیۆرانەی كە لە نێوەندی رۆشنبیری كوردییەوە دەبیسترێن تاكو ئێستا هەوڵنەدراوە شوێنو سروشتو میكانیزمی كاركردنیان بدۆزرێتەوە، بەڵكو بەبێ ئەوەی پێشینەیەكی زانراو لەبارەیانەوە هەبێت یان ناسێندرابن بەكار دەهێنرێن، ئەمانەش راستەوخۆ پەیوەندی بە بەشی دووەمی ناونیشانی ئەم باسەوە هەیە واتە سەرخانی خواستراو یان گوتاری خواستراو. بۆیە لێرەدا هەوڵدەدەین هەم ئاخاوتن لەسەر هەردوو چەمكی كۆمەڵگای داخراوو سەرخان یان گوتاری خواستراو بكەین، هەم شوێنو سروشتو میكانیزمی كاركردنی ئەو دوو چەمە لە كۆمەڵگای كوردیدا بخەینە بەردەم لێدوانەوە.

چەمكی كۆمەڵگای داخراو لە روانگەی پەرەسەندنی كۆمەلایەتیو قۆناغەكانی گەشەی كۆمەلایەتییەوە قۆناغێك نییە كە كۆمەڵگا لە پەرەسەندنی خۆیدا لە مێژوویەكی دیاریكراودا پێی بگاتو لێێ تێپەڕێت. وەكو چۆن دەڵێین قۆناغی فیودیالی یان سەرمایەداری نەخێر بەڵكو ئەم چەمكە وەكو بەشێك لەسەرخان دەردەكەوێت بەڵام لە بنەڕەتدا رەنگدانەوەی ژێرخانی كۆمەلایەتییە، مەبەست لە كۆمەڵگای داخراو ئەو كۆمەڵگایەیە كە لەڕووی بنیادی پێكهاتنی كۆمەلایەتییەوە بنیاتێكی داخراوی هەیە لەشێوەی پێكهاتەی خێڵو عەشیرەتدا، لەڕووی ئاینییەوە كۆمەڵگایەكی بە توندی پەیوەستبووە بە بنەماكانی ئاینییەوەو ئاین تیایدا پرنسیپی كارو پەڕێوەبردنو هەموو بوارەكانی تری ژیانە، لەڕووی ئەخلاقەوە كۆمەڵگایەكی پارێزكارەو هەمیشە لایەنگری رابردووەو دژی داهاتووە، ئەو داهاتووەی كە پیرۆزی ئەخلاقی رەمزەكانی رابردوو تیایدا دەكەونە بەردەم مەترسی لێدانو تێكشكاندنەوە، لەڕووی نەریتی كۆمەلایەتیەوە، كۆمەڵگای داخراو كۆمەڵگایەكی تەقلیدیە، بەو مانایەی پەیوەستە بە دابو نەریتی باوباپیرانەوەو هەر هەنگاوێك بۆ دوور كەوتنەوە لە دابو نەریتی باوباپیران بە لادان لێكدەدرێتەوە. هەڵبەت كۆمەڵگای داخراو لەڕووی عەقڵو روانینو ئاسۆی بینینو مەودای كاری

کۆمەڵایەتیو بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتیشەوە داخراوە ئەویش لە دوو ئاستدا. ئاستی یەکەم لەنێو خودی پێکهاتەی خۆیدا کە هەموو پەیوەندییەکانی لە سنووری پێکهاتە بچوکەکانی نێو خودی کۆمەڵگا خۆیدا ئەنجام دەدرێت واتە لە سنووری پێکهاتەی خێزان، بنەماڵە، تیرە، خێڵ، عەشیرەت، حیزب تایەفەی ئایینی، مەزهەب، نەتەوە، یان لەسەر ئاستی یەکەی داخراوی جوگرافی گوند، ناوچە، شار، هەرێم، کە ئەمەش سەرباری حاڵەتی داخران جۆرێك لەپەرتبوونیشە لە هەموو پێکهاتە مرۆییو جوگرافییەکانی تر.

لە ئاستی دووەمدا کۆمەڵگای داخراو، پەرتبوو، دابڕاوە لە کۆمەڵگاکانی تر، بەو مانایەی کە ناتوانێت ببێتە رەگەزێکی چالاكو بەرهەم هێنی ئەو پێکهاتەیەی کە پێی دەوترێت کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەویش لەو روانگەیەوە کە بەشداری دیاری هەبێت لە مێژووی بەرهەم هێنانی شارستانی جیهانیدا. بە واتایەکی دی کۆمەڵگای داخراو هەمیشە وەکو کۆمەڵگای ناوچەیی دەمێنێتەوە کە ئەویش تەنیا لە سنووری جوگرافیای خۆیدا بوونی دەبێتو هەرگیز ناگاتە ئەو ئاستەی لەڕووی بەراوردکارییەوە لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تردا شوێنو پایەی دیاری بکرێت. کاتێ ئاخاوتن لەسەر کۆمەڵگای داخراو دەکەین دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە چەمکی کۆمەڵگای داخراو لە بەرامبەر چەمکی کۆمەڵگای کراوەدا دادەنرێت، کە یەکەمیان کۆمەڵگایەتی تەقلیدیەو دووەمیش کۆمەڵگایەکی مۆدێرنەو بنەماو خاسیێتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی هەیە.

گرفتی کۆمەڵگای داخراو بەشێوەیەکی سەرەکی گرفتەکانی نێوخۆیەتی لەو روانگەیەوە کە وەکو پێکهاتەیەکی ناچالاك لەڕووی گەشەکردنەوە دەیهێڵێتەوە بەجۆرێك کە پەرەسەندنو گۆڕانکاری لەنێوخۆی ئەو کۆمەڵگایەدا زۆر لاواز بێت بەو ئەندازەی کە لەبەرامبەر هەڵسەنگاندنی چەمکی کۆمەڵایەتی بووندا بمانخاتە بەردەم گومانەوە، گومان لەوەی ئایا ئەم پێکهاتە بووەتە کۆمەڵگا یان دەشێ پێی بگوترێت کۆمەڵگا. ئەمانەش ئەو پرسیارە سەرەکیانەن کە لەبەرامبەر ئێمەدا خۆیان نیشان دەدەن: ئایا کورد چ جۆرە کۆمەڵگایەکە؟ یان

ئایا کورد بووەتە کۆمەڵگا؟ ئایا ئەگەر کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی داخراوە یان کراوەیە؟ ئایا زەمینەی بەرەو بە مەدەنی بوونی هەیەو لەبارە؟ ئایا دەشێ دیموکراسی لەم کۆمەڵگایەدا بێتە ئاراوە، ئەگەر لەسەر ئەوە رێکەوتین کە کۆمەڵگایە؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە ئەم لێکۆڵینەوەیە بەجۆرێك لەدوای وەلامەکانیان دەگەرێتو هەوڵدەدات ئاخاوتن لەسەر ئەم پێکهاتەیە بکات ئەویش بە گەرانەوە بۆ نێو خودی پێکهاتەو گەران بەدوای بەڵگەی دیاردەو هەوڵدانیش بۆ ئاخاوتن کردن لەسەر ئەو بەڵگانە بەو هیوایەی لەسەر بنەمای شیکاری ناوخۆی توخمو رەگەزە پێکهێنەرەکانو خاسیەتو میکانیزمی کارکردنیان هەوڵبدەین شوێنی ئەم پێکهاتەیە دیاری بکەین.

دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت: ناشێت چوارچێوەی راستی رووداوە مێژووییەکان دیاری بکرێن بۆ هیچ کۆمەڵگایەك بەبێ تێگەیشتنی بنەمای ئەو رووداوە بەشێوەیەکی ئاشکرا[1] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ناکرێت بریار لەسەر هیچ رووداو یان دیاردەیەك بدرێت بەبێ مامەڵەکردنی وردی زانستیانە لەگەڵ بنیادی پێکهێنەری ئەو پێکهاتەیەدا کە ئەو رووداوەی تێدا روو دەدات یان ئەو دیاردەیەی تێدا دەردەکەوێت. بە واتایەکی دی بۆ ئاخاوتن لەسەر ئەوەی بزانین ئایا کۆمەڵگایەك کۆمەڵگای کراوەیە یان داخراو دەبێ لەنێو رەگەزە پێکهێنەرەکانی بنیادی پێکهێنەری ئەو کۆمەڵگایە خۆیدا هەوڵی لێکدانەوەو دیاریکردنی بدەین، بە مانایەکی تر ناشێت هیچ پێوانەیەکی دەرەکی ئامادە بهێنینو هەوڵبدەین ئەو کۆمەڵگایە بەپێی ئەو پێوانە لێکبدەینەوە یان هەوڵبدەین ئەو کۆمەڵگایە بخەینە چوارچێوەی ئەو پێوانە ئامادەیەوە، بۆیە جێگای خۆیەتی لەدوای وەلامی ئەو پرسیارە بگەرێین: ئایا کۆمەڵگای کوردی چ جۆرە کۆمەڵگایەکە؟ دەشێ لەپاڵ ئەم پرسیارەدا چەند پرسیارێکی تر سەرهەڵبدەن ئایا کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگای سەرەتاییە؟ یان بە زاراوەیەکی دی کۆمەڵگای دەرەوەی نووسینە یان کۆمەڵگای داخراوە یان کۆمەڵگای کراوەیە؟ کە سەرجەم ئەم دووانانەی پرسیارەکانیان لێ پێکدێت لە سنوورێکی

فراوانتردا دەکەونە چوارچێوەی دووانەیەکی ترەوە ئەویش دووانەی کۆمەڵگای تەقلیدیو کۆمەڵگای مۆدێرنە کە دووەمیان دەبێتە هاومانای کۆمەڵگای مەدەنی.

ئەگەر سەرنجی بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵگای کوردی بدەین ئەوە رەگەزە پێکهێنەرەکانی ئەم کۆمەڵگایە جگە لە یەکەی خێزان کە یەکەی بنەڕەتی پێکهێنەری هەموو کۆمەڵگایەکە، کۆمەڵگای کورد پێکهاتووە لە یەکەی خێڵو عەشیرەت، ئەوانیش دابەش بوون بۆ یەکەی بچووکتر لە تیرەو هۆزو بنەماڵە، سەرباری پێکنەهاتنی دەوڵەتی خێڵو دەوڵەتی فیودیالو سیستەمی ئابوری فیودیالی لە کۆمەڵگای کوردیدا بەلام پێکهاتەی خێڵو عەشیرەت پارێزگاریان لە بوونی خۆیان کردووەو وەکو یەکەیەکی داخراو کە سەرجەم چالاکیەکانی ژیانو پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان لە سنووری داخراوی خۆیدا هێشتوتەوە، ناسنامەی خۆی پاراستووە، بەو مانایەی دوای دروستبوونی شارو دەرکەوتنی سەرەتای سادەی پیشەسازیو دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژی بۆرژوا بەبێ فۆرمەلە بوونی بۆرژوا وەکو چینێکی کۆمەلایەتی ئامادە، ئەم پێکهاتە خێلایەتییە هێشتا پێکهاتەی سەرەکی کۆمەڵگای کوردییەو عەقڵو ئایدیۆلۆژیاو کەلتوری باو هێشتا عەقڵو ئایدیۆلۆژیاو کەلتوری خێڵەو هەر دەزگاو دامەزراوێکیش بەناوی حیزبو رێکخراو دەزگای کۆمەلایەتیو کەلتوریو دیموکراتی دروستبوبێت وێنەیەکی لەبەر نوسراوەی ئەو پێکهاتەیە یان بە هەمان عەقڵو ستراتیژی ئەو پێکهاتەیە کار دەکات کە ئەو پێکهاتەیەش پێکهاتەیەکی داخراوە بۆیە بە سروشتی عەقڵی داخراوو ئایدیۆلۆژیای داخراوو کەلتوری داخراوی بەرهەم هێناوە، بەو مانایەی کە هەموو شتێك لە سنووری خۆیداو بە روانینی خۆی دەبێت یان لە دەرەوەی خۆیدا ناتوانێت کەسی دیو هیچ دی ببینێتو ناشتوانێت کەسی ترو هیچ پێکهاتەیەکی تر بکاتە هاوبەشی خۆی، عەقڵی بالادەست کە عەقڵی کۆمەڵگای خێلایەتیە لەو روانگەیەوە کە نەتەوە یان چەمکی نەتەوایەتی نەبۆتە چەمکێکی بالادەستی ئەوتۆ کە هەموو پانتایی

ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای گرتبێتەوە بەو مانایەی کە لە سنووری ئەو پێکهاتەیەدا کە پێی دەگوترێت نەتەوە سەرجەم پێکهاتە بچووکەکانی تر کە لە بنەڕەتدا پێکهێنەری نەتەوەن بتوێنەوەو لە یەیەکی گەورەترو فراوانتر پێکەوە کارلێك بکەن و ببنە رەگەزێکی ئەو پێکهاتە نوێیەو خاسێتە کۆنەکە لە عەقڵ و ستراتیژو ئایدیۆلۆژیاو دابو نەریت ون بکەن و عەقڵ و ستراتیژو ئایدیۆلۆژیاو دابو نەریتێکی شمولی کە سەرتاپای جەستەی نەتەوە بگرێتەوە بچێتە جێگای ئەوان. واتە گوتاری نەتەوەیی یان ناسیونالیزم جێگای گوتاری خێڵ بگرێتەوە.

لە پێکهاتەی خێڵ و عەشیرەتدا ناشێت باسی کرانەوەو مەدەنی بوون و دیموکراسی بکرێت. ئەویش لەبەر ئەوەی لە هەرەمی دەسەڵاتی خێڵ و عەشیرەتدا دەسەڵات دەسەڵاتی تاکەکەسەو هەر ئەوی سەرخێڵ یان شێخی عەشیرەت خاوەنی بڕیارەو هەموو فەرمانێك لەوەوە دەردەچێت و بە هیچ شێوەیەك ئەو فەرمانە رەت ناکرێتەوەو تەنانەت جگە لە خودی سەرخێڵ یان شێخی عەشیرەت کەس بەشداری لە دەرکردنیدا ناکات، بە واتا پێکهاتەی دامەزراوی خێڵ و عەشیرەت هەمان شێوەی پێکهاتەی هەرەمی دەسەڵاتی ئایینییە. چۆن خواوەند لە لوتکەی ئەو هەرەمەدایەو فەرمان بۆ خوارەوە دەردەکات و هیچ کەس مافی رەتکردنەوەی نییە[٢]، بە هەمان شێوە لە دامەزراوی خێڵ و عەشیرەتیشدا هیچ فەرمانێك رەت ناکرێتەوە. ئەمەش سروشتی ئەو دامەزراو یان پێکهاتانەیە کە تیایدا تاکە کەس خاوەنی بڕیارو هەموو فەرمانێکەو هیچ کەس مافی بەشداریکردنی نییەو دەبێ بە ملکەچی ئەو فەرمانانە جێبەجێ بکرێت، لە حاڵەتی لەم جۆرەشدا بەهیچ شێوەیەك رای پێچەوانە یان بۆچوونی جیاواز یان چەمکی گفتوگۆ دروست نابێت ئەمەش یەکێکە لە خاسێتە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای داخراو. لە کۆمەڵگای داخراودا تەنیا سەرۆك لەبری هەمووان بڕیار دەدات، تەنیا سەرۆك لەبری هەمووان بیر دەکاتەوە، ئەگەر لەم روانگەیەوە سەیری کۆمەڵگای کوردی بکەین نەك

بگەڕێنەوە بۆ رابردوو، بەڵکو لە ئێستاشدا بۆمان دەردەکەوێت سەریاری گۆڕینی رووکەش و دیمەنی دەرەوەی کۆمەڵگا، سەریاری "دروستبوونی حیزب و رێکخراو و یەکێتیی و سەندیکاو یانەکان و هەرەوەزییەکان"[٣] کە بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنین هێشتا کۆمەڵگای کوردی پێکهاتەیەکی خێڵایەتی هەیەو سەرجەم ئەم دامەزراوانەشی کە دروستبوون لەسەر هەمان شێوە پێکهاتنی دامەزراوی خێڵ دروست بوون کە ئەوانیش بەرهەمی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی نین بەو ئەندازەی بە لاسایی کردنەوە دروستکراون واتە بەرهەمی خواستراوی زەمینەو واقیعێکی ترن. ئەگەر دروستکردنی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی ناسروشتی گواسترابێتەوە بۆ نێو پێکهاتەی خێڵایەتی داخراوی کۆمەڵگای کوردی، ئەوە دەبێ بزانین لەبەر ئامادەنەبوونی زەمینەی کۆمەڵایەتی و ئابوری و ئەخلاقی و لەبەر عەقڵی داخراوی یەك ئاراستەی باڵادەست لەم کۆمەڵگایەدا ئەم دامەزراوانە وەکو پێکهاتەی ئیفلیج خۆیان دەنوێنن و ناتوانن ببنە فاکتەری گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا چونکە خۆیان بەرهەمی گۆڕانکاری پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی نین بەڵکو بەرهەمی زەمینەیەکی ترن، هەڵبەت ئەم حاڵەتی وەرگرتنەش تەنیا کۆمەڵگای کوردی نەگرتۆتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی سروشتی هەر دیاردەیەکی نوێی کۆمەڵایەتی یان هەر فکرەو روانینێکی نوێی لە هەر شوێنێك دەریکەوێت، ئەوا کار لە شوێنانی تریش دەکات و هەندێ جار ئەو دیاردانە یان ئەو گۆڕانکارییانە لەجێگایەکی دیاریکراو سەرهەڵدەدەن و بەخێرایی پەرەدەسەنن. ئەم گۆڕانکارییانە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە ئەورووپای رۆژئاواوە سەریان هەڵداوەو ئێستا لە رووی کاریگەرییانەوە بوونەتە گۆڕانکاری جیهانی[١]. کە مەبەست لەم قسەیەش بەتایبەتی لێرەدا سەرجەم دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و سەرجەم سیفات و خاسیەتەکانی ئەو کۆمەڵگایەیە وەکو کۆمەڵگایەکی کراوە بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئایا دەشێ سەرخانی کۆمەڵگایەکی پەرەسەندو لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی داخراوی خێڵایەتیدا کاری پێبکرێت

یان لەکار پێکردندا دەبێتە مایەی رەخنەو بگرە زەمینەش خۆش دەکات بۆ ئەوەی ئەگەری گۆرانکاری سروشتی لە هەناوی کۆمەڵگادا لەبار ببات.

هەر لێرەوە ئاخاوتن لەسەر مەسەلەی دیموکراسی لە کۆمەڵگا داخراو، دواکەوتووەکاندا سەرهەڵدەدات لەو روانگەیەوە کە دیموکراسی لە کۆمەڵگای پێشکەوتوو پەرەسەندوی کراوەدا پیادە دەکرێت واتە ناشێت چاوەروانی دیموکراسی بکرێت لە کۆمەڵگای داخراودا چونکە بەلایەنی هەرە کەمەوە دیموراسی بریتییە لە هاوبەشکردنی هەمووان و قبوڵکردنی یەکتری و کاری بەکۆمەڵ و مافی هەمووان و زەقکردنەوەی جیاوازییەکان و چرکردنەوەی ناکۆکیەکان لەشێوەی هێمنداو لەسەروی هەموو ئەمانەشەوە یەکتر قبوڵکردن و داننان بە مافی یەکتریداو پارێزگاریکردن لە مافو لە بیرورای یەکتری و پەیرەوکردنی چەمکی هاوولاتی بوون ئەگەر ئەمانە خاسیێتەکانی دیموکراسی بن ئایا لە کۆمەڵگای داخراودا تا چ ئاستێك ئەم خاسیێتانە بوونیان دەبێت یان بواری بوونیان هەیە؟ لەکاتێکدا کۆمەڵگایەك دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی تیایدا دروست نەبوویێت و حیزب بەدیلی دامەزراوی خێڵ و عەشیرەت بێت و حکومەت لەسەر هەمان بنەمای خێلایەتی دروست بوویێت و عەقڵ و ستراتیژی خێڵ بوویێتە عەقڵ و ستراتیژی حیزب و حکومەتیش هەر بە هەمان عەقڵ و ستراتیژی خێڵ بەرێوە بچێت و لەسەر هەمان شێوازی دامەزراوی خێڵ دامەزرا بێت ئەوە بێگومان مەسەلەی دیموکراسی وەکو سەرخانێکی وەهمی دەمێنێتەوە تەنیاو بەس تەنیا بۆ خەڵەتاندنی جەماوەر بەکار دەهێنرێت و هەندێ جار بەناوی مەسەلەی دیموکراسیەوە لە گەمەی نادیموکراسیدا سەرۆك حیزب و سەرۆکی دەزگاو سەندیکاو رێکخراوو یانەو.. تاد بەناوی هەڵبژاردنەوە شەرعیەت دەدەن بەمانەوەی خۆیان لە پۆستەکانیاندا تا ئەو کاتەی دەمرن هەر چۆن لە دامەزراوی خێڵدا سەرۆك خێڵ و شێخی عەشیرەت تا ئەو کاتەی دەمرێت بە سەرۆك یان بە شێخ دەمێنێتەوە. پێم باشە چەند نموونەیەکی زیندوو لەنێو واقیعی کۆمەلایەتی کوردیدا بهێنمەوە.

پارتی دیموکراتی کوردستان وەکو دیارترین حیزب لە مێژووی کورددا لە دامەزراندنیەوە خوالێخۆشبوو بەرزانی کە بەرزترین نموونەی خەباتگێرو یەکەمین سەرکردەشە کە خاسیەتەکانی باوکی ڕۆحی هەبووە لە مێژووی کورددا لە دروستبوونی پارتیەوە تاکو کۆچی دوایی سەرۆکی پارتی بووە. لەدوای کۆچی دوایی بارزانیشەوە تاکو ئێستا سەرۆکایەتی ئەو حیزبە نەگۆڕاوە سەرباری چەند کۆنگرەیەك، دیارە لێرەدا مەبەست لەوە نییە کە گۆڕینی سەرکردایەتی حیزبێك پەیوەندی بە ئاستی توانای سەرکردەوە هەیە، نەخێر بەڵکو مەبەست لەوەیە کە تا چ ئاستێك گۆڕانکاری لە لوتکەی هەرەمی دەسەڵاتدا دەکرێت. تەمەنی یەکێتیی نیشتمانی بووەتە بیستو هەشت ساڵ، لە دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانییەوە مام جەلال سکرتێری ئەم حیزبەیە سەرباری بەستنی چەند کۆنفرانسو کۆنگرەیەك، سکرتێر هەر لە جێگای خۆی ماوەتەوە هەموو جارێکیش بە تەسکیە واتە بەبێ دەنگدان بووەتەوە بە سکرتێر، نەك هەر ئەوە بەڵکو سکرتێر مافی تەسکیەکردنی چەند ئەندامێکیشی هەبووە بۆ مانەوە لە مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی ئەگەر سەرنجی بەرنامەی یەکێتیی نیشتمانیی بدەین خۆی بە پارتێکی یان ڕێکخراوێکی سۆشیال دیموکرات پێشکەش دەکات، ئەنجا با بپرسین ئایا مانەوەی سکرتێر بۆ ماوەی بیستو هەشت ساڵو دڵنیاشین کە تا لە ژیاندا بمێنێت هەر لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە چ جیاوازییەکی هەیە لە شوێنی ئەو سەرخێڵەی بە میرات لە باوكو باپیرییەوە سەرۆك خێڵایەتی بۆ ماوەتەوەو تاکو نەشمرێت هەر سەرخێڵ دەبێتو بە سەرخێڵی دەمێنێتەوە؟ سکرتێرەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش لە پۆستی خۆیان ماونەتەوە تاوەکو تیرۆرکراون، واتە گۆڕانکاریش لە پۆستی سکرتێری ئەو پارتەدا بەرهەمی گۆڕانکاری دیموکراسیانە نەبووە بەڵکو بەرهەمی تیرۆری ڕژێمی شمولی ئێرانی بووە.

لێرەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە حیزبی کوردی لەڕووی لوتکەی دەسەلاتیەوە هەر هەمان پێکهاتەی خێڵی کوردی هەیەو سەرۆکو سکرتێرو تەنانەت زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیش تا مردن لە شوێنەکانی خۆیاندت دەمێننەوە، بە حوکمی ئەو مانەوەیەش کۆنترۆڵی دەزگاکانی حیزب بە تەواوی دەکەنو لەگەڵ ڕۆیشتنی کاتدا هەموو ئەو دەنگانەی کە نەشازن بەپێی ڕوانینی ئەوی سەرۆك یان سکرتێر کپ دەکرێنەوە، ئەوسا حیزب دەبێتە دامەزراوێك شێوەی تاکە کەسێکی دەبێتو یەك ئاراستەی بیرکردنەوەو یەك جۆر ڕوانین تیایدا باڵادەست دەبێتو تەنانەت بچوکترین جیاوازی نامێڵرێت لەم کاتەشدا توانای بیرکردنەوە لەناو دامەزراوی حیزبدا هەرەس دەهێنێتو تەنیا سەرۆك یان سکرتێر لەبری هەموو حیزب بیردەکاتەوەو بەوەش سوپایەکی ڕێکخراو لە ئەندامی حیزب دروست دەبێت کە کەس توانای بیرکردنەوەی نامێنێتو سەرجەم ئەو سوپایە وەکو بەشەکانی ئامێرێکی گەورەیان لێدێت بە فەرمان کار دەکەنو بە فەرمان دەوەستنو ئەنداکانی مەکتەبی سیاسیو سەرکرایەتیش یەك کاری بنەڕەتیان دەبێت ئەویش شەرعیەتدانە بە هەموو گوتەو قسەو هەڵوێستەکانی سەرۆكو سکرتێر. ئەوەش وایان لێدەکات جیاوازی لەنێوان ئەوانو ئەو بێژەرەی رادیۆو تەلەفزیۆندا نەمێنێت کە وتارە نووسراوو رەسمیەکانی راگەیاندنی حیزب دەخوێنێتەوە. هەر لێرەوە حیزبی کوردی لەلایەك هاوشێوەی دامەزراوی خێڵی کوردییەو سەرۆك یان سکرتێر لە شوێنی سەرخێڵ یان شێخە، ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیش هاوشێوەی پیاوانی نزیکی سەرخێڵن کە لە دامەزراوی خێڵدا پێیان دەوترێت پیاو ماقوڵ یان ریش سپی کە سەرخێڵ تەنیا بۆ شەرعیەتدان بە بڕیارەکانی خۆی پرسیان پێدەکاتو مەرجیش نییە بەقسەیان بکات. لەلایەکی ترەوە ئەم شێوازە کارکردنە لە دامەزراوی حیزبی کوردیدا هەموو بنەمایەکی هاوبەشیکردنی لە بڕیارداندا کوشتووەو زەمینەی دروستکردنی دیکتاتۆری رەخساندووە. دیکتاتۆر بەو مانایەی کە سەرکردە

هەموو پانتایی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتی حیزبو کۆمەڵگا کۆنترۆڵ دەکاتو بە ئارەزووی خۆیو بەبێ هیچ بنەمایەکی دیموکراسیانە کێی بوێت دەیهێنێتە پێشەوەو لەو ئەڵقە تەسکە دلخراوەدا کە بەدەوری خۆیدا دروستی کردووە بەشداری دەکا کە ئەو ئەڵقەیەش دەورێکی ئەوتۆی لەبڕیاردا نییە بەڵام بەشداری دابەشکردنی مەنسەبو مەکسەب دەکات.

ئەگەر بە وردی سەرنجی بازنەی دلخراوی دەسەڵاتی کوردیو بازنەی تەسکی دەوری سەرۆکو سکرتێری حیزب بدەین لە کۆمەڵگای کوردیدا ئەوسا تێدەگەین کە قسەکردن دەربارەی کرانەوەو دیموکراسیو کۆمەڵگای مەدەنی قسەکردنە لە چ وەهمێك، بەڵام حیزب لە کوردستاندا لەبەر هەستکردنی بە بنەمای لاوازی خۆی ناتوانێت بەڕاستی خۆی چۆن پێکهاتووەو چۆن کار دەکات بەو شێوەیە لە بەرنامەو ستراتیژو راگەیاندنەکانیدا خۆی نمایش بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە حیزب بەو پێکهاتە خێڵایەتیەوە چ لەڕووی بنیادی پێکهاتنەوە چ لەڕووی مانەوەی سەرۆك یان سکرتێرەوە تا لە ژیاندا بێت چ لەڕووی ئاراستەی فەرمانو میکانیزمی کاری ناوخۆو دیسپلینی حیزبیەوە چ لەڕووی کارکردنیەوە لەنێو کۆمەڵگادا چ لەڕووی ئەو ئامەزراوانەی بەناوی رێکخراوی دیموکراتی یان رێکخراوی جەماوەرییەوە پێکیهێناون.. کەچی ناتوانێت لە گەوهەردا چۆنە وەها خۆی نمایش بکات بەڵکو رووکەشێکی خواستراو دەپۆشێتو دەیەوێت بە قسەو لە راگەیاندندا خۆی وەکو حیزبی کۆمەڵگایەکی پەرەسەندوی کراوە نیشان بدات، ئەوەش وا دەکات حیزبی کوردی بەشێوە پێکهاتەیەکی ئالودەبوو بە شیزۆفرینا دەربکەوێتو هەمیشە درزێکی گەورە لەنێوان کەسێتی حیزبو مومارەسەکردنی حیزبدا هەبێت، حیزب خاسێتی دیموکراسی یان سۆشیال دیموکراتی لەخۆی نابێت بەڵام نادیموکراسیو دلخراوو خێڵایەتیو کۆمپرادۆر بێت، خۆی بە حیزبی پێشڕەوی زەحمەتکێشان ناو ببات و بەڵام سەرکردایەتییەکەی لەسەر بنەمای پشتی خێڵو عەشیرەتو ناوچەگەری دانرابنو زەحمەتکێشی بێ پشتی خێڵو

عەشیرەت هەمیشە پێشمەرگەبن‌و قوربانی ڕێگای خەباتێك بن كە بڕوایان پێیەتی بەڵام سەركردایەتی بەرەو ئەو ئامانجە ئاراستەیان نەكات. حیزب دروشمی نەتەوایەتی بەرز دەكاتەوە لەسەر ئاستی ناوخۆ بەڵام لەبەر ئەوەی نەبۆتە حیزبی نەتەوایەتی‌و لەڕووی پێكهاتنەوە سنووری خێڵایەتی‌و سنووری ناوچەگەری‌و هەرێمایەتی بەجێنەهێشتووەو هەڵگری گوتاری نەتەوەیی نییە، هەمیشە لە ئاستی داواكارییە نەتەوەییەكاندا كەسێتێكی جووت ئاراستەی هەیە یان كەسێتێكی جووت هەڵوێستی هەیە لەسەر ئاستی ناوخۆ، خۆی وەكو حیزبی پێشڕەوی نەتەوە نیشان دەدات بەڵام لەڕووی عەمەلی‌و لەبەرامبەر ئەوی داگیركەری كوردستاندا لاوازەو ناتوانێت پێ لەسەر مافەكانی نەتەوە دابگرێت چونكە نەبۆتە حیزبێكی نەتەوەیی. حیزبی نەتەوەیی بەو مانایەی كە هەڵگری گوتاری نەتەوەیی بێت‌و پرۆژەی نەتەوەیی هەبێت لە كۆمەڵگایەكی كراوەدا دروست دەبێت كە هەرەمی خێڵ‌و عەشیرەت‌و عەقڵ‌و ستراتیژی خێڵ لە كۆمەڵگادا باڵادەست نەبێت. بەڵكو بەپێچەوانەوە حیزبی نەتەوەیی لە كۆمەڵگایەكدا دروست دەبێت كە كۆمەڵگا لە ڕووی پەرەسەندنەوە گەیشتبێتە ئاستێك كە عەقڵ‌و ستراتژو پێكهاتەی خێڵایەتی هەڵوەشابێتەوە، ئەوەش تەنیا لە كۆمەڵگایەكدا دەبێت كە شۆڕشی پیشەسازی گەیشتبێتە ئەنجام‌و چینی بۆرژوای پیشەسازی‌و بۆرژوا نیشتمانی بەتەواوی دەركەوتبن‌و ئابوری خێڵ‌و پەیوەندییە ئابورییەكانی قۆناغی فیوئیال هەڵوەشابنەوەو پەیوەندی ئابوری‌و پەیوەندی بەرهەمهێنانی بۆرژوازی جێگای گرتبێتەوە، لەو كاتەشدا ئینتیما بۆ سەرخێڵ‌و سەرۆك عەشیرەت‌و ناوچەو هەرێم‌و شار هەڵدەوەشێتەوەو ئینتیما یان بۆ چینی كۆمەڵایەتی دەبێت یان بۆ نیشتمان، لەوكاتەدا حیزبی نەتەوەیی یان نیشتمانی ئەوتۆ پێكدێت كە هەڵگری گوتاری نەتەوەیی بێت. دیارە داخراوی كۆمەڵگای كوردی تەنیا پەیوەست نییە بەو بنیادە خێڵایەتیەی كە ئەم كۆمەڵگای پێكهێناوە، بەڵكو چەند هۆكارێكی تریش دەوری كاریگەرییان بینیووە لە سروشتی پێكهێنانی ئەم كۆمەڵگایەداو

مانەوەی وەکو کۆمەڵگایەتی داخراو. کە یەکێك لەو هۆکارانە تۆپۆگرافیای کوردستانە[٥] کە بەشێوەیەکی ئەوتۆ کاری کردووە تەنانەت کۆمەڵگای کوردی خستۆتە حاڵەتێکەوە کە ئەگەر بە وردی لێکدانەوەی بکرێت ئەوا بەپێی پێناسە سۆسیۆلۆژییەکان دەشێ زۆرێك لە خاسێتەکانی کۆمەڵگای نەبێت یان بە لایەنی کەمەوە ناتەواوی زۆری هەبێت لە روانگەی بوونیەوە بە کۆمەڵگایەکی خاوەن ناسنامە. هەرچەندە شێوازی جۆراوجۆری کۆمەڵگا هەیە[٦].. جیاوازی ئاشکرا لەنێوان کۆمەڵگای وڵاتانی سەرمایەداریو کۆمەڵگای وڵاتانی دواکەوتوودا بە ئاشکرا دەبینرێت، بۆ نموونە ناشێت کۆمەڵگای چینی هەر هەمان شێوازی کۆمەڵگای بەریتانی یان کۆمەڵگای سودانی هەبێت. زانینی ئەو جیاوازییە هەر لە خۆوە بڕیار نادرێت هەروەك هاوشێوە بوونی کۆمەڵگاکانیش ناکرێت لەسەر بنەمای هەندێ خاسێتی هاوبەشو لێکچوو بڕیار بدرێت.. لە توێژینەوەی باری کۆمەڵایەتیدا بەکارهێنانی دابەشبوونە فیکرییەکان شتێکی باوە ئەویش وەکو هۆکارێك بۆ تێگەیشتن یان لێکدانەوەی لێکچوونو جیاوازی[٧] بە هەر حاڵ کۆمەڵگای کوردی تەنیا بە هاوشێوەکردن لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تردا بڕیاری قۆناغی ژیانیو ئاستی پەرەسەندنیو سروشتی ژیانیو ناسنامەکەی دراوە، بە واتایەکی دی بەبێ توێژینەوەی بنیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی لەسەر بنەمای ئەوەی لەبارەی کۆمەڵگاکانی ترەوە گوتراوە بەسەر ئەم کۆمەڵگایەشدا سەپێندراوە. بۆ نموونە حیزب شیوعی عێراقی لە درێژەی مێژووی خۆیدا کۆمەڵگای عێراقی هاوشێوە کردووە لەگەڵ کۆمەڵگای روسیای پێش شۆڕشو تەنانەت کۆمەڵگا پەرەسەندووەکانی ئەورووپاشداو کۆمەڵگای کوردیشی جیانەکردۆتەوە لە کۆمەڵگای عێراقی، کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان کۆمەڵگای کوردی هاوشێوە کردووە لەگەڵ کۆمەڵگای چینیدا، سەرجەم شێخو سەیدەکانی کوردستان خۆیان دەبەنە سەر پێغەمبەرو کەس‌وکاریو تێڕوانینی ئایینییەکانیش لە کوردستاندا واتە ئەوانەی لە روانگەی ئیسلامەوە لێکدانەوەی

کۆمـەڵگای کـوردی دەکـەن جیـاوازی لـەنێوان کۆمـەڵگای کـوردیو کۆمـەڵگا ئیسلامیەکانی تـردا ناکـەن.. هـەموو ئـەم هاوشـێوەکردنانەش لاوازی عـەقڵی لێکدانەوەیـە لـە پانتـایی رۆشـنبیریو سیاسـیو کۆمەڵایـەتی کوردیـداو لـەبری هەڵهێنجانی دەرئەنجامەکان لەنێو خودی کۆمەڵگاوە ئەو دەرئەنجامانە بەسـەر کۆمـەڵگای کوردیـدا دەسـەپێنن کـە لـە کۆمـەڵگاکانی تـردا بەدەسـتهاتوون.. ئەمەش سروشتی ئەو حاڵەتەیە کە تیایـدا سـەرخان لـە کۆمەڵگایەکـەوە قـەرز دەکرێت بـۆ کۆمەڵگایـەکی تـر، کـە بەگشتی حاڵـەتی خواسـتنی سـەرخان لـە کۆمـەڵگاکانی تـرەوە بـۆ کۆمـەڵگای کـوردی شـتێکی لەبەرچـاوەو ئـەوە لـە بنەڕەتدا لەژێر کاریگەری کەلتوری ئەوانی تردا سەری هەڵداوەو مێـژووی دوورو درێژی ژێر دەسـتەییو باڵادەسـتبوونی کـەلتوری ئـەوان عـەقڵو بیرکردنـەوەی کوردی لەکارخستووە، نەك بەرەو کرانەوە کـوردی ئاڕاسـتە نـەکردووە بـەڵکو یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی دلخران مانەوە لە قۆناغی منـداڵی کۆمـەڵگادا، کاریگەری داگیرکردنو فەرهـەنگی ئـەوانی داگیرکـەرە. بـە مانایـەکی تـر کـورد سەرباری ئـەوەی لـەڕووی سیاسـیو مێـژوویيو جوگرافییـەوە کۆڵۆنی کـراوە، دیسان خواستنی گوتارو سـەرخانی خواسـتراویش چ بـە خواسـتی کـورد خـۆی بێت یان لەڕووی بێ ئاگاییەوە بێت یان وەرگرتنـی بێـتو توانـای کـارپێکردنو گونجاندنی لەئارادا نەبێت.. لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو خواستنە بۆتـە شـتێکی نامۆ لە کۆمەڵگای کوردیـداو ئـەنجامیش رووکەشـێکی رەونەقـدارکراو لکێنـراوە بەژێرخانێکی کۆمەڵایەتی وێرانەوە کە ئەو رووکەشە وەکو دیمەنێکی موزەیەف خۆی نواندووە چونکە پەیوەندی نەبووە بـە سروشـتی کۆمەڵایـەتی کۆمـەڵگای کوردییەوە چ لەڕووی ئەو جۆری شیکردنەوە سادانەی بـۆ قۆناغەکـە کـراوە، چ لەڕووی ئەو بەرنامـەی کـە حیزبـەکان بـۆ قۆنـاغی شـۆڕش خسـتویانەتەڕوو، چ لەڕووی ئەو دامودەزگایانـەی کـە لـەماوەی دەسـەڵاتدارێتیاندا لـە کوردسـتاندا بـەناوی رێکخـراوی دیمـوکراتیو جەماوەرییـەوە دروسـتیان کـردوون سـەرجەم حاڵـەتی خواسـتنی سـەرخانو نـەتوانینی قسـەکردن لـەنێو خـودی کۆمـەڵگای

کوردییەوە ناتوانێت کۆمەڵگای کوردی لە حاڵەتی داخراوەوە بگوازێتەوە بۆ حاڵەتی کراوە، بەڵکو بەجۆرێکی تر تەشویهی رەوتی سروشتی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی دەکات.

رۆڵی تۆپۆگرافیا لە داخستنی کۆمەڵگای کوردیدا رۆڵێکی لەبەرچاوە لەو روانگەیەوە کە ئەو فۆپۆگرافیایە لەڕووی دیمۆگرافیەوە پێکهاتەی خێڵ‌و عەشیرەتەکانی بەجۆرێك دابەشکردووە کە رووبەری پەیوەندییەکان‌و ئاڵوگۆڕی پەیوەندی زۆر تەسك بێت‌و، بەجۆرێك هەر ناوچەیەکی بچوکی داخراو وەکو یەکەیەکی سەربەخۆی پەرت‌و دابڕاو دەربکەوێت، کە ئەوەش لەلایەك ئاستی کۆمەلایەتی بوونی لاوازکردووە، لەلایەك پەیوەندییەکانی خوێن‌و دەماری بەهێزتر کردووە کە خوێن‌و دەمارگیریش لە بنەما سەرەکییەکانی پێکهاتەی داخراوی خێڵ‌و عەشیرەتن، لەلایەکی ترەوە ئەم تۆپۆگرافیانە دەوری هەبووە لە مێژووی دروستبوونی شاردا لە کوردستاندا، بەجۆرێك ئەو شارانە دروستبوون تاکو ئێستاش خاسیەتی گوندی گەورەیان هەیە نەك خاسیەتی شار. بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی شاری سلێمانی بدەین لەڕووی دابەشبوونی دانیشتوانەوە تیایدا ئەوا دەبینین خەڵکی هەر ناوچەیەکی لادێ کە هاتوونەتە شار لەو بەشەی شاردا نیشتەجێ بوون کە دەکەوێتە لای ناوچەکەی خۆیانەوە، بە مانایەکی دی لەو رووبەرەی کە ناوی شاری لێنراوە داخرانێکی تەواوی کۆمەلایەتی ئەوتۆ هەیە کە هیچ کارلێکێکی کۆمەلایەتی ئەوتۆ دروست نەبێت کە کاریگەری لەسەر کۆمەلایەتی بوونی خەڵك هەبێت. بۆیە دەبینین عەقڵی باوو رەوشتی باوو تەقسی کۆمەلایەتی باو لەم شارەدا هەمان عەقڵ‌و رەوشت‌و تەقسی لادێیە، تەنیا هەندێ دیمەنی سادەی رووکەشی بێگەوهەر نەبێت کە لەڕێگای سەرخانی گواستراوەو لەڕێگای تەلەفزیۆنەوە گەیشتۆتە ئێرە، بەبێ ئەوەی زەمینەی عەقڵی‌و کۆمەلایەتی لەئارادابێت بۆ کارپێکردنی ئەو دیمەنە خواستراوە بۆ نموونە لەشاردا دەبێ هەر کەسێك ئینتیمای بۆ چین‌و توێژی کۆمەلایەتی هەبێت‌و پەیوەست بێت بە رێکخراوو سەندیکاو یانەو

کۆمەڵەی مەدەنیو دیموکراسییەوە هەر کەس بەناوی خۆیەوە بناسرێتەوە، بەڵام لەشاری ئێمەدا واتە لەناو جەرگەی شاردا ئەندامان ئینتیمایان بۆ خێڵو عەشیرەتو ئەو ناوچەیە هەیە کە پێشتر خێڵ یان عەشیرەتەکەی یان باپیرانی لە ئەویٚ ژیاون، تەنانەت ئەم دیاردەیە لە پێش خەڵکی ئاساییەوە نوخبەی رۆشنبیر پەیرەوی دەکاو بۆ نموونە ئەو ناوانەی دەنووسن یان لەبواری هونەردا کار دەکەن یان لە هەر بوارێکی تری چالاکی کۆمەڵایەتیدا بەشدارن لەبری ئەوەی کوڕی باوکیان بن کوڕی گوند، یان ناوچە یان خێڵو عەشیرەتن، چەندین کەس لەدوای ناوی خۆیانەوە ناوی بەرزنجی، قەرەداخی، کۆیی، مەتینی، زاخۆیی، هیرانی، میراودەلی، هەورامی، زەنگەنە، جاف، هەڵەبجەیی، سەنگاویی، کاکەیی.. تەنانەت لەگەڵ ناوی وەزیرەکانی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمدا هەمان مەسەلە لەبەرچاوە.. کاکەیی، شاکەلی، زاخۆیی.. ئەمەش لەڕوویەکەوە ئەوە دەگەیەنێت کە ناوی شوێنو خێڵو عەشیرەت هەوڵێکە بۆ ئەوەی ناوێکی نەناسراو بکات بە ناسراو بەڵام لە بنەڕەتدا ئەم جۆرە مامەڵەکردنە بەرهەمی لاوازی ئینتیما بۆ نەتەوەو ئینتیما بۆ نیشتمانەو لەجێگای ئەوەش بوونی ئینتیمایەکی بەهێزە بۆ گوند، ناوچە، هەرێم، خێڵ، عەشیرەت، حیزب.. کە ئینتیماش بۆ هەریەکە لەم پێکهاتە بچوکانە لە خاسێتە دیارەکانی کۆمەڵگای داخراوە. لە کۆمەڵگای داخراودا سنووری کۆمەڵایەتی بوون تەسکە، هەر بەو پێیە عەقڵی دلخراوو روانینی تەسك بەرهەم دێت. ئەم پەیوەستبوونە بە ناوچەگەرێتیو بە نەسەبەوە ئاستی لاوازی کۆمەڵایەتی بوونو ئاستی لاوازی هەستو هوشیاری نەتەوایەتی نیشان دەدات. تەنانەت حیزبی کوردیش نەیتوانیووە لەو پەیوەستبوونە ناوچەگەرێتیو نەسەبیە رزگاری ببێت بەڵکو بەپێچەوانەوە لەبەر ئەوەی حیزبی کوردیش خۆی لەسەر هەمان زەمینەو لە هەمان بنیادی کۆمەڵایەتی پێکهاتووە زیاتر پەیوەستبوونی ناوچەگەرێتیو خێڵایەتی پەرە پێداوە. ئەندامی سەرکردایەتی حیزب بەپێی ئەو پێوانانە دانراون. ئەگەر سەرنجی هەردوو حیزبی دیاری

کوردستان بدەین دەبینین مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیان بەپێی شارو ناوچەو عەشیرەت دانراون. لە حکومەتیشدا ئەگەر سەرۆك وەزیران هەولێری بێت ئەوا جێگرەکەی خەڵکی سلێمانی بووە، ئەگەر وەزیرێك خەڵکی سلێمانی بێت ئەوا جێگرەکەی خەڵکی دهۆك یان هەولێر بووە، ئەمە جگە لەوەی سەرکردایەتی ئەم دوو حیزبە سەرەکیەی کوردستان ئەوەندەی خەریکی کۆکردنەوەی خێڵو عەشیرەتو خزمانی فلان شوێن بوون ئەوەندە سەرقاڵی کاری رێکخستنی جەماوەر نەبوون کەواتە پێکهاتەی داخراوی خێڵو عەشیرەت لە کۆمەڵگای کوردیدا هەر ئەوە نییە کاری لەسەر خودی پێکهاتەکان خۆیان کردبێت بەڵکو ئەم پێکهاتەیە بنەمای سەرەکی کۆمەڵگای کوردییە.

هەر بە ئەمان شێوە تۆپۆگرافیای نالەبارو پێکهاتوو لە چیاو دۆڵو گردو دەشتی تەسكو ئیکتیفای زاتی ((بەشی خۆکردن)) لەرووی ئابوورییەوە(٨) کە هەم تۆپۆگرافیاو هەم ئیکتیفای زاتی وایکردووە کە مرۆڤی کوردی دابەش بوو بەسەر کانیو کارێزەکانداو ژیاو لە شێوەی گوندی بچووکی نێوان چیاو شاخەکاندا کە تەنیا ئاسمانی لێوە دیارەو تەنیا گوندە نزیکەکانی تر پێی دەزانێت لە مێژووی مرۆڤی کوردیدا ئەو روانینە مەودا تەسکەی بەرهەم هێناوە کە سنووری دنیا هەر گوندەکەی ئەمو چەند گوندێکی نزیکیەتی، ئەوەش ئاسۆی مرۆڤی کوردی تەسك کردۆتەوەو روانینێکی داخراوی لە کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردیدا بەرهەم هێناوە کە ئەوەش بنەمای کۆمەڵگای داخراوی کوردی پتەوکردووە.

یەکێك لە هۆکارەکانی تری هێشتنەوەی کۆمەڵگای کوردی بە کۆمەڵگایەکی داخراو مەسەلەی ئایینە. ئەوە ئاشکرایە کە ئایین بەگشتی پێکهاتەیەکی داخراوە بەو مانایەی یەك رەهەندی بینینی هەیەو لەسەر بنەمای روانینێکی رەها بنیادنراوە کە مەبەست لەوەش رەهایی خۆیو رەتکردنەوەی هەموو دەرەوەی خۆیەتی. لە کۆمەڵگای کوردیدا بەتایبەتی لەو کاتەوە کە بووەتە هەڵگری پەیامی ئیسلامی، ئایین زەمینەی یەکگرتنەوەی لەنێوان داخرانی

ئایینیو داخرانی خێڵایەتی رەخساندووە، شەرائیعو ئایینەکانو هەر کارێکی تر کە پەیوەست بێت بە جەماوەرەوە ئایینو خێڵایەتی پێکەوە کاریان تیا کردووەو رێگای کرانەوەیان نەداوە. بۆ چەندوچوون دەبێ دەمارگیری (خێڵایەتی) بنەما بێت، ئەگەر ئەو داواکارییە بەبێ (خێڵایەتی) نەگاتە ئەنجام، ئەوا (خێڵایەتی) پێویستییەکی میللییەو بەهۆی ئەوەوە فەرمانی خودا دەگاتە ئەنجام[٩] لەم گوتەیەی ئیبن خەلدوندا بە ئاشکرا پەیوەندی ئایینو دەمارگیری دەردەکەوێت، ئەو سیاقەشی کە ئەم گوتەیەی تێدا هاتووە سیاقێکە بۆ پەیوەندی نێوان ئایینی ئیسلامو خێڵایەتی عەرەبی، دەشێ وەها لێکبدرێتەوە کە یەکێك لە هۆکارەکانی داخرانی کۆمەڵگای عەرەبی بەتایبەتیو کۆمەڵگای ئیسلامی بەگشتی بگەرێتەوە بۆ پێکەوە کارکردنی دەمارگیری خێڵایەتیو داخرانی ئایینیو تاك رەهەندی ئایینی. وەك ئاشکرایە لە کۆمەڵگای کوردیدا دەمارگیری خێڵایەتیو داخرانی ئایینی لەو روانگەوە یەکیان گرتۆتەوە کە هەردووکیان بنەمای داخراوی کۆمەڵگای کوردییان زیاتر چەسپاندووە چونکە هەردووکیان لە هەمان هەرەمی فەرمانو لە هەمان هەرەمی پێکهاتندا هاوشێوەن. هەرەمی خێڵ هەرەمێکە فەرمان لە لوتکەوە بەرەو بنکە ئاراستە دەکرێت، بە هەمان شێوە لە هەرەمی دەسەڵاتی ئایینیدا فەرمان لە لوتکەی هەرەمەکەوە کە رۆحی باڵای خواوەند لەو لوتکەیەدایە بەرەو خوارەوە ئاراستە دەکرێت واتە بۆ بنکەی هەرەمەکە کە جەماوەرتی بڕوادارو پەیڕەوکەری ئایینەکە ئەگرێتەوە. لە هیچ کام لەم دوو ئاراستەی فەرمان کردندا کەس مافی ئەوەی نییە هیچ فەرمانێك رەت بکاتەوە، بەڵکو مافی گفتوگۆ کردنیش لەسەر هیچ فەرمانو بڕیارێکی سەرەوە لە سنووری ئەو دوو هەرەمەدا نیە، لە هەر بنیاد یان پێکهاتەیەك یان دامەزراوێکدا کە تەنیا لوتکە فەرمان بکاتو خوارەوە جگە لە جێبەجێکردن هیچ مافێکی نەبێتو توانای گفتوگۆکردنیش لەئارادا نەبێت واتە فەرمان یەك ئاراستەی هەیە، ئەمەش تەنیاو بەس تەنیا لە هەرەمە داخراوەکاندا بەرهەم دێت، بەگشتی ئەو دامەزراوانەی کە تیایاندا

فەرمان لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئاراستە دەكرێت خوارەوە مافی بەشداری هیچ فەرمانو بڕیارێكیان نییە ئەوا ئەو دامەزراوانە دامەزراوی داخراون. لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین لە كۆمەڵگای كوردیدا فەرمانو بڕیار بەگشتی لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئاراستە دەكرێتو مافی گفتوگۆو رەتكردنەوەی فەرمانو بڕیاریش بۆ خوارەوە نییە، لەو روانگەیەوە دەتوانین سەرنجی دامەزراوەكانی خێزان، خێڵ، عەشیرەت حیزب، دامەزراوی ئایینی، رێكخراوی دیموكراتیو جەماوەری سەندیكا، یەكێتیی، یانە بدەین. دیارە كۆمەڵگاش لەكۆی ئەم دامەزراوانە پێكهاتووە بۆیە، كۆمەڵگاش دەبێتە هاوشێوەی ئەم دامەزراوانە واتە دەبێتە كۆمەڵگایەكی داخراو كە لە راستیشدا بنەمای سەرەكی ئەم داخرانە پێكەوە كاركردنی خێڵایەتیو ئایینە.

بەلای ئیبن خەلدونیشەوە خێڵایەتی دەكەوێتە پێشی ئایینەوەو ئەو پێی وایە ئەگەر خێڵایەتی بپوكێتەوە شەرانیەكانیش دەپوكێنەوە بێگومان داخرانی كۆمەڵگا دەكەوێتە سنووری ئەو شەرانیمانەوە كە ئیبن خەلدون لە تیۆرە كۆمەڵناسیەكەیدا باسی لێوە دەكات. یان بە مانایەكی تر ئەگەر هەر شەرانیمێك لەسەر بنەمای خێڵایەتیو دەمارگیری بنیاد نەنرابێت ئەوا هەمیشە لەبەردەم ئەگەری هەڵوەشاندنەوەدایە.. شەرانیەكان هەڵدەوەشێنەوە ئەگەر پایەكانیان لەسەر بنەمای خێڵایەتی بنیاد نەنرابن[10] دیارە لەو هەڵوەشاندنەوەشدا ئەگەری كرانەوەی كۆمەڵگا دێتە ئاراوە. بەلام بەگوێرەی كۆمەڵگای كوردی پایەی سەرەكی بنیادنانی سەرجەم شەرانیەكانو دامەزراوە كۆمەلایەتیەكان رایەڵەی دەمارو خوێنە كە ئەوانیش پایە سەرەكیەكانی خێڵایەتین، دەشێ دامەزراوی خێڵ لە رووكەشدا گۆڕانی بەسەردا هاتبێت یا گۆڕانی رووكەشی بەسەردا بێت بەلام گەوهەرو ماهیەتی ئەو دامەزراوە هەروەك خۆی ماوەتەوە، تەنانەت دامەزراوەكانی حیزبو رێكخراوو سەندیكاو یانەكانو یەكێتییەكانیش كە دامەزراون هەمان پێكهاتەی هەرەمی خێڵیان هەیەو بە هەمان میكانیزم كار دەكەن، بۆیە ئەگەر لە

رابـردوودا ئـایینو کـەلتوری داخـراوو خۆپـارێزی خێڵایـەتی پێکـەوە کاریـان کردبێتو یەکیان گرتبێتەوەو سـەرخانی داخـراوی خێڵایـەتی ئایینیـان بەرهـەم هێنابێـت، ئـەوا لـە قۆنـاغی ئێـستادا سـەرباری ئامـادەبوونی تـەواوی هـەمان حاڵەت، ئـەوا یەکگرتنـەوەی ئایـدیۆلۆژیاو روانینـی داخـراوی ئـەو دامەزراوانـەو کەلتوری داخراوی کۆمەڵگای کوردیو سـەرخانی داخـراوی خێڵایـەتی پێکـەوە لەگەڵ سەرخانێکی خواستراوی دەرەوەی زەمینەی واقیعی کۆمەڵگای کوردیـدا پێکەوە سەرخانێکی موزەیفو لە هەمان کاتدا داخراویان لە کۆمەڵگای کوردیدا بەرهەم هێناوە کە بەڕووکەش هاوچەرخو کراوەیەو لـە گەوهەریشدا تەقلیدیو داخـراوە، ئـەوەش بـاری نائاسـایی سـەرخانی بـاوی ئێـستای کۆمەڵایـەتی کۆمەڵگای کوردییە. ئەوەش ئەگەر لە نموونەیەکی بەرجەستەدا نیشان بدەین دوو وێنە دێتە پێش چاومان کە هەردووکیان نـەگونجاون لەگـەڵ بـاری واقیعـی خۆیاندا، یەکەمیان وێنەی کەسێتییەکە بە جلوبـەرگو رووکەشێکی مۆدێرنو هاوچەرخانەوە کە هەڵگری عەقڵی داخراوی خێڵەکە ئەمەش خاسێتی بەشێکی دیـاری کۆمــەڵگای کوردییــە بــە زۆریــەی رۆشـنبیرەکانیو بــە بەشـێکی حیزبەکانیـشیەوە. وێنــەی دووەم وێنــەی کەسـێتییەکە بــە جلوبــەرگو روکەشێکی تەقلیدیو کۆنو فۆلکلۆرییەوە کەوا ئیدعا دەکات هـەڵگری عـەقڵی کراوەی سەردەمە. ئەمەش بارێکی تـری دیـاری نێـو کۆمـەڵگای کوردییـە، کـە وەکو ئەوە وایە سەرخێڵێك خۆی بە هەڵگری پرۆژەی هاوچەرخێتیو تازەگەری دابنێت. بە مانایەکی دی ناتوانین وای ببینین کە عەقڵی داخراوی خێڵایەتی کـە لە دامەزراوەکانی خێڵو عەشیرەتو حیزبو دامەزراوەکانی بەناو دیموکراسـیو جەماوەریـدا کـار دەکـاو عـەقڵی بالادەسـتە پـرۆژەی کرانـەوەو هاوچـەرخێتی هــەڵناگرێت. هــەر بــە هــەمان شـێوە رووکەشــی ئـازادی بـیروڕاو رووکەشـی دیموکراسـیو تەنانـەت پـەراوێزی دیموکراسـی تەسـکو رووکەشـی کۆمـەڵگای مەدەنی کـە ئەمانـەش بەرهـەمی پەرەسـەندنی کۆمـەڵگای کـوردی نـین بـەڵکو خواسراون.. ئەمانەش بەو عەقڵیەتە داخراوەی لە پشتیانەوەیە لەبـەر ئـەوەی

بەرهەمی گەشەی سروشتی کۆمەڵگای کوردی نین ناتوانن ببنە پرۆژەی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگای کوردیدا.

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی داخراویی کۆمەڵگای کوردی دابو نەریتی خۆپارێزو داخراوی کۆمەڵگای کوردییە. هەڵبەت ئەم دابو نەریتەش بەرهەمی مێژوویەکی دووروودرێژی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایەو بووەتە بەشێك لە بوونی‌و، پانتایی کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای داگیرکردووە بەجۆرێك کە نەریتی کۆمەڵایەتی‌و نەخلاقی کۆمەڵایەتی‌و چەمکی شەرەفی کۆمەڵایەتی پێش بنەماکانی ئایین‌و شەریعەت کەوتوون. نەریتی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا خاسێتی پیرۆزبوونی پێبڕاوەو زۆر لایەنی بووەتە (تابۆ) بەو مانایەی کە شایەنی دەست لێدان نییە ئەمەش دابو نەریت دەخاتە ئاستی ئایینەوە واتە دەسەلاتی رەها بوونی پێ دەبەخشێت‌و هەر لێدوان‌و تەجاوز کردنێکیشی قەدەغە دەکات ئەوەش لەو روانگەیەوە کە پیرۆزییان پێبەخشراوە. دیارە هەر دیاردە یان شتێکیش پیرۆزی پێبەخشرا دەبێ رێزی لێ بگیرێت.. پیرۆزی هەڵوێستی پێ سەرسام بوون‌و رێزگرتن‌و نهێنی بوون‌و ترساندن‌و شەرمەندی بەرهەم دێنێ. ئەم رێزگرتنەش بۆ دیاردەی دیاریکراو گواستنەوەی لە حاڵەتی دنیاییەوە بۆ حاڵەتی پیرۆزیی پێشکەش کردووە[11] خاسێتی پیرۆزی بە هەر دیاردەیەك یان پێکهاتەیەك یان دامەزراوێك ببەخشرێت ئەوا ئەو دیاردەیە یان ئەو پێکهاتەو دامەزراوە خاسێتی دیاردەو پێکهاتەو دامەزراوی ئایینی وەردەگرێت، هیچ دیاردەو پێکهاتەو دامەزراوێکی ئایینی شایانی لێدوان نییە چونکە پیرۆزی خاسێی رەها بوونی پێبەخشیووەو هەموو دیاردەیەکی پیرۆز یان رەها لە گەوهەریدا بە سروشتی خاسێی داخرانی هەیە باشترین نموونەش خودی ئایینە، بە مانایەکی تر لە ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا سەرەتایی‌و دواکەوتووەکاندا دابو نەریت خاسێتی بە تەوتەم بوون وەردەگرێت، تەوتەمیش پەیوەستە بە ئایینەوە یان بە روانینی ئایینییەوە دۆرکایم رای وایە، تەوتەمیزم سیستەمێکی ئایینییە کە تیایدا شتی دیاریکراو بەتایبەتی ئاژەڵو

رووەك بە پیرۆز دادەنێت[١٢]. لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا بەتایبەتی لە کۆمەڵگای داخراوو تەقلیدیدا کە لەڕووی ئایینییەوە پەیرەوکەری ڕۆحی باڵای خودابن، دابو نەریتە کۆمەڵایەتیو ئایینیەکان ئەو خاسێتی پیرۆزییەیان پێدەبەخشرێتو دەبنە تەوتەم، بەتەوتەم بوونیش خاسێتێکی دیاری کۆمەڵگای داخراوە، کۆمەڵگای کوردی دابوونەریتی خۆی بە پیرۆز دەزانێتو تەنانەت وەکو تەوتەمیش سەیری دەکات، لە راسیشدا ئەو دابو نەریتە لەگەڵ ئەوەشدا خاسێتی جوانی پەیوەست بە کەسێتی کوردی تێدایە، بەڵام لایەنی باڵادەستی خۆپارێزو کۆنەپەرستانەیەو بوار بۆ نیشکردنی عەقڵو کرانەوە ناهێڵێتەوەو هەمو مرۆڤ پەیوەست دەکات بەڕابردووەوەو مەودای ڕوانینو هەنگاونانی بەرەو ئایندە تەسك دەکاتەوە.

به مانایەکی دی لە کۆمەڵگای داخراودا ڕوانینێکی پارێزکارانە باڵادەستە کە دەیەوێت هەموو شتێ وەکو ئەوەی هەیە بمێنێتەوە چونکە لە هەموو گۆڕانکارییەك دەترسێتو پێی وایە گۆڕانکاری دەبێتە هۆی پەشێوییو تێکچوونی ئارامیو هارمۆنیای ژیان دەشێوێنێت، بۆ نموونە لویس دی بونالدی فەیلەسوفی پارێزکاری فەڕەنسی دژی هەر گۆڕانکارییەك بوو لە کۆمەڵگاداو گۆڕانکارییە شۆڕشگێڕییەکان دووچاری پەشێوییان دەکردو پەرۆشی گەڕانەوە بوو بۆ ئاشتیو هارمۆنیای سەدەکانی ناوەڕاست[١٣] کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی خۆپارێزە لەو ڕوانگەیەوە کە گیانی سەرکێشی زۆر لاوازە تێیداو بەردەوام هەوڵدەدات لەگەڵ واقیعی باودا چەندێ تفتو تاڵی تر بێت رابێت. ئەوەش تا ئەندازەیەك پەیوەندی بە ڕاهاتنییەوە هەیە بۆ ژیانی گرانی نێو چیای سەختو ئاوو هەوا ساردی وڵاتەکەی لە زستاندا. هەروەك پاڵنەری هێشتنەوەی کورد لە هەڵوێستی خۆپاراستندا بریتییە لە عەقڵی داخراوی خێڵایەتیو دابو نەریتی پارێزکارانەو پەیوەستبوونی توندی بە ئایینەوە کە سەرجەم ئەم حاڵەتانە وایان لە مرۆڤی کورد کردووە مرۆڤێکی گۆشەگیری ناچالاك بێت لەڕووی تێڕامانو بیرکردنەوەوەو هەموو شتێك بگێڕێتەوە بۆ لای

خوداو خۆی وەکو مەخلوقێکی قەدەری سەیر بکات کە بەپێی ئەوەی لە چارەی نووسراوە هەنگاو دەنێت، ئەم عەقڵیەتە باوەی کە لە کۆمەڵگای کوردیدا باڵادەستەو کار دەکات تا ئەندازەیەکی زۆر پەیوەندی هەیە بە قۆناغی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو ئاستی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردییەوە. لەرووی پەرەسەندنەوە کۆمەڵگای کوردی لە قۆناغی منداڵی کۆمەڵگادا ماوەتەوە چونکە تاکو ئێستا لەرووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییەوە نەگەیشتۆتە ئاستی دروستکردنی دەوڵەت، کۆمەڵگای بێ دەوڵەت کۆمەڵگایەکی ساوا یان سەرەتایی یان ئیفلیجە لەرووی گەشەکردنەوە، بە واتایەکی دی ئەو کۆمەڵگایەی دەوڵەتی نییە یان لە پەرەسەندنی خۆیدا نەگەیشتۆتە ئاستی بەرهەم هێنانی دەوڵەت کۆمەڵگایەکی نائاسایی یان ناسروشتییە دەوڵەت چییە بێجگە لە دیاردەیەك لە دیاردە کۆمەڵایەتییە سروشتییەکان کە بەپێی یاسایەکی سروشتی لەدایك دەبێت[14]. هەر لێرەوە دەتوانین بڵێین کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی سروشتی نییە، راستە داخرانی کۆمەڵگا خاسیەتێکی تێکرای کۆمەڵگا جیاوازەکان بووە، بەڵام ئەو خاسیەتە پەیوەستبووە بە قۆناغێکی دیاری ژیانی کۆمەڵایەتییەوەو لەگەڵ گۆڕینی ئەو قۆناغەی ژیاندا خاسیەتی داخرانیش بەرەو کۆتایی چووە لە کۆمەڵگای رۆژئاوایدا لەگەڵ دەرکەوتنی پۆزەتیڤیزمدا کە ئەویش بەندە بە پەرەسەندنی زانستو تەکنۆلۆژیاوە خاسیەتی داخرانی کۆمەڵگا بەرەو کۆتایی دەچێت. هەڵبەت ناشێت باسی دیموکراسیو ئازادی بکرێت لە کۆمەڵگای داخراودا، بۆیە لەگەڵ دروشمی ئازادی شۆرشی فەرەنسادا زەمینەی کرانەوە لە رۆژئاوا بەرەو فۆرمەلە بوون چوو، دیموکراسیش تەنیا لەسەر ئەو زەمینە کراوەیە بوونی دەبێت.

هەڵبەت مەسەلەی دیموکراسیو باسکردنی دیموکراسی لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەسەر ئاستی قسەکردن رووبەرێکی فراوانی داگیرکردووە ئەگەرچی خودی ئەو چەمکە نەك لای جەماوەر بەگشتی بەڵکو لای زۆرینەی نوخبەی رۆشنبیرو

سیاسیش چەمکێکی نەناسراوە ئەویش لەو ڕوانگەیەوە کە تەنیا نـاوی زاراوەی دیموکراسـی لێـرە ناسـراوە نـەك گەوهـەرو ماهیـەتو شـێوازی کـارکردنو چەسپاندنی. بێگومان ئەو قسەکردنەش لەبارەی دیموکراسییەوە لە کۆمـەڵگای دڵخراوی کوردیدا ئەو پرسیارەمان لا دروسـت دەکـات ئایـا دەشـێ کۆمـەڵگای داخراو بکرێت بە کۆمەڵگایەکی دیموکراسی؟

لە کۆمەڵگای داخراودا تاکە یەك ڕوانینو یەك بۆچوونو یەك لێکدانـەوەو یـەك ڕاڤەکردنو یەك تێگەیشتنو یەك بیرکردنـەوەو یـەك ئاڕاسـتەی کـارکردنو یـەك ناوەندی بڕیارو یەك ئایدیۆلۆژی باڵادەستو یەك جۆر ڕەفتارو یەك عەقڵ هەیەو کار دەکات دیموکراسیش بریتییـە لـە هاویەشـی لـە ڕاوبۆچـووندا، جیـاوازی لـە ڕوانینو تێگەیشتنو لێکدانەوەدا، جیاوازی لە ئاڕاستەدا، جیـاوازی لـە بڕیـاردا، جیـاوازی لـە عەقڵـدا، بـوار بـۆ بەشـداری کردنـی هـەموانو گـوێگرتن لـە ڕای زۆرینە.. ئایا ئەم دوو ئاڕاسـتە دژە پێکـەوە دەگـونجێن کـە یەکـەمیان عـەقڵی داخراو بەڕێوەی دەباتو دووەمیشیان عەقڵی کراوە؟ بێگومان هـیچ پانتاییـەك نامێنێتەوە بۆ مومارەسە کردنی دیموکراسی لە کۆمەڵگای داخراودا، کۆمەڵگای کوردی لەو جۆرە کۆمەڵگا داخراوانەیە کە ناشێت مومارەسەی دیموکراسی تێدا بکرێـت، خـۆ ئەگـەر پـەراوێزێکی لاواز بـۆ مومارەسـەیەکی لاوازی دیموکراسـی هەبێت ئەوە دەبێ بزانین ئەو پەراوێزە تەسکە لە ئەنجامی خواستی سـەرخانی دەرەوە بۆ نێو واقیعی کـوردی دروسـتبووە کـە ئـەوەش بـووە بـە بەڵگەیـەکی باش بۆ سەرکردایەتی سیاسی کـوردیو دەسـەڵاتی کـوردی کـە چـۆن ئـارەزوو بکەن باسـی دیمـوکراتی بکـەن. بـۆ نموونـە هەڵبـژاردن یەکێکـە لـە بنـەماکانی دیموکراسی. لە کوردستاندا جگـە لـە هەڵبـژاردنی پەرلـەمان لەسـاڵی (١٩٩٢). هەڵبژاردنی شارەوانیەکان لە سلێمانیو هەولێر کرا. لـە سـلێمانی کـە یـەکێتیی نیشتمانی تیایدا باڵادەستە پـارتی نـەیتوانی بەشـداری ئـەو هەڵبژاردنـە بکـات، هـەروا لـە هـەولێر کـە پـارتی تیایـدا، باڵادەسـتە یـەکێتیی نـەیتوانی بەشـداری هەڵبژاردن بکات، لە سلێمانی یەکێتییو لە هەولێر پارتی دەرچوو چـونکە هـیچ

مونافەسەیەك لە هەڵبژاردنەكاندا نەبوو جگە لە یەكگرتووی ئیسلامیو حیزبە بچوكەكانی تر كە هیچ كامیان مەترسییان بۆ سەر یەكێتیو پارتی نییە، راگەیاندنی هەردوو حیزب وەك پرۆسەیەكی دیموكراتیو بە قوڵیو بە حەماسەتەوە باسی ئەو هەڵبژاردنەیان دەكرد، بەڵام هەمووان دەزانین كە ئەوە جگە لە یارییەكی نادیموكراتیانە بەناوی دیموكراتییەوە هیچی تر نییە لەكاتێكدا حیزبی فەرمانڕەوا لە سنووری دەسەڵاتی خۆیدا هەڵبژاردن دەكاتو رێگاش نادات مونافیسە سەرەكییەكەی بەشداری ئەو هەڵبژاردنە بكات هەموو ئەو مەسەلانەی تر كە لە كوردستاندا بەناوی دیموكراسیەوە باسیان لێدەكرێت هیچیان لەو هەڵبژاردنانەی شارەوانیەكانی سلێمانیو هەولێر باشتر نین كە پێم وایە ئەم هەڵبژاردنانەش هیچ جیاوازییەكی ئەوتۆیان نییە لەگەڵ ئەو هەڵبژاردنانەی كە دیكتاتۆرەكانو رژێمە تۆتالیتارەكان لە وڵاتەكانی خۆیاندا ئەنجامی دەدەن بۆ فریودانی رای گشتی جیهانی. هەڵبەت نادیموكراتی بوونی ئەم هەڵبژاردنانەی لە شارەوانیەكانو لە رێكخراوە پیشەییەكانی كوردستاندا دەبینرێت، تەنیا یەكێتیو پارتی لێی بەرپرسیار نین، بەڵكو پەیوەندی بەو زەمینە كۆمەڵایەتییەوە هەیە كە یەكێتیو پارتیش بەرهەمی ئەون كە ئەوەیش زەمینەی خێڵایەتیو دواكەوتوو داخراوی كۆمەڵگای كوردییە.

ئێمە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە كرد كە لە كۆمەڵگای داخراودا یەك جۆر بیركردنەوەو یەك جۆر روانین هەیە كە ئەوەش بەرهەمی كەلتوری ئەو كۆمەڵگایەیە، كەلتوری كوردی راستە بەرهەمی واقیعی كۆمەڵایەتی خێڵایەتی دواكەوتووی كوردییەو ئەوەش هۆیەكی سەرەكییە بۆ باری داخراوی ئەم كەلتورە. بەڵام هۆیەكی سەرەكی تریش لەئارادایە كە بەدرێژایی مێژوو كاری كردووەو كاریگەری خۆی لەسەر كەلتوری كوردی هەبووە كە ئەویش باری داگیركردنو دابەشكردنە، داگیركردنو دابەشكردنی كوردستان لە مێژووی زۆر دێرینەوە لەسەر ئاستی كەلتوری بە دوو هێڵی هاوشان كاری لە كەلتوری كوردی كردووە كە ئەویش كاریگەرییەكی نێگەتیڤە لەو روانگەیەوە كە كەسێتی

کەلتوری کوردی لاواز کردووەو ڕوویەری بیرکردنەوەو ئیشکردنی عەقڵو مەودای خەیاڵی تەسك کردۆتەوە بەجۆرێك کە زەمینە خۆشکەر بێت بۆ بەرهەم هێنانی یەك جۆر لەبیرکردنەوە، یەك جۆر لە ڕوانین، یەك جۆر لە خەیاڵ، یەك جۆر لە ڕەفتار، ئاڕاستەی یەکەم یان هێڵی یەکەمی کاریگەری داگیرکردن لەسەر کەلتوری کوردی ئەوەیە کە کەلتوری داگیرکەر خۆی سەپاندووەو بووەتە جێگرەوەی کەلتوری کوردیو خۆی لەبری ئەو کاری کردووە ئەویش بە زمانو بە عەقڵی ڕۆشنبیریو بە ئاڕاستەی بیرکردنەوەشەوە، تەنانەت بە لایەنی ڕەفتاریو شێوازی هەڵسوکەوتو دەربڕینیشەوە، کەلتوری کوردی کردۆتە وێنەیەکی لەبەر شۆراوەی نێگەتیڤی کەلتوری عەرەبیو فارسیو تورکی تەنانەت لەسەر ئاستی مەسەلەی ڕۆشنبیریو عەقڵیو هەستو هوشیاری نەتەوەییش دەبنیت ڕۆشنبیریو عەقڵو هەستو هۆشیاری کوردی وەکو وێنەو پاشکۆی ڕۆشنبیریو عەقڵو هەستو هوشیاری عەرەبو تورکو فارس دەردەکەوێت. ڕۆشنبیریو عەقڵی ئەم سێ کەلتورەش کە کەلتوری داگیرکەرن لەسەر کوردستانو بۆ مانەوەی خۆیان ڕێگایان نەداوە بە هیچ ئاڕاستەیەکی جیاواز لە سروشتی ئاڕاستەی خۆیان دەربکەوێتو لە گەهەریشدا کەلتوری داگیرکەر کەلتورێکی دلخراوە لەو ڕوانگەیەوە کە هاتووە کەلتورێکی تر تێکبشکێنێتو لەناوی ببات بۆ ئەوەی خۆی جێگای بگرێتەوە، بە واتا کەلتوری داگیرکەر پڕۆژەی کوشتنی جیاوازیی هەڵگرتووە، کوشتنی جیهاوازیش یەکێکە لە بنەماکانی کەلتوری دلخراو. جگە لەوەش کەلتوری داگیرکەران لەسەر کوردستان خۆیان لە بنەڕەتدا کەلتوری داخراونو لەڕووی پەروەردەوەشەوە ئێمەی کورد بەو کەلتورە داخراوانەی داگیرکەرانی کوردستان پەروەردە بووین بۆیە زەمینەی کرانەوە لە واقیعی کۆمەلایەتیو کەلتوریو عەقڵی ئێمەدا لە ئاستێکی زۆر لاوازدایە.

ئاڕاستەی دووەمی کاریگەری کەلتوری داگیرکەران لەسەر کوردو کەلتوری کوردیو کەسێتی کوردی لەو ڕوانگەیەوەیە کە پڕۆژەی داگیرکردنی کوردستان

گیانی بەرەنگاربوونەوەی خولقاندووە لای گەلی کورد، وایکردووە کە خاڵی ناوەندی بیرکردنەوەو روانینو تێڕامانو لێکدانەوە بریتی بێت لە مەسەلەی رووبەڕووبونەوەی داگیرکەرو رزگارکردنی نیشتمان کە ئەوەش یەك کەلتورو یەك عەقڵو یەك روانینو یەك هەڵوێستی بەرهەم هێناوە ئەویش کەلتورو عەقڵو روانینو هەڵوێستی بەرگرییە. بێگومان لە حاڵەتی بەرگریشدا بوار بۆ لێکدانەوەی جیاوازو روانینی جیاوازو بەرهەم هێنانی عەقڵی جیاوازو هەڵوێستی جیاواز نابێتەوە، بەڵکو تاك رەهەندی لە هەموو رووییەکەوە دەبێتە خاڵی باوو باڵادەست کە ئەوەش خاسێتی کۆمەڵگای دلخراوە، بە مانایەکی تر هۆیەکی سەرەکی مانەوەی باری داخراوی کۆمەڵگای کوردی لە هەموو رووییەکەوە پەیوەندی هەیە بە پرۆسەی داگیرکردنو دابەشکردنو باڵادەست بوونی کەلتوری داگیرکەرەوە لە کوردستاندا. لە کوردستاندا لە مێژووی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتییەوەو لەو کاتەوە کە کورد هەستی بەژێردەستەیی خۆی کردووەو لەسەر ئەو بنەمایەش گیانی بەرانگاری سەری هەڵداوە، ئاراستەی کارو جوڵە لە فەرهەنگی کوردیدا یەك ئاراستە بووە کە ئەویش ئاراستەی بەرگرییەو ئەوەش وەکو تاکە کەلتوری نەتەوەیی کورد لێی دەڕوانرێت.. لە راستیشدا قسەکردن لەسەر تاکە کەلتورێکی نەتەوەیی فرە شێوەیی هوشیاریو شێوازەکانی بیرکردنەوەو رەفتاری باو لەناو ئەو کەلتورەدا دەشارێتەوە[15]. ئەوەش خاسێتی کۆمەڵگایەکی داخراوە کە بێگومان ئەم روانینە بە تەواوەتی بەسەر کۆمەڵگای کوردیدا دەچەسپێت. بەڵام بێ ئەوەی ئێمە لە ناوەندی رۆشنبیریو سیاسیو کەلتوری خۆماندا تاکو ئێستا توانیبێتمان پێداچوونەوەی ئەو واقیعە باوو باڵادەستەی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو مێژوویو کەلتوری خۆمان بکەینو بزانین ژێرخانی کۆمەڵایەتی ئێمە چ سەرخانێکی بەرهەم هێناوە بێ چەندو چوون لە بۆشایدا لەسەر خانێك دەدوێن کە نامۆیە بە واقیعی ئێمەو لە دەرەوە خوازراوە، بە واتا ئەو سەرخانە لە کۆمەڵگا کراوەکانەوە خوازراوە بۆ سەر واقیعی کۆمەڵایەتی

داخراوی ئێمە، دیارە ئێمە مەبەستمان لەم قسانە ئەوە نییە کە کۆمەڵگای کوردی هەموو دەرگاکانی دەرەوە دابخاتو ڕێگا نەدات بەوەی کە هیچ بەرهەمێکی دەرەوە لە زانستو زانیاریو تەکنۆلۆژیاو عەقڵو کەلتورو ڕوانین بێتە نێو کۆمەڵگای کوردییەوە، نەخێر مەبەستمان لەوەیە لەکاتێکدا کە کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی داخراوەو هێشتا لەڕووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییەوە زۆر لە دواوەیەو کۆمەڵگایەکی پەراوێزی نائامادەیە لەڕووی بەرهەمهێنانی فیکرو شارستانێتەوە. ناشێت ئەم واقیعە ڕەچاو نەکرێتو سەرخانی کۆمەڵگا پێشکەوتووە کراوەکان بهێنیتو ئیدعاو بانگەشەی بۆ بکەیت بەڵام لەڕووی پراکتیکەوە هەمان سەرخانی داخراوو دواکەوتووی خۆت پیادە بکەیت بانگەشەو باسی دیموکراسیو کۆمەڵگای مەدەنیو لێبوردنو ئازادی بیروڕاو قبولکردنی ئەوی دی تەنیاو بەس تەنیا قسە بێت کە ئەوەش لە ئاکامدا زیانی گەورەی لێ دەکەوێتەوەو ئەم زاراوانە کاتێ بەشێوەی موزەیفەو دوور لە واقیع بانگەشەیان بۆ دەکرێت، ڕێگا لە باری سروشتی دروستبوونو سەرهەڵدانو پیادەکردنیشیان لە داهاتوودا دەگیرێت. بە مانایەکی دی ئێمە دەبێ بەر لە هەموو شتێ کۆمەڵگای خۆمان بناسینو بزانین بەو پێیە چۆن کاری جدی دەکرێت لە ناوەوەی کۆمەڵگاو بە مەبەستی گۆڕانکاریو هەنگاونانی بەرەوپێشەوە. لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە سەرباری بەگومانەوە ڕوانین بۆ کۆمەڵگای کوردی وەکو کۆمەڵگایەکی خاوەن شوناس کە خاسێتە دیارەکانی کۆمەڵگای هەبێت، ئەم کۆمەڵگایە تاکو ئێستا نەیتوانییوە فیکر بەرهەم بهێنێت، نەبوونی فیکری هاویەش هۆکارێکە بۆ لاوازی یەکبوونو کۆمەڵایەتی بوونی پەرەسەندوو، ڕاستە پێداویستییەکانی ژیان جۆرێك لە کۆمەڵایەتی بوونی دروستکردووە، بەڵام ئەو کۆمەڵایەتی بوونە هەمان کۆمەڵایەتی بوونی کۆمەڵگا سەرەتاییو تەنانەت هەر دواکەوتووەکانیشە، بەواتایەکی دی دەتوانین بڵێین لەم کۆمەڵگایەدا یەك ڕوانینو یەك بیرکردنەوە بەرهەم هاتووە، بە واتا تەنیا گوتارێك ئامادەبوونی

هەیە کە ئەویش گوتارێکی داخراوی بارگاوی کراوە بە چەند رەگەزی دژو ناکۆکو نەگونجاو لەگەڵ یەکتر، ئەویش لەسەر بنەمای فرە رەهەندیو فرە ئاراستەییو جیاوازی بەرهەم نەهاتووە، بەڵکو لەبەر نەتوانینی گفتوگۆو یەکتر قبوڵ نەکردنو ترس لە جیاوازیو ترس لە سڕینەوەو لەنێو چوون وەکو کەشتی نوح لە هەر رەگەزێ جوتێك لە توخمە جیاوازەکانی تێدایە، ئەوەش وەکو کەشتی نوح نەبۆتەوە سەرەتاو درێژە پێدانەوەی ژیان، بەڵکو لەنێو خودی ئەو گوتارە ئاڵۆزەدا ناتەکتیفەدا رەگەزەکانی مردن ئامادەن، چونکە ئەو گوتارەی یەك رەهەندی هەیە ڕوویەری کارکردنی تەسکەو کاتی مانەوەشی لە ئایندەدا کورتە بە هەر حاڵ ئەم گوتارە تاك رەهەندە داخراوەش بەشێکی زۆری پایەو رەگەزەکانی لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵگای کوردییەوە هاتوونەتە ناوەوەو بکەری لاوازی کوردی نەیتوانیوە بە ئاراستەیەکی گونجاو بیخاتە کار. کە مەبەست لەو بکەرەش بزوتنەوەی جەماوەرییە کە ئەویش ناسیونالیستە کە ناشێت بەبێ بوونی ناسیونالیزم ئەو بکەرە جەماوەرییە دروست بێت. بە واتایەکی تر گوتاری داخراوی کوردی کە گوتاری خێڵایەتی ئایینیەو بەردەوامی دەداتە خۆی لە ئەنجامی قەیرانی ناسیونالیزمی کوردیو گوتاری ئەو ناسیونالیزمەیە.

# سەرچاوەکان
# کۆمەڵگەی داخراو


١ـ شياميلوف ـ حول مسألة الإقطاع بين الكرد ـ ترجمة و تقديم الدكتور كمال مظهر أحمد الطبعة الثانية ١٩٨٤ص٥.

٢ـ عەتا قەرەداغی ـ چەمكی دەوڵەت و بزوتنەری مێژوو لە كۆمەڵگای كوردیدا ـ سلێمانی ١٩٩٩ ل١٢٧.

٣ـ الدكتور فالح عبدالجبار ـ دەوڵەت ـ كۆمەڵگای مەدەنی ـ وەرگێڕانی ئاوات ئەحمەد ـ سلێمانی ٢٠٠٢ ـ ل٤.

٤ـ

4- Antony Giddens – Sociology – second Edition Macmillan – 1986-p4.

٥– عەتا قەرەداخی پەرەسەندنی ناسروشتی كۆمەڵگای كوردی ـ سلێمانی ٢٠٠١ ل١٧١.

٦ـ تيودور موت ادرنو ـ محاضرات في العلم الإجتماع ـ ترجمة جورج كتوزه.. مرطز إنماء القومي ص٢٨.

٧ـ أشلي مونتاعو ـ البدائية ـ ترجمة محمد عصفور ـ كويت ١٩٨٢ـ ص٢٥.

٨ـ عەتا قەرەداخی ـ پەرەسەندنی ناسروشتی لە كۆمەڵگای كوردی ـ سلێمانی ٢٠٠١ ل١٧٦.

٩ـ الدكتور محمد عابد الجابري ـ العصبية و الدولة ـ بغداد ـ ص٥٣٨.

١٠ـ إبن خلدون ـ مقدمة إبن خلدون ـ الجزء الثاني ص٥٤٠.

11- George Ritzer – Sociological Theory fifth edition New York – 2000 – p91.

12- Ibid – p91.

13- Ibid- p.11.

١٤ـ الدكتور عبدالله العروي ـ مفهوم الدولة ـ المركز الثقافي العربي ـ الطبعة السادسة. ١٩٩٨ ـ ص١٦.

١٥ـ الدكتور برهان غليون ـ أغتيال العقل ـ مكتبة مدبولي ـ الطبعة الثالثة، ١٩٩٠ ـ ص١٠٠.

# بەشی سێیەم

## کورد: گوتاری توونلو تیژیو
## کەلتووری داخراوو عەقلی بەرهەمهێنی تیرۆر

## سەرەتا:

لێرەدا هەوڵدەدەین ئاخاوتنی نێوان بنیادی کۆمەڵایەتیو سەرهەڵدانی توندو تیژی بکەینو لەوێشەوە لە ئامادەبوونی ئەو بنەمایانە بدوێین کە دەبنە هۆی بەرهەمهێنانی توندوتیژی، هەروەها لە هەمان کاتدا ئاخاوتنی ئەوە دەکەین کە چۆن توندوتیژی دەبێتە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی ئەو عەقڵیەتەی کە لە پشتی تیرۆرەوە تیرۆر بەرهەم دەهێنێت. لە هەمان کاتدا هەوڵدەدەین ئاخاوتنی ئەوە بکەین ئایا تیرۆر لە کۆمەڵگای کوردیدا رەگەوریشەی واقیعیانەی هەیە یان وەکو زۆر رەگەزی تری سەرخانی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی کوردییەوە خواستراوە؟ ئایا ئەو هۆکارانەی کە برەو بە پەرەسەندنی ئەو عەقڵیەتە دەدەن کە تیرۆر بەرهەم بهێنێتو بکەری تیرۆریزم ئامادەبکات چین؟ ئایا رێگاچارەیەکی پێشبینیکراو هەیە بۆ لاوازکردنی ئەو عەقڵیەتەی کە تیرۆر بەرهەم دەهێنێت یان نا؟

بێگومان سروشتی بنیادی کۆمەڵایەتی هەر کۆمەڵگایەکو شێوازی پەروەردەکردن لەو کۆمەڵگایەدا کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیە لەسەر چۆنێتی رێکخستنی ژیانو بەرێوەبردنی. لە هەمان کاتدا بنیادی پێکهێنەری کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنی عەقڵی کۆمەڵایەتیو رەفتاری کۆمەڵایەتیو هەڵوێستو مامەڵەی کۆمەڵایەتییە لە هەر کۆمەڵگایەکدا، بە واتایەکی تر ئەوەی عەقڵی کۆمەڵایەتی لە هەر کۆمەڵگایەکدا بەرهەم دێنێت بنیادی پێکهێنەری ئەو کۆمەڵگایەو شێوازی ئیشکردنی توخمو رەگەزەکانی ئەو بنیادەیە پێکەوە.

لە کۆمەڵگای باوکسالاریدا کە ئاراستەی فەرمان هاوشێوەی ئاراستەی فەرمانە لە هەرەمی دەسەڵاتی ئایینیدا کە ئەوانیش لە لوتکەوە بەرەو خوارەوەیە، هەمیشە دوو جەمسەر پێکدێت، جەمسەری فەرمانکەرو جەمسەری

فەرمان بەسەردا کراو. جەمسەری یەکەم خاوەنی دەسەڵاتی رەهایە، لە هەرەمی ئایینیدا خۆی لە هێزی رەهای خوددا دەبینێتەوە، لە هەرەمی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیشدا ئەم جەمسەرە بریتییە لە تاکەکەسی دەسەڵاتدار، کە ئەویش بەپێی دامەزراوە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکان دەگۆڕێت، لە هەرەمی خێزاندا باوکە، لە هەرەمی خێڵو عەشیرەتەدا سەرخێڵ یان شێخی عەشیرەتە، لە حیزبدا سەرۆك یان سکرتێرە، لە دەوڵەتدا سەرۆکی دەوڵەتە لە ئاستی سەرخانی کۆمەڵایەتیشدا ئەو جەمسەرەی کە دەسەڵاتی رەهای هەیە ئایین، یان دابو نەریت یان ئایدیۆلۆژیای حیزبە کە ئەمانەش مل کەچی ئەقڵی باوو بالادەستی کۆمەڵگان.

بەگشتی ئەم جەمسەرە بەشێوەیەکی رەها خاوەنی دەسەڵاتو بڕیارە لە کۆمەڵگادا، لە بەرامبەردا جەمسەری دووەم کە بریتییە لە ئەندامانی خێزان، ئەندامانی خێڵو عەشیرەت، ئەندامانی حیزب، هەموو هاوولاتیانی ئەو کۆمەڵگایە لەم جۆرە بنیادەدا فەرمانی جەمسەری یەکەمی بەسەردا دەسەپێنرێتو ئەویش مافی رەتکردنەوەی نییە، بەڵکو دەبێ سەرجەم ئەو فەرمانە جێبەجێ بکات، ئەم میکانیزمەی فەرمان لە هەرەمی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا سروشتی سەرجەم ئەو کۆمەڵگایانەیە کە پەیوەندییەکان تیایدا پەیوەندی شاوڵین نەك پەیوەندی ئاسۆیی، بە واتایەکی دی دەتوانین بڵێین لە کۆمەڵگا رۆژهەڵاتیەکاندا کە ئاراستەی فەرمانو پەیوەندییەکان شاوڵین زەمینەی دیموکراسی زۆر لاوازە چونکە میکانیزمی فەرمانو سروشتی فەرمان پەیوەندییەکانی ژیانو بەڕێوەبردن رێك دەخات کە ئەویش تەنیا یەك ئاراستەی هەیەو لە سەرەوە شۆڕ دەبێتەوە بۆ خوارەوە، لەم میکانیزمەشدا بواری دروستبوونی یەك عەقڵو یەك بیرکردنەوەو یەك روانینو یەك لێکدانەوە هەیە، ئەمەش لە گەوهەردا ئەو عەقڵیەتەیە کە ئەوی دی ناخوێنێتەوەو بڕوای بە بوونی نییە. ئایا لەم کاتەدا ئەوی دی چۆن بیر دەکاتەوەو چ هەڵوێستێك وەردەگرێتو چ کاردانەوەیەکی دەبێت ئایا ئەمی جەمسەری یەکەم کە

جەمسەری دەسەڵاتە چۆن رەفتار لەگەڵ هەر کاردانەوەیەکی ئەوی جەمسەری دووەمدا دەکات؟ لەکاتێکدا هەموو جوڵەیەکی جەمسەری دووەم واتە ئەوی دان پێدانەنراو هەنگاوێکە بۆ رەتکردنەوەی پرۆژەی چەسپاوی بێ دەنگ کردنو کوشتنی ئەو.

بێگومان ئەوی جەمسەری دووەم واتە ئەوی پرۆژەی سڕینەوەو لەناوبردن لە کۆمەڵگای داخراوەکانی رۆژهەڵاتدا کە ئاراستەی فەرمان لەسەرەوەیەو سروشتێکی رەتنەکراوی ئایینی وەرگرتووە بە دەرەنگ دەگاتە ئەوەی کە خۆی بناسێتو لەوە تێبگات کە ئەو لە بنەڕەتدا پرۆژەیەك نییە بۆ بێدەنگ کردنو سڕینەوەو لە دروستبووندا هەمووان وەکو یەك دروستکراون، بەڵام ئەوی بەهێز دەسەڵاتی بەدەست هێناوەو چووەتە لوتکەی ئەو هەرەمەکەوە کە خۆی دروستی کردووەو ئەمی تری فڕێداوەتە خوارەوەو لەسەرەوە بۆ خوارەوە سەیری کردووەو بینیوویەتیو هەر بەو پێیەش هەستکردن بە بەهێزی خۆی بووەتە فاکتەری سەرەکی دەرکردنی فەرمانو باڵادەست بوونو بەکارهێنانی ئەودی بۆ جێبەجێ کردنی ویستەکانی خۆی، لەمەشدا ئەوی دی بووەتە جێبەجێ کەر، بەڵام گوێڕایەڵی بۆ جێبەجێ کردن مەرج نییە بۆ هەتا هەتایە بەردەوام بێت، بۆیە ئەو تەلیسمە دەشێ بشکێت، ئەنجا ئەمی جەمسەری خوارەوە دەشێ کاردانەوەی توندو تیژانەی هەبێت بەرامبەر ئەو توندوتیژییە بەردەوامەی کە سروشتی فەرمانی ئایینی وەرگرتووەو بوونی ئەمی سڕیوەتەوە، ئەوی دەسەڵات هەمیشە شەرعیەتی داوە بە دەسەڵاتی خۆییو لەوێشەوە شەرعیەتی ئەوەی بەدەست هێناوە کە مافی رەوای خۆیەتیو بگرە پێویستیشە بە هەر شێوەیەك بشێت دەسەڵاتی خۆی بپارێزێتو کۆمەڵگا لە پەشێوییو فەوزای کۆمەلایەتی لە روانگەی روانینی خۆیەوە بپارێزێت، هەموو هەرەمەکانی دەسەلات کە ئاراستەی فەرمان تیایاندا شاوڵیە واتە لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە، هەموو جوڵەو هەڵوێستو رەتکردنەوەیەکی جەمسەری خوارەوە بە پەشێوییو یاخی بوونو تێکدان دەداتە قەڵەم بە بیانووی پاراستنی

ئاسایش‌و هێمنی ڕەوایەتی دەداتە خۆی کە هێزو توندوتیژی تا ئاستی کوشتنی جەستەیش بۆ کپکردنی هەر جۆرە دەنگێکی لەو جۆرە بەکار بهێنێت، بەواتە هەرەمی دەسەڵات خۆی بۆ پاراستنی خۆی‌و لەبەر بڕوا نەبوونی بەوی دەسەڵات بەسەردا کراو بەرهەمهێن‌و پیادەکەری توندوتیژییە، بەواتا ئەو خۆی بەرهەمهێن‌و پیادەکەری توندوتیژییە، بەواتا ئەو خۆی بەرهەمهێنی عەقڵی سڕینەوەو لەناوبردنی هەموو ئەوێکی ترە کە دەیەوێت بوونی هەبێت. ئەم ستراتیژەی نیشکردنیش لەخۆیدا ستراتیژێکی تیرۆریستانەیەو تیرۆر بەرهەم دێنێت، بۆیە بە ڕاشکاوی دەتوانین بڵێین بەگشتی دەسەڵاتە نادیموکراسیەکان هەموویان هەڵگری پرۆژەی تیرۆرن، ئیتر گرنگ نییە لە ئێستا ئەو پرۆژەیە لە چ شێوازێکیدا پیادە دەکرێت، ئایا لە ئاستی بێدەنگ کردنی ئەو بیردایە، یان بێبەشکردنیەتی لە تێکڕای مافەکان، یان گەیشتۆتە ئاستی تیرۆری جەستە. بێگومان ئەمانە هەموویان تیرۆرن‌و هەمووشیان بەرهەمی ئەو عەقڵیەتە داخراوەن کە لە کۆمەڵگا دلخراوو تاک ڕەهەندەکاندا بەرهەم دێت.

مەبەستمان لە کۆمەڵگا داخراوەکانیش ئەو کۆمەڵگایانەیە کە ئاستی فەرمان شاوڵییەو لە لوتکەوە بەرەوە بنکە دەچێت یان هەرەمی دەسەڵاتی ئایینییە یان هەرەمی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیای بە ئایین بووە، یان هەرەمی خێڵ‌و عەشیرەتە، یان هەرەمی دەوڵەتی خێڵ یان دەوڵەتی ئایینی یان دەوڵەتی تاکە حیزبی دەسەڵاتدارە کە ئەم دامەزراوانە بەگشتی یەك عەقڵ کۆنترۆڵیان دەکات‌و دەیانبات بەڕێوە ئەویش عەقڵێکە لەسەر بنەمای ئەو ستراتیژە ئیش دەکات کە دەڵێت: "بۆ ئەوەی خۆم هەبم دەبێ هەموو ئەوانی تر بسڕمەوە" ئەم عەقڵە خۆی هەڵگری پرۆژەی لەناوبردنی هەموو ئەوانی دییە هەر لەبەر ئەوە بە تۆخم‌و ڕەگەزەکانی توندوتیژی بارگاوی کراوەو لەساتی جۆراوجۆردا بە ڕەهایی پیادەی بوونی خۆی دەکات، بێگومان ئەم عەقڵەش لەناودیارەوە نەهاتووە بەڵکو بەرهەمی سروشتی پێکهاتەی کۆمەڵگایە. بەگشتی کۆمەڵگا

داخراوەکان ئەم عەقڵە بەرهەم دەهێنن‌و ئەم عەقڵەش بەڕێوەیان دەبات. دیارە لەکاتێکدا دەسەڵات بەم ڕوانین‌و ستراتیژە کار دەکات ئەوی فەرمان بەسەردا کراویش کە پەروەردەی هەمان کەلتورو هەمان زەمینەی کۆمەڵایەتییە بە هەمان ئاراستە وەڵام دەداتەوەو هەڵوێستەکان کاردانەوەی سیاسەت‌و عەقڵ‌و ڕەفتاری دەسەڵات‌و فەرمان دەبێت هەر بۆیە ئەویش واتە ئەوی ئەندامانی خێزان، ئەوی ئەندامانی خێڵ‌و عەشیرەت ئەوی ئەندامانی کۆمەڵگا بە هەمان ڕەگەزەکانی توندو تیژی بارگاوی کراوەو لە هەر ساتێکدا بۆی بلوێت هەمان کاردانەوەی توندوتیژانەی دەبێت چونکە ئەویش لە ئاستی نەگوتراو یان کپکراودا پرۆژەی سڕینەوەو لەناوبردنی ئەوی تری هەیە. ئەوەی لە کۆمەڵگا داخراوو سەرەتاییەکاندا هۆکاری پەشێویی‌و ئاژاوەی بەردەوامە ئەو پرۆژە ترسناکەیە کە چ هەرەمی دەسەڵات‌و چ پێکهاتەی دەسەڵات بەسەردا کراو بۆ سڕینەوەی یەکتر هەیانە. ئەوەش لەو بنەمایەوە سەرچاوە دەگرێت کە بنیادی کۆمەڵایەتی نەیتوانیووە عەقڵی یەکتر قبوڵ کردن‌و دان بەیەکترنانـدا بەرهەم بهێنێت، بەگشتی لە هەر زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیدا پرۆژەی قبوڵ نەکردنی یەکترو عەقڵیەتی سڕینەوەی یەکتر ئامادەبوونی هەبێت ئەوا توندوتیژی دەبێتە خاسیەتی دیاری ئەو کۆمەڵگایە، توندوتیژیش بە هەموو شێوەکانیەوە لە منداڵدانی خۆیدا هەڵگری پرۆژەی تیرۆرە بە ئاستە جیاوازەکانیەوە کە لە تیرۆری فیکرییەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە تیرۆری جەستە بێگومان لەسەر زەمینەی واقیعی کۆمەڵگا داخراوەکان کە یەك عەقڵ‌و یەك ڕوانین کار دەکات‌و کۆنترۆڵی کۆمەڵگا دەکات. هەموو عەقڵ‌و ڕوانین‌و بیرکردنەوەیەکی تر لەبەردەم مەترسیدایە، مەترسی لێدان‌و سڕینەوەو لەنێوبردن. ئەمەش خاسیەتی ئەو کەلتورانەیە کە توانای دایەلۆگو یەکتر قبوڵکردنیان نییە، هەر لێرەوە لە بەرامبەر یەکتر قبوڵ نەکردندا چەمکی لێبوردەیی دێتە ئاراوە، کە ئەوە ئاشکرایە چەمکی لێبوردەیی لە کەلتورە

داخراوەکاندا جێگای نابێتەوە، ئیتر گرنگ نییە ئەو کەلتورەی ئایینی بێت یان عەلمانی بە ئایین بوو.

دیارە ئەوە ئاشکرایە لەو کۆمەڵگایانەدا کە بنیادی عەقڵی بەڕێوەبردن و تێگەیشتن لە چەمکی مرۆڤ لاوازەو بەهای مرۆڤ نازانرێت ئەوە ئاراستە کارکردن بۆ یەکلاکردنەوەی هەموو ناکۆکیەکان لە ڕێگای هێزەوە شتێکی لەبەرچاوە کە زۆربەی کات ئەم حاڵەتەش لەشێوەی نهێنی و لە پشتەوە ئەنجام دەدرێت، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر بڕوای بە هیچ پێوانەیەکی تری عەقڵی، سیاسی، ئەخلاقی ــ یاسایی نییە بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکان، بەڵکو ڕاستەوخۆ بڕوای بە لەناوبردنی ئەوی بەرامبەر هەیە لەپێناوی لابردنی هەموو بەربەستێکدا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی ڕەهای خۆی. مەترسی ئەم عەقڵیەتە هەر لەوەدا نییە کە هەوڵی لەناوبردنی دژو نەیارەکانی بدات لەشێوەی نهێنیدا بەڵکو مرۆڤ لە هەموو بنەما مرۆییەکانی ڕووت دەکاتەوەو دەیگەیەنێتە ئاستێک کە خۆی بتەقێنێتەوە لەپێناوی لەناوبردنی ئەوی تردا. کە ئەم ڕەفتارە لە سلوکی هیچ کام لە زیندەوەرانی تردا نییە، کەواتە عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر ئاو عەقڵیەتەیە کە مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ سادەترین و لاوازترین زیندەوەر کە لە بەهای ژیانی خۆیشی تێنەگات لەپێناوی لەناوبردنی ئەوانی تردا خۆیشی لەناو ببات، هەرچەندە لەپاڵ ئەم ئامادەکردنەدا عەقڵی تیرۆر دەتوانێت بڕوا بوون بە بەدەستهێنانی بەهەشت لە مێشکی ئەو ئەندامە لاوازانەدا بکات بە یەقین کە ئامادەی خۆتەقاندنەوەن لەپێناوی لەناوبردنی ئەوی تردا. بەمانایەکی تر دەتوانین بڵێین عەقڵی تیرۆر بەرهەم هێن لەسەر بنەمای ئەو ستراتیژە ئیش دەکات کە دەشێ بە ستراتیژی بە یەقین کردنی ئامانجەکان ناو ببرێت، کە ئەم حاڵەتەش زیاتر سیمایەکی ئایینی هەیەو تموحی بەدەستهێنانی ئەو دنیاو شەهیدبوون دەبێتە هێزی پاڵنەر بۆ بەلاوە نانی ئەم دنیاو لە پاڵیشیدا لەنێوبردنی نەیارانی خوا. بێگومان عەقڵی تیرۆر بەرهەمهێن لە ڕوانگەی ئایینەوە هەوڵدەدات لەنێو تێکستە

ئایینیەکانـدا کـار بکـاتو هـەر لەوێـشەوە شـەرعیەت بـۆ کارەکـانی خـۆیی وەربگرێت، دیارە ئـەم رووبـەرەش ولـە رووبـەری ئـایین لەبـەر ئاسـتی لاوازی تێگەیشتنی کۆمەڵ لە بنەماکانی ئـایینو لەبـەر شـیانی لێکدانـەوەو راڤـەکردنی جیاواز بۆ تێکستە ئاینییەکان بـە ئاسـانی بـەکاردەهێنرێت بـۆ ئـەوەی عـەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر کاری تێدا بکات.

دیارە مێژووی تیرۆر کۆنـەو لـەو کاتـەوە مـرۆڤ دابـەش بـوە بـۆ دەسـەڵاتدارو دەسـەڵات بەسـەردا کـراو توونـدوتیـژی لـەدایك بـووە لەگـەڵ لـەدایکبوونی توندوتیژیدا عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆرو دیسپلین کـەرو رێکخـەری ئـەو عەقڵـەو گەیانـدنی بـە ئاسـتی پیـادەکردنیش لـەدایك بـووە. هـەموو هەوڵـدانێك بـۆ پاسیفکردنی ئەوی دیو لەکارخستنیو بێبەشکردنی بـەکارهێنانیو تـا دەگاتـە لەناوبردنی، عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر لە پشتیەوەیە.

دیارە جێگای خۆیەتی ئاماژە بۆ دوو ئاست لە عەقڵی تیرۆر بکەین یەکـەمیان ئاستێکی گشتگرو هەمەلایەنەو شێوازی ئایدیۆلۆژیایـەکی شمولی وەرگرتـەوەو هەوڵـدەدات لەچوارچـێوەی پرنـسیپە ئـایینیو ئـەخلاقیو کۆمەڵایەتییەکانـدا جێگای خۆی بکاتەوەو هەر لـەو سەرچاوانەشـەوە شـەرعیەت بـە بـوونی خـۆی بدات کە ئەمەش لە دوو ئاسـتی دامەزراوەیـدا دەردەکـەوێت ئاسـتی یەکـەمیان ئـەو دامـەزراوە دەوڵـەتیو حیزبـیو رێکخراوەییانـە دەگرێتـەوە کـە لـەپێناوی مانەوەی خۆیاندا هەموو ئەوانی دی رەت دەکەنەوەو بڕوایان بەبوونی ترو بەڕای جیاواز نییە ـ ئـەم دامەزراوانـەش بـە ئاشـکراو بـێ پەردەپۆشـکردن لـەرێگای کوشتنو بڕینو وێرانکردنەوە پیادەی بەرنامەی تۆتالیتارانەی خۆیان دەکەن.

ئاستی دووەمیان ئەو حیزبو گروپو دەستەو تاقمانە دەگرێتەوە کـە هـەڵگری راستەقینەی عەقڵی تیرۆرکەرن لە یەك کاتدا ئەوی تر تیرۆر دەکەنو خۆیشیان دامەزراوەیـەکن بـۆ ئامـادەکردنی کەسـانێك کـە بـە کوشـتنی خۆیـان لـەرێگای خۆتەقاندنـەوەوە ئـەوانی دی تـیرۆر بکـەن، یـان لـەرێگای ئامـادەکردنو راهێنانەوە کەسانێك ئامادە بکەن بۆ سەربڕینو مل پەڕاندنو سوکایەتی کردن

بە جەستەی مرۆڤ کە ئەمەیان ترسناکترین ئاستی تیرۆرەو هیچ بنەمایەکی ئەخلاقیو سنورێکی ئەخلاقی نامێنێتەوە نەبەزێندرێت.

ئاستی دووەمی عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر ئەوەیە کە زیاتر لەسەر ئاستی تاکەکەسەو نەبۆتە عەقڵیەتێکی شمولی، کە ئەمەیان زیاتر لەرێگای نهێنییەوە کارە تیرۆرییەکانی خۆی ئەنجام دەداتو بکەری ئەم جۆرە تیرۆرە لەپێناوی ئاوەلاکردنی رێگا لەبەردەمی خۆیدا ئەم کارە دەکاتو نایەوێت خۆی لەناویچێت، زۆربەی کاتیش لەرێگای ئامادەکردنی کەسانی ترو فریودانو هەڵخەڵەتاندنیانەوە ئەو کارە دەکات. ئەم جۆرە تیرۆرەش مێژوویەکی کۆنتری هەیەو لەنێو کۆمەڵگا دواکەوتووە سەرەتاییەکاندا لەدێر زەمانەوە باویووە.

ئەگەر لەدوای مێژووی تیرۆرو عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر بگەرێین لە کۆمەڵگای کوردیدا ئەوا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت ئەم کۆمەڵگایەش بەدەر نییە لە سەرچاوەو عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر مادەم کۆمەڵگایەکە لە مێژووی زانراوییەوە توندوتیژی ئامادەبوونی هەبووە تیایداو یەك عەقڵو یەك روانینو یەك بیرکردنەوە تیایدا ئامادەبووەو کاری کردووەو ئاراستەی فەرمان ئاراستەیەکی شاولی بووە تیایدا هەمان شێوەی ئاراستەی فەرمان لە هەرەمی دەسەلاتی ئاییندا. ئەوی سەرخێڵو سەرۆك عەشیرەت لە دامەزراوەی خێڵو عەشیرەتی کوردیدا کە نوێنەرایەتی بەرزترین دەسەلاتی کردووە لەو دامەزراوانەدا شێوەی دەسەلاتێکی شمولی بووەو ئەوی خوارەوە جگە لە کارکردنو بەرهەمهێنان خاوەنی هیچ مافێك نەبووە، هەر کەمتەرخەمیو پشت گوێ خستنو ئەرك جێبەجێ نەکردنێکیش بووەتە هۆی بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەری زۆر جار یاخی بوونی تاکەکەس لە هەرەمی دەسەلاتی خێڵو عەشیرەتدا بەس بووە بۆ ئەوەی لەپشتەوە ئەو کەسە بکوژرێت، کە ئەمە جۆرێکە لە تیرۆرو مێژووی ئەم جۆرە تیرۆرە لە کۆمەڵگای ئێمەدا زۆر کۆنە. هەرچەندە دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە تیرۆرە جیاوازە لە تیرۆری سیاسی.

لەسەردەمی دەسەڵاتی میرنشینی باباندا ئاشکراترین هەوڵی تیرۆر بەرچاو دەکەوێت کە ئەویش لە ئەنجامی نەتوانینی قبولکردنی یەکترەوە سەری هەڵداوە، لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە کە پرۆژەدانەری ئەو کارە تیرۆریستیە رابەری ئایینیو رابەری تەریقەتی قادری بووە لە کوردستاندا کە بەرنامەی تیرۆرکردنی رابەری تەریقەتی نەقشبەندی داناوە. شێخ مارفی نۆدێی دووکەس دەنێرێت بۆ کوشتنی مەولانا خالیدی جافی مکایەڵی رابەرو زیندوکەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستاندا. بێگومان هەوڵە تیرۆریستیەکە ناگاتە ئەنجام، ئەویش لە ئەنجامی بڕوا نەبوونی ئەو دوو کەسەی کە شێخ مارف رایسپاردبوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. دیارە لێرەوە دوو خاڵی سەرەکی هەن دەبێ ئاخاوتنیان لەسەر بکرێت. یەکەمیان بەرنامەدانەری تیرۆرەکە خۆی نەخشەکە جێبەجێ ناکات بەڵکو کەسانی دی ئامادە دەکات بۆ ئەو کارەیە، کە ئەم شێوازە ئیشکردنە هەمان خاسێتی ئیشکردنی سەرخێڵو سەرۆک عەشیرەتەکانی کۆمەڵگای کوردی هەیە کە لە رێگای بەکارهێنانی کەسانی ترەوە هەوڵیان داوە نەیارەکانی خۆیان تیرۆر بکەن.

دووەم ئەو کەسانەی کە ئەرکەکەیان پێسپێردراوە، لە بنەڕەتدا بڕوایان بەو کارە نەبووە، بەپێچەوانەی زۆرێك لەوانەی کە ئێستا بۆ کاری تیرۆر ئامادە دەکرێن کە نەك ئامادەن. ئەو کارەی پێیان دەسپێردرێت جێبەجێ بکەن، بەڵکو بۆ ئەو مەبەستە ئامادەن خۆیشیان بتەقێننەوە ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخان کە شێخ مارف سەرکەوتوو نەبووە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەدا بۆ لەنێوبردنی مەولانا خالید، لە هەمان کاتدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە خودی شێخ مارف هەڵگری عەقڵی تیرۆرکەرو پرۆژەی تیرۆر نەبووە، بەڵکو لە ئەنجامی هەڵچووندا ئەو بڕیارەی داوە، هەرچەندە ئەوەش ناتوانێت پاساوی ئەوەی بۆ بهێنێتەوە کە ئەو کارە لە دەرەوەی مەسەلەی تیرۆرە. ئەگەر لەدوای هۆکاری هەوڵدانی شێخ مارف بۆ تیرۆرکردنی مەولانا خالید بگەڕێین ئەوا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازی بیروڕاو غیرەی زانستی لە

هۆکارە سەرەکیەکانی ئەو کارەیەن، ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە کۆمەڵگای کوردی ئەو قۆناغەدا عەقڵیەتی یەکتر قبوڵکردنو جیاوازی بیروڕاو جیاوازی ڕوانینو جیاوازی لێکدانەوە لەدایک نەبووە. بەڵکو یەك عەقڵو یەك ڕوانینو یەك لێکدانەوەی باڵادەست ئامادەیی هەبووە. ئەو تاکە عەقڵو ڕوانینو لێکدانەوەیەش بۆ پاراستنی خۆی هەوڵی لەناوبردنی هەموو ئەوانەی داوە کە لە دەرەوەی ئەو بیر دەکەنەوە یان بە ئاڕاستەیەکی جیاواز دەڕوات کار دەکەن.

بێگومان دیارترین ئاڕاستەی ڕوانینو فیکری لە مێژووی کۆمەڵگای کوردیدا لەسەردەمی بابانەکاندا دەردەکەوێت کە ئەویش جیاوازی ڕوانینو لێکدانەوەو کارکردنی نێوان تەریقەتی قادریو تەریقەتی نەقشەبەندییە، بەڵام تەریقەتی قادری کە سنووری ئەو دەسەڵاتەدا پێش دەرکەوتنی مەولانا خالیدو پەرەسەندنی ڕێبازەکەی ئامادەبوونی هەبووە، نەیتوانیووە دەرکەوتنی ڕێبازی نەقشبەندیو پەرەسەندنی قبوڵ بکات بۆیە هەوڵی داوە ڕابەری ئەو تەریقەتە لەناو ببات ئەویش لەشێوەی تیرۆرکردندا، کەواتە ئاشکراترین نموونەی پرۆژەی تیرۆر لە کوردستاندا پرۆژەی تیرۆری فیکریو پەیامە. شێخ مارفیش زیاتر هەوڵیداوە لەنێو تێکستی ئاینیدا بەڵگە بۆ لەڕێگالادانی مەولانا خالید بدۆزێتەوەو ڕەوایەتی بەپرۆژەی لەناوبردنی بدات، کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە لە مێژووی ئێمەدا یەکەمین پرۆژەی تیرۆری ڕێکخراوو بەرنامە بۆ دانراو ئەگەر بەرنامەیەکی سادەش بووبێت ڕوانینو تێکستی ئایینی کراوەتە پاڵپشتی کە ئەوەش لەپشتەوە جۆرێك لە تەکفیرکردن ئامادەبوونی هەیە واتە تەکفیرکردنی مەولانا خالیدو ناوبردنی بەفێڵبازو لەڕێگالادەرو بیدعەچی، ئەم تۆمەت دانەپاڵەش بەسە بۆ ئەوەی شەرعیەتی لەناوبردنی بەدەست بێنێت. لەسەر وەختی دەسەڵاتداری شێخ مەحمودی حەفیددا، هەرچەندە سنووری ئەو دەسەڵاتە دیاریکراو بوو چ لەڕووی سیاسییەوە چ لەڕووی مەعنەوییەوە، بەڵام بەدەر نەبووە لە توندوتیژیو عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر ئامادەبوونی

هـەبووە. لەسـەر دەمـی ئـەو دەسـەڵاتەدا جـەمال عیرفـانو پاشـانیش عـارف سائیب لە پشتەوە تیرۆر دەکرێن ئـەوەی لـەبارەی جـەمال عیرفانـەوە زانـراوە ئەوەیە کـە رۆشـنبیرێکی دیـاری سـەردەمەکەی خـۆی بـووەو لەگـەڵ شـێوازی دەسـەڵاتو بـەرێوەبردنی شـێخ مـەحموددا نـاکۆك بـووە لـەو روانگەیـەوە کـە شێوازی دەسـەڵاتو بـەرێوەبردنی شـێخ مـەحمودی بـەجێگای رەخنـە لێگرتن زانیووە، ئەمەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە لەسـەردەمی شـێخ مـەحموددا عـەقڵی قبوڵکردنی رەخنەو بۆچوونی جیاواز لـەدایك نـەبووەو دەرکـەوتنی تاکەکەسـی جیاواز لەرووی بیرکردنەوەو روانینو پەیبردنەوە بەس بووە بۆ ئەوەی ئەو تاکە کەسە بەر نەفرەت بکەوێتو نـەك هـەر تـیرۆری فیکـری بکرێـت بـەڵکو تـیرۆری جەستەش بکرێت.

بێگومان ئێمە دەزانین وەرگرتنی هەڵوێستی رەخنەگرانە کارێکی تەندروستەو ئەگەر سادەترین بنـەمای عـەقڵی رەخنـەیىو یـەکتر قبـوڵکردنو خوێندنـەوەی ئەودی هەبێت ئـەوا رەخنـە دەبێتـە جـۆرە ئـامرازێکی شارسـتانیانە بـۆ فـشار خستنە سەر دەسەڵات بـۆ دوورکەوتنـەوە لـە هەنـدێ هەڵسوکـەوتو رەفتـاری نادروستو لە گەندەڵی، بە مانایەکی دی رەخنە ئـەوە بەدەسـەڵات دەڵێت کـە هەوڵی چاککردنی خۆیىو ریفۆرم کرن بدات لە بوارە جیاوازەکانی ژیاندا، بەڵام کـاتێ دەسـەڵات خـۆی بـە نوێنـەری خـوا بزانێـت لەسـەر زەویىو پێـی وابێـت رەوایەتی رەهای بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی چۆنی دەوێت بەو جۆرە کـار بکـاتو چی دەوێت لە سنووری دەسەڵاتەکەی خۆیدا جێبـەجێی بکـات، ئـەوا ناتوانێـت گوێ لە رەخنە بگرێتو ئەوی دی بخوێنێتـەوە، بـەڵکو بەپێچەوانەوە رەخنـەو رای جیاواز وەکو هەوڵێك بۆ روخاندنی خۆی سەیر دەکاتو لەو پێناوەشـدا بـە هەموو جۆرێك توندوتیژی بەکار دەهێنێـتو هـەوڵی لـەناوبردنی ئـەوی دی کـە ئەوی رەخنەگر یان ئەوەی هەڵگری راوبۆچوونی جیـاوازە دەدات. تیرۆرکردنـی (مارشـەمعون)ی لەسـاڵی ۱۹۱۸دا سـەرۆکی ئـایینی ئاشـورییەکان لەسـەردەمی سمکـۆی شـکاكو تیرۆرکردنـی جـەمال عیرفـان لەسـاڵی ۱۹۲۲ لەسـەردەمی

دەسەڵاتدارییەکەی شێخ مەحمودی حەفیددا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو دەسەڵاتە خاوەنی عەقڵیەتێك بووە کە جگە لە خۆیو عەقڵی خۆیو روانینو بۆچوونی خۆی هیچی تری نەبینیوەو هەر عەقڵو روانینو بیرکردنەوەیەکی جیاوازی وەکو لادانو بەزاندنی هێڵی سوور سەیرکردووە. دیارە ئەوەش شێوازی بیرکردنەوەی نێو کۆمەڵگا داخراوەکانە، ئەو کۆمەڵگایانەی کە ناتوانێت عەقڵی قبولکردنی جیاوازیی بەرهەمبهێنێت.

ئەگەر هەتا کۆتایی هاتنی دەسەڵاتداریتی شێخ مەحمود کورد چ وەکو کۆمەڵگاو چ وەکو دەسەڵاتیش بڕوای بەیەك عەقڵو یەك بینینو یەك ئاراستەی بیرکردنەوە هەبوبێتو رووبەری بیرکردنەوەی جیاوازیش زۆر تەسك بوبێتو زەمینەی کۆمەڵایەتیو کەلتوری کوردی یەك جۆر عەقڵی بەرهەم هێنابێت ئەوا دەبێ بزانین لەدوای دەسەڵاتدرییەکەی شێخ مەحمود لەم بەشەی کوردستانو لەدوای دابەشکردنی کوردستانیش پاش جەنگی یەکەمی جیهانی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لە بنیادی پێکهێنەری ئەم کۆمەڵگایەدا روویندەداوە، چونکە بەئاشکرا سەرخانی کۆمەڵایەتی بەندە بەژێرخانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاوە، لێرەوە مەبەستمان ئەوە نییە لە روانگەی تیۆری مارکسیزمەوە سەیری ئەو مەسەلەیە بکەین، نەخێر بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە بنیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی پەرەسەندنێکی ئەوتۆی تێدا فەراهەم نەبووە، کە بنەماکانی کرانەوەو دروستبوونی تاکەکەسی خاوەن ناسنامە بوبێتە حاڵەتێکی باڵادەستو بەو پێیەش عەقڵی جۆراوجۆرو روانینی جیاواز دروست بوبێت، ئەگەرچی بە کاریگەری باروتۆخی سیاسی دەوروبەرو بەهۆی گەیشتنی سەرخانی دەرەوە بۆ نێو ئەم کۆمەڵگایە هەندێ چەمکی سیاسیو حیزبی لێرە دەرکەوتبن، بەڵام بەشێوەیەکی نامۆو خواستراو، کە ئەوەش نەك هەر نەیتوانووە عەقڵی یەکتر قبولکردنو چەمکی لێبوردن بهێنێتە کایەوە، بەڵکو مەسەلەکانی ئاڵۆزتر کردووە بەجۆرێك کە سیمای ونبوونو پەشێوی بە کۆمەڵگای کوردی بەخشیووە ئەویش لەو روانگەیەوە مەترسی ونبوونو

لەنێوچوون کاردانەوەی توندوتیژی لای تاكو دەستە کۆمەڵایەتیەکان دروستکردووە، کە ئەو کاردانەوەیانەش بەدەر نەبوون لە بەکارهێنانی توندو تیژی.

لەگەڵ دروست بوونی حیزب لە کوردستاندا لە کۆتایی سییەکانو سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوودا، جۆرو ئاراستەی بیرکردنەوەی جیاواز سەری هەڵدا ئەگەر ئەو جیاوازییە لە ئاستی لاوازیشدا بوویێتو تەنانەن قەرزیش کرابێتو بەرهەمی واقیعی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری نەبوویێت بەڵام بوو بەهۆی ئەوەی کە ئاراستەی جیاواوی ئیشکردنی سیاسیو روانینی سیاسی دروست بکات. گەیشتنی پرۆژەی ستالینی بۆ کوردستانو دروستبوونی حیزبە شیوعییەکان لە ناوچەکەداو شان بەشانی ئەوەش دروستبوونی حیزبو رێکخراوی تر کە زیاتر پەیوەستبوون بە مەسەلەی نەتەوایەتی کوردە لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوودا جۆرێك لە جوڵەی لە کوردستاندا دروستکرد، هەرچەندە تێروانینی فیکریو ئایدیۆلۆژی ئەو حیزبو رێکخراوانە لەو کاتەدا لاواز بوو، بەڵام توانیان لەسەر واقیعی کۆمەڵایەتی کوردی ئەوکاتە جێگای خۆیان دیاری بکەن، ئەم حیزبو رێکخراوانەش بەرهەمی دوو هۆکاربوون. هۆکاری یەکەمیان کاریگەری دەرەوەو بانگەشەکردنی حیزبی شیوعی سۆڤێتی سەردەمی ستالین بوو بۆ رزگارکردنی گەلانو بەو مەبەستەش هەوڵدانی سۆڤێت بۆ دروستکردنی حیزبی شیوعی لەسەر نموونەو مۆدێلی خۆی لە وڵاتانی تردا کە ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکرا بەر ئەم پرۆژەیەی سەردەمی ستالین کەوتن. هۆکاری دووەم باروبۆخی ناوخۆو کاریگەری جەنگی جیهانیو سیاسەتی توندو تیژی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان کە هۆکاربوون بۆ ئەوەی وا لە نوخبەی رۆشنبیری ئەو سەردەمەی کورد بکەن بیر لە دروستکردنی حیزبو رێکخراو بکاتەوە. بێگومان ئەم نوخبە رۆشنبیرەی ئەو سەردەمەش پەروەردەی واقیعی کۆمەڵگای داخراوی کوردی بووە بۆیە نەیتوانیوە بە ئاراستەیەکی جیاواز لەبیرکردنەوەی گشتی خەڵك بیر

بکاتەوەو بەجۆرێکی جیاواز لە کۆمەڵ رەفتار بکاتو هەڵگری عەقڵێکی کراوەو جیاواز بوو بێت لە عەقڵی باوو باڵادەستی کۆمەڵگا.. هەر بۆیە بەرنامەو ئایدیۆلۆژی ئەو حیزبو رێکخراوانەی لەو سەردەمەدا دروست بوون بە هەمان خاسێتو روانینو عەقڵو کارکردنی نێو کۆمەڵگای کوردەواری بارگاوی بوون کە ئەویش تاکە عەقڵو تاکە روانینو تاکە بیرکردنەوەو تاکە لێکدانەوە بوو، بە واتە یەك رەهەندی عەقڵیو نیشکردن هەبوو کە ئەویش بە سەرجەم توخمو رەگەزەکانی توندوتیژی باوی نێو کۆمەڵگای داخراوی کوردی بارگاوی کرابوو، ئەمە سەرباری توندوتیژییەکی تریش کە بە توندوتیژی شۆرشگێرانە ناو دەبرێتو ئەمیش واتە توندوتیژی شۆرشگێرانە رەوایەتی دەدات بە حیزبو بە شۆرش بۆ ئەنجامدانی کاری توندوتیژی تا ئەندازەی ئازاردانو کوشتن کە ئەمەش لە بنەرەتدا بە کاریگەری ئایدیۆلۆژیای ستالینی نەك هەر لەنێو حیزبە شیوعیەکاندا جێگای گرتووە بەڵکو لە کارو بەرنامەی نیشکردنی حیزبە دژ شیوعیەکانیشدا هەمان شێوەی حیزبە شیوعیەکان پەیرەوکراوەو بگرە هەندێ جار توندتریش.

ئێستا حیزبی کوردی هەڵگری سەرجەم ئەو بنەمایانەی توندوتیژییە کە عەقڵی تاك رەهەندی کوردیو کۆمەڵگای داخراوی کوردی بەرهەمی هێناون ئەمە جگە لەوەی کە توخمێکی تری توندوتیژیش هاتۆتە ناو بەرنامەو کاری حیزبی کوردییەوە کە ئەویش وەکو پێشتر باسمان کرد توندوتیژی شۆرشگێرانەیە کە هەموو رەوایەتیەك دەدات بەخۆی بۆ قەلاچۆکردنی دژەکان بەناوی بەرژەوەندی حیزبیو نیشتمانیو نەتەوەییەوە. بۆیە لە دروست بوونی حیزبی کوردییەوە مەسەلەی توندوتیژی لە کۆمەڵگای کوردیدا زیاتر پەرەی سەندووەو بەتایبەتیش لەسەر هەڵدانی بزوتنەوەی چەکدارییەوە مەسەلەی توندوتیژی بەکارهێنان گەیشتۆتە ئاستێکی بالا لە جێبەجێ کردندا ئەو جێبەجێکردنەش لە گەلێك ئاراستەو نیمەندا خۆی نیشانداوە. بەلام پێویستە

پیادەکردنی دوو ئاڕاستەی توندوتیژییەو بەو پێیەش دوو جۆر لە تیرۆر لە کوردستاندا لە یەکتر جیا بکەینەوە.

یەکەمیان ئەو توندوتیژییەی کە داگیرکەرانی کوردستان بەدژی کورد بەکاریان هێناوەو سەرباری جینۆسایدو وێرانکردن هەندێ جار کاری تیرۆریستی بەرنامە بۆ دارێژراویشیان بەرامبەر بە کەسانی دیاری کورد لە سیاسیو نوخبەی رووناکبیرو تەنانەت سەرکردە دیارەکانیش کردووە بەتایبەتیش لەو سەروەختەوە کە بزوتنەوەی کوردی لە شێوەی چەکداریدا دەستی پێکردووە. لەوانەش کوشتنی شێخ سەعیدی حەفید باوکی شێخ مەحمود لە موسڵ، کوشتنی سمایل خانی شکاك لەلایەن دەسەڵاتی ئێرانەوە لەساڵی ۱۹۳۰و هەوڵدانی تیرۆرکردنی سەرۆك بارزانی لە ۱۹۷۱/۹/۲۹ لەرێگای مینرێژکردنی چەند مەلایەکەوەو تیرۆرکردنی سەیدا ساڵح یوسفی. هەروەها تیرۆرکردنی دکتۆر قاسملۆو دکتۆر عەبدوڕەحمانی شەرەف کەندی لەلایەن دەزگای تیرۆر ئەنجامدەری دەوڵەتی ئێرانەوە. هەروەها تیرۆرکردنی دەستەیەك لە رۆشنبیرانی منەوەری کورد لە باشوری کوردستان لەلایەن دەزگا سیخوڕیو تیرۆر ئەنجاندەرەکانی رژێمی بەعسەوە لەوانەش تیرۆرکردنی مامۆستا عومەر تۆفیقو مامۆستا عەبدولخالق مەعروفو کاکەی فەلاحو رەئوف زوهدیو ئەمە سەرباری تیرۆرکردنی دەیانو سەدان کەسێتو کادیری کوردی لە پشتەوە یان لە بۆسە بۆ داناندا.. هەموو ئەمانەش بەڵگەی ئەوەن کە رژێمە تۆتالیتارە داگیرکەرەکانی کوردستان هەر بەوەوە نەوەستاون کە وڵاتی ئێمەیان داگیرکردووەو خێرو بێری وڵاتیان بۆ خۆیان بردووەو گەلی کوردیان کردۆتە کۆیلەو هەر جوڵەو بزوتنەوەیەکیش سەری هەڵدابێت بە ئاگرو ئاسن هەوڵی دامرکاندنەوەیان داوە، بەڵکو لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا ئەنجامدانی کاری تیرۆریستیانە لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە بەشێك بووە لە بەرنامەو پرۆژەی ئەو دەوڵەتانە بۆ رێگاگرتن لە هەر جوڵەیەکی رابوونەوە لە کوردستاندا، دیارە هۆکاری ئامادەبوونی عەقڵی تیرۆر بەرهەمهێن لە

دامەزراوەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەداو بڕوا بوون بە ستراتیژی بۆ ئەوەی خۆم هەبم دەبێ هەموو ئەوانی دی بسڕمەوە بەرهەمهێنی پرۆژەی تیرۆری بەردەوامە.. هەر بۆیە دەبینین ئەم دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان لەساتەوەختی دابەشکردنی کوردستانەوە بەسەریاندا، لەهەر کات و شوێنێکدا بۆیان لوابێت تیرۆریان بەرامبەر بە کورد ئەنجام داوە. بێگومان ئەوە ئاشکرایە کە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دەوڵەتی کۆمەڵگا داخراوەکانن کە تاکە یەک عەقڵ و یەک روانین و یەک بیرکردنەوە تیایاندا بەرهەم هاتووەو سەرباری دروستبوونی دەوڵەتیش تیایاندا هێشتا کرانەوە رووینەداوەو بەهۆی دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەوە بۆیان بەبێ ئەوەی ناسیونالیزم ئامادەبوونی هەبێت، ترسێکی بەردەوام لە ئێستاو لە ئایندە کۆنترۆڵی سیاسەتی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستانی کردووەو بە گومان و ترسەوە سەیری هەر جوڵەیەکی فیکری، رۆشنبیری، سیاسیان کردووەو لە پلەی یەکەمدا هەوڵیانداوە ئەو جوڵانەوانە لەناو ببەن ئەگەر تەنانەت لەسەر ئاستی تاکە کەسیش بووبن.

دەرکەوتنی ناسیونالیزمی ئەو نەتەوانە بەشێوەیەکی ناسروشتی بەهۆی کاریگەری دەرەوەو نەتوانینی بەدەستهێنانی ناسنامە، ئەو ناسیونالیزمانەی لەبەردەم ترسێکی خنکێنەردا راگرتووەو هەم ترسی لەنێوچوون و هەم نەبوونی زەمینەی فیکری و رۆشنبیری و بەو پێیەش نەبوونی پرۆژەی هاوچەرخی نەتەوەیی وایلێکردن بەشێوەیەکی توند پەیوەستبن بە کەلتوری داخراوی پێشتریان و بە بنەماکانی خوێن و دەمارەوە کە ئەوەش ئاستی رۆحی و مادی ئەو ناسیونالیزمانەی بە رەگەزەکانی شۆڤێنیزم بارگاوی کردووە کە ئەم حاڵەتەش لە بوونی خۆیدا رەگەزەکانی توندوتیژی و بەو پێیەش تیرۆری هەڵگرتووە، بۆیە ناشێت تەسەوری بوونی ناسیونالیزمی عەرەب و تورک و فارس بکرێت لە دەرەوەی شۆڤێنیەت و لە دەرەوە توندوتیژی و لە دەرەوەی تاک رەهەندی و لە دەرەوەی بوونی پرۆژەی لەنێوبردنی ئەوانی دی غەیری خۆیان

بەتایبەتی نەتەوەو ئیتنیکە جیاوازەکانی تر. ئەم باری توندوتیژیو زەبروزەنگ بەکارهێنانەی ناسیونالیزمی نەتەوە سەردەستەکانی کوردستانو دامەزراوە حیزبیو دەوڵەتیەکانیان کاریگەری نێگەتیفی لەسەر کۆنەستی کۆمەڵایەتی کوردیو بزوتنەوەکانیشی هەبووەو وەکو بەرهەمی کاردانەوەی ئەو دەرکەوتوون لەڕووی سیاسەتو بەرنامەو عەقڵو کارکردنیشەوە. جگە لەم جۆرە تیرۆرە لە سنووری هەرەمی خێڵو عەشیرەت خۆیدا، جۆرێکی تریش لە تیرۆر لەنێوان خێڵو عەشیرەتەکاندا هەبووە، ئەم خێڵ یان عەشیرەت هەوڵیداوە فلانە کەس لە پشتەوە لە عەشیرەت یان خێڵێکی تر تیرۆر بکات تەنانەت زۆریەی کات تۆڵە سەندنەوە لەنێو خێڵو عەشیرەتەکاندا لەسەر بەرژەوەندی مادیو مەعنەوی خێڵ شێوازی تیرۆری وەرگرتووە کاتێ لە پشتەوە ئەم خێڵ یان عەشیرەت ئەندامێکی بێ گوناهی ئەو خێڵ یان ئەو عەشیرەتی تری کوشتووە بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە، کەواتە دەتوانین بڵێین پاڵنەری خوێنو دەمار کە بنەمای سەرەکی جوڵەو میکانیزمی پەیوەندیو ستراتیژی خێڵەو جگە لە بەرهەمهێنانی تاکە روانینو تاکە عەقڵو تاکە بیرکردنەوە، لەگەڵ خۆیدا رەتکردنەوەی هەموو عەقڵو روانینو بیرکردنەوەیەکی دەرەوەی خۆیی هەلگرتووەو لە سروشتی خۆیدا بەرهەمهێنی توندوتیژیە کە ئەویش لە هەناوی خۆیدا پرۆژەی تیرۆری هەلگرتووە کەواتە دەتوانین بڵێین عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر لە بنەڕەتدا شتێکی نامۆ نییە بە کۆمەڵگای کوردیو ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە تیرۆر شتێکی نامۆیە بە کۆمەڵگای کوردی رەنگە زۆر لەجێگای خۆیدا نەبێت، بەڵام دەتوانین بڵێین تیرۆر لە کۆمەڵگای کوردیدا نەبۆتە پرۆژەو سەرباری ئامادەبوونی عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر لەم کۆمەڵگایەدا بەڵام هێشتا ئەم عەقڵیەتە لەسەر ئاستی تاکەکەس ماوەتەوە تەنیا لەم ساڵانەی دواییدا نەبێت کە بەهۆی پەرەسەندنی گروپە توندڕەوە ئاینییەکانەوە شێوازی رێکخراوی وەرگرتووە.

ئەگەر لە قۆناغی قسەکردن لەسەر بوونی جۆرێك لە تیرۆر لە دامەزراوی خێڵو عەشیرەتی کوردیدا بگوازیتەوە بۆ قۆناغی دەسەلاتی میرنشینەکان، دەبینین هەمان شێوەی پێشتر عەقڵی بەرهەمهێنی توندوتیژیو بەو پێیەش عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر ئامادە بوونی هەبووە، بەلام دیسان ئەو عەقڵە لە سنووری تاکە کەسدا ماوەتەوە نەبۆتە عەقڵێکی شمولیو پرۆژەی هەمەلایەنی تیرۆری هەبێت جۆری دووەمی توندو تیژیو بەو پێیەش تیرۆر لە کوردستاندا ئەوەیە کە کورد خۆی ئەنجامی داوە، ئەویش دەبێت بە دوو ئاراستەوە، یەکێکیان توندوتیژی بەکارهێنانو تیرۆرکردنی کاربەدەستانی داگیرکەرانی کوردستانە کە ئەمەش توندوتیژی شۆرشگێرانە بەرهەمی هێناوەو لە روانگەی کاری شۆرشگێرییەوە رەوایەتی پێدراوە کە ئەمەش هەم کەسانی سەر بەنەتەوەی دەوڵەتی داگیرکەری گرتۆتەوە، هەر سیخورو ئەلقە لە گوێو پیاواتی خۆفرۆشی کوردیشی گرتۆتەوە. هەوڵدانی کوشتنی پارێزگاری سلێمانی محەمەد ئەمین ئەحمەدو هەوڵدانی کوشتنی پارێزگاری هەولێر ئیبراهیم زەنگەنەو کوشتنی عوسمان محەمەد فایەقو چەندین کادیری درندەی بەعس لە سالانی حەفتاکانو هەشتاکاندا لەو جۆرە کوشتنانەن کە زەبرو زەنگو توندو تیژی شۆرشگێری لە پشتیانەوە بووەو بە روانینی ئێمەی کورد وەکو نەتەوە ئەوە کارێکی رەوا بووە. ئەگەر چی لەرووی مرۆڤایەتییەوە کاری نادروست بووە.

ئاراستەی دووەمی تیرۆر لە کوردستاندا تیرۆری ناوخۆیە کە ئەمەیان بەرهەمی عەقڵی تاك رەهەندو روانینی تاك رەهەندو بروا نەبوونە بە بوونی ئەوی دی، ئەوێك کە لەگەڵ مندا لەبیرو بۆچوونو لێکدانەوەدا جیاوازە، ئەمەش ترسناکترین شێوازی تیرۆرە. پێشتر باسی هەوڵدانی تیرۆرکردنی (مەولانا خالیدی) نوێکەرەوەی رێبازی نەقشبەندیو تیرۆرکردنی (جەمال عیرفانو عارف سائیب)مان کرد کە کورد خۆی بکەری ئەنجامدەری ئەو هەوڵە تیرۆریستیانە بووە. لەدوای دروستبوونی حیزب لە کوردستانو بەتایبەتیش دوای

سەرهەڵدانی بزووتنەوەی چەکداری لەباشووری کوردستاندا روویەری تیرۆری کورد بۆ کورد فراوانتربووە. لەساڵانی شەستەکاندا عەلی حەمدی ١٩٦٥و ئەحمەد عەبدوڵڵا ١٩٦٧و ئەحمەد شیروانی ١٩٦٧ لە هەولێرو ئیبراهیم ساڵح ژاژڵەیی‌و عەبدوڵڵا شۆڕش کە سەر بە حیزبی شیوعی بوو ١٩٦١و حسێن فەرەج نرەیی ١٩٦١ کە شیوعی بوو لەگەڵ عومەری مام عەلی‌و نووری وردەواڵەو عارفی حاجی حەسەنی کورتاندرو ١٩٦٢دا تیرۆرکراون ئەمە جگە لەوەی کە لە گوندی کانی ماسی ١٩٦٣ ژمارەیەکی دیار لە کادیرو ئەندامانی حیزبی شیوعی تیرۆرکران لەلایەن هەندێ کادیری بەناو پارتی ئەوکاتەوە، دیارە هەڵوێستی سەرۆك بارزانی لەو کاتەدا ئاشکرا بووەو لە بەیانێکدا رایگەیاندووە کە هەموو ئەو بکوژانە لە کورتترین کاتدا بە پەلە رەوانەی سەرکردایەتی بکرێن بۆ سزادانیان. بێگومان ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردوو کە لە باشووری کوردستان بڵێسەی شۆڕش گەرمی کردبوو، لەلایەن سوپای دەوڵەتی تۆتالیتاری داگیرکەری عێراقی بە ئاگرو ئاسن هەوڵی لەناوبردنی کوردو وێرانکردنی وڵاتەکەی دەدا، لەلایەکی تریشەوە ناکۆکییەکانی نێو شۆڕش‌و بزوتنەوەکەی‌و سەرئەنجامیش دابەشبوونی بزوتنەوەکە لە شێوەیەکی توندوتیژدا کە ئەنجام شەڕی کوردو کوردی لێکەوەوەو لەپاڵ ئەو شەڕەشدا زەبرو زەنگو توندوتیژی زۆر بەکارهاتووەو تیرۆری ناوخۆی لێکەوتۆتەوە هەریەکە لەباڵی سەرکردایەتی شۆڕش کە باڵی بەهێزو بالادەستبوو لە سەنگەری گەلدا بوو، هەروەها باڵی مەکتەبی سیاسیش کە پاڵی دا بە رژێمی داگیرکەرەوە کەم تا زۆر کاری تیرۆریان لەدژی کادیرانی یەکتر بەکارهێناوە. دیارە هەم دابەشبوونەکە لەو شێوە توندوتیژوداو هەم دەستدانە چەك لە یەکتری هەم زەبروزەنگو توندوتیژی بەکارهێنان بەدژی یەکترو بەدژی لایەنگرانی یەکتری بەرهەمی ئەو عەقڵە باوو بالادەستەیە لە کەلتوری کوردیدا کە ناتوانێت ئەوی تر قبوڵ بکات‌و هەر ناڕاستە بیرکردنەوەو لێکدانەوەیەکی جیاواز بە لێدان لەخۆی دەزانێت‌و وەکو پرۆژەی لەنێوبردنی

خۆی سەیری دەکات ئەوەش ئەو زەمینە کۆمەڵایەتیو کەلتووریو عەقڵیەیە کە لە کۆمەڵگای کوردیدا توندو تیژیو کێشە بەرهەم دێنێتو زۆربەی کات بە تەقینەوەی چەکداری یان بە کوشتن کۆتایی دێت. پەشێوی ناجۆری نێو بزوتنەوەی سیاسی کوردی لە سەرەتایەوە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەرهەمی ئەو عەقڵە تاك رەهەندو شمولیەیە کە تەنیا خۆی دەبینێتو هەموو شتێکی بەپێی مواسەفاتی خۆی دەوێتو جگە لە خۆیشی هەموو ئەوانی تر رەتدەکاتەوە.

بێگومان قۆناغێکی تری مێژووی کورد کە جێگای ململانێیی سیاسیو چەکداریو پێکدادانی ناوخۆی نێوان کورد بووە قۆناغی دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلولە. ئەم قۆناغە ترسناکترین قۆناغی مێژوویی بزوتنەوەی کوردییە لە روانگەی بەرفروانی شەڕو پێکدادانە ناوخۆییەکانەوە بەو پێیەش لە روانگەی بەکارهێنانی زەبرو زەنگو توندوتیژیو تیرۆر کردنو تەنانەت کوشتنی بە کۆمەڵیشەوە، بەگشتی حیزبو رێکخراوەکانی کوردستان کە ئامادەبوونیان هەبووە لە شاخ لە مێژووی توندوتیژیەدا بەشداربوون بەڵام هەریەکە بەپێی قەبارەی ئامادەبوونیو دیارە سروشتی توندوتیژیو شێوازێ پیادەکردنیشی لە حیزبێکەوە بۆ حیزبێکی تر جیاوازی هەبووەو هەر بەو پێیەش لە کوشتنو برینو تەنانەت تیرۆرکردنیشدا جیاوازییان هەبووە. ئەو حیزبەی کە تەوحی تاکڕەوانەی زیاتر بووە بۆ بەلاوەنانی ئەوانی ترو بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەتەنیا زیاتر هەوڵیداوە لەڕێگای چەکەوە ئەو تەوحەی خۆی بسەپێنێت. ئەو حیزبەی کە نەیتوانیووە پەیوەستبوونی خۆی بە کۆمەڵگای کوردییەوە گرێ بداتو رەگو ریشەیەکی بەهێزو پتەوی لەنێو بنیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردیدا نەبووە، زیاتر هەوڵیداوە لەڕێگای زەبرو زەنگو توندوتیژیەوە بوونی خۆی بسەپێنێت. بەڵام لەپاڵ ئەم حاڵەتەشدا لە کۆمەڵگای کوردیدا جۆرێك لە گیانی لێبوردەییو دوورکەوتنەوە لە گیانی تۆڵە سەندنەوە ئامادەبوونی هەیە، دەتوانین بەرزترین نموونەی لێبوردن لە مێژووی بزووتنەوەی کوردیدا

بەگشتیو لە ئاستی سەرکردایەتیدا لای بارزانی نەمر ببینینەوە، بەتایبەتی لەکاتی ڕێکەوتننامەی ئازاردا کە بارزانیو بزوتنەوەی کوردایەتی لەوپەڕی هێزدا بوون، بەڵام ئەو وەکو سەرکردەیەکی لێبوردەو کە بڕوای بە توندوتیژیو بەزەبرو زەنگو بە تۆڵەکردنەوە نەبوو لە هەموو نەیارەکانی پێشتری بورد.

بێگومان لە سەرهەڵدانەوەی شۆڕشدا لەدوای شکستی ساڵی (١٩٧٥) دیسان توندوتیژیو زەبرو زەنگو تیرۆریش بەکارهاتووە، ئەمەش بەگوێرەی کۆمەڵگای کوردیو حیزبو ڕێکخراوەکانیشی شتێکی غەریب نییە چونکە لە کۆمەڵگایەکی داخراوی وەکو کۆمەڵگای کوردیدا کە حیزبو ڕێکخراوەکانیش بەرهەمی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردین ئاساییە ئەو کارانە ڕوویدەن مادەم هێشتا عەقڵی یەکتر قبوڵکردن باڵادەست نەبووە، بەڵام دەبێ سەرباری بوونی توندوتیژیو تیرۆریش ئێمە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە تیرۆر لە عەقڵی سیاسی کوردیو لە ئەخلاقی کۆمەڵایەتی کوردیدا نەبۆتە پڕۆژەو کارێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو نییە یان نەبۆتە بەرهەمی ئایدیۆلۆژیایەکی باڵادەست.

## سەرئەنجام:

# لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیەدا دەگەینە چەند ئەنجامێک:

١- لەسەرجەم کۆمەڵگا داخراوو دواکەوتووەکاندا فرەدەنگیو فرە رەنگیو فرە رێکخستنو فرە حیزبی بە ئاسانی دروست نابێت، ئەگەر دروستیش بوو ئەوا بە بنیادی پێکهاتنو لەبەرنامەو کارکردندا هاوشێوە دەبن ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا یەک عەقڵی باڵادەستو یەک روانین کار دەکات. کە ئەویش هەموو دەرەوەی خۆی رەتدەکاتەوە.

٢- دەسەڵات بەگشتی مومارەسەی جۆرێک لە توندوتیژی دەکات کە ئەو مومارەسەکردنەش بەپێی سیستەمە سیاسییەکان دەگۆرێت. لە سیستەمی دیموکراتیدا مومارەسەی دەسەڵات بەشێوەیەکی کراوەو ئاڵوگۆرانەو هاوچەرخانە دەکرێت چونکە ئاڵوگۆرکردنی دەسەڵات هەیە، بەڵام لە سیستەمی سیاسی داخراوو تاک رەهەندا دەسەڵات بۆ پاراستنی خۆیی زیاتر توندوتیژی بەکاردێنێ کە زۆر جار دەگاتە ئاستی پاکتاوی رەگەزیو پاکتاوی هەموو بۆچوونە جیاوازەکان ئەوەش هەندێ جار تیرۆر بەرهەم دێنێ، کە دەشێ بە تیرۆری دەوڵەت ناوبرێت یان راستەوخۆ بەرامبەر بە دەنگو رەنگو بۆچوونو عەقڵو ئاینو ئیتنیکە جیاوازەکان بەکاری دەهێنێت.

٣- لە کۆمەڵگای کوردیدا عەقڵی بەرهەمهێنی توندوتیژیو بەو پێیەش عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆریش ئامادەبوونی هەیە، بەڵام ئەو عەقڵە نەیتوانیووە مەسەلەی تیرۆر بکات بە پرۆژە، هەر بۆیە عەقڵی تیرۆر لەسەر ئاستی سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردی لەشێوەی کاری تاکەکەسدا ماوەتەوە.

٤ـ تیرۆر لە شێوەی ڕێکخراوو کاری گروپو دەستەی تیرۆریستیدا لە کۆمەڵگای کوردیدا ڕەگو ڕیشەو بوونی مێژووییانەی نییە، ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا دەبینرێت لە شێوەی کاری گروپو دەستەی ڕێکخراودا بەرهەمی عەقڵو کەلتوری کوردی نییەو لە دەرەوە گەیشتۆتە کوردستان.

٥ـ تیرۆر لە زەمینەی عەقڵیو کەلتوری کوردیدا ناتوانێت ڕەگو ریشە دابکوتێت چونکە زەمینەی کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیو کەلتوری کوردی ئامادەیی ئەوەی تێدا نییە کە تیرۆری ڕێکخراو لە شێوەی پرۆژەدا تیایدا سەر هەڵبدات.

٦ـ لەگەڵ گۆڕانی، کۆمەڵگای کوردی لە عەقڵو کاری تاکەکەسییەوە بۆ عەقڵو کاری دامەزراوەییو چەسپاندنی عەدالەتی کۆمەڵایەتیو جێگیربوونی چەمکی هاووڵاتی بووندا بنەماکانی توندو تیژی لاواز دەبنو بەو پێیەش زەمینەی تیرۆرو پەرەسەندنی عەقڵی بەرهەمهێنی تیرۆر لاواز دەبێت.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت سەرباری بوونی ئاستێکی لاواز لە گیانی لێبوردەیی لە کۆمەڵگای کوردیدا بەڵام لێبوردەیی وەکو چەمکێك ڕوویەرێکی تەسکی هەیە لە کۆمەڵگای کوردیداو ئەو ڕوویەرەش لەگەڵ دروستبوونی حیزبی کوردیدا لە چارەکی دووەمی سەدەی ڕابردوو بەدواوە تەسکتر بووەتەوە چونکە بەگشتی حیزبی کوردی چ لەڕووی بنیادی پێکهاتنو چ لەڕووی شێوازی کارکردنو بەرنامەو ستراتیژەوە تێکەڵاوێکن لە دامەزراوی خێڵ یان باشتر بڵێین جێگرەوەی دامەزراوەی خێڵن، لەلایەکی تریشەوە بریتین لە حیزبی شمولی ستالینی واتە یەك ڕوانینو یەك بینینو یەك بەرنامەو ستراتیژیان هەیە کە ئەویش خۆ بە ڕەها زانینو بەو پێیەش ڕەتکردنەوەی هەموو ڕوانینو بۆچوونو بەرنامەو ئایدیاو ستراتیژو تەنانەت کەسێکیشە کە لە دەرەوەی دامەزراوەکەی ئەو بێت. گوتاری حیزبی کوردی لەسەر بنەمای ئەم تێڕوانینە بەرهەم هاتووە بۆیە گوتارێکە لەپێناوی ئەوەی کە تەنیا خۆی هەبێت دەبێ هەموو ئەوانەی دەرەوەی خۆی بسڕێتەوە، ئەمەش دەیکاتە گوتارێکی بارگاوی کراو بەتووندو تیژی. گوتارێك کە ناتوانێت دان بە هیچ

بوونێکدا بنێت لە دەرەوەی خۆی. هەر ئەمەش وایکردووە کە مێژووی تۆمارکراوی کورد هەر لە پەیوەندی خێڵایەتیو دامەزراندنی میرنشینەکانو حیزبی کوردیو بزوتنەوەکانو دەسەڵاتە ئیدارییەکانی ئەمری واقیعەوە لە شێخ مەحمودەوە بۆ کۆماری مهابادو بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان، مێژوویەکی بارگاوی کراو بێت بە توونەدو تیژی، بە هەوڵدان بۆ لەنێوبردنی هەموو دژەکان، بە سڕینەوەی هەموو نەیارەکان، بەڕێگانەدان بەدروستبوونی فەزایەك بۆ فۆرمەڵەبوونی چەمکی هاوڵاتی بوون. هەروەك لەم واقیعەدا هەر نەیاریو ئۆپۆزسیۆن بوونێك یان هەر داواکردنی مافێك وەکو جۆرێك لە تاوان لەلایەن عەقڵی دەسەڵاتی کوردییەوە سەیر بکرێت، گوتاری ئێ ستای کوردی گوتارێکی بارگاوی کراوە بە ه وو توخمو رەگەزەکانی هەر گوت ێکی شمولی داخراو، دیارە هەموو گوتارێکی شمولیش بارگاوی کراوە بە توونەدو تیژیو جۆرێکە لە پرۆژەی لەنێوبردنی هەموو ئەوانەی لە دەرەوەی ئەودان لەسەر ئاستی روانینو بیرکردنەوەو ئایدیۆلۆژی حیزبو کۆمەڵگاو تاکەکەسیش، ئەمەش حاڵەتێکە رووبەرێکی هێجگار فراوانی لە کۆمەڵگای کوردی داگیرکردووەو خودی کۆمەڵگاش بەرهەمهێنی ئەم کەلتورەو ئەم گوتارە داخراوەیە.

# سەرچاوەکانی کەلتوری داخراو

## سەرچاوەکان/

1- David sugarman – Legality, Ideology and The State – London -1983.

2- cemmer, D. The prison community. New York – 1990.

٣- أدونيس العكرة ـ الإرهاب السياسي ـ بيروت دار الطليعة ـ ١٩٨٣.

4- Amnesty International – Iraqi Kurds – Human Rights Violations in Iraq – (New York Amnesty International 1990).

5- Macdwall – A modern History of Kurds – London – New York -2000.

٥- الدكتور علي الوردي ـ دراسة في طبيعة المجتمع العراقي ـ المكتبة الحيدرية - الطبعة الثانية ـ ١٩٩٨.

٦- نادر ئینتسار ـ ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی ـ و. عەتا قەرەداغی ـ سلێمانی ٢٠٠٤ل٧٨.

٧ـ د. علي حرب ـ الممنوع و الممتنع ـ المركز الثقافي العربي ـ ١٩٩٥.

# بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

*** نووسین:**

١ـ فۆرمەلە نەبوونی گوتاری کوردی / هێلسنکی ١٩٩٥.

٢ـ ستراتیژو کەسێتی نەتەوەیی کوردی ـ سلێمانی ١٩٩٨.

٣ـ چەمکی دەوڵەتو بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا ـ سلێمانی ١٩٩٩.

٤ـ کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد ـ سلێمانی ٢٠٠١.

٥ـ کۆمەڵگای کوردیو پەرەسەندنی ناسروشتی ـ سلێمانی ٢٠٠١.

٦ـ سلێمانی زەمینەی ململانێی تەسەوف ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٣.

٧ـ خەونی سەربەخۆیی لە واقیعێکی ناجێگیردا ـ سلێمانی ٢٠٠٥.

٨ـ گۆران و گەڕان بەدوای یەقیندا سلێمانی ١٩٩٩.

٩ـ گەڕان بەدوای ناسنامەدا ـ سلێمانی ٢٠٠١.

١٠ـ گەڕان بەدوای بووندا ـ سلێمانی ٢٠٠٢.

١١ـ گەڕانەوە لە خەیاڵەوە بۆ واقیع ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٤.

١٢ـ گەڕان بەدوای ماناکانی شیعردا ـ ٢٠٠٦.

*** وەرگێران:**

١٣ـ رێبازەکانی رەخنە ـ کتێبی یەکەم ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٢.

١٤ـ رێبازەکاتنی رەخنە ـ کتێبی دووەم ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٧.

١٥ـ پەرەسەندنی دانیشتوانی سلێمانی ـ ٢٠٠٠.

١٦ـ ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی ـ سلێمانی ٢٠٠٤.

١٧ـ تارماییەکان ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٥.

١٨ـ جیۆپۆلەتیکی نوێی تورکیا ـ سلێمانی ٢٠٠٦.

# ئامادەیە بۆ چاپ:

١ـ فانتازیای گەڕانەوە.

٢ـ ڕەگ و ڕیشەی کورد.

٣ـ گوتاری ناسیونالیزمی کوردی ـ بەرگی دووەم.